



# كوردستان

## لە سەدەی نۆزدەهەمدا

### وەک گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان بینیویانە

**بەرگی یەکەم**

**وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە،**
**پێشەکی و پەراوێزنووسینی:**

نەجاتی عەبدوڵڵا






## لە سەدەی نۆزدەهەمدا

### وەک گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان بینیویانە

**بەرگی یەکەم**

**وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە،**
**پێشەکی و پەراوێزنووسینی:**

نەجاتی عەبدوڵڵا

هەولێر
٢٠٢٢

**بیروڕاگەلێك كە لەم كتێبەدا هاتوون، بەرپرسیارێتی سەرلەبەریان تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی، ئەكادیمیای كوردی لێیان بەرپرس نییە.**




* ناوی کتێب: کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەک گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان بینیویانە
* لەفەرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا.
* بەرگ : یەکەم
* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود
* نەخشەسازی: عیسام موحسین
* وێنـەی سـەر بـەرگ: كوردەكانـی پیدەشـتی ئەنتاكیـا (1790)، بـە قەڵەمكێشـی هونەرمەنـد و نیگاركێشـی فەرەنسـایی (فرانسـوا ڕۆسـی 1824-1743 ) Rosset François).
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٤٩١)
* چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٢١)ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە

# پێشەکی

لە مێژووی کوردناسیی ڕۆژئاواییدا، سەدەی نۆزدەهەم بە دەوڵەمەندترین و پڕ بەرهەمترین سەدە دادەنرێت لەڕووی دەوڵەمەندی و زۆریی ئەو مەتریاڵ و سەفەرنامە و گەشتنامانەی لەو سەدەیەدا بۆ ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کراون. بەدڵنیاییەوە ئەو سەفەرنامە و بیرەوەری و پەیوەندییانەی سەفەر، کە گەڕۆک و گەڕیدە ڕۆژهەڵاتناسەکان (بەڕوویێکی تایبەتی) ئەوروپایی و ئەمریکاییەکان، لەکاتی گەشتەکانی خۆیاندا بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئیمپراتۆریای پێرسیا (ئێران) لە گەڕان و سوورانەکانیاندا بە ناوچە کوردەوارییەکانی ئەم دوو ئیمپراتۆریایە، سەرنج و تێبینی وردی خۆیان تێیاندا تۆمارکردوون و دواتر ئەم گەڕۆکانە پاش گەڕانەوەیان لە داوێنی کتێبی سەفەر و گەشتنامەکانی خۆیاندا باسی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تا ڕادەیەك ژیانی فەرهەنگیی کۆمەڵی کوردەواری ئەوسەردەمانەشیان بۆ تۆمارکردووین و بیروڕای خۆیان لەسەر ئەو دیمەن و دابونەریتانە دەربڕیوە، کە بینیویانە و سەرنجی ڕاکێشاون. ئەمڕۆ ئەو سەرچاوانە بۆ ئێمە بەدەر لەو نیازەی، کە خاوەنەکانی گەشتیان بۆ کردووە، بۆ ئێمە بوونەتە سەرچاوەیەکی گەورە و لەگەڵ خۆیاندا برێکی زۆر زانیاری و مەتریاڵ و فیگور و وێنەی دەگمەنی کورد و کوردستانیان بۆ پاراستووین و گەواهی زۆر ڕووداوگەلی گرینگ و مێژوویی بوون، کە لەو سەردەمانەدا ڕوویان داوە. ئەم سەرچاوانە فرە بابەتن و

دەکرێ بۆ لێکۆڵینەوە لەزۆر  لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی کوردی خوێندنەوە و تێرامانی فرە دیسپلینیان بۆ بکرێ و لەو ڕێگەوەیەوە ئەوەندەی دەکرێ وێنەی ئاڵقە ونەکانی مێژووی خۆمانی پێ بدۆزینەوە و دووبارە بەدوای سەرەداوی ڕووداوەکان بچین بۆ دۆزینەوەی لایەنە شاراوەکانی مێژووی خۆمان.

لەناو بەرهەمە کوردناسیەکاندا، کوردناسی لای ئەوروپاییەکان (بەتایبەتی ئینگلیز و فەرەنساییەکان) و زۆریش بەتایبەتی لەسەدەی نۆزدەهەمدا شوێنێکی تایبەت دەگرێ. چاوگێرانێك بەناو و پێگە و  کەسایەتی گەڕۆکەکان ئەوە بەدەر دەخات، کە بەشی زۆرترینی ئەو گەڕۆکانە، بەپێچەوانەی سەدەکانی شانزەهەم-هەژدەهەم، زیاتر عەسکەرتار، دیپلۆماتکار وکارداریی دەوڵەتیی بوون و زیاتر بۆ زانیاریی کۆکردنەوە هاتوون، بە ئامانجی ڕێگە خۆشکردن بۆ سیاسەتی وڵاتگیریی و دەستپێڕاگەیشتنی وڵاتەکەیان بەو دەروناوچانەدا گەشتەکانیان ئەنجام داوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندەی ئەوەی ئەم سەفەرنامانە لە کاتی خۆیدا بۆ زانیاری وئاگەداربوونی وڵاتەکەیان گرینگ و پێویست بوون، ئەمڕۆ بۆ ئێمە ئەو زانیارییانە گەلێک زۆر لەوە زیاتر گرینگ تر و بەسوودترن. ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بێت و لە مێژووی سەدەی نۆزدەهەمی کوردستاندا ئەو سەرچاوە کوردناسیانە دەربهاوێژین، کە ئەوروپاییەکان نووسیویانە پێم وانییە شتێکی ئاوهامان لە بواری مێژوونووسیی کوردیدا بۆ بمێنێتەوە. بۆیە هەق وایە و دەبوایە ئەمڕۆ هەموو ئەم کەرەستە کوردناسیانە وەربگێردرابوونایەتە سەر زمانی کوردی و بە لێکدانەوە و پەراوێزی پێویست بمانهێنابوونایەوە ناو کتێبخانەی کوردی. ئەم هەوڵەی ئێمە کە تایبەتە بە سەفەرنامە ئەورپاییەکان لەسەدەی نۆزدەهەم و لەم بەرگی یەکەمەدا کۆکراوەی شەش سەفەرنامەی گرینگ لەبارەی کوردستان لە سەدەی نۆزدەهەم بەسەر یەکەوە بڵاودەکەینەوە و زۆر

بەهیواین بتوانین ئەم پرۆژەیە بەردەوام بێت و لە بەرگەکانی دیکەدا تەواوی ئەو سەفەرنامانەی دیکە، کە هەر لەو سەدەیەدا ئەنجام دراون و ماون، ئەوەندەی دەرۆستی دێین بە کوردی بڵاویان بکەینەوە و هەر بەم بۆنەیەشەوە پێشنیازی ئەوە دەکەین، تا هەرچی زوورترە ناوەندێکی تایبەت بە کوردناسی لە کوردستان بکرێتەوە، کە بایەخ بە بەرهەمەکانی کوردناسی بدات و کتێبخانەی تایبەتی و گۆڤاری تایبەتی خۆی هەبێت و کاری سەرەکی ئەوەبێت بەوەرگێڕانی ئەم سەفەرنامە و کتێبانە ڕابگات، کە بەزمانە ئەوروپاییەکان نووسراون و پەرچەڤەیان بکاتەوە بۆسەر زمانی کوردی و، ئەوە کارێکە تا دوا ڕادە پێویست و لەجێی خۆیدایە و کەلێنێکی گەورە لە بواری مەعریفەناسیی کورد پڕ دەکاتەوە. وەک هەموو جار لە کۆتایی ئەم پێشەکییە پێویستە سوپاسێکی زۆری (ئەکادیمیای کوردی)، ئەو دەزگە زانستییە ئەکادیمییە بەرزە بکەم، کە هەمیشە لە پشت کارەکانی من بووە و، بۆ ئەوە شایانی هەموو پێزانینێکمە. هەروەها سوپاسێکی تایبەتی هاوڕێی خۆشەویستم ئامانج شاکەلی دەکەم، کە بە بەشی زۆری کوردییەکەی ئەم بەرگەدا چۆتەوە و لەزۆر جێگەشدا تێبینی زۆر وردی پێداوم، کە گەواهی ڕێز و ستایشی تایبەتییە.

**فەرەنسا**

**١٢ ی تەمموزی ٢٠٢٢**

# سەفەرنامەی گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتناس و گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان
# ( وەك سەرچاوەیەك بۆ مێژووی کورد)

**پێشەکی: سەدەی شانزەهەم-هەژدەم**

ڕەنگە بەشێوەیەکی زۆر سەرەتایی یەکەمین تاڵە داوەکانی پەیوەندی نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی سێزدەهەم کاتێك یەکەمین گرووپی مسیۆنێرە فەرەنسایەکان لەساڵی ١٢٨٨ بە سەرۆکایەتیی Aorentin Ricoldo چوونەتە تەورێز و لەوێشەوە بەناو کوردستاندا چوونەتە مووسڵ(١). دواتر سەدەی چواردەهەم و سەدەی پازدەهەم هیچ پەیوەندییێکی ئاوها لەنێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا نەبووە، گەرچی لەو ماوەیەدا بڕێک لە مسیۆنێر و موژدەگارەکان بەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا گەڕاون، بەڵام تایبەت بە کوردستان و سەرزەمینی کوردان شتێکی ئاوایان بۆ بەجێنەهێشتووین، کە بتوانین بەتایبەتی قامکی بۆ درێژ بکەین.

ڕەنگە لە سەدەی شانزەهەمەوە یەکێک لە کۆنترین سەفەرنامەکانی ڕۆژئاواییەکان بۆ ڕۆژهەڵات، سەفەرنامەی ئەو بازگانە ڤینیزیاییە بێ، کە لەسەرەتای سەدەی شانزەهەم لەسەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی و بە

---

(١) فەرهاد پیرباڵ (د)، کورد لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل.٢٢

دیاریکراویش لە سەروبەندی جەنگی چاڵدێراندا هاتۆتە ڕۆژهەڵات بەناو کوردستانیشدا تێپەڕبووە. ئەو گەڕۆکە لە سەرچاوەکان بە بازرگانە ڤێنیزییە بێناوەکە ناوی هاتووە. لە ڤینیسیاوە سەفەری کردووە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و ناوی خۆی نەنووسیوە و ئەمەش وای لە ڕۆژهەڵاتناسەکان کردووە و هەر بەناوی "بازرگانە ڤێنیزاییە بێناوەکە" ناوی ببەن. سەفەرنامەکەی بە زمانی ئیتاڵی لە ساڵی ١٥٥٩دا بڵاوکرایەوە[١]. لەسەفەرنامەکەیدا وەسفێکی زۆر کورتی "قەڵا جوانەکەی بتلیس" دەکات و دەڵێت شازادەی ناوچەکە سینۆرێکی seigneur کورد بووە بە ناوی "سەرەسبێگ Sarasbec" (شەرەف بەگ Sharaf beg)؛ دەشڵێت: ( شا ئیسماعیلی سەفەوی لەشکرێکی ٦٠٠٠ هەزار سوارەی بۆ سەر ئەم شازادە کوردە نارد، بەڵام ناچار بوو بانگی سوپاکەی بکاتەوە بۆ ئەوەی بەری هێرشێکی دیکە بۆ سەر شانشینەکەی پێ بەرپەرچ بداتەوە و ئەوە سەردەمی شەڕی چاڵدیران بوو)[٢].

ئەوە هەر لە سەدەی شانزەهەمدا بوو، کە بۆ یەکەمجار یەکەمین قوتابخانەی دەوڵەتیی فەرەنسی لە ئیستەنبووڵ کرایەوە و لەم سەدەیەدا ئیدی چەند گەڕیدە و مسیۆنێرێکی ڕۆژئاوایی (بەتایبەتی فەرەنسایییەکان)سەفەری ڕۆژهەڵاتیان کردووە و کەموزۆر چەند شتێکیان لەسەر کوردستانیش نووسیوە لەوانە: ژان شێسنوو[٣] Jean Chesneau ( کە لە ساڵەکانی 1547 تا 1555 ماوەی

---

[1]Viaggio d'un mercatante che fu nella Persia, Ed. Ramusion, collection "Délia navigationi et viaggi", Venetia 1559.

[2]Ismet Chériff Vanly, LES KURDES ET LE KURDISTAN DANS LES RELATIONS D'ANCIENS VOYAGEURS OCCIDENTAUX (XVIe - XVIIIe siècle) Avec introduction et commentaires, KSSE – Publication, 1973, pp.11-12.

[3]CHESNEAU Jean, *Voyage de Paris en Constantinople*, Édition critique par Lisa Pochmalicki, Genève, Droz, 2019, LXVIII + 127 p.

هەشت ساڵ لە ئیستەنبووڵ لە کونسوڵخانەی فەرەنسا کاری کردووە)، ژان شێسنوو لە سەفەرنامەکەیدا باسی دیاربەکر مووش و خارپووت و بتلیس دەکات[١]. (ژاك گاسووت Jacques Gassot ١٥٢٥-١٥٨٥)[٢]، لە سەفەرنامەکەیدا باسی وان، مووش، بتلیس، دیاربەکر و مەلاتییە و ئوورفە دەکات[٣]. کلۆد بیلیەڤر[٤] Claude Bellièvre (1487-1557) سەری کوردستانی تورکیای داوە و باسی شاری بتلیس دەکات [٥]. پییێر بیلۆن Pierre Belon، ناتورالیست بووە و لە ساڵەکانی ١٥٤٦ تا ١٥٤٩ بەناو تورکیای عوسمانی و سووریەدا گەڕاوە. هەر لەو سەروبەندانەدا لە ساڵی ١٥٦٥ لە هیندوستانەوە پورتوگالیاییەک بەناوی (میستەر ئەفۆنسۆ Mestre Affonso) بە بتلیس دا دەڕوات و چەند زانیارییەکی زۆر کەم لەبارەی قەڵای بتلیس یادداشت دەکات (قەڵاکە دەکەوێتە سەر بەرزاییی بەردەڵانێکی سەخت، بە دیواری بەرز دەورە دراوە، کە تاوەرەکان لە لایەکانیانەوە دەورەیان داوە و بە وریاییەوە پاسەوانی دەکرێت، پێدەچێت بەئاسانی داگیرنەکرێ)[٦].

---

[١] فەرهاد پیرباڵ (د)، هەمان سەرچاوە، ل.٢٤.

[2] Jacques Gassot, Le Discours du voyage de Venise a Constantinople, contenant la querele du grand Seigneur contre le Sophi: avec elegante description de plusieurs lieux, villes, & Citez de la Grece, & choses admirables en icelle. Par maistre Jaques Gassot, dedié & envoyé a maistre Jaques Tiboust, escuier, Seigneur de Quantilly, Notaire & Secretaire du Roy, & son Esleu en Berry. (1550).

[٣] فەرهاد پیرباڵ (د)، هەمان سەرچاوە، ل.٢٤.

[4] Souvenirs de voyages en Italie et en Orient et Notes historiques, pièces de vers - Précédés d'une notice sur C. Bellièvre, sa famille et son œuvre par Jean Tricou, 1956.

[٥] فەرهاد پیرباڵ (د)، سەرچاوەی پێشوو، ل.٢٤.

[6] Ismet Chériff Vanly, op.cit, p.12.

ڕەنگە دوایین ساڵەکانی سەدەی شانزەهەم لەناو گەڕیدە ئەوروپاییەکان گەواهی یەکەمین سەرەتای ناسیاوی فەرەنسییەکان بێ بە گەلێک بەناوی (کورد) و ناسینی کورد لای فەرەنساییەکان لێرەوە دەست پێ دەکات کاتێک گەڕۆکێکی بێ ناو[1] بەناوی (بەگزادەیەکی دارودەستەی سینۆر شارلی بالیۆزی پاشای ئەنگڵستان) لە سەفەرنامەکەی خۆی، کە لە ٢ ی سێپتامبەری ساڵی ١٥٩٨ لە حەلەبەوە دەرچووە، بە ئەلباب، بیرەجەک، ڕەققە، دێرەزوور، تا فەلووجە و پاشان لە ٣٠ی ئەیلوول تا ٤ ی تشرینی دووەمی ١٥٩٨ لە بەغدا ماوەتەوە و پاشان چۆتە پێرسیا (ئێران) و دواتر لە کۆتایی ساڵی ١٥٩٩ لەگەڵ ئەنتۆنی شارلی چۆتە مۆسکۆ، بەڵام چاپی سەفەرنامەکەی ڕێک دوای نیو سەدە دواتر، ساڵی ١٦٥١ لە پاریس بە ناوی (سەفەرنامەی گەشتێك بۆ ئێران لە ساڵەکانی ١٥٩٨ و ١٥٩٩) چاپکراوە[2]. گرووپە گەڕۆکەکە ناچار بوون بۆ ئەوەی سەری ئەسفەهانی پایتەختی پێرسیا (ئێران) بدەن بەناو کوردستاندا تێپەڕ بین و لەم سەفەرنامەیەدا زۆر بە کورتی باسی کورد دەکات و باسی سەفەرەکانی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ ناو چیاکانی کوردستان و دەڵێ چەندین ماڵی قوڕین هەبوو، کە سەریان داپۆشرابوو و بۆنی نان و دار (دارسووتان)

---

[1] بەقسەی تۆژەر ئیدوارد دونیسۆن ڕۆس، ئەم گەڕۆکە بێ ناوە، ناوی ( ئابێل پینسۆن Abel Pinçon) بووە و بەپێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز ناسنامەکەی ئاشکرا کردووە ، بڕوانە:

Olivier Salmon, Alep dans la littérature de voyage européenne pendant la période ottomane (1516-1918), tom 2, p, 778.

[2] Relation d'un voyage de Perse fait es annees 1598. & 1599 par un gentil-homme de la suitte de Seigneur Scierley ambassadeur du Roy d'Angleterre, 1651.

دەهات، دانیشتوانەکەی ئەوانەن، کە کاردۆخییەکانییان بەزاند. لەبارەی زمانی خەڵکەشەوە دەنووسێ خەڵکەکەی بەزمانێک، کە نە زمانی عەرەبی، نە تورکی، نە ئەرمەنی و نە فارسی بوو، قسەیان پێ دەکرد، بەڵکو بە زمانێك قسەیان دەکرد کە تایبەت بوو بە خۆیان. هەروەك چۆن خەڵکەکە ناوی تایبەتی خۆیان هەیە و گوێڕایەڵیی پادشاهی جیهان ناکەن و هەموو ئەم خەڵکانە تا مەملەکەتی پێرسیا (ئێران) بە خۆیان دەڵێن کورد Covrdes. دوایی باسی ئەوە دەگێڕێتەوە چۆن نان و پەنیر (کەرە) و میوە و سەوزەیان لە کوردکان وەرگرتووە و ئەوانیش لەبەرانبەردا مەرێك و چەند پارچە قوماش و دەستەسڕیان پێداون [1].


RELATION
D'VN
VOYAGE
DE
PERSE
FAICT ES ANNEES
1598. & 1599.

PAR VN GENTIL-HOMME DE
la suite du Seigneur Sherley Ambassadeur
du Roy d'Angleterre.

NOVS séiournasmes à Halep environ deux mois, d'où nous partismes le second iour de Septembre l'an mil cinq cens nonante-huict apres souper, pour prendre le chemin vers Babylone, & arrivasmes ...

(سەفەرنامەی گەشتێك بۆ ئێران لە ساڵەکانی ١٥٩٨ و ١٥٩٩)

---

[1] Relations veritables et curieuses de l'isle de Madagascar, et du Bresil: Auec l'histoire de la derniere guerre faite au Bresil, entre les Portugais et les Hollandois; Trois relations d'Egypte, & vne du royaume de Perse, 1856, p. 119.

لەناو سەفەرنامە ئینگلیزییەکان، جۆن میلدنهال* (١٥٦٠-١٦١٤) یەکەمین گەڕاڵی ئینگلیز بووە، کە ساڵی ١٥٩٩-١٦٠٠ ، لە دوایین ساڵەکانی سەدەی شانزەهەم و یەکەمین ساڵی سەدەی حەڤدەهەم سەفەری ئیمپراتۆریای هیندستانی کردووە و دواتر سەری ئیمپراتۆریای ئێران و ئیمپراتۆریای عوسمانی داوە و لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، کە ساڵی ١٦٢٥ لە لەندەن چاپکراوە بەناو کوردستانیشدا ڕۆیشتووە، لە ٧ ی حوزەیرانی ١٦٠٠ حەڵەب بەجێدەهێڵی و بە خۆیی و شەشسەد کەس لە دارودەستەکەیەوە لە ڕێگەی بیر، ئوورفە، دیاربەکر، بتلیس، وان، جولفا، سولتانییە، قەزوین، قوم، کاشان، کرمان، سیستان و قەندەهار سەفەر دەکا، تا ساڵی ١٦٠٣ دەگاتە لاهور و زۆر بە کورتی باسێکی ئەو شارە کوردییانەش دەکات کە پێیاندا ڕەت بووە[1]. دواتر لە سەدەی حەڤدەهەم چەند سەفەرنامەیەکی گرینگی ڕۆژئاوایی هەیە بۆ کوردستان، کە سەرچاوە گەلێکی زۆر گرینگن بۆ کوردناسی و گرینگترینیان بریتین لەم سەفەرنامانە: ڕەنگە سەردەستەکەیان سەفەرنامەکەی ئیتالیایی پیترۆ دیێلا ڤالێ[2] Pietro D'ELLA VALLE (1886-1652)بێ، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم کە یەکێک لەسەرچاوە هەرە دەوڵەمەند و پڕ زانیارییەکان بێ بۆ مێژووی کوردناسی. دیێلا ڤالێ ساڵی ١٦٢٦ کە لە ئیستەنبووڵ دەبێ، خانی بتلیس دەبینێ

* John MILDENHALL

[1] بۆ چاپی ئەم سەفەرنامەیە، بڕوانە:

Oost-Indise voyagien van J. Mildenhall en J. Cartwright, in de jaren 1599 en 1606 te water en te lande, gedaan na de landen van Persien en den Grooten Mogol. Door haar selfs beschreven, en nu aldereerst uyt het Engels vertaald, etc.

[2] وەرگێری ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژی بەناوی (کورد و کوردستان لە سەفەرنامەی پیترۆ دیێلا ڤالێ - سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم) لەڕووی چاپە فەرەنسییەکەوە نووسیوە و بەم زووانە بڵاودەبێتەوە (وەرگێڕ).

سەردانی شارەکە دەکات و وەک ڕووداوێکی گرینگ هاتنی خان دەگێڕێتەوە. خان بەڵێنی تەیارکردنی دوانزە هەزار سەربازی بە سوڵتانی عوسمانی داوە. دیێلا ڤالێ ساڵی ١٦١٦ لە بەغدا گیرۆدەی داوی خۆشەویستی کچێکی کریستیانی ئاسووری دەبێ بەناوی (مانی Maani) دەیخوازێ و بەخۆیی و بە دوو نۆکەرەوە زۆرترین بەشی کوردستان لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەم تەی دەکات و لەناو ڕەشماڵی کوردەکان دەمێنێتەوە و نانی کوردەکان دەخوا و لەناو ڕەشماڵ لەگەڵ کوردەکان لەسەرمان هەڵدەلەرزێ و زۆر دۆستانە باسی کورد دەکات. لە باسی خانی بتلیس دەڵێ خاوەنی (١٠ بۆ ١٢) هەزار سوارەیە.






دوای سەفەرنامەی دیێلا ڤالێ ڕەنگە گرینگترین سەرچاوەی کوردناسی سەفەرەنامەکەی فەرەنسایی بازرگانی بەردی گرانبەها، ژان پاتیست تاڤێرنییێ Jean-Baptiste TAVERNIER (١٦٠٥-١٦٨٩) بێ. تاڤێرنییێ ساڵی ١٦٣٢ سەری کوردستانی داوە. لە ئیتالیا دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕێک دەکەوێ سەری خاکی پیرۆز بدات و بەڕێگەی ئیستەنبووڵ سەفەری ئیسفەهان دەکات و دواتر بەڕێگەی زێیی گەورە بەناو ئەربیل، شارەزوور، قەسری شیرین دەچێتە کوردستانی ئێران و هەمەدان. گرینگیی ئەم سەرچاوەیە لەوەدایە، کە زۆر بە وردی باسی شوێن و ڕۆڵی کورد لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریا لە ساڵەکانی سییەکان و چلەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا دەکات. شایانی گوتنە تاڤێرنییێ لەزۆر جێگەدا بە کوردستاندا تێدەپەڕێ -سێ ڕێگەی سەرەکی دەگرێتە بەر، ئەوەی دیار و لەبەرچاوە ئەوەیە، کوردستان پردێکی ئیجگار گرینگ بووە بۆ گەیشتن بە فارس (ئێران). بە چەشەیەکی زۆرەوە بەم ڕێگەیانەدا تێدەپەڕێ دەڵێ: (ڕاستییەکەی زۆر خۆشە سەفەر بۆ وڵاتی ئەم کوردانە بکەی: ئەگەرچی لە لایەک ڕێگەکان سەختن، بەڵام لە هەموو لایەک درەختی گەورە گەورە دەبینرێ وەکوو بەڕوو و ...دیمەنی جوان جوان)[1]. دواتر لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم، لە ساڵی ١٦٦٣، گەڕۆکی فەرەنسایی ژان دو تیڤینۆ Jean de THEVENOT (١٦٣٣-١٦٦٧) بۆ دووەم جار لە مارسیلیاوە دەچێ بۆ ئەسکەندەرییە، لەوێشەوە دەگاتە دیمەشق، پاشان حەلەب. بەدرێژایی سنوورەکانی باشووری-ڕۆژئاوای کوردستان، حەلەب بەجێدەهێڵێت بەرەو ئوورفە، پاشان ماردین و نیسبین و مووسڵ، لەوێشەوە بەکەڵەک بەناو دیجلە بۆ بەغدا دادەبەزێت و لە بەغداشەوە بە نزیکەیی هەمان ڕێچکەی ئەو سەفەر هەڵدەگرێ، کە دیێلا ڤالێ بەر لە نیو سەدە پێشتر بە کوردستانی پێرسیا (ئێران)دا

[1] موحسین ئەحمەد عومەر، ( وینەی کورد لای گەرۆکە فەرەنسیەکان)، گۆڤاری (ڕابوون)، ژمارە (٦)،١٩٩٣، سوید، ل. ١٠٥.

ڕەتبوو بوو، بە تایبەتی بە مەندەلی، سەراو، گەویر، ماهیدەشت، پولی-شا، کرماشان، بێستون، سەحنە، کەنگاوەر، هەمەدان، پاشان بە ئیسفەهان تێدەپەڕێ و، لەوێشەوە لە کەنداوی فارسەوە بەرەو هیندستان دەڕواتەوە و ساڵی ١٦٨٩ سەفەرنامەکەی لە پاریس چاپ دەکات[1].

دواتر بەدرێژایی کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم و بەدرێژایی سەدەی هەژدەهەم ئەم گەڕۆکە ئەوروپاییانە سەردانی کوردستان دەکەن: فیلیپ ئەڤریل[2] Avril Philippe (١٦٥٤-١٦٩٨)،پێتی دو لە کرروا Pétis de la Croix (١٦٧٠)[3]، پوولێ Poullet(1668)[4]، ژان شاردان[5] Jean Chardin (1643-1713)، کەم و زۆر چەند شتێکیان لەسەر کوردستان بۆ بەجێهێشتووین، گەڕیدەی ئینگلیزی ڕیچارد پۆکۆسکی (١٧٠٤-١٧٦٥) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (وەسپی ڕۆژهەڵات و چەند وڵاتێکی دیکە)[6] کە ساڵی ١٧٤٥ چاپکراوە زۆر بە ڕاگوزەریی باسێکی کوردیش دەکات. گەڕیدەی فەرەنسایی (ژان ئۆتێ Jean

(1) Voyages de M. de Thévenot en Europe, Asie et Afrique, Première partie contenant le voyage du Levant, Paris, I689.

(2) Voyage en divers États d'Europe et d'Asie, entrepris pour découvrir un nouveau chemin à la Chine (par le P. Ph. Avril.) (1692).

(3) Relation de Dourry Efendy, ambassadeur de la porte Othomane auprès du roi de Perse, traduite du turk, et suivie de l'Extrait des voyages de Pétis de La Croix, Parism 1810, pp 77-174.

(4) POULLET, Nouvelles relations du Levant, qui contiennent plusieurs remarque, touchant la Religion, les moeurs & la politique de divers Peuples, Par Monsieur P. A., Paris, L. Billaine, MDCLXVII [=1668].

(5) Jean Chardin, *Journal du voyage du Chevalier Chardin en Perse*, Amsterdam, Jean Wolters & Ysbrand Haring, 1686.

(6) Richard Pococke; A description of the East, and some other countries, London : printed for the author, by W. Bowyer; and sold by J. and P. Knapton, W. Innys, W. Meadows, G. Hawkins, S. Birt, T. Longman, C. Hitch, R. Dodsley, J. Nourse, and J. Rivington, MDCCXLIII-MDCCXLV [1743-1745].

(Otter-١٧٤٨)[1]. دواتر لە کۆتایی نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم گەڕیدەیەکی دیکەی ئینگلیز بە ناوی ژۆن ژاکسۆن لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، کە دوو ساڵ دوای گەشتەکەی، سەفەرنامەکەی ساڵی ١٧٩٩ لە لەندەن چاپکراوە، بە کورتی باسێکی کورد و شارەکانی کوردستان بە تایبەتی شاری ئامەد (دیاربەکر)[2] دەکات.


A
DESCRIPTION
OF THE
EAST,
AND
Some other COUNTRIES.
VOL. II. PART II.
OBSERVATIONS on the ISLANDS of the ARCHIPELAGO, ASIA MINOR, THRACE, GREECE, and some other Parts of EUROPE.
By RICHARD POCOCKE, LL.D. F.R.S.
LONDON,
Printed for the AUTHOR, by W. BOWYER.
MDCCXLV.

(وەسفی ڕۆژهەڵات و چەند وڵاتێکی دیکە)


NOUVELLES
RELATIONS
DU LEVANT
QUI CONTIENNENT
PREMIERE PARTIE
des Voyages du S. POULLET.
A PARIS,
M.DC.LXVIII.
AVEC PRIVILEGE DU ROY.

(سەفەرنامەی پوولێ ١٦٦٨)

---

(1) Jean Otter, *Voyage en Turquie et en Perse, avec une relation des expéditions de Tahmas-Koulikhan* par M. Otter, Paris : Guérin, 1748, 2 vol.

(2) John Jackson, Journey from India, Towards England, in the Year 1797: By a Route Commonly Called Over-Land, Through Countries Not Much Frequented, and Many of Them Euphrates and Tigris, Through Curdistan, London, 1799.

پاش ئەم چاوگێڕانە خێراییە بە سەفەرنامەی گەڕۆک و گەڕیدە ئەوروپاییەکان بۆ کوردستان لە سەدەکانی (شانزەهەم-هەژدەهەم)، بۆ ئەوەی کاری پۆلینکردنی سەفەرنامەکانی سەدەی نۆزدەهەم مان ئاسانتر بێت، ئێمە ئەم سەدەیە بەوپێیەی بەشی زۆرترینی گەڕۆکە ڕۆژئاواییەکان فەرەنسایی و ئینگلیز بوون، باسەکە بەم شێوەیە دابەشی سەر دوو بەشی سەرەکی دەکەین.




کوردێکی چیایی لە هەکاری  (گاسپارد درۆڤیل، بەرگی یەکەم، 1825)

# بەشی یەکەم:
# سەفەرنامەی گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتناسە فەرەنسییەکان وەك سەرچاوەیەك بۆ مێژووی کورد
## (سەدەی نۆزدەهەم)

لەگەڵ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم پەیوەندییەکانی ڕۆژهەڵات- ڕۆژئاوا زیاتر شێوەیەکی ڕەسمی بەخۆیەوە دەگرێ. فەرەنسا بایەخێکی زۆر زیاتر بەم پەیوەندییانە دەدات بەتایبەتی دوای داگیرکردنی میسر لەلایەن ناپلیۆنەوە ساڵی ١٧٩٨. بەم شێوەیە سەدەی نۆزدەهەم ژمارەیەکی یەکجار زۆری سەفەرنامەی فەرەنسایمان هەیە بۆ ڕۆژهەڵات، کە سەری کوردستانیشیان داوە و کەم و زۆر باسی کوردستانی سەدەی نۆزدەهەممان بۆ دەگێڕنەوە. جگە لەوە سەدەی نۆزدەهەم سەدەی گەشتنامەی دیپلۆماتیش دەبێت کەوا حوکوومەتی فەرەنسا لە ڕێگەی وەزارەتەکانی پەروەردەی گشتی، وەزارەتی ناوخۆ، وەزارەتی حەربی و ئەکادیمیای فەرەنسی مسیۆنی تایبەت بۆ ڕۆژهەڵات دەنێرن. بۆ ئەوەی باسەکەمان شێوەیەکی میتۆدیك وەربگرێ، ئەم بەشەمان کردۆتە دوو تەوەر. تەوەری یەکەم نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، کە سەردەمێکی زۆر چارەنووسسازە لە مێژووی کورد و سەرەتای شەڕی کورد و تورکە و دواجار هەر لەم نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا هەموو ئەمارەتە کوردییەکان کۆتایی یان دێت. ئەم ماوەیە بۆ خۆی سەرەتای لەرزین و درزتێکەوتنی

پەیوەندی چەندین ساڵەی نێوان تورك و کوردە و گەواهینامەکانی گەڕۆکەکان مەتریاڵ و کەرەستەی زۆریان تێدایە بۆ مێژووی کورد. ئەگەر سەدەی هەژدەهەم بۆ مێژووی کورد لەناو سەفەرنامە فەرەنسایيەکان تەنیا سەفەرنامەکەی ژان ئۆتێ ی تێدا بووبێت ئەوا بەپێچەوانەوە سەدەی نۆزدەهەم کۆمەڵێکی زۆر کتێبی سەفەرنامەی تێدایە کە وا لە خوارەوە بە کورتی باسی گرنگترینیان دەکەین:

یەکەم گەڕۆکی فەرەنسی سەدەی نۆزدەهەم کە پێی نابێتە کوردستانەوە گییۆم ئەنتوان ئۆلیڤیێ Guillaume Antoine Olivier (١٧٥٦-١٨١٤) بوو. ئەم گەڕۆکە ناتورالیست بووە و لەلایەن ئەنجوومەنی تەنفیزیی کاتیی شۆڕش هەر دوای شۆڕشی فەرەنسی بە ئەرکێك نێردراوە بۆ ئێران. ئۆلیڤیێ لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا دکتۆرا لە پزیشکی وردەگرێ و چەندین نامیلەکەی لەبارەی مێش و مەگەز نووسیووە. لەسەفەری بۆ ئێران بەناو کوردستانی باکووری و باشووریدا ڕۆیشتووە و زۆر بە کورتی باسی کورد دەکات و حوکمی ناڕاست بەسەر کورد دەدات بە تایبەت لەبارەی ئێزیدییەکان[1].

دووەم گەڕۆکی فەرەنسی کە باسی کوردستان دەکات ئەدریەن دوپرێ Adrien Dupré (١٧؟-١٨٣١)،کە خۆی لە ڕۆژهەڵات لە دایك بووە و کوڕی کۆنسوڵی فەرەنسا بووە لە تەرابزون و هەموو گەنجی خۆی لەوناوچەیە بەسەر بردووە. ماوەیەکی زۆر وەکوو وەرگێڕ لە کونسوڵخانەکانی فەرەنسا لە ڕۆژهەڵات کاری کردووە و دوایی خۆشی بووەتە کۆنسوڵ. ساڵی ١٨٠٧ لەگەڵ مسیۆنی جەنەڕاڵ گاردان دەکەوێ بۆ ئێران. ساڵی ١٨١٩ سەفەرنامەکەی خۆی

---

[1] Guillaume Antoine Olivier, *Voyage dans l'Empire ottoman, l'Egypte et la Perse* fait par ordre du Gouvernement pendant les six premières années de la République. Paris : chez H. Agasse, (1801)-1807, 6 vol.

(" سەفەرێك بۆ ئێران لە ساڵەکانی ١٨٠٧، ١٨٠٨ و ١٨٠٩)"[(١)] لە پاریس لە دوو بەرگدا چاپ دەکات.

سێیەم: ڕەنگە ژوبێر ئامێدێ Pierre-Amédée-Émilien-Probe Jaubert (١٧٧٩-١٨٤٧) کە ساڵی ١٨٠٥ لە ڕۆژهەڵات بووە و سەفەرنامەکەی خۆی ساڵی ١٨٢١ لە پاریس سەفەرنامەکەی خۆی (سەفەر بۆ ئەرمەنستان و ئێران لە ساڵەکانی ١٨٠٥ و ١٨٠٦، لەگەڵ سەرنجێك دەربارەی گیلان و مازەندەران)[(٢)] بڵاوکردۆتەوە بازدانێکی گەورە بێت لەوەی لە هەموو گەڕۆکەکانی پێش خۆی جوانتر باسی کوردستانی کردبێت. ژوبێر کوڕی موحامییەکە و هەر لە منداڵییەوە فێری زمانەکانی ڕۆژهەڵات بووە. لە ١٩ ساڵیدا بەگەڵ لەشکرکێشیی فەرەنسا دەکەوێ بۆ سەر میسر دواتر دەبێتە وەرگێڕی ناپلیۆن و ساڵی ١٨٠٥ بە ئەرکێکی نهێنی لەلایەن ناپلیۆنەوە دەنێردرێ بۆ ئێران و لە ڕێگەیدا بۆ ئێران لە کوردستان، لەلایەن میری بایەزید، میر مەحموود پاشا زیندانی دەکرێ و حەوت مانگ لە زیندان دەبێت و لەم ماوەیەدا وەرگێڕەکەی ژنێکی کورد بووە. دوای ئازاد بوونی دەچێتە ئێران و نامەکەی ناپلیۆن دەدات فەتحعەلی شا. ژوبێر لەم هەموو ماوەیەی زینداندا تێبینی لەسەر کۆمەڵگەی کورد هەبووە و بە تایبەت لەبارەی ژنی کوردەوە و لای وایە ژنی کورد یەکەم کۆیلەی مێردەکەیەتی بەڵام کۆیلەیەك بە ویستی خۆی. ژوبێر یەکەم دیپلۆماتی

---

(1) Adrien Dupré, *Voyage en Perse fait dans les années 1807, 1808 et 1809, en traversant la Natolie et la Mésopotamie, depuis Constantinople jusqu'à l'extrémité du golfe Persique, et de là à Iréwan,* Paris : J.G. Dentu, 1819, 2 vol.

(2) Jaubert Pierre-Amédée-Émilien-Probe(Chever), *Voyage en Arménie et en Perse, fait dans les années 1805 et 1806, suivi d'une notice sur le Ghilan et le Mazandéran* ; par M. le colonel Trézel, Paris : Pélicier et Neveu, 1821, XII-(507 p).

ئەوروپاییە کە باسی سنووری کوردستان دەکات و ئەم سەفەرنامەیە ڕەنگە باشترین سەرچاوە بێت بۆ نیشاندانی کۆمەڵگەی کورد لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم. ژوبێر ئامێدێ چەند جارێک بە کوردستان تێپەڕیوە، بە وردی لە نزیکەوە تێبینی کۆمەڵگەی کورد و مرۆڤی کوردی کردووە. ئاخاوتنی ژوبێر دەربارەی کورد کۆمەڵێک لایەن دەگرێتەوە: مێژوو، جوگرافیا، بەرهەمهێنان و ئابووری، زمان و کولتوور، شێوەی ژیان [١].

لە درێژەی ساڵانی بیستەکان کاریگەریی سەفەرنامەکەی ژوبێر ئامێدێ بەسەر گەڕۆکەکانی دوای خۆیەوە دیارە. دوای ژوبێر ئامێدێ لە ساڵانی بیستەکاندا سێ گەڕۆکمان هەیە کە هاتوونەتە کوردستان. کە ڕەنگە کۆلۆنێل گاسپارد دروڤیل، کە ساڵی ١٨٢٥ سەفەرنامەکەی (سەفەر بۆ ئێران لە ساڵەکانی ١٨١٢ و ١٨١٣ )[٢] لە پاریس بڵاوکردۆتەوە بەرچاوترینیان بێت. گاسپارد دروڤیل لە ئێران ژیاوە و شەش مانگ میوانی عەسکەرخانی دوایەمین بالوێزی ئێران بووە لە فەرەنسا. دروڤیل کە لە ساڵەکانی ١٨١٢ و ١٨١٣ لە ئێران بووە دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵکەوتووە کە زۆر شوێنی ئێران بگەڕێ ودیارە بێگومان چۆتە کوردستانیش (وادەبێت زیاتر کوردستانی ئێران بووبێ) بەڵام شوێنی کوردستان دەستنیشان ناکات. لەبارەی کوردستانیشەوە زۆر زانیاری وردی تێدایە لەبارەی کوردستان لە دەیەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و بە تایبەتیش سترەکتووری کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووری کوردستان و تابلۆیەکی زۆر جوانی ژیانی کۆڵەمەرگی جوتیارانی کورد نیشان دەدات و دەڵێ: " کوردەکان زۆر بە کلۆڵیی دەژین، لەناو هەموو کوردستاندا، بەدەر لە کۆشك و قوڵلەی

---

[١] موحسین ئەحمەد عومەر، هەمان سەرچاوە، ل. ١١٠.

[2] Gaspard Drouville, *Voyage en Perse, fait en 1812 et 1813*, Paris: Librairie Nationale et étrangère, 1825, 2 vol. (xxv-282, 243 p).

بەگەکان، هیچ شوێنێ ژیانی مام ناوەندی تێدا نییە،ماڵی تایبەتیی هەرە دوڵەمەندەکان ناگاتە ئاستی ماڵی جوتیارەکانی ئێران (ل. ١٧٦)" درۆڤیل لەبارەی کورد زۆر بەڕەقی و زۆر بەخراپ باسی خەسڵەت و ئەدگاری کوردەکان دەکات.

دوای گاسپارد درۆڤیل Gaspard Drouville دوو گەڕۆکی دیکەی فەرەنسایی سەریان لە کوردستان داوە ئەوانیش بارۆن فێلێکس بێژوور(١٨٣٦-١٧٦٥) [1] و ڤیکتۆر فۆنتانییێ-ن. زانیارییەکانی بۆژوور گەرچی لە زانیارییەکانی گاسپارد نزیکن بەڵام زانیاریی زۆر گرینگیان تێدایە بەتایبەتی لە (فەسڵی پێنجەم و شەشەم) و هەروەها لە بەشەکانی دیکەش زانیاریی زۆر ورد لەبارەی کوردەوە دەبینرێن [2]. هەرچی گەشتنامەکەی ڤیکتۆر فۆنتانییێ یە بەناوی (گەشت بۆ ڕۆژهەڵات)[3] نووسەرەکەی ماوەی یانزە ساڵ لە ڕۆژهەڵات بووە و سەفەرنامەکەی خۆی لە پاریس بڵاودەکاتەوە. بڕوانامەی دەرمانسازی هەبووە و ساڵی ١٨٢١ دەبێتە ئەتاشەی زانستیی لە کۆنسوڵخانەی فەرەنسا لە ئیستەنبووڵ. فۆنتانییێ ناتورالیست و دیپلۆمات ساڵی ١٨٢٦ بۆ ماوەی پێنج مانگ، گەشتێك بۆ باکووری ئەنادوڵ دەکات و لەوێوە دەچێتە سیواس و ناسیاوی لەگەڵ کورد

---

(1) Louis-Auguste-Félix Beaujour, de, *Voyage militaire dans l'Empire othoman ou Description de ses frontières et de ses principales défenses, soit naturelles, soit artificielles,* Paris : F. Didot, 1829, 2 vol.

(٢) هەموو ئەو زانیارییانەی لەم سەرفەرنامەیە لەبارەی کوردەوە هاتوون، لەلایەن وەرگێڕی ئەم کتێبە لە دەرفەتێکی نزیکدا بە کوردی لە بەرگی دووەمدا بڵاودەبێتەوە (وەرگێڕ).

(3) V. Fontanier, Voyages en Orient : entrepris par ordre du gouvernement français, de l'année 1821 à l'année 1829 : Turquie d'Asie, Paris : P. Mongie ainé, 1829, 1 vol. (xiii-332 p).

پەیدا دەکات. سەفەرنامەکەی بەتایبەت لەباری مۆدی ژیانی ئەو کوردە کۆچەرانەی ئەو دیونی گەلێك گرینگە. بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی هۆزی کورد و بە تایبەتی هۆزی کۆچەری کورد لەم ماوەیەدا سەرچاوەیەکی گرنگە.

دوای سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩ ئیدی دەورانێکی نوێ لە پەیوەندییەکانی ڕۆژئاوا-ڕۆژهەڵات دەست پێ دەکات. لە دوا دەیەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم کۆمەڵێك گەشتنامەی فەرەنسیمان لەبەر دەستە کە بۆ لێکۆڵینەوەی دوایین قۆناغ و گەواهی هێرشی لەشکرکێشییەکانی عوسمانی بۆ سەر ئەمارەتە کوردییەکان گەلێك پڕ بایەخن، کە ئەگەر ئەم سەفەرنامانە نەبوونایە ڕەنگە ئێمە بۆ خۆمان وەکوو کورد هەر هیچمان لەبەردەست نەبوایە. من بە تایبەت پێ لەسەر ئەم ماوەیەدا دادەگرم کە بەڕاستی ماوەیەکی گەلێك ناسکە لە مێژووی کورددا.

بۆ لێکۆڵینەوە لە دوایین قۆناغەکانی مێژووی ئەمارەتی بابان و بە تایبەتیش شاری سلێمانی لە دەورانی ئەحمەد پاشای بابان دا، سەفەرنامەکەی ئەکادیمی هونەرە جوانەکان یۆژین فلاندن (١٨٠٩-١٨٧٤) (سەفەر بۆ ئێران لەلایەن یۆژن فلاندن پەیکەرتاش و پاسکال کۆست ئارشیتێکتۆری وابەستەی بالوێزخانەی فەرەنسا لە ئێران لە ماوەی ساڵەکانی ١٨٤٠ و ١٨٤١ دا)[1] بە هاوەڵی شێوەکاری ڕۆژهەڵاتناس پاسکال کۆست (١٨١٧-١٨٧٩) کە وەکوو دووەمین مسیۆنی فەرەنسا (١٨٤٠-١٨٤١) ڕەوانەی ئێران دەکرێن، یەکێکە لە سەرچاوە گرانبەهاکان. یۆژین و کۆست لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا لە تەبرێزەوە دەچنە بەغدا و بە ناوچەی سلێمانی دا تێپەڕ دەبن و چاویان بە ئەحمەد پاشای بابان

---

(1) Eugène Flandin, *Voyage en Perse de MM. Eugène Flandin, peintre, et Pascal Coste, architecte [...] pendant les années 1840 et 1841 : relation du voyage,* Paris : Gide et Jules Baudry, 1851, 2 vol. (511, 536 p).

دەکەوێ «ئەم سنجاقە (سلێمانی) هەمیشە لەسەر پێیە بۆ جەنگ و ناوەندێکی هەمیشەییە بۆ کۆکردنەوەی سوپا. لەو ساتەی کە ئێمە گەیشتینە ئەوێ، پاشا ئۆردوویەکی لە نزیك شار درووست کرد بوو، دوو هەزار یا سێ هەزار پیاوی کۆکردبۆوە. نەمتوانی بزانم نیازی ڕاستەقینەی بۆ بڵاوکردنەوەی هێز لەم نوختە خاڵەدا چییە. هەندێك دەیانووت حوکوومەتی تورکیا ترسی لە بوونی سوپای ئێران هەیە، کە موعتەمەد مەنسوورخان* لەسەر سنوور کۆیکردوونەتەوە. سەرباری ئەوەی کە زۆر سرووشتییە مێژووی سلێمانی و بەگەکانی ترس لای بابیعالی درووست بکەن، کە چەند سەرهەڵدانێکی نوێ لە لایەن کوردەکان بەم بۆنەیەوە سەرهەڵبدات». پاش ئەوەی ڕۆژێک لە سلێمانی دەمێننەوە و بە چاوی خۆیان سوپا و تۆپەکانی ئەحمەد پاشای بابان دەبینن و بۆ ڕۆژی دوایی سلێمانی بەجێدەهێڵن بەرەو بەغدا. بۆیە ئەم سەفەرنامەی بۆ مێژووی ئەم ماوەیە گرنگە یەکێکە لە سەرچاوەکانی دەستی یەکەم.

ڕەنگە هێرشەکانی حافز پاشا بۆ سەر ئەمارەتی سۆران لە هەمووان زیاتر باس کرابێت. زیاتر لە چوار (٤) گەڕۆکی فەرەنسی باسی ئەم لەشکرکێشییە دەکەن و هەمووشیان لەم کاتەدا لەوێ بوون. ژان پاتیستان پوژولا (١٨٠٩-١٨٦٤) لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، کە ساڵی ١٨٤٠ بە ناوی (سەفەر بۆ ناو ئاسیای بچووك)[1] لە پاریس لە دوو بەرگدا چاپی کردووە بۆ خۆی گەواهی ئەو کاولکارییە دەدات، کە سوپاکەی حافز پاشا بەسەر کوردستانی عوسمانیدا هێناوە و باسی ئەو دەکات کەوا چۆن چوار هەزار کورد (ژن، پیرەمێرد) بە دیل

---

* Meuhtamet Manoutcher-Khân

[1] Baptistin Poujoulat, *Voyage dans l'Asie Mineure, en Mésopotamie, à Palmyre, en Syrie, en Palestine et en Égypte*: faisant suite à la Correspondance d'Orient, Paris : Ducollet, 1840-1841, 2 vol. (456, 612 p).

گیراون و باسی کارەساتی جەنگ لەناو شار و ئاواییە کوردییەکان دەگێڕێتەوە و تەواوی تێکستی سەفەرنامەکە لێرە لەم کتێبەدا کراوە بە کوردی. گەڕۆکێکی دیکەی فەرەنسایی بە ناوی یۆژین بۆرێ (١٨٠٩-١٨٧٨) ئارکیۆلۆژیست بووە و لە سەفەرنامەکەی خۆیدا کە ئەویش ساڵی ١٨٤٠ بەناوی (نامەکاری و یادەوەریی سەفەرێك لە ڕۆژهەڵاتدا)[1] چاپکراوە و لە کاتی لەشکرکێشیەکەی حافز پاشا ساڵی ١٨٣٨ لە کوردستان بووە بۆ خۆی شایەدحاڵی لەشکرکێشییەکان بووە. گەڕۆکێکی دیکەی فەرەنسایی ئۆشێر-ئێلۆی (١٧٩٣-؟) ئەویش لە سەفەرنامەکەی خۆیدا " پەیوەندییەکانی سەفەرێك بۆ ڕۆژهەڵات لە ١٨٣٠ تا ١٨٣٨".[2] کە ساڵی ١٨٤٣ لە پاریس چاپکراوە باسی لەشکرکێشییەکانی حافز پاشا دەکات بۆ سەر ئەمارەتی سۆران. گەڕۆکێکی دیکەی فەرەنسایی شارل تێکسێر، کە ساڵی ١٨٤٢ سەفەرنامەکەی بڵاودەکاتەوە گەرچی لەکاتی لەشکرکێشییەکەی حافز پاشا لە ئیمپراتۆریای عوسمانی بووە بەڵام شتێکی یەکجار کەم لەسەر هێرشەکە باس دەکات.

لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم. یەکەم گەڕۆکی فەرەنسایی هوممێر دوو هێل Xavier Hommaire de Hell گەرچی سەفەرنامەکەی خۆی ساڵی ١٨٤٦ بۆ تورکیا دەست پێ دەکات بەڵام ساڵی ١٨٥٦ لە پاریس سەفەرنامەکەی لە چوار بەرگدا بە ناوی (سەفەر بۆ تورکیا و ئێران بە دەستووری حوکوومەتی

---

[1] Eugène Boré, *Correspondance et mémoires d'un voyageur en Orient*, Paris : Olivier-Fulgence, 1840, 2 vol. (VIII-425 , 498 p).

[2] Aucher-Eloy, *Relations de voyages en Orient de 1830 à 1838*; revues et annotées par le comte Jaubert, Paris : Librairie encyclopédique de Roret, 1843, (XXXI-775 p.)

فەرەنسا لە ماوەی ساڵەکانی ١٨٤٦، ١٨٤٧ و ١٨٤٨ دا )[1] بڵاودەبێتەوە. هوممێر ساڵی ١٨٤٦ کورد دەناسێ و بە یاوەری ژنەکەیی و وێنەکێش ژول لۆرانس هەموو کوردستانی باکوور و بەشێکی کوردستانی باشوور گەڕاوە. ئاگستۆسی ١٨٤٩ بێ ئەوەی گەشتنامەکەی تەواو بکات لە ئەسفەهان کۆچی دوایی دەکات و هەر لەوێشدا دەینێژن. گەشتنامەکەی هۆممێر گرنگییەکەی بۆ مێژوونووسی کورد ئەوەیە هۆممێر لە کاتی تێکشکان و لەشکرکێشیی سوپای عوسمانی بۆسەر سوپای بەدرخان پاشا لە کوردستان بووە، و بەچاوی خۆی میر بەدرخانی بە دیلکراوەیی بینیوە، کە سەرباز و جەندرمەی عوسمانی بەدەورەوە بووە و بۆ ئیستەنبووڵ یان گواستۆتەوە. هوممێر ئارخەیان بووە بەم بەدیلگرتنە و لای وابووە دوای ئەوە ئیدی ئارامی دەگەڕێتەوە وڵات و لە هەمان کاتدا سەرسامی خۆشی لەبارەی وێرانکاریی ئاواییە کوردییەکان دەگێڕێتەوە، کە لە سۆنگەی شەڕدا وێران بووبوون. دووەمین سەفەرنامەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم سەفەرنامە یان ڕاستر تێبینی سەفەری ژول لورەنسی نیگارکێشە، کە ساڵی ١٨٥٤ لە ڕۆژنامەی *L'Illustration* ژمارە ٥٧٤ ی ڕۆژی ٢٥ ی شوباتی ١٨٥٤ بڵاوکراوەتەوە. ئەم وتارە کورتە کە بە ناوی "کوردەکان: تێبینییەکانی گەشتێکی تورکیا و ئێران"[2] بڵاویکردۆتەوە وەکو پاشکۆی کتێبەکەی هۆممێر

---

[1] Xavier Hommaire de Hell, *Voyage en Turquie et en Perse : exécuté par ordre du gouvernement français pendant les années 1846, 1847 et 1848,* Paris : P. Bertrand, 1860.

[2] Jules Laurens, « *Les Kurdes : Notes d'un voyage en Turquie et en Perse* » In : *L'Illustration,* Paris, n° 574, XXIII, 25 02.1854, PP. 119-123.

(ئەم وتارە بچووکەی ژول لورانس لەلایەن ئێمەوە کراوە بە کوردی و لە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا بڵاودەکرێتەوە و ژمارە ئەسڵییەکانی ڕۆژنامەکەش لە کتێبخانەی ناوەندیی زانکۆی سۆربۆنی یەک هەیە و کۆپیەکی ئۆرگینالی ئەم وتارە بیست ساڵیش

سەیر دەکرێ و پڕییە لە نیگاری جوانی کوردستان و دۆستانە باسی کورد دەکات.

ئەگەر تاوەکوو نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم هەموو گەشتیارەکان پیاو بووبن، ئەوا بۆ یەکەمجار یەکەم ژنە گەشتیاری فەرەنسایی زمان و بە بنچینە ئیتالیایی کریستینا تریڤولزیۆ بێلژیۆژۆسۆ(1871-1808) کە لەسەر حیسابی خۆی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٥٢ بە هاوەڵی کوڕەکەی و خزمەتکارێکی سەفەری ڕۆژهەڵات دەکات و سێ ساڵ لە ڕۆژهەڵات دەمێنێتەوە. مەدام بێلژیۆژۆسۆ زیاتر عەودالی ناسینی مۆدی ژیان بووە لە ڕۆژهەڵات. شا ژن کریستینا تریڤولزیۆ بێلژیۆژۆسۆ ، سێ ساڵ دوای ئەوە دواتر لە کتێبی (شانۆی ژیانی تورکیا-بیرەوەریی سەفەر) لە فەسڵێکی دوور و درێژ بەناوی "شازادەیەکی کورد" بۆ یەکەمجار باسی ژیانی ناو حەرەمیی پاشایەکی کورد (محەممەد پاشا) دەکات کە خاوەنی پێنج ژن بووە: فاتیمە (کورد بووە).، هەروا سێ ژنی دیکەی جۆرجی، چەرکەس و سەنیگالی و کەنیزەکێکی دیکەی بەناوی (حەبیبە) هەبووە، ڕەنگە ئەمە بۆخۆی یەکەم لێکۆڵینەوە بێت لەسەر ژیانی ناو حەرەمیی پاشایەکی کورد. بەڵام مەدام بێلژیۆژۆسۆ لە باسی ژنە جوتیارەکان و کۆچەرەکان کە لەسەر ڕێگە دیونی بە پریمیتیڤ(سەرەتایی) باسیان دەکات و بێزیان لێدەکاتەوە[١].

---

زیاترە لە ئەرشیڤی ئێمەدا هەیە و هەر توێژەرەوەیەک پێویستی بە وتارەکە بێ بە فەرنسی، دەتوانێ سوود لە ئەرشیڤی ئێمە وەربگرێ، وەرگێڕ).

[1] *Cf.* Princess Cristina Triulzi-Belgiojoso, « Un prince Kurde », in : *Scènes de la vie turque : souvenirs de voyage*, Paris, 1858, p. 145-276.

# L'ILLUSTRATION, JOURNAL UNIVERSEL.

25 FÉVRIER 1854.



Ab. pour Paris, 3 mois, 9 fr. — 6 mois, 18 fr. — Un an, 36 fr.
Prix de chaque N°, 75 c. — La collection mensuelle, br., 3 fr.

N° 574. — Vol. XXIII. — Bureaux : rue Richelieu, 60.

Ab. pour les dép. — 3 mois, 9 fr. — 6 mois, 18 fr. — Un an, 36 fr.
Ab. pour l'étranger. — 10 fr. — 20 fr. — 40 fr.

SOMMAIRE.

Incendie du palais législatif à Québec (Canada). — Histoire de la semaine. — Courrier de Paris. — Souvenirs de la monarchie autrichienne. — Chronique musicale. — Molière et Cervantes. — [illegible]

Gravures : Vue du palais législatif de Québec pendant l'incendie. — [illegible]

## Incendie du Parlement de Canada.

Deux fois en cinq années, le palais législatif de Canada a été dévoré par un incendie. Cette fois du moins on a cette consolation, que, si cruel qu'il soit, ce n'est qu'un accident, imputable seulement, dit-on, à la mauvaise construction des calorifères.

On se souvient qu'en 1849, sous l'administration de M. Lafontaine, aujourd'hui chef de la justice au bas Canada, la législature ayant, sur sa proposition, accordé des indemnités à ceux qui avaient souffert injustement des violences du parti dominant en 1838, la populace des tories avait réduit en cendres la chambre du Parlement, alors établie à Montréal. — A la suite de cet acte criminel, il fut arrêté que dorénavant, tous les quatre ans, le Parlement s'assemblerait alternativement dans Québec et dans Toronto, les deux anciennes capitales des deux provinces unies de Canada. La législature a vu périr aujourd'hui son palais de Québec, — consumé par les flammes dans la nuit du 1er au 2 février. Il faisait alors un froid de 25 degrés Réaumur, froid assez intense pour empêcher le jeu des pompes.

Par la position magnifique de ce palais, bâti comme il était sur un promontoire élevé de 150 pieds au-dessus du fleuve Saint-Laurent, et dominant toute la basse ville, il est facile de se figurer ce que le spectacle de cet incendie pouvait offrir de sinistre beauté : le feu dévastateur projetait



Incendie du palais législatif, à Québec.

(ڕۆژنامەی L'Illustration ژمارە ٥٧٤ ی ڕۆژی ٢٥ ی شوباتی ١٨٥٤)



(قەڵەمکێشەکانی ژوڵ لورەنس)

گەشتنامەکەی ئا. کلیمان بەناوی "گەشتێك بەناو کوردستانی جنووبیی عوسمانی: لە کەرکووکەوە تا ڕواندز"[1] کە ساڵی ١٨٦٦ لە گۆڤاری یادداشتنامەی کۆمەڵەی جوگرافی ژنێڤ بڵاوکراوەتەوە یەکێکە لەو سەرچاوە دەگمەنانەی کە پڕیە لە زانیاری لەبارەی کوردستان. بە تایبەت لەبارەی کەرکووك دەڵێ: کەرکووك سێ بەشی کوردە و بە دەروازەی چوونە ناو کوردستان دەژمێردرێ.

دواتر تا نیوەی ساڵی ١٨٧٥ هیچ گەڕۆکێکی دیکەی فەرەنسی نەچووەتە کوردستان. ساڵی ١٨٧٥ گەڕۆکی هۆڵەندی- فەرەنسی زمان شوڤالیێ لیکلاما، کە بۆ ماوەی چوار ساڵ ١٨٦٥-١٨٦٨ هەموو ڕۆژهەڵات و ڕووسیا گەڕاوە لە بەرگی ٣ و ٤ سەفەرنامەکەیدا بەناوی (سەفەر بۆ ڕووسیا، قەفقاز و ئێران بەناو میزۆپۆتامیا، کوردستان، سوریە، فەلەستین و تورکیا لەماوەی ساڵەکانی ١٨٦٥-١٨٦٨ دا)[2] لە زۆر جێگەدا باسی کوردستان دەکات و دوو بەشی کوردستان گەڕاوە و لە کوردستانی عوسمانی نەخۆش دەکەوێ و ناچار دەبێت بمێنێتەوە. سەفەری هەموو شارە گەورەکانی کوردستان دەکات: ئەربیل، کەرکووك، سلێمانی و خانەقین. سەفەرنامەکە ساڵەکانی ١٨٧٢-١٨٧٤ لە پاریس بڵاودەکاتەوە.

---

[1] A. Clément, « Excursion dans le Kurdistan ottoman méridional, de Kerkouk à Rawanduz en 1856 », In: *Mémoire de la Société de géographie de Genève*, 1856, p. 189-212 & 213-295.

[2] Chevalier Lycklama a Nijeholt, *Voyage en Russie, au Caucase et en Perse, dans la Mésopotamie, le Kurdistan, la Syrie, la Palestine et la Turquie, exécuté pendant les années 1866, 1867 et 1868*, Paris: A. Bertrand, 1872-1874.

سەفەرنامەی لە هەمووان گرنگتری فەرەنسی لەبارەی مێژووی کورد ڕەنگە سەفەرنامەکەی هێنری بێندەر بێت، کە یەکەم گەڕۆکی فەرەنساییە بە تایبەت سەفەری کوردستانی کردبێت. سەفەرنامەکەی بەناوی (سەفەر بۆ کوردستان، بۆ میزۆپۆتامیا و ئێران)[1] ە، کە ساڵی ١٨٨٧ لە پاریس چاپکراوە و یەکێکە لە سەرچاوە دانسقەکانی مێژووی کورد. بیندەر لە ٢٠ ی تەمموزی ١٨٨٥ بە شەمەندەفەری خێرای ڕۆژهەڵات دەگاتە ئیستەنبووڵ و لەوێوە گەشتەکەی دەست پێ دەکات و زۆر بە وردی باسی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، سیاسیی و باری جوگرافیایی کوردستان دەکات. بیندەر کوردی دابەشی سەر دوو چین کردووە: کوردانی کۆچەر و کوردانی نیشتەجێ. ئەوانەی یەکەم کۆچەرن و ئەوانی دووەمیش خەریکی کشتوکاڵ و مەڕدارین.

ڕەنگە بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی ژیانی مەسیحییەکانی کوردستان لە دوا چارەگی سەدەی نۆزدەهەم هیچ سەرچاوەیەك بەقەد گەشتنامەکەی باوکە ژاك ڕیتۆری "گەشتنامەی مسیۆنێرێك بۆ ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی ئیمپراتۆریای عوسمانی"[٢] بەکەڵك نەبێت. ڕیتۆری ژاك قەشەیەکی کاتۆلیکی فەرەنسیە و ساڵانی شێستەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەلایەن دەستەی مسیۆنیرە مەسیحیەکان بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی ژیانی مەسیحییەکانی کوردستان و باربۆکردنی کڵێسە مەسیحییەکان ڕەوانەی کوردستان دەکرێ. ساڵی ١٨٧٦

---

(1) Henry Binder, *Au Kurdistan, en Mésopotamie et en Perse : mission scientifique du Ministère de l'Instruction publique*, Paris : Quantin, 1887

(2) Jacques Rhétoré, « Voyage d'un missionnaire dans les provinces de Kerkouk et de Soleimanié de l'Empire turc », In *L'Année Dominicaine*, 1879 (pp.490-493; 540-545); 1880 (pp: 207-210; p. 353-367).

سەفەرێکی ئەسقەفییەی زاخۆ، بەعشیقە و هەکاری دەکات و دواتر ساڵی ١٨٧٨ سەفەرێکی کوردستانی عوسمانی دەکات و لە مووسڵەوە دەچێتە ئەربیل و دواتر کەرکووك و سلێمانی و تەواوی سەفەرنامەکەش لەم کتێبەدا کراوە بە کوردی.

ڕەنگە دوایین سەفەرنامەی سەدەی نۆزدەهەم گەشتەکەی ئارمان پییێر شۆلێ بێت، کە ساڵی ١٨٨٧ وەك چاودێر ڕەوانەی تورکستانی ڕووسیا دەکرێ. ساڵی ١٨٩٠ لەسەر پێشنیازی بالوێزخانەی فەرەنسا لە ئیستەنبووڵ سەفەرێکی دوور و درێژ بەناو ئەرمێنیا و کوردستان و میزۆپۆتامیادا دەکات. دوو ساڵ دواتر ١٨٩٢ سەفەرنامەکەی لە پاریس بەناوی (سەفەر بۆ تورکیای ئاسیایی)[1] چاپ دەکات. لە ئەنقەرەوە دەچێتە ئەرزەرۆم و لەوێشەوە بۆ باکووری کوردستان و بەرەو لای گۆلی وان. شۆلێ لەناو بەگە کوردەکان ماوەتەوە و تێبینی لەسەر بەگە کوردەکان نووسیووە.

[1] Armand Pierre Cholet, *Voyage en Turquie d'Asie : Arménie, Kurdistan et Mésopotamie,* Paris : Plon, 1892.

**سەرچاوە:**

بۆ نووسینی ئەم باسە، بەتایبەتی بەشی یەکەم، وێرای سەفەرنامەکان تەماشای ئەم سەرچاوانەش کراوە و سوودیان لێ وەرگیراوە:

1- ISK's Kurdish bibliography. Edited by Silvio van Rooy and Kees Tamboer, Amsterdam : International Society Kurdistan, 1968, 2 v.

2-Mohsen Ahmad Omar, *Les voyageurs français au Kurdistan XVIIe, XVIIIe et XIXe siècles,* Paris, Thèse de doctorat : Littérature générale et comparée : Paris 3 : 1996, (356p).

3-Nazand Abdulla Begikhani, *La femme kurde dans les littératures européennes principalement française et anglaise du XIXeme et du début du XXeme siecle.* sous la direction de Jean Bessiere, thèse de doctorat : littérature comparée : paris 3 : 1997, (387p).

4-Lokman I. Meho, The Kurds and Kurdistan : a selective and annotated bibliography. Westport, Conn. : Greenwood Press, 1997, (xv, 356 p)

5-Chris Kutschera, *Le Kurdistan.* Coll : (Le vagabond enchanté), Lausanne, Ed. Favre, 1998, (191 p).

٦- نەجاتی عەبدوڵڵا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی، کورد و کوردستان لە سەرچاوە فەرەنسییەکاندا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ۲۰۰۹.

# بەشی دووەم:
# گەڕیدە و دیپلۆماتکارە ئینگلیزەکان لە کوردستانی سەدەی نۆزدەهەمدا

ئەگەر پەیوەندی نێوان فەرەنسا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی شانزەهەم و لەم سەدەیە بەدواوە چەند ڕۆژهەڵاتناسێك سەفەری ڕۆژهەڵاتیان کردووە و کەم و زۆر چەند شتێکی کەمیشیان لەسەر کوردستان نووسیوە. بەڵام دەبینین پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆریای بەریتانیا و ئەو بەشەی ڕۆژهەڵات کە وەک بەشێک لە (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) ناسراوە دروست دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم، وەک لە پێشەوەدا وتمان بەگوێرەی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەکانی ئێمە، لە هەموو ئەدەبیاتی کوردناسیی ئینگلیزیدا لە هەردوو سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا، هەموو سەرچاوەکانی کوردناسیی ئینگلیزی تەنیا بریتین لە چەند سەرەقەڵەمێکی زۆر کورت، کە ئەو سێ گەڕۆکە ئینگلیزە، کە لە پێشەوەدا باسمان کردن، لەماوەی دوو سەدەدا بۆیان بەجێهیشتووین.

بەڵام مێژووی ڕاستەقینەی کوردناسین لای ئینگلیز هەر بەراستی لەگەڵ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەست پێ دەکات، لەگەڵ پەلهاویشتن و گەشەسەندنی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیز بۆناو هەموو گۆشەیەکی ڕۆژهەڵاتی دوور و نزیك. بۆیە سەدەی نۆزدەهەم سەدەیەکی پڕ لە دەستکەوتی گەورەیە لە بواری


سێر جۆن ماڵکۆڵم

کوردناسیی ئینگلیزییدا و ئەوە هەر لە سەرەتای ئەو سەدەیەش بوو، کە شاندەکەی سێر جۆن ماڵکۆڵم (١٧٦٩-١٨٣٣) بە نوێنەرایەتیی ئیمپراتۆریای بەریتانیایی دەگاتە ئێران، کە کۆمەڵێك پسپۆری سیاسی و ڕاوێژکاریی لەگەڵدا بوو، یەکێك لەوانە جۆن مەکدۆنالد کینێیر (١٧٨٢-١٨٣٠)، بوو، کە ڕاوێژکاری جۆن ماڵکۆلم بوو. لێرەوە دەکرێ سەرەتای سەدی نۆزدە بەسەرەتای مێژووی کوردناسین دابنێین لای ئینگلیز و لێرە بەدوا دیپلۆمات و مەئمووڕانی سیاسیی دەوڵەتی بەریتانیای فەخیمە بە مەبەستی ناسین و زانیاریی کۆکردنەوە لەبارەی گەلانی ناوچەکە و بە نیازی دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکە دەستیان کرد بە پشکنین و گەڕان و سووڕان بەناو هەموو گۆشەیەکی ڕۆژهەڵات بە ناوچە دوورە دەستەکانی کوردستانیشەوە کە هەرگیز پێشتر هیچ گەڕۆکێك سەری پێدا نەکردبوو، ئەوان دەستیان کرد بە زانیاریی کۆکردنەوە و نووسینەوەی یادداشتنامە و بیرەوەرییەکانی خۆیان.

کینێیر کە لەگەڵ شاندەکەی سێر جۆن ماڵکۆڵم بۆ ئێران ساڵی ١٨٠٨-١٨٠٩ هاتۆتە ڕۆژهەڵات لە کتێبەکەی خۆیدا (یادداشتنامەی جوگرافیایی ئیمپراتۆریای ئێران)[1] ،کە ساڵی ١٨١٣ لە بارەی جوگرافیای ئیمپراتۆریای ئێران بڵاوی کردۆتەوە، باسی هەموو هەرێمەکانی ئێران دەکات و ئەوەی پەیوەندی بە کوردستانیشەوە هەیە ئەم هەرێمانەن کە باسیان دەکات: یەکەم: ئەردەڵان. هەرێمی ئەردەڵان لای ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانە. درێژییەکەی

---

[1] John Macdonald Kinneir, A geographical memoir of the Persian Empire,1813, (VIII, 486 p).

هەزار میلە و لە ڕووباری چکۆڵەی شاروخ تا هەرێمی زەهاوی تورکیا درێژ دەبێتەوە، پانییەکەی نزیکەی سەد و شێست میلە و دواتر باسێکی جوگرافی و دابەشبوونی ئاواییەکان و پێکهاتەی ئیتنیکی هەرێمەکە دەکات (ل. ١٤٢-١٤٧)، ئازەربایجان (ل. ١٤٨-١٥٨)، خوراسان (ل. ١٦٩-١٨٦) و دواجاریش لە بەشی پاشالقی ئوورفەدا باسێکی جوگرافیایی گرینگی پاشالقی ئوورفە و پێکهاتە و ئاواییەکانی دەکات (ل.٣١٣-٣١٨) هەمان لیۆتینان کۆلۆنێل کینیێر (١٧٨٢-١٨٣٠)، دوای کۆتایی هاتنی مسیۆنەکەی بۆ ئێران چەند گەشتێکی بۆ ئێران کردووە و لە کۆتایی ساڵی ١٨١٠ بەشێکی کوردستان گەڕاوە و دواتر لە ساڵانی ١٨١٣-١٨١٤بەناو کوردستان و ئاسیای بچووکدا گەڕاوە. ساڵی ١٨١٨ لە لەندەن سەفەرنامەکەی لە کتێبێکی نایاب بە ناوی (سەفەر بۆ ئاسیای بچووك و ئەرمەنستان و کوردستان لە ساڵەکانی ١٨١٣-١٨١٤دا)[1] بڵاو دەکاتەوە، کە بە یەکێك لەسەرچاوە دەستی یەکەمەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمی مێژووی کورد دادەنرێ. کینیێر ساڵی ١٨٢٤ پۆستێکی بەرز لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات وەردەگرێ و لە تاران نیشتەجێ دەبێت. ساڵی ١٨٣٠ لە تەورێز کۆچی دوایی دەکات.

TRAVELS
IN
GEORGIA, PERSIA, ARMENIA,
ANCIENT BABYLONIA,
&c. &c.
DURING THE YEARS 1817, 1818, 1819, AND 1820.
By Sir ROBERT KER PORTER.
IN TWO VOLUMES.
VOL. II.
LONDON:
1822.

(چەند گەشتێك بۆ جۆرجیا و ئێران
و ئەرمەنستان و بابلی کۆن)

[1] John Macdonald Kinneir, Journey through Asia Minor, Armenia, and Koordistan, in the years 1813 and 1814; with remarks on the marches of Alexander and retreat of the Ten Thousand*. London : John Murray, 1818, (XII-603 p).

دەکرێ جۆن مەکدۆنالد کینێر John Macdonald Kinneir (١٧٨٢-١٨٣٠) بە باوکی کوردناسیی ئینگلیزی دابنێین و یەکەمین گەڕۆکی ئینگلیزە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، کە هاتۆتە کوردستان و لە نزیکەوە پێ بە پێ بەناو بەشێکی زۆری خاکی کوردستاندا گەڕاوە و شارەزاییەکی زۆری مێژوویی هەبووە و لەم کتێبەیدا، کە بە ناوی (سەفەر بۆ ئاسیای بچووك و ئەرمەنستان و کوردستان لە ساڵەکانی ١٨١٣-١٨١٤دا)[1] بڵاوی کردۆتەوە ویستوویە شوێن پێیی سوپا دەهەزارییەکەی زەینەفۆن هەڵبگرێت و بەناو کوردستاندا گەڕاوە و خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم سەفەرنامەیە تێ دەگا کە

JOURNEY

ASIA MINOR, ARMENIA,

KOORDISTAN,

IN THE YEARS 1813 AND 1814,

MARCHES OF ALEXANDER,

AND RETREAT OF

THE TEN THOUSAND.

BY

JOHN MACDONALD KINNEIR,

LONDON:

JOHN MURRAY, ALBEMARLE-STREET.

1818.

سەفەر بۆ ئاسیای بچووك و
ئەرمەنستان و کوردستان

---

(1) ئەم وەرگێڕانەی ئێمە بۆ ئەم سەفەرنامەیە، کە لەبەشی دووەمی ئەم بەرگی یەکەمەدا بڵاوکراوەتەوە، لە ڕووی چاپە فەرەنسییەکەوە کراوە بە کوردی، بەڵام لەگەڵ چاپە ئینگلیزییەکەش بەراورد کراوە و لە زۆر شوێندا لە ڕووی چاپە ئینگلیزییەکەوە داڕێژراوەتەوە، بۆیە ئەگەر جیاوازی لەگەڵ دەقە کوردی و فەرەنسییەکە لە بڕێك جێگەدا بەرچاوکەوت ئەوا دەبێت خوێنەر بگەڕێتەوە سەر چاپە ئینگلیزییەکە و جیاوازییەکان لەگەڵ چاپە ئینگلیزییەکە ڕاست کراونەتەوە. فەسڵی (یادداشت لەبارەی هێرشی سەر هیندوستانەوە) لەگەڵ فەسڵی (ڕێگەی بەغدا بۆ بەسرە: لەگەڵ تێبینی گەلێك لەبارەی دارخورما و ئەسپی عەرەبی) لە وەرگێڕانی چاپە فەرەنسییەکە نازانم بۆ پاش وپێش خرابوون، ئێمە وەك چاپە ئینگلیزییەکەمان لێ کردەوە و ڕاستمان کردەوە، (وەرگێڕ).

نووسەرەکەی چەندە شارەزای مێژوو بووە و سەفەرنامەکەشی کە لە دووەم بەشی ئەم کتێبەدا کراوە بە کوردی چ نرخێکی گەورەی مێژوویی هەیە.

دوای کینیێر ئەم گەڕۆکە ئینگلیزانە سەردانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستانیان کردووە و کەموزۆر زانیاری و مەتریالی کوردناسییان بۆمان بەجێهێشتووە، لە گرینگترینیان ئەوانەن: ج.س. بیکنگهام J, S. Buckingham [1] (١٨١٦)، دواتر کۆلۆنێلی سوپای ئینگلیز ولیەم هیوود William Heude (١٧٨٩-١٨٢٥)، کە ساڵی ١٨١٧ سەفەری ئیمپراتۆریای عوسمانی دەکات و لە سەفەرنامەکەی خۆیدا (سەفەرێك تا کەنداوی فارس و سەفەرێك بە ڕێگەی وشکانیی لەناو خاکی هیندستانەوە بۆ ئەنگلستان لە ساڵی ١٨١٧ دا)[2]، لە ٢٨ ی شوباتی ١٨١٧ لە بەغداوە دەردەچێ و لە ڕێگەی کفرییەوە دەچێتە سلێمانی و دوایی لە ڕێگەی کۆیە دەچێتە هەولێر (ئەربیل) و لەوێشەوە بۆناو ئێزیدییەکان و قەرەقووش و تا مووسڵ (لا:١٨٩-٢١٦). دواتر لە نەینەواوە بەناو بیاباندا دەچێتە نەسیبین و ماردین و وەسپێکی وردی شاری جەزیرە و نەسیبین دەکات و پاشان باسی ئێزیدییەکان (یان وەك ئەوەی ئەو پێیان دەڵێ شەیتان-پەرستان) دەکات و ئینجا لە ماردینەوە دەچێتە دیاربەکر و لەوێشەوە بەناو چیاکانی تۆرۆسدا بە مەڵاتیە و دۆڵی سیواسدا دەڕوات و دواجار سەفەرەکەی لە ئیستەنبوڵ بە کۆتا دێت (هەموو بەشەکانی ئەم سەفەرنامەیە کە تایبەتن بە کورد و کوردستان لەم کتێبەدا لەسەفەرنامەی سێیەمدا کراون بە کوردی).

---

[1] J, S. Buckingham. Travels in Assyria, Media, and Persia. (London, 1830.)

[2] William Heude, A voyage up the Persian Gulf, and a journey overland from India to England in 1817: containing notices of Arabia Felix, Arabia Deserta, Persia, Mesopotamia, The Garden of Eden, Babylon, Bagdad, Koordistan, Armenia, Asia Minor. London: Longman, Hurst, Rees, Orme, and Brown, 1819, (252 p).



کلۆدیوس جیمس ڕیچ

هاوکات لەگەڵ هەمان دەورانی سەفەرەکەی ولیەم هیوود، گەڕۆکێکی دیکە بەناوی سێر ڕوبێرت کێر پۆرتێر Sir Robert Ker Porter (١٧٧٧-١٨٤٢)، ساڵەکانی ١٨١٧ تاوەکوو ١٨٢٠ گەشتێکی دوورودرێژی بۆ جۆرجیا و ئێران و ئەرمینیا و عێراقی عەجەمی و عێراقی عەرەبی و کوردستان ئەنجام داوە و لە ساڵی ١٨٢١-١٨٢٢لە دوو بەرگی گەورە، سەفەرنامەکەی خۆی بە ناوی (چەند گەشتێك بۆ جۆرجیا و ئێران و ئەرمەنستان و بابلی کۆن)[1] بڵاوکردۆتەوە. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە بەرگی دووەمی سەفەرنامەکەیە، کە تێیدا نووسەر لە کرماشانەوە (ل. ١٧٨) لەڕێگەی ماهیدەشت هاتۆتە قەسری شیرین، لەوێوە چۆتە کوردستانی عوسمانی (کە ئەو پێی دەڵێ عێراقی عەرەبی)، لە دیالەوە چۆتە قزڵرەبات و حەمرین و لەوێشەوە چۆتە بەغداد (ل. ٢٢٨). دواتر لە بەغداوە (ل. ٤٢٧) بەرەو کوردستان هاتووە و چووەتە کەرکووك و لەوێشەوە چووەتە سلێمانی زۆر بە درێژی باسی سلێمانی و ناوچەی شارەزوور دەکات و پاشان لەوێشەوە بەرەو ساوج-بولاق (سابڵاغ) و ئازەربایجان و مەراغە ڕۆیشتووە (ل. ٤٩٨).

---

[1] Robert Ker Porter (Sir), Travels in Georgia, Persia, Armenia, ancient Babylonia, &c. &c : during the years 1817, 1818, 1819, and 1820. With numerous engravings of portraits, costumes, antiquities, &, London : Longman, Hurst, Rees, Orme, and Brown, 1821-22, 2 vol. (XX-720, 869 p).

ڕەنگە یەکێك لە دیارترین و بەناوبانگترین سەفەرنامەی کوردناسیی ئینگلیزەکان بۆ کوردستان، سەفەرنامەکەی کلۆدیوس جیمس ریچ Claudius James Rich بێت، کە ساڵی ١٨٢٠ بە تایبەت بۆ کوردستانی کردووە و کە دواتر بووە بە سەرچاوەیەکی بێ وێنە بۆ هەموو ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی لەبارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون. سەفەرنامەکەی ڕیچ بۆ یەکەمجار ساڵی ١٨٣٦لە لەندەن بە دوو بەرگ بەناوی (سەربوردەی جێنشینێك لە کوردستان و شوێنەواری نەینەوای کۆن، لەگەڵ ڕۆژانەی سەفەرێك بە ڕێڕەوی دیجلە بۆ بەغدا و ڕاپۆرتێك دەربارەی شیراز و پەرسیپۆل)[1] لەلایەن هاوسەرەکەیەوە لە لەندەن بڵاوکرایەوە. ڕیچ (١٧٨٧-١٨٢١) لە شاری دیژۆن لە فەرەنسا لە بنەماڵەیەکی ئاریستۆکرات لە دایك بووە بەڵام منداڵیی خۆی لە بریستۆل بەسەر بردووە. لە منداڵی زۆر حەزی لە مۆسیقا بووە و زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان سەرنجی ڕاکێشاوە. عیبری، ئاسووری، فارسی و عەرەبی فێربووە. لە بیست ساڵییەوە بووە بە موقیمی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات لە بەغدا و شەش ساڵ لەو پۆستەدا ماوەتەوە. لە بەهاری ١٨٢٠ باری لەشساغی تێك دەچێ و بۆ هەوا گۆڕین لەسەر داوەتی مەحموود پاشای بابان، بە هاوەڵیی هاوسەرەکەی و دەست و پەیوەندەکانی سێ مانگ لە کوردستان ماوەتەوە و زۆربەی کاتەکانیشی هەر لە سلێمانی بەسەربردووە. سەری تەواوی ناوچەکانی ئەمارەتی بابان و ئەمارەتی سۆران و ئەمارەتی ئەردەڵانیشی داوە و ئەو زانیاری و مەتریالانەی بەدەستی داون وێنەیەکی زۆر ڕاستەقینەی ڕەوشی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی

---

[1] Claudius James Rich, Narrative of a residence in Koordistan, and on the site of ancient Nineveh : with journal of a voyage down the Tigris to Bagdad and an account of a visit to Shirauz and Persepolis, ed. By his widow, London : J. Duncan, 1836, vol.I (XXXIII, 398 P); Vol II (VIII, 410 p).

سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە کوردستان نیشان دەدەن و یەکێکە لەو سەرچاوانەی، کە ناکرێ بۆ کەسێك باسی مێژووی کورد بکات لەو سەربەندەدا و نەگەڕێتەوە بۆسەر ئەم سەرچاوەیە. ئەم سەفەرنامەیە پانزە ساڵ دوای مردنی ڕیچ وەك وەفایەك لە لایەن هاوسەرەکەیەوە (ماری ماکینتۆش) ساڵی ١٨٣٦ بە دوو بەرگ لە لەندەن بڵاوکرایەوە. بەرگی یەکەمی ئەم گەشتەنامەیە کە لە ١٦ ی نیسانی ١٨٢٠ دەست پێ دەکات و لە ڕێگەی دەللی عەبباس ، تووزخورماتوو و چەمچەماڵ و ڕۆژی ٨ ی ئایار گەیشتۆتە سلێمانی و تا ١٧ ی تەمموز هەر لە سلێمانی ماوەتەوە و دواتر بە ڕێگەی دەربەندی گۆیژە سەردانی سنەی کردووە و ناوچەکانی پێنجوین و مەریوان و ئەو دەوروبەرە گەڕاوە و دواتر لە ٢٥ ی ئەیلوول گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و تا ٢١ ی تشرینی یەکەمی ١٨٢٠ هەر لەوێ ماوەتەوە. بەرگی یەکەمی ئەم سەفەرنامەیە سەروەر تەرخانی کوردستان کراوە و بەپێچەوانەوە بەرگی دووەمی لەم ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە سلێمانی جێدەهێڵێ ( لە ٢١ ی تشرینی یەکەم) و هەر تەنیا فەسڵی یەکەمی لەسەر کوردستانە و ئەوی دیکە پەیوەندییێکی ئاوهای بە مێژووی کوردستانەوە نییە.

کونسوڵی ئینگلیز لە ئەرزەرۆم، جیمس برانت J. Brant دوو سەفەری بۆ کوردستان ئەنجام داوە، سەفەری یەکەمیان بە ناوی "سەفەر بۆ بەشێکی ئەرمەنستان و ئاسیای بچووك لە ساڵی ١٨٣٥"[1]، کە لە هاوینی ١٨٣٥ بە مەبەستی زانیاری کۆکردنەوە بۆ حوکوومەتەکەی کردوویە. ئەم سەفەرە زۆر بە تایبەتی بۆ ناوچە ئەرمەننشینەکان و کوردنشینەکانی عوسمانی کراوە و برانت لەم سەفەرنامەیەدا زیاتر بایەخی بە وەسفی جوگرافیایی، بەرزایی چیاکان، شوێنی جوگرافی، ئاو و هەوا و ژمارەی دانیشتوان داوە. سەرەتای سەفەرنامەکەی

---

(1) J. Brant "Journey through A part of Armenia and Asia Minor in Year 1835", In JRGS, Vol VI, 1836, pp. 187-223.

ناوچەی تەرابزۆندەوە دەست پێ دەکات و لەوێشەوە بەرەو سنووری ڕووسیا
و باتوم دواتر بۆ پاشالقی قارس و ئەردەهان و ئەرزەرۆم دەڕوات. لە چیاکانی
دوگلیك کە بە قسەی نووسەر تەنیا کوردەکانی تێدا دەژین باسی کوردەکانی
ئەم ناوچەیە دەکات. دواتر باسی ناوچەکانی ئەرزەنجان، عەرەبگیر (لێرە
هەست دەکەین ئیدی نەژادی کورد لەو ناوچەیە بالادەستە)، باسی دیاربەکر،
مەلاتیە، جەزیرە دەکات و لە کۆتایی سەفەرنامەکەیشدا نەخشەیەکی
گەشتەکەی بە سەعاتەڕێ و ڕەوشی ڕێگەوبانەکانیشی داناوە. هەرچی سەفەری
دووەمە، بەناوی "چەند سەرنجێك لەبارەی گەشتێك بەناو بەشێکی کوردستان؛
لە هاوینی ساڵی ١٨٣٨ دا"[1] بڵاوکردۆتەوە. ئەم سەفەرنامەیە لە ئەرزەرۆم لە ١٦
ی حوزەیرانی ١٨٣٨ دەست پێ دەکات و بە ناوچەکانی وان، موش و بتلیسدا
دەڕوات و لە ١٩ ی ئەیلوولی هەمان ساڵ تەواو دەبێت. برانت، دۆڵ بە دۆڵ و
شاخ بە شاخی ناوچەکە گەڕاوە و وەسپێکی وردی دۆڵ و چیا و پێدەشت و
کانیاوەکان دەکات و ئەم گەشتە زیاتر بە ئامانجی زانیاریی کۆکردنەوە بووە
لەبارەی کوردستان و ڕەوشی ئەرمەنییەکان. شایانی گوتنە برانت لەم گەشتەدا،
میستەر ئادام گیفۆرد گلاسکۆتی ئەفسەری هێزی زەریاوانیی، کە نەخشەی
ڕێگە و بانەکانی سەفەرەکەی بۆ کێشاوە و هەروەها پزیشکی نەشتەرگەر
ئەدوارد دیکسۆنی لەگەڵدا بووە. دواجار برانت ڕۆژانەیەکی دەرچوون و ناوی
ئەو شوێنانەش، کە سەفەری تێدا کردوون لەگەڵ دووری ڕێگەی نێوان
ناوچەکان بڵاوکردۆتەوە.

ڕەنگە لە دیارترین سەفەرنامەکانی کوردناسی، لە کۆتایی نیوەی یەکەمی
سەدەی نۆزدەهەم سەفەرنامەکانی جیمیس بیللی فرەیزەر James Billie Fraser

---

[1] J. Brant, "Notes of a Journey through a part of Kurdistan in the Summer of 1838", In JRGS, Vol X, 1841, pp. 341-432.

(١٧٨٣-١٨٥٦)ی، گەڕۆکی ئینگلیز بێت. لە یەکەمین زستانە گەشتی خۆیدا لە کۆنستنتینۆپلەوە بۆ تاران، کە ساڵی ١٨٣٨ لە لەندەن لە دوو بەرگدا بەناوی (زستانە گەشتێك لە ئیستەنبووڵەوە بۆ تاران)[1] بڵاوکراوەتەوە، فرەیزەر لەم سەفەرنامەیەدا تەنیا لەنامەی شەشەم (ل. ٢٥٣-٣٠٣) باسی کورد دەکات و دواتریش لە نامەی حەوتەم لە لاپەڕەکانی (٣٠٤-٣٦١) کەم و زۆر باسی کورد دەکات. یەکێکی دیکە لە سەرچاوە زۆر بەرچاو و دیارەکانی کوردناسی جیمیس بیللی فرەیزەر، بریتیە لە کتێبی (چەند گەشتێك بۆ کوردستان و میزوپۆتامیا)[2] کە ساڵی ١٨٤٠ لە دوو بەرگدا لە لەندەن بڵاوکرایەوە. فرەیزەر یەکێك لەو گەڕۆك و گەڕاڵە ئینگلیزانە بووە کە زۆرترین بەشی ژیانی بەسەفەر و گەڕان بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٨٣٤ لە ڕێگەی ئیستەنبووڵەوە بە ئەرکێکی دیپلۆماسی دەگاتە تەوریز و ناوچەی حوکمڕانی ئەردەڵانەکان. لە تەورێزەوە دەچێتە ورمێ و ساوجوبۆلاق و سەردەشت و لەوێشەوە ویستویە بچێتە ڕواندزی میری پاشای کۆرە، بەڵام وادیارە لەبەر ئۆپیراسیۆنەکانی جەنگ نەیتوانیوە ئەو سەفەرە بکات بۆیە ئاڕاستەی سەفەرەکەی بۆ شاری سلێمانی گۆڕیوە و لە ڕۆژی ١ ی تشرینی دووەمی ١٨٣٤ دەگاتە سلێمانی و ماوەیەك میوانی سلێمان پاشای بابان دەبێت و دواتر لە ڕێگەی کفرییەوە دەگەڕێتەوە بەغدا و پاشان لە ڕێگەی دیالەوە دەچێتەوە بۆ ئێران. فرەیزەر سەفەرنامەکەی خۆی بە شێوەی نامە بۆ هاوسەرەکەی نووسیوە و بە پۆستە بۆ ئەنگلستانی ڕەوانە

---

[1] James Billie Fraser, A winter's journey (Tâtar), from Constantinople to Tehran, published by R. Bentley, London, 1838, 2 volumes (Vol 1, VII+420 p), (Vol 2, 511 p).

[2] J. Baillie Fraser, Travels in Koordistan, Mesopotamia, etc : with sketches of the character and manners of the Koordish and Arab tribes, [1840?], 2 v.in 1 (ix, 477 p).

کردوتەوە. سەفەرنامەکە ساڵی ١٨٤٠ لە لەندەن لە دوو بەرگدا بڵاوکرایەوە، کە بەرگی یەکەمیان (١٥) نامە و بەرگی دوەمیشیان بریتییە لە (١٩) نامە.


هێنری ئۆستن لایارد

ناکرێ لە دوادواییەکەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم باسی هێنری ئۆستن لایارد Austen Henry Layard ، یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئارکیۆلۆژیای کۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەکرێ، لایارد لە تەمەنی بیست و دوو ساڵی لەندەن جێدەهێڵێ بەو هیوایەی بتوانێ لە دەرەوەی وڵات سەرمایەیێك پێکەوە بنێ و سەفەری ئیمپراتۆریای عوسمانی دەکات و ساڵی ١٨٤٠ لە مووسڵ ناسیاوی لەگەڵ ئارکیۆلۆژیستی فەرەنسایی، بۆتا پەیدا دەکات کە لە مووسڵ خەریکی هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی بووە. لایارد دوای ئەم سەفەرەی مووسڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئیستەنبوڵ و لە ساڵانی ١٨٤٢ تا ١٨٤٥ لەوێ دەمێنێتەوە و وەکوو کارداری نارەسمیی لە بالوێزخانەی ئەنگلستان لە لای بابیعالی کاردەکات و لە تشرینی یەکەمی ١٨٤٥ بە یارمەتی بالوێزخانە بۆ کاری هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی دەگەڕێتەوە مووسڵ و لە نەمروود جێگیر دەبێت و تا ساڵی ١٨٤٧ هەر خەریکی کاری ئارکیۆلۆژی دەبێت. لایارد، لە سەفەرنامەکەیدا بە ناوی (نەینەوا و کەلاوەکانی: لەگەڵ سەربووردەی سەفەرێك بۆ لای مەسیحیە کلدانییەکانی کوردستان و ئێزیدی یان شەیتان پەرستەکان)[1]،

---

[1] Austen Henry Layard, Nineveh and its remains : with an account of a visit to the Chaldæan Christians of Kurdistan, and the Yezidis, or devil-worshippers; and an inquiry into the manners and arts of the ancient Assyrians. London: John Murray, (2nd ed.), 1849, 2V (VOL I, XXX, 399 p), (VOL II, XII, 495 p).

که بە دوو بەرگ لە لەندەن، ساڵی (١٨٤٩) بڵاوکرایەوە هەر تەنیا سەفەرنامەیێکی هەڵکەندنی ئارکیۆلۆژی لەناوچەی مووسڵ و دەوروبەری نییە، بەڵکو سەفەرنامەیەکی مێژوویی زیندووی سەردەمی خۆشیەتی و مێژووی کوردستان بەشی شێری بەرکەوتووە. فەسڵەکانی (٤ تا ٩) تەرخانی مێژووی کوردستانی دەورانی لایارد کراون. بەم شێوەیە لە فەسڵەکانی (٤ تا ٦) بایەخێکی زۆری بە ئێزیدییەکان داوە و چۆتە ناویان و لە نزیکەوە دۆستایەتی لەگەڵ شێخەکانیان پەیدا کردووە. بەهەمان شێوە لە فەسڵی حەوتەمی کتێبەکە بایەخێکی زۆری بە قەتڵوعامی ئاسوورییەکانی هەکاری لەساڵی ١٨٤٣ داوە و لە فەسڵی هەشتەم باسێکی کورتی مێژووی مەسیحییەکانی کوردستان دەگێڕێتەوە. هەرچی فەسڵی نۆیەمە دیسان دەگەڕێتەوە سەر باسکردنی سەفەری خۆی بۆ ناو ئێزیدییەکان و باسی ژیان و ڕێکخستنی ئایینی و کۆمەڵایەتی و دابونەریتی ئێزیدییەکان دەکات و چەندین وێنەی مێژوویی بەدەستەوە دەدات و وێنەیەکی ڕوونی دوادواییەکەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمی ئێزیدییەکان باس دەکات.

لەنێوان ساڵەکانی ١٨٣٨ تاوەکوو ١٨٥٦ برێك گەریدە و پیاوی کارداری دەوڵەتیی ئینگلیز، کۆمەڵێك سەفەرنامە و تێبینی و سەرنجی وردیان لەبارەی کۆمەڵگەی کوردەواری لەو دەورانەدا بۆ بەجێهێشتووین لەوانە: ژ.شیل[١]، هۆراتیۆ سوتگات[٢]، جۆرج فلۆوەر[٣]، جوستین پێرکینس[٤].

---

[1] J. Shiel, "Notes on a Journey from Tabriz through Kurdistan via Van, Bitlis, Se'rt and Erbil, to Suleimaniyah, in July and August 1838".

[2] Horatio Southgate, Narrative of a tour through Armenia, Kurdistan, Persia, and Mesopotamia. Vol 1, [S.l.]: Tilt and Bogue, 1840.

[3] George Fowler, Three years in Persia, with travelling adventures in Koordistan, London, 1841, 2 v.(XII, [2], 330; X, 2, 333, 1 p.)

[4] Justin Perkins, "Journal of a Tour from Oroomiah to Mosul through the Koordish Mountains"[4]. In: JAOS. II, 1851, pp, 71-119.

ژ.گ. تایلۆر کونسوڵی ئینگلیز لە دیاربەکر، سەرجەمی بەرهەمی سێ گەشتی خۆی کە لەنێوان ساڵەکانی ١٨٦١-١٨٦٣ بە ڕەزامەندیی حوکوومەتی خاوەندشکۆی بەریتانیا بۆ دیاربەکر، پایتەختی پاشالقی کوردستان ئەنجامی دابوون لە وتارێکدا بە ناوی (سەفەر بۆ کوردستان لەگەڵ چەند تێبینی بۆ سەرچاوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دیجلە لەگەڵ پاشماوە کۆنەکانی دراوسێکانیان)[1] ساڵی ١٨٦٥، لە گۆڤاری Journal of the Royal Geographical Society بڵاوکردەوە. تایلۆر لەم گەشتانەیدا زیاتر مەبەستی بووە لە ڕەوشی بازرگانیی ناوچەکە تێبگات و داتاگەلێك کۆبکاتەوە، کە خزمەتی بەرژەوەندییە کۆلۆنیالییەکانی بەریتانیا بکات. باسی پێکهاتەی ئیتنیکی و ئایینی ناوچە کوردەوارییەکان دەکات و باسی سەرچاوە ئابووری و سروشتییەکان و هەروەها توانای هۆزەکان و پێکهاتەی هۆزەکانی ناوچەکە باس دەکات. دواجاریش لەناو خشتەیەکدا پێکهاتەی ئیتنی و ئایینی پاشالقی دیاربەکر دیاری دەکات.

یەکێکی دیکە لەو ئینگلیزانەی، کە بە ناوی (عوسمان سەیفی بەگ) لەناو سوپای عوسمانیدا ناسراو بوو، ئەویش (فریدریك میللینگن)ە، کە بە ڕەچەڵەك ئینگلیزە، بەڵام لە ئیستەنبووڵ لە دایك بووە و خزمایەتی لەگەڵ خانەوادەی عوسمانییەکاندا هەبووە. سەرباری زمانی تورکی، بە تەواوی ئینگلیزی، فەرەنسی و ئیتالیایی زانیوە. قوتابخانەی حەربییە لە ئیستەنبووڵ تەواو دەکات و فەرماندەی بەتالیۆنی سوپای عوسمانی بووە. میللینگن بە حوکمی ئەوەی فەرماندەی بەتالیۆنی سوپا بووە، لە نزیکەوە سەرۆکهۆزە کوردەکانی بینووە و

---

[1] J. G. Taylor, « Travels in Kurdistan, with Notices of the sources of the Eastern and western Tigris, and Ancient Ruins in their neighbourhood », In: Journal of the Royal Geographical Society, 1865, pp. 21-58.

تێبینی و سەرنجەکانی خۆی لەماوەی مانەوەی لەناوچەکە لەبارەی کوردەوە لە کتێبی (ژیانی سەرەتایی لەناو کوردەکاندا)[1] نووسیوە بەڵام هەرگیز نەیتوانیووە لەو ڕوانگە عوسمانییە بچێتە دەرەوە کە عوسمانییەکان سەیری کوردیان پێ کردووە. شایانی گوتنە، کە میللنگن بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی کتێبی نووسیووە.

لە دوا دەیەی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئیزابێلا لوسی بیشۆپ، نووسەر و فۆتۆگرافیست، کە هەموو ژیانی خۆی لەسەفەر و نووسیندا بردۆتە سەر و هەموو دونیا گەڕاوە: ئەمریکا، کەنەدا، ئاسیای ڕۆژهەڵات، چین، ژاپۆن، کۆریا و تیبیت، لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەشیدا لە هیندستان ساڵی ١٨٨٩ سەری ئێران و هەرێمەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی دەدات و بەشێکی کوردستانیش دەگەڕێ. ئەو زیاتر بە دوای مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتدا گەڕاوە و لەو جێگەیانەی سەفەری کوردستانی کردووە تێبینی و سەرنجی زۆری لەسەر کورد نووسیوە. ساڵی ١٨٩١ سەفەرنامەکەی خۆی لە لەندەن لە دوو بەرگدا بەناوی (سەفەرێك بۆ ئێران و کوردستان)[2] بڵاوکردۆتەوە و لە بەرگی دووەمدا (ل. ٢٦١-٣٩٠) تەرخانی کوردستان کراوە. شایانی گوتنە مەدام بیشۆب ماوەیەك لە شاری خانەقین و پاشان لە لای بەختیارییەکان ماوەتەوە. ساڵی ١٨٩١ لە گۆڤاری (The Contemporary Review) وتارێکی بەناوی (سێبەری کوردەکان)[3] بڵاوکردۆتەوە.

---

(1) Frederick Millingen (Osman bey), Wild life among the Koords, London: Hurst and Blackett, 1870, (xiii, 380 p).

(2) Isabella L. Bird Bishop, Journeys in Persia and Kurdistan, Tom I Londres : Murray, 1891, (XIV-381 p.); Tom II, Londres : Murray, 1891, (409 p).

(3) Isabella Lusy Bishop (-Bird), « The shadow of the Kurds » In: The Contemporary Review, London, May 1891, Vol 59, pp. 642-654; pp. 819-835.

هەر لە دوایین دەیەی سەدەی نۆزدەهەم کۆمەڵێك ئەفسەری بەریتانیایی تێبینی و سەرنجی گەشتەکانی خۆیان لەبارەی ناوچەکانی کوردستان بڵاوکردۆتەوە، وەك: کاپیتان.ف.ڕ.مۆنسێل لە سەفەرنامەکەی خۆیدا بە ناوی (کوردستان)[1]، کە لە هاوینی ١٨٩٢ لە باکوورەوە چۆتە کوردستان و لە ٢٦ ی ئاگستۆسی ١٨٩٢ کوردستانی جێهێشتووە. باسی ڕێگە و بانەکانی سەفەر و تێبینی لەسەر ئاوایی و شار و شارۆچکە کوردییەکان دەخاتە ڕوو و بەشی زۆری کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران گەڕاوە و سەفەرنامەکەی پڕییە لە زانیاری و کەرەستە دەربارەی ڕەوشی کۆمەڵایەتی کوردستان لە دوایین دەیەی سەدەی نۆزدەهەمدا. هەر لە هەمان دەوراندا والتەر .ب. هاریس لە گەشتنامەکەی خۆیدا بەناوی "گەشتێك بە کوردستانی ئێران"[2]، کە لە ساڵی ١٨٩٥ لە لەندەن بڵاوکرایەوە، باسی گەشتێك بۆناو خاکی کوردستانی ئێران دەکات. نووسەر لە ١٢ی ئاداری ١٨٩٥ لە تەورێزەوە سەفەرێکی بۆ ناوچە کوردەوارییەکانی گۆلی ورمێ کردووە و لە ١٤ ی مانگ گەیشتۆتە مەراغە. بەقسەی نووسەر ژمارەی دانیشتوانی مەراغە ١٨٠٠٠ کەس بووە و ئەو شارە بە شوێنی ئاکنجیی هۆلاکۆ دادەنێ. لە مەراغەوە دەچێتە سابڵاغ و لەوێشەوە بەهۆی ڕێبەرێکی کورد و لەگەڵ دەست و پێوەندە تورك و عەرەبەکانیدا، لە ٢٠ ی ئایار دەگاتە سەردەشت و سەردانی مەنگوڕەکان دەکات. دوای سێ ڕۆژ مانەوە لە سەردەشت بەرەو بانە و سەقز و سنە دەڕوات و لە کۆتایی سەفەرنامەکەشیدا ناوی هۆزە کوردەکانی ناوچەی سنە و سەقز و دەوروبەریان

(1) Captain F. R. Maunsell, R.A, « Kurdistan »(1). In: The Geographical Journal, N° .2, February, 1894, Vol. III, pp, 81-95.

(2) Walter B. Harris « A Journey in Persian Kurdistan », In: The geographical journal , The Royal Geographical Society– London: Vol.6, 1895 (July–December), pp. 453–457.

بەدەستەوە دەدات. هەمان نووسەر ساڵی ١٨٩٦ لە کتێبێکی (٣٣٥) لاپەرەدا، سەفەرێکی خۆی دەگێڕێتەوە بە ناوی ( لە باتوومەوە بۆ بەغدا بە ڕێگەی تفلیس و تەورێز و کوردستانی ئێران)[١]، کە یەکێکە لەسەرچاوە گرنگەکانی دوایین ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمی کوردستان.

دواتر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تاوەکوو کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کۆمەڵێك دیپلۆمات و کارداری دەوڵەتیی و ئەندازیاری ڕێگەوبان لە گەشتەکانی خۆیاندا باسی کورد و کوردستانیان کردووە و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندیان بۆ بەجێهێشتووین لەوانە: سێر مارك سایکس لە وتاری " چەند گەشتێك بۆ باکووری میزۆپۆتامیا"[٢] باسی ناوچەکانی جەزیرەی ئیبن عومەر، هۆزە کوردییەکان، ئیبراهیم پاشا، کوردەکانی تورعابدین و کوردەکانی سوریە و هەروەها کوردەکانی هەردوو لای چیای شنگال دەکات و بایەخێکی تایبەتیشی بە ئێزیدییەکان داوە و چەندین وێنەی نایابی سەرۆکهۆز و ئاواییە کوردییەکانی لەگەڵدا بڵاوکردۆتەوە. جگە لەوە ولیەم ئیدوارد کۆللینس[٣]، کاپیتان بێرترام دیکسۆن[٤]، ل. مۆلینێکس-سیل[٥]، مۆرگان فیلیپ

---

[1] Walter B. Harris, From Batum to Baghdad via Tiflis, Tabriz, and Persian Kurdistan, Edinburgh, Ed. W.Blackwood, 1896, (335 p).

[2] Mark Saykes, "Journeys in North Mesopotamia", In: The Geographical Journal, N° .3, September, 1907, Vol. XXX, pp. 237-254 & 384-398.

[3] William Edward Collins, Notes of a Journey to Kurdistan, Reprinted, with additions, from the Anglican Church Magazine, Guildford: For private circulation, 1908, (58 p).

[4] Captain Bertram Dickson, « Journeys in Kurdistan ». In: GJ, Vol XXXV, n° 4, April 1910, pp, 357-379.

[5] L. Molyneux-Seel, "Journey into Dersim". In: The Geographical Journal Vol. XLIV, (July to December), 1914, pp. 49-68.

پرایس[1]، ماژۆر کینیپ ماسۆن[2]، ئی.بی. مێجەر سۆن[3]، ئێدوارد ولیم چارلس تۆئێل[4]، گی.م. لیز[5]، س.ژ.ئیدمۆندز[6]، فرانسیس م. هاللی[7]، ئارشیبالد میلنا هامیلتۆن[8] ، گی.ئی، هیبارد[9] و لیندفایلد سۆن (خێزانی مێجەر سۆن) [10]

---

[1] Morgan Philips Price, "A journey through Azerbaijan and Persian Kurdistan », In: Journal of the Manchester Geog. Soc, Vol. XXX, 1914. pp. 45-67.

[2] Major Kenneth Mason, M.C., R.E, "Central Kurdistan", in: The Geographical Journal, N° .6, December, 1919, Vol. LIV, pp. 329-347.

[3] Ely Banister Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise ... Second edition, with a memoir of the author by Sir Arnold T. Wilson., London: John Murray, 1926, (XXI. 421).

[4] Edward William Charles Noel, Diary of Major E.M. Noel : on Special Duty in Kurdistan, from June 14th, to September 21st, 1919, Basrah, [1920], (76 p).

[5] G. M. Lees, « Two years in South Kurdistan », In: Journal of the Royal Central Asian Society. London, Vol. 15.1928, (3), pp. 253-278.

[6] C. J. Edmonds, "Soane at Halabja: an echo", In Journal of the Royal Central Asian Society. Vol. 1936, pp. 622-625.

[7] Francis M. Halley, "The Gorge of the Qal'a Cholân and its confluence with the lesser Zab: Notes of a Tour in south Kurdistan in 1921", in: The Geographical Journal, Vol. LXXXVI, (July to December), 1936, pp. 158-164.

[8] Archibald Milne Hamilton, Road through Kurdistan : the narrative of an engineer in Iraq; with a foreword by Major-General Rowan-Robinson, London: Faber & Faber limited, 1937, (331 p).

[9] G. E. Hubbard, From the gulf to Ararat: an expedition through Mesopotamia and Kurdistan, Edinburgh and London: W. Blackwood and Sons, 1916, (pp. xv. 273)

[10] Mrs Lindfield Soane, "A Recent Journey In Kurdistan", In: JRCAS, London, July 1935, P: 403-417

سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ و دەوڵەمەندی کوردناسی ئینگلیزییان بۆ بەجێهێشتووین کە هەموویان شایانی ئەوەن بکرێنە کوردی و بە پێشەکی و پەراوێزی مێژووییەوە بڵاوبکرێنەوە.

**سەرچاوە:**

بۆ نووسینی ئەم باسە، بەتایبەتی بۆ بەشی دووەم، وێرای سەفەرنامەکان تەماشای ئەم سەرچاوانەش کراوە و سوودیان لێوەرگیراوە:


1- ISK's Kurdish bibliography. Edited by Silvio van Rooy and Kees Tamboer, Amsterdam: International Society Kurdistan, 1968, 2 v.

2-Nazand Abdulla Begikhani, *La femme kurde dans les littératures européennes principalement française et anglaise du XIXeme et du début du XXeme siecle.* sous la direction de Jean Bessiere, thèse de doctorat : littérature comparée : paris 3 : 1997, (387p).

3-Lokman I. Meho, The Kurds and Kurdistan : a selective and annotated bibliography. Westport, Conn. : Greenwood Press, 1997, (xv, 356 p).

٤- نەجاتی عەبدوڵڵا، بیبلیۆگرافیای کوردناسی، کورد و کوردستان لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ۲۰۰۹.

# پێشەکی

گاسپارد درۆڤیل ئەفسەری سوپای فەرەنسا لە ساڵەکانی ١٨١٢-١٨١٣ لە پانزەهەمین ساڵی حوکمڕانی فەتحعەلی شای قاجار (١٧٩٧-١٨٣٤ ز) لە گرووپی ئەو ئەفسەرە فەرەنسییانە بووە، کە لەگەڵ مسیۆنی کۆلۆنێل گاردان چۆتە ئێران و دوای بێئاکام مانەوەی کۆششەکانی گاردان، ئەم، ماوەی شەش مانگ میوانی عەسکەرخانی دوایین باڵیۆزی ئێران لە فەرەنسا بووە و لەو ماوەیەدا هەموو ئێراندا گەڕاوە. دوای گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا چاپی یەکەمی بەرهەمی گەشتنامەکەی ساڵی ١٨١٩ لە سانت پێترسبوورگ بە تیراژی تەنیا (١٥٠) دانە بڵاودەبێتەوە. وەك نووسەر دەڵێ (بەرێکەوت) دانەیەکم بەردەست کەوتووە و هەر زوو درکی بەوە کردووە سەفەرنامەکە چەند چەمك گەلێکی گرانبەها و دیاریکراوی تێدایە سەبارەت بە دابونەریتی ئێستەی ئێران، لەبارەی حوکوومەت و سوپاوە، هەموو ئەمانە هانیان داوە چاپێکی تازەی بکاتەوە[1]. وەك خۆی لە پێشەکی سەفەرنامەکەیدا باسی کردووە بەنیاز بووە لەبارەی سوپای ئێران بنووسێ، بەڵام دواتر بیری کردۆتەوە، کە ئەمە تەنیا بۆ چەند کەسێك بەنرخە بۆیە ڕای خۆی گۆڕیوە و پێی وایە کە [چ گەڕۆکەکان و چ مێژوونووسەکان، ئەوەی تا ئێستا لەبارەی ئێران یان نووسیوە، زیاتر وەسفی

---

[1] ساڵی ١٨١٩ چاپی یەکەمی لە سانت پێترسبۆرگ لە ڕووسیا و دواتر دوای شەش ساڵ لە پاریس چاپی دووەمی بە دوو بەرگ بڵاوکرایەوە (٢٤٣+٢٨٢ لاپەرە) و ساڵی ١٨٢٨ هەر لە پاریس چاپی سێیەمی بە دوو بەرگ بڵاوکرایەوە.

شوێنەکانیان کردووە و زۆر بە کەمی لەبارەی دابونەریت و ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی ئەو بەشە سەرنجڕاکێشەی ئاسیایان نووسیوە، کە بە تەواوی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێمە جیاوازە، لەبەر ئەوە من بەنیاز نیم مێژوویەکی تازەی ئێران بنووسمەوە، چونکە ئەستەمە زیادەیەك بخەمە سەر ئەوانەی کە شاردان، تیڤینۆ، ئۆلیڤیێ، کینێر و پیکۆ و هی دیکە نووسیویانە. هەندێك لەو نووسەرانە زانیارییان لەبارەی دابونەریت و ڕێورەسمی فارسەکان زۆر بە وردی نووسیوەتەوە و زۆر بە وردی ڕاستییەکانیان خستۆتە ڕوو بەڵام زۆریشیان لەسەر بنەمای زیادەڕەویین یان لەسەر زانیاری دروست نەنووسراونەتەوە، لەناو ئەوانەدا ئەوەی پێوەندی بە ژنانی چینی سەرەوە هەیە، ئەوروپاییەك لە هەر پایە و پلەیەکدا بێت، دەتوانێ بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە ئێراندا بمێنێتەوە، بەڵام بێ ئەوەی تاکە کەسایەتییەکی ژن ببینێت، بۆ ئەوە دەبێ یارمەتیدەرێکی هەبێت کە زۆر بەئەستەم وەگیر دەکەوێ و زۆریش دەگمەنە ببینێتەوە]. گاسپارد درۆڤیل لە سەفەرنامەکەیدا زۆر بایەخی بە پێگەی ژن و ڕەوشی ژنانی ئێران داوە و لای وایە کە گەڕۆکەکانی پێش خۆی، چاویان بە ژنانی ئێران نەکەوتووە و تەنیا بە خەیاڵی خۆیان لەبارەی ژنانی ئێرانەوە نووسیوویانە، بەڵام ئەم بەهۆی ناسیاویی چۆتە ناو حەرەمی عەسکەرخان. گاسپارد درۆڤیل لە سەفەرنامەکەیدا زۆر دەگمەن توخنی مێژوو و جوگرافیای ئێران کەوتووە، چونکە ئەم لایەنە لە ڕوانگەی ئەوەوە لەلایەن گەڕۆکە فەرەنسی و ئینگلیزەکان زۆری لەسەر نووسراوە.

گاسپارد درۆڤیل کە لە ساڵەکانی ۱۸۱۲ و ۱۸۱۳ لە ئێران بووە دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵکەوتووە کە زۆر شوێنی ئێران بگەڕێ و دیارە بێگومان چۆتە کوردستانیش (وادەبێ زیاتر کوردستانی ئێران بووبێ) بەڵام شوێنی کوردستان دەستنیشان ناکات. دواتریش وا دیارە بەناو کوردستانی عوسمانیدا ڕۆیشتۆتەوە

و بەناو جۆلەمێرگ دا تێپەڕیووە و لەناو کریستان و کوردەکاندا ماوەتەوە و زۆر زانیاری سەرنجڕاکێش لەبارەی کریستیانەکان دەخاتەڕوو. ئەم سەفەرنامەیە لەبارەی کوردستانەوە زۆر زانیاری وردی تێدایە لەبارەی دەیەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و بە تایبەتیش سترەکتووری کۆمەلاٌیەتی و سیاسیی کوردستان و تابلۆیەکی زۆر وردی ژیانی کۆلەمەرگی جووتیارانی کورد نیشان دەدات و دەڵێ: " کوردەکان زۆر بە کلۆڵیی دەژین، لەناو هەموو کوردستاندا، بەدەر لە کۆشك و قوڵڵەی بەگەکان، هیچ شوێنی ژیانی مام ناوەندیی تێدا نییە، ماڵی تایبەتیی هەرە دەوڵەمەندەکان ناگاتە ئاستی ماڵی جوتیارەکانی ئێران (ل. ١٧٦)". لەبارە کەسێتی تاکی کورد، لە هەموو ڕۆژهەلاٌتناسێکی دیکە خراپتر باسی کورد دەکات و دەنووسێ: " کورد گەلێکی بالاٌبەرز و کەڵەگەتن، ڕوخسارێکی جوانیان هەیە ئەگەرچی سیمایان ئەسمەرە. بەلاٌم زۆر ناشارەزان و هەر بە خۆرسك دڕندەن، کە شوێنەوارەکانی زۆربەی جار ترسناکن. ئەوان هێشتا لە تورکەکان درۆزنترن و ئەمە دەکرێ زیاتر قسەی لێوە بکرێ: بەلاٌم ئەم خەسڵەتەیان دوورە لەوەی لای خۆیان مەحکومی بکەن و لەچاوی ئەوانەوە ئەوە بەهرەیەکە و نیشانەیەکە بۆ دانایی. کوردەکان لە هەموو ڕۆژهەلاٌتییەکانی دیکە وەحشیترن، هەر هەموو خەوشێکیان هەیە بێ ئەوەی یەک خەسڵەتی باشیان هەبێ، دلڕەق، خوێنخۆر، غەدار، دووڕوو و دزی بێباکن، تەنیا لەسەر تالاٌنوبڕۆ دەژین، کە دەیکەنە سەر ناوچەکانی هاوسێکانیان. من لە هەموو خەسڵەتەکانیان تەنیا ئازایەتییەکی بێوێنەم بینی، بەلاٌم ئەم ئازایەتییە نە عەقلاٌنییە و نە لە سۆنگەی هەستێکی شەرافەتمەندانەوەیە". ئەمەی خوارەوە وەرگێراوی کوردیی ئەم بەشەی سەفەرنامەکەیە، کە تایبەتە بە کورد.

# VOYAGE

# EN PERSE,

## FAIT EN 1812 ET 1813;

PAR GASPARD DROUVILLE,

Colonel de cavalerie au service de S. M. l'Empereur de toutes les Russies, Chevalier de plusieurs ordres.

SECONDE ÉDITION.

TOME PREMIER.








A PARIS,

A LA LIBRAIRIE NATIONALE ET ÉTRANGÈRE,

RUE DES PETITES-ÉCURIES, N° 47.

1825.

# (فەسڵی سی و هەشت)[1]

## کورد Curdes

ئەمڕۆ نزیکەی سەرجەم کوردەکان باجدەری دەوڵەتی ئێرانن و زیاد لەوەش لە سۆنگەی نیشاندانی مەیلداریی زۆریان بۆ ئێران، پێم وایە وەکو نموونەی تورکمانەکان ڕۆژێك دێ دەبنە بەشێکی جودانەبووە لە ئێران. کەوابێ چەند وشەیەك لەبارەی خەسڵەت، خوڕەوشت و هەروەها لەبارەی شێوازی ژیانیان باس دەکەم، کە بەهەمان شێوەی ئەوەی لەگەڵ فارسەکان و هەروەها لەگەڵ تورکەکانیش جیاوازییان هەیە .

بنچینەی ئەم گەلە زۆر نادیار و ناڕۆشنە، دەڵێن نەوەی (سکیت)ەکانن[2]، بەڵام وەك چۆن نە خۆیان و نە هاوسێکانیشیان ناتوانن کەمترین ڕوناکی لەم

---

[1] Gaspard Drouville, Voyage en Perse, fait en 1812 et 1813, Paris: Librairie Nationale et étrangère, 1825, Chapitre XXXVIII, Les Crudes, pp: 187-207

[2] سکیتەکان (Scythes) کە بە زمانی یۆنانی کۆن (Σκύθοι / Skúthoi ) یان پێدەڵێن، گەلێکی کۆنی ئیندۆ-ئەورووپایی کۆچەری دەوارنشین بوون و لە بنەڕەتدا ئێرانین و بەزمانە ئێرانییەکان دەئاخاوتن و لە شانشینی (سکیتیا)ەوە هاتوون، لە پێدەشتی ڕووسیاوە بەرەو زەریای خەزەر و ئۆراڵەوە هاتوون. هێریدۆت لەبارەی سکیتەکان نووسیویە و هەروەها مێژوونووسی جوو، فلافیوس بە گەلی (ماجوج) ناوی بردوون (وەرگێڕ).

باریەوە بخەنەڕوو، دەبینین بنچینەی ڕاستەقینەیان بۆ ئێمە وەك بنچینەی فارسە کۆنەکان ونە، کە ئێمە تەنیا دەشێ تەنیا لەمێژووی دەورانی کۆرشەوە شتێکی کەمی لێ بزانین .

بەڵام ئەوەی جێگای دڵنیایی و باوەڕە ئەوەیە، کە کوردەکان نە هەمیشە نیشتەجێیی ئەو ناوچەیە جوانە بوونە، کە کەوتۆتە نێوان دیجلە و فوڕات و جاران میزۆپۆتامیای بە پیتوفەڕی پێکدەهێنا و نە ئەو چیایانەی تۆرۆس، کە دۆڵ و شیوە بەپیتەکانی ئەمڕۆ تەواو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندین. بەوپێیەی ماوەیەك لەناو کوردەکاندا ژیاوم، دەتوانم بیانناسم و هەڵیانبسەنگێنم، من بە ڕوانینی عادات و دابونەریت، زمانیان، هەتا بە جلوبەرگیشیان باوەڕم وابووە، کە ئەوانە بنچینەیان عەرەبە. هێشتا هاوشێوەیی و پێوەندی ئەوەندە سەرنجراکێش لەنێوان ئەوان و دەوارنشینە عەرەبەکان هەیە، کە وام لێدەکەن باوەڕ بەوە بکەم کە ئەوانە چەند تایەفەیەکی دەوارنشینە عەرەبەکان بن، کە لە دەورانی جەنگی ئاینییدا، کاتێك ئێران لەلایەن عەرەبەکانەوە داگیر دەکرێت لە عێراقی عەرەبیدا جێگیر بووین. لەوێوە بەرەو باکوور، بەدرێژایی چیای زاگرۆس تاوەکو ڕووباری موراب، کە ئەمڕۆ کوردەکان لە ئەرمێنیای تورکی جیادەکاتەوە، هەڵدەکشێن .

کوردەکان دابەشی سەر چەند خێڵێك دەبن کە بە حوکمڕانییەکی ڕەها لەلایەن بەگەکانەوە حوکمڕانی دەکرێن. خێڵە کوردەکان بەشی زۆریان خراونەتە ژێر پاراستنی ئێرانەوە، کە بەگوێرەی ژمارەی ڕەعیەتەکانیان سەرانەیان لێ وەردەگرن. کورد گەلێکی باڵابەرزن، کەڵەگەت و ڕوخسارێکی جوانیان هەیە ئەگەرچی سیمایان ئەسمەرە. بەڵام زۆر ناشارەزان و هەر بەشێوەیەکی خۆرسك دڕندەن، کە شوێنەوارەکانی زۆربەی جار ترسناکن. ئەوان هێشتا لە تورکەکان درۆزنترن و ئەمە دەکرێ پتر قسەی لێوە بکرێ: بەڵام ئەم خەسڵەتەیان دوورە لەوەی لای خۆیان مەحکومی بکەن و لەچاوی ئەوان ئەوە

بەهرەیەکە و نیشانەیەکە بۆ دانایی. کوردەکان لە هەموو ڕۆژهەڵاتیيەکانی دیکە وەحشیترن، هەر هەموو خەوشێکیان هەیە بێ ئەوەی یەک خەسڵەتی باشیان هەبێ، دڵڕەق، خوێنخۆر، غەدار، دووڕوو و دزی بێباکن، تەنیا لەسەر تاڵانوبڕۆیی دەژین، کە دەیکەنە سەر ناوچەکانی هاوسێکانیان. من لە هەموو خەسڵەتەکانیاندا تەنیا ئازایەتییەکی بێوێنەم بینی، بەڵام ئەم ئازایەتییە نە عەقڵانییە و نە لە سۆنگەی هەستێکی شەرافەتمەندانەوەیە. ئەوە زیاتر بێ پەروایی وەحشییەکە، کە تەنیا دەیەوێ پەلاماری نێچیرەکەی بدات بە بێ بیرکردنەوە لەو مەترسییانەی کە لەو پەلامارەدا بەرەو ڕووی دەبنەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەك لە وڵاتی خۆیاندا دابونەریتی میوانداریيان هەیە، هەمان ئەو پیاوانەی کە لەوانەیە لەو دیو سنوورەکانی خۆیان بێبەزەییانە کەوڵت بکەن، دەشێ یەکەمین کەسانێك بن هاورێیەتیت بکەن و خزمەتت بکەن بتپارێزن کاتێك تۆ لەسەر خاکی ئێران دابێت .

دە تا وەکو بیست کوردێك کۆدەبنەوە بۆ تاڵانیی و برێکجار ئاواییەکان و شارەکان تاوەکو ناوجەرگەی ئەناتۆلیا تاڵان دەکەن. بۆ تاڵانی گەورە و بڕێک گرنگتر، چەندان تاقم پێکەوە یەك دەگرن و دەستکەوتەکان دابەش دەکەن. ئەوان بەدەگمەن نەبێ، دەنا بەدەستی بەتاڵ ناگەڕێنەوە.

هۆزەکانی هەکاری[1] و باڵبان[2] و مەهرەوان[3] و بەیلام[4] یان هۆزەکانی ناوچە پێدەشتەکان، کە ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی شازادە دان، وەکو ئەوانی دیکە پەنا نابەنە بەر تاڵانوبڕۆ، چونکو دابونەریتی کۆچەریی و ئەو سەرقاڵییەیان بە مێگەلەکانیانەوە کەمێك هەڵسوکەوتیانی نەرم کردوون، بەڵام ئەوانیش ئەگەر

---

(1) Hékary

(2) Belban

(3) Méhervan

(4) Beilam

لەدەرەوەی خاکی خۆیان یەخەگیریان ببێت، دەگەڕێنەوە سەر ڕەوشت و کردەوەی دڕندانەیان.

کوردەکان بەهەمان شێوەی فارسەکان، لەسەر بنەمای سەروەت و سامانداری، تەنیا بۆ دوو چین دابەش دەبن. مێگەلدار و خاوەنداریێتی ئاوایی، کەم تا زۆر هەموو ئاواییەکان نەستوورییەکانیان تێدا دەژین، کە هەموو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندییانە. لێرە، پێوەری ڕیزگرتن ئەوەیە کە کوردێك دەتوانێ چەند نۆکەری چەکداری بۆ خۆی ڕابگرێ و بەخێویان بکات. سەردار بۆخۆی هەمیشە پیاوەکانی بۆ لەشکرکێشی دەنێرێ، ئەوانە هەموو ئەو دەستکەوتانەی بۆ دەهێننەوە کە بندەستیان خستوون و ئەو بەشەی کە سەرۆك وادەی پێداون، وەردەگرن. سەردارە گەورەکان بەشێوەیەکی کلۆلانە دەژین، چونکە لەناو هەموو کوردستاندا، جگە لە کۆشکی قایمی بەگەکان نەبێ، یەك شوێنی نیشتەجێبوونی شیاو نییە . ماڵی تایبەتیی هەرە دەوڵەمەندی کوردەکان ناگاتە ئاستی ماڵی جوتیارە فارسەکان، ماڵی کوردەکان خانۆچکەی نزم، بێ پەنجەرە، لەناو کلاوڕۆژنەیەکی بازنەییەوە ڕووناکیی بۆ دێت، کە لە بنمیچی ماڵەکەوە کراوەتەوە و شەوانە بە بەردی پان دەیگرن .

کوردەکان سوونین، واتە لە تایەفەی عومەرن، زۆر بڕوایان بە پروپووچ هەیە و چوار یان پێنج جار لە ڕۆژێکدا نوێژ دەکەن. بێجگە لە سەرقاڵییەکانیان سوودێکی ئەوهای نییە و لەوەدا لە تورکەکان دەچن. کە وەك ئەوان تەواوی ڕۆژ دانیشتوون بێ ئەوەی بجوڵێنەوە. کوردەکان زۆر قسە دەکەن و حەزیان لە هەقایەتە، بەم شێوەیە هەمیشە دەروێشەیلێکی بێگانە لای خۆیان گلدەدەنەوە و ئەرکی بەخێوکردن و دابینکردنی گوزەرانیان دەکێشن.

شێوازی ژیانیان زۆر سادەیە و خواردنیان بریتییە لە کفتەی برنج، لەگەڵ کوفتەی تێکەڵاو بە بەهارات و لەناو شۆربا دەیکوڵێنن، بەزۆری گۆشتی مەڕ و



بزن دەخۆن کە دەیکوڵێنن و بە بێ ڕۆن و هەتا بە بێ خوێش دەیخۆن. نانیان هێشتا لە نانی فارسەکان تەنکترە و بەشێوەیەکی ئاسایی لەبەر خۆرەتاو دەیبرژێنن. زۆر حەزیان لە گۆشتی وشترە، کاتێکیش لە دەستکەوتدا دەستیان دەکەوێ، ئەوە ڕۆژێکی داوەتکارییە بۆ هاوسێکانیان، کە هەموویان لە ڕەوشگەلێکی ئاوهادا داوەت دەکرێن بۆ ئەوەی بێن بەشی خۆیان بخۆن.
کوردەکان هەرگیز شەراب ناخۆنەوە و لایان قەدەغەیە، ئەوەی سەرپێچی بکات و لەمە لا بدات و بیخواتەوە، بە توندی سزای دەدەن. دەیگرن و قاچی بە دارێکەوە دەبەستنەوە، دوانزە سەعاتێك لێی دەگەڕێن. لەکاتێکدا ئەگەر جارێکی دیکە بخواتەوە سزاکە دارکاریشی دێتە سەر .

پێشتر وتم لە کاتی جەنگدا کوردەکان ناچارن ژمارەیەک لەشکر بخەنە بەردەست شازادە، بەڵام لەناو هەموو هۆزەیلی ژێر دەسەڵاتی شازادە، ڕاستییەکەی تەنیا یەك هۆز هەیە، کە بەکەڵکی ئەو دێت ئەویش هۆزی (بەیلام)ە ، کە ئەو هۆزە لەشکرەکەی بە تاقی تەنیا بارەتەقای هەموو هۆزەکانی ترە. ئەم هۆزە لە پێدەشتێکی بەرفراواندا دەژی، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە سنوردراوە بە لقە ڕووبارێکی چکۆڵەی زاگرۆس، کە لە باکوورەوە بەرەو باشوور شۆڕ دەبێتەوە و، هەرێمی سەڵماس و ورمێ جیادەکاتەوە، کە ئەم هەرێمانە لە درێژبوونەوەدا لەگەڵیدا هاوتەریبن. ئەم هێزە پێشتر جاران بەشێك بووە لە هۆزی هەکاری، بەڵام ئەو بەگەی کە حوکمڕانی هۆزی هەکاری دەکات و لەناوچیاکاندا دەژی، بووەتە سۆنگەی ناڕەزایی لەلای ڕەعیەتگەلی دانیشتووی

پێدەشت. ئەوان ماوەیەکی درێژ تەقەلایان بوو لەڕێگەی ئیسماعیل بەگ ناوێکەوە، کە خاوەنی قەلایەکی بەهێز بوو و کەوتبووە سەر لووتکەیەکی شاخی زاگرۆس، کە ئێستاکە باسم کرد و بەسەر پێدەشتەکەدا دەیڕوانی، خۆیان لە دەست حوکمڕانیی (بەگی هەکاری) ڕزگار بکەن. دواجار هۆزی بەیلام توانیان ڕاپەرن و ئیسماعیل بکەن بە سەرۆکی خۆیان، بەمەرجێك کە هەموو شتێك بکات لەپێناو هێشتنەوەی سەربەخۆییاندا. ئیسماعیلی فێڵباز وەختایەك بە ئاواتی خۆی گەیشت، بەپەلە خۆی خستە ژێر باڵی وەلیعەهد شازادە و خۆی وەك واساڵی[1] شازادە ڕاگەیاند و لەئەنجامدا وەکو بەگی هۆزی نوێی پێد ەشت یان بەگی هۆزی بەیلام بەناوی قەلای ئیسماعیل ڕاگەیەندرا، بەمەرجێك خۆی بە ڕەعیەتی ئێران بزانێت و گوێڕایەڵیی ئەو فەرمانانە بێ، کە لە لایەن (شا)ی باوکی یا لەلایەن شازادە خۆیەوە دەردەچن[2].



---

[1] واساڵ: لە سەدەکانی ناوەڕاست پیاوی ئاغاکان بوون، کە تا کۆتایی ژیانیان لە خزمەت ئاغا دەبوون (وەرگێڕ).

[2] بەگی هەکاری ویستی تۆڵەی ئەم کردەوەی سەربەخۆخوازییە بکاتەوە، دەرفەتی ئەوەی قۆستەوە کاتێك ئیسماعیل بەگ بەسەرکردایەتیی دوانزە هەزار کەس لە پیاوەکانی پێوەندی بە سوپای شازادەوە کرد، پێی وابوو کە دەتوانێ دەست بەسەر قەلاکەدا بگرێت، بەڵام خوشکی ئیسماعیل بەگ کە قارەمانێکی راستەقینە بوو کاتێك بە پەلامارەکەی زانی، بەپەلە بەخۆی سەرکردایەتیی چوارسەد پیاوی سوارەی کرد و هێرشی کردە سەر باباخانی کوڕی بەگی هەکاری، سەرەنگومی کرد، بەم شێوەیە سەرجەم ئەو سێ هەزار سوارەی کە لەگەڵ باباخان دا بوون، دەستگیر کران

ئەم پەیماننامەیە، کە دووربوو لەوەی زیانی بۆ ئەوان هەبێ بۆیە بە قازانجی ئەوان دەشکایەوە. لە ڕاستیدا لەماوەی چەند ساڵێکدا بوون بە باشترین و دەوڵەمەندترین هۆزی وڵات، وەك ئەوەی هەمیشە ئازاترین هۆز بوون. لەکاتی جەنگدا پانزە هەزار سوارەی تەواو ساز و تەدارەك و چەکدار ئامادە دەکرد و کاتێکیش بچوونایە دەرەوەی ناوچەکانی خۆیان، بڕە پارەیەکیان لە (شا) وەردەگرت؛ ئەم بڕە پارەیە بۆ بە چاکی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆیان، زۆر بوو.

ئەم هۆزە باشترین جۆری ئەسپیان هەبوو، کە خاوەنی هێز و خێراییەکی نائاسایی بوو، چونکە هەر سوارێک دەبوو بۆ خۆی مشووری ئەسپی خۆی بخواردایە، بۆیە بەشێوەیەکی تایبەتیی دەیانعاملاندن. کوردەکان زۆرینەی ماینەکانیان لە ئەسپی عەرەبی یان تورکی چاك دەکەن، بەم پێیە ژمارەیەك جوانووی نایابییان چنگ دەکەوێ، کە نرخەکەی وا زۆر گران نییە و دەتوانین ئەسپێکی زۆر جوان بە پەنجا ڕیال (سەد و پەنجا فرەنك) بەردەست بخەین.

کوردەکان وەك سوپای غەیرە نیزامیی ئێرانی شەڕ دەکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەمێك لەوان نیزامی زیاتریان هەیە، کە هەرچەندە بەشێوەیەکی ناتەواویش بێ، دەزانن لە جەنگدا بەسەر دوو ڕێزدا دابەش ببن. سەرۆکی هۆز یان خێڵ کە بە ئازاترینیان دادەنرێن، هەمیشە بەچەند هەنگاوێك لە پێشەوەیانن و دەبێ بەرەنگاربی یەکەمین دوژمنەکان ببنەوە.

وەختایەك لە مەیدانی جەنگدا دەبن و ئەرکێکیان پێ ڕادەسپێردرێت، هەریەکەیان ئامادەن و چەکەکانیان تاقی دەکەنەوە، وریا لەوەی کە هیچ شتێك نیگەرانیان نەکات وا بەئارامییەوە کارەکە دەکەن وەك ئەوەی سەرقاڵی گاڵتە و

---

یاخود کوژران، خان بۆخۆی زۆر بە سەختی لەگەڵ چەند پیاوێکی چەکداری خۆیدا ڕزگاری بوو (تێبینی نووسەر).

گەم بن. لەو دەمەدا مەلای هەر هۆزێك بەناو بەرەكانی جەنگدا دەگەڕێت و بەدەستی ڕاستی تەورێك بەرز دەكاتەوە و بەدەستی چەپیشی لە تەپڵێكی چكۆڵە دەدا كە بە كەڵپۆزی زینی ئەسپەكەیەوە گرێدراوە و هەموو دەم هاوار دەكات (الله). بەم نیشانەیە هەموو ڕیزەكان هێرش دەبەن و مەلاكە كە لە پێشەوەی هەمووانە زۆربەی جار یەكەمین گورز ئەو دەیوەشێنێت. هەموو پیاوێك ڕمێك، كە لە هی قزڵباشەكان دەچێ، خەنجەرێك، جووتێك دەمانچە و دوو شمشێری پێیە. شمشێرێكیان بە لاقەدەوەی دەبەستێ و ئەوی دیكەشیان ئاسۆیی لەژێر پشتێنی زینی ئەسپكەی دەبەستێ و لە ئەگەری شكانی شمشێری یەكەمیدا " زۆر جار وا ڕێک دەكەوێ لە كاتی بەركەوتنی بە كڵاو زرێ، سێڵ زرێ و قەلغانی دوژمن، دەشكێن" ئەمەیان بەكار دەهێنێ. كوردە هەرە ئازاكان، گەلێك بەڕێزن، و لەهەر پێگەیەك بن، مافی ئەوەیان هەیە لەبەردەم گەورەكانیاندا دابنیشن، كە ڕێزی زۆریان بۆ دادەنێن، چونكە سل لە كاریگەریی دەستڕۆیشتوویی ئەوان دەكەنەوە، كە لەناو لایەنگیرەكانی ئەواندا هەیانە، ئەوان هەروەها هەندێک مافی دیكەشیان هەیە، كە سەرەكیترینیان بریتییە لە چەقاندنی پەڕێكی تاووس بە مێزرەكەیاندا لە بەرانبەر كوشتنی هەر دوژمنێك. بەم شێوەیە مێزەری زۆربەیان بەو پەڕە تاووسانە داپۆشراوە، من ڕۆژێك نۆ پەڕەتاووسم بە مێزەری گەنجێك ژمارد كە هێشتا بیست و پێنج ساڵ نەدەبوو. كوردەكان ئێرەیی لە بەرانبەر ئەو نیشانەی شەرافەتمەندیتییە بە یەك دەبەن و جنێوی هەرە قورس كە بمانەوێ بە كوردێك بدەین ئەوەیە پێی بڵێی مێزەرەكەی لەبەر خۆرەتاودا سووتاوەتەوە و هێشتا بۆ ئەوە نابێ سێبەرێكی بۆ پەیدا بكات!

جلو بەرگیان زۆر  لە جلوبەرگی مەملووکەکان دەچێ، لەم ڕووەوە وێکچوونێکی زۆریان لە ئازایەتی ، بێ پەروایی و بەتایبەتیی کارامەیی لەگەڵ ئەواندا هەیە.

کوردەکان وەك موسڵمانەکانی دیکە فرەژنیی ناکەن،  هەرچەندە ئاینەکەشیان ڕێگەی پێداون تا چوار ژنیان بێ، کەچی زۆر بەدەگمەن لەیەك ژن زیاتریان هەیە. بەم شێوەیە ژنانی کورد لە ژنانی فارس بەختیارترن، کە بە دەگمەن ژنانی فارس ڕۆژەکانیان بەسەردەبەن بەبێ ئەوەی بەهۆی ئێرەیی پێبردن و دووڕوویییەوە تووشی دەمەقاڵی نەبنەوە.

جلوبەرگی ژنانی کورد زۆر ڕێکپۆش و زۆریش شیاوترە وەك لەوەی ژنانی فارس. جگە لەوە کراسێکی گەورەی تورکی کە زۆر جوانە دەیپۆشن، هەروەها جلێکی کورت لەبەردەکەن، کە بەشێکی لەشیان دادەپۆشێ بە پشتێنێکی زۆر گران دەیبەستن، کە لەگەڵ نەخشی بەژن وباڵایان بەشێوەیەکی نایاب دەگونجێت. ژنانی کوردیش کڵاوپێچ لەسەر دەکەن و شەرواڵ لەبەر دەکەن، بەڵام زۆر سووکتر و زۆر بە شکۆوە دروست کراوە. ژنانی کوردیش وەك ژنانی فارس حەزیان لە خشڵ و زێروزەبەرە، ئەوە بۆ ئەوان خۆشنوودییەکی گەورەیە کە خۆیانی پێوەدەربخەن و خۆیان بە ناسیاوەکانیان نیشان بدەن کاتێك سەردانیان دەکەن. ژنانی کورد یەکجار نەزانن و هیچ سەرقاڵییەکی دیکەیان نییە جگە لەوەی کە وەك ژنانی فارس جگەرە دەکێشن و بەشێکی تەواوی ڕۆژ دەگەڕێن و دەسووڕێنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان بەشێوەیەکی زۆر جوان شارەزای زیڕدۆزین، پەستەک و فەرەنجیی بۆ هاوسەرەکانیان دەنەخشێنن. ئەم جلوبەرگانە زۆر دەوڵەمەندانەن و تەنیا لە ڕۆژانی شادی و جەژندا دەپۆشرێن، بەڵام هیچ شتێك ناگاتە ئەو جوانییەی، کە لە ئیستەنبووڵ دەدورێت، کە لەوێدا بەڕای من بەرگدرووە هەرە بەبەهرە و دەسترەنگینی جیهان

دەبینین. وێرای ئەوەی کە ژنانی کورد لە چینی خوارەوە وەك ژنانی فارس دەموچاویان داناپۆشن. بەڵام هەرگیز ژنانی کورد بە بێ چارشێوێکی سپی، کە گشت ئەندامیان دادەپۆشێ لەماڵ دەرناکەون، واتە هەرچەند ژنانی کورد پەچە ناکەن، بەڵام ئەوان لە بریتی ئەوە سەرپۆشگەلێکی سەمەرە دەپۆشن. ئەو سەرپۆشانە جۆرە خۆرەتاو-پارێزێکە لەوانەی پیرەمێردە چاوکزەکان، ئەوانەی بەرگەی گەرمای خۆرەتاو ناگرن، بەسەریاندا دەدەن، بەڵام (پەچە) ڕووپۆشی ژنانی کورد گەورەترن و لە مقەوای ڕەنگ ڕەش دروست کراون: بە پارچە قوماشێکی دروستکراو لە موو (یاڵ)ی ئەسپ دەیبەستنەوە، کە لێیەوە بەتەواوی هەموو شتەکانی دەرەوە دەبینن، بەبێ ئەوەی بتوانرێ ڕەنگەکان بناسرێنەوە. بەشێوەیەکی گشتی ژنانی کورد لە ژنانی فارس ئازادییان پترە و بەزۆری لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەماڵ دەردەچن بەبێ ئەوەی، کە مێردەکانیان نیگەران بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دەبن .

ژنانی کورد وەك ژنانی تورك ڕووخۆشن و بەشێکی زۆریان وەك ئەوان دۆستی دڵخوازیان هەیە کە لەگەڵیاندا پەیوەندیان هەیە و هەموو ڕۆژ بەنهێنی یەکتر دەبینن. ئەم ساتوسەودای نامەونامەکارییەیان زۆر بە وریایی دەکرێت، بەڵام ئاستەنگەیلی خۆیشی هەیە. ڕێککەوتوون لەسەر چەند گوڵێك، کە مانای جیاوازی هەیە وبەگوێرەی ئەو شێوازەش، کە بۆیان ڕێك دێت و لەنێوان خۆیاندا هاوبەش دەبێ. تەنگەتاوییەکانی ئەم پەیوەندیگرتنە نارۆشنە زۆر زیاتر زیاتر دەبن، ئەگەر ژنەکە بەرەو ڕووی ڕووداوێك بۆوە، یان ئەگەر گومانی لێبکەن و حەسوودێك کلیلی نهێنییەکان پێ بزانێ، ئەوکاتە دەبێ دەستەوجێ ئەو گوڵەی کە بەیانی واتەی خۆشنوودی و خۆشەویستی دەگەیاند، ئێوارە مانای ڕق و تۆڵەسەندنەوە بدات. مێردەکان کە هەموویان بەوەدا تێپەڕبوون بەچاکی ئەم شێوازی دەربرینە دەناسن و تا بۆیان بکرێ گوڵ قەدەغە دەکەن،

بەڵام ئەوەش سوودی نییە، چونکە شێوازی بەخشینی ئەم دەسکە گوڵانە هێندە کارامە جێبەجێ دەکرێ، کە مێردەکان هەرگیز ناتوانن پەی بە مانای ڕازەکە بەن و لێی دەگەڕێن وەکو خۆیان شتەکان تێپەر بىن. ژوانی عاشقانە زۆر ئاسایین، بەڵام گەرچی هەمیشە زۆر ترسناکە، بەجۆرێك دوو دۆستی عاشق کەبەیەکەوە لەبەرانبەر یەك دەگیرێن هەمیشە دەبێ نرخی ئەم بەختەوەرییە مەرگێکی دڕندانە بێت، بەڵام ئەمە ڕێگە لەوە ناگرێ کە ژنان وادەی ژوان بدەن و پیاوانیش بە پەلەپرووسکێ قەبووڵی بکەن، بەڵام پاراستنی بەرژوەندی هەردوو لا بەنهێنی وایکردووە کە ڕووداوگەلی ناخۆش زۆر دەگمەن بێت. ژوانەکان بەشێوەیەکی ئاسایی لەوماڵانە دەبن کە چەندین دەرگەی دەرچوونیان هەیە. ماڵەکان لەلایەن جووەکانەوە بە کرێ دەدرێن و ئەوان زۆر شارەزان لە بەڕێوەبردنی ئەم سەرەرۆییە عاشقانەیەدا. دۆستەکان لە دەرگەی پشتەوە دەچنە ژوورەوە و پیاوان جلی ژنان دەپۆشن. خۆگۆرین لەم وڵاتە زۆر ئاسانە کۆڵوانە و پەچەیەک کەسەکە بەتەواوی دەشارێتەوە و ڕێگە لە زانینی ڕەگەزەکەشی دەگرێ. ئەگەر بەڕێکەوت یەکێکیان یان ئەوی لایەنی دیکە نەیتوانی لە کات و ساتە دیاریکراوەکە بە ژوان ڕابگات ، جووەکە بۆ سبەینەکەی لەسەر پەنجەرەکە چەپکێك گوڵ دادەنێ کە واتاکەی ڕازێك دەبێ بۆ هەموان جگە لەو ژن و پیاوەی کە پەیامەکەیان بۆ دانراوە و لە سروشتی بەربەستەکە تێدەگەن کە وادەی ژوانەکە تێکدراوە و لە هەمان کاتدا ڕۆژ و سەعاتی وادەی دووەم دیاری دەکات. وەڵامەکە بەهەمانشێوە دەبێ و سەرەڕۆییەکانی خۆشەویستانە زۆربەی جار وادەبێ چەندین ساڵ بەردەوام دەبێ بەبێ ئەوەی پەی بە نهێنییەکە ببردرێت. ئەوە زیاتر لە تورکیا مایەی سەرسامییە بەتایبەتی کاتێك ژنێك لە حەرەمدا لەگەڵ کەسێکی دیکەدا دەبێ، نەك تەنیا لەلایەن مێردەکەی و خەسیوەکانەوە چاودێری دەکرێ ، بەڵکو هەتا لەلایەن هاوەڵەکانیشی، کە

هەموویان دژین، تەنانەت لە لایەن کۆیلەکانیشی کە ئێرەیی بەسەردارەکانیان دەبەن و سووتاون بۆ شوێنگرتنەوەیان، هەموو شتێکی شیاو دەکەن بۆ ئەوەی پێی بگەن، چاودێریی دەکرێن.

تورکیا سەبارەت بەم ژوانانە تایبەتمەندێتیی سەرنجڕاکێشی هەیە و بەگشتی زۆر ناسراون و نابنە مایەی گومان لێ کردن. ژنگەلێك هەیە ماوەی دە یان دوانزە ساڵێك درێژە بەم چەشنە سەرەڕۆییە عاشقانەیە دەدەن، بەبێ ئەوەی مێردەکانیان پێی بزانێ لەگەڵ کێ مامەڵە دەکەن، لەکاتێکدا ژنان بە بچووکترین هەنگاوهەڵگرتنەکانی پیاوان شارەزان و هەر شتێك پەیوەندی بەوانەوە هەبێ پێی شارەزان. ئەوە دەگمەن نییە، کە ژنان بە پێویستییەکانیان ڕابگەن و ئەو جووانەی، کە دەلاڵی گەیاندنی دیارییەکانن خاوەنی دیارییەکە ناناسن، چونکە هەرگیز ژنان متمانەی تەواویان پێیان نییە. دواجار هەڵبەت ژنانێکیش هەن کە تا ماوەیەکی زۆر لەدوای ڕاوەستانی پەیوەندیی گەرموگووڕییان کەچی لەڕێگەی شاراوە و کەسی دەست پێڕانەگەیشتوو، هێشتا هەر دیاریی بۆ دۆستەکەیان دەنێرن.

جگە لەو هۆزە نیشتەجێیانەی کە لە پێشدا باسم کردن، کۆچەری دیکەی کورد هەن کە دەتوانین ئەوانیش دابەشی سەر دوو چین بکەین. ئەوانەی کە تەنیا بەشێکی ساڵ لەناو ڕەشماڵدا دەژین و ئەوانەی کە هەمیشە کۆچەرن. ئەوانەی یەکەم بەشێوەیەکی ئاسایی بریتین لە دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە لەوەڕی پێویستیان بۆ تێرکردنی ئاژەڵەکانیان تێدا نییە، کە ئەمە هاوکات لەگەڵ زەوقی ژیانی کۆچەرییان ڕێك دێتەوە، کە بڕیار دەدەن ماڵەکانیان جیبهێڵن و ماوەی حەوت تا هەشت مانگی ساڵ، کە لەو ماوەیەدا ئێستگەی وەستانیان دەگۆڕن، بە وەسپکردن و دیاریکردنی بازنەیەك لەچەند شوێنێك کە بەوە کۆتایی دێت دەیانگەڕێنێتەوە شوێنی خۆیان. وەك چۆن شێوازی ڕەشماڵ

هەڵدانیان و ژیانیان هەمانشێوەی کۆچەرییە ڕاستەقینەکانە، بیروڕایەك لەبارەی ئەم کوچ و بارە دەدەم کە بەگوێرەی من بریتییە لە شانۆیەکی هەرە نایاب. ڕاستیەکەی ئێمە ناتوانین شەکەت ببین لەوەی پەسنی ئەوە بکەین، کە ئەو کۆچەرانە بە چ ئاسانییەك بەیەکەوە هەوارەکانیان دەگۆڕن، بەبێ ئەوەی بپەشۆکێن بە چەندایەتیی گەورەی زۆری قاپ وقاچاخ و ئاژەڵ، کە بۆ ئەوان پێویستە، بەخێراییەوە بەشوێنیانەوە دەچن. یەکێك لەو خێزانانە بەشێوەیەکی ئاسایی پێك دێت لە دوانزە کەس ، پیاو، ژن، منداڵ و خرمەتکار. ڕەشماڵەکانیان لە چنراوی ئەستووری خوری رەش کە دەستکردی خۆیانە پێك دێت و بە چەند ئەستوندێکی چەقێنراو لەسەر زەوی بەبێ هیچ شێوازێکی کەڵەگیی ڕەشماڵەکان ڕادەگیرێن. باوك، کە سەرۆکی خێزانە هەرگیز ناچێتە دەرەوە، کوڕەکان، ڕەبەن بن یان ژندار، تەواو سازو ئامادەن و چەکدارن، بەردەوام بە کاروبارەکان ڕادەگەن و دەست دەکەن بە ڕاو و شکار کە چەند حەوتوو یان چەند مانگی ڕەبەق لە ماڵ دوور دەکەونەوە، کاتێکیش دەگەڕێنەوە، جگە لە جگەرەکێشان، قاوە خواردنەوە، خواردن و نووستن، هیچی تر ناکەن. ڕەشماڵەکانیان دابەش دەبێ بەسەر چوار بەش: بەشی یەکەمیان بۆ خێزانە و لەوانی تر جیادەکرێتەوە بە پەرژینێکی بچووکی لە قامیش چنراو بە بەرزی سێ پێ، ئەم پەرژینە "چیغ" ڕەنگێکی سەوزی تێری هەیە و نیوانی قامیشەکان هێندە سفت نییە کە ڕێگە لە تێپەڕبوونی هەوا بە نیوانیاندا بگرێت کە ئەمە وادەکات ئەم بەشە زۆر فێنك بێت. لەسەر زەوییەکە فەرشێك ڕادەخرێت و ئەم شوێنە لەیەك کاتدا هەم دیوەخانی ڕەشماڵە و هەم هۆڵی نان خواردن و ژووری نووستنیشە، چونکە بەشێوەیەك وەك فارسەکانی چینی خوارەوە، کوردەکانیش هەموویان لەیەك ژووردا دەخەون. باوك، دایك، کوڕ، کچ، زاوا، بووك و منداڵی نەوەکان، هەموویان پێکەوە بەیەکەوە لە هەمان

شوێندا دەخەون، دابو نەریتێك کە لە جۆرجیاشدا بینیم هەبوو. بەشی دووەمی ڕەشماڵ تەرخانکراوە بۆ ئەسپەکان و ئەو مەیتەرانەی کە مشووریان دەخۆن. بەشی سێیەمیان کە لە هەموویان گەورترە هی ئەو ئاژەڵانەن کە نابرێن بۆ لەورگە و ئەوانەی کە هەموو ئێواران لەناو ڕەشماڵ دەمێننەوە، وەکو مانگا، مەڕ و بەرخەکانیان هەروا ماین و جوانووەکانیان. بەشی چوارەم و دوایین بەشی ڕەشماڵ بۆ ناندین و گەرماو و هەموو ئەوشتانەی کە پێوەندییان بە ماڵدارییەوە هەیە تەرخان کراوە. ژنان کار دەکەن و یەکبینە سەرقاڵن، زۆر کارامە و زۆریش پاک و خاوینن ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ پیسوپۆخڵیی کەسەکانی هەردوو ڕەگەز، کە لەناو شار و ئاواییەکاندا دەژین. کاتێك ژنەکان هەموو کاری ماڵەوە دەکەن، کاری فرەچەشنەی خوریچنین دەکەن، بە تایبەت دروستکردنی پشتێنەیەکی گەورە کە لەسەرانسەری ئێراندا دەفرۆشرێت. چەند پارچەیەکی پێکەوەدەنێن بۆ ئەوەی مافوورێکی هاوبەشی لێ دروست بکەن بۆ بەکار هێنانی لەلایەن چینەکانی خوارەوەی گەل .

جلوبەرگی ژنانی کۆچەر لە جلوبەرگی ژنانی شارنشین جیاوازە. ژنانی کۆچەر کراسێکی درێژ لەبەر دەکەن کە لەسەرەوەدا کراوەیە، بە کەمەربەندگەلێکی سپی ڕادەگیرێن، کە کۆتایی گرێیەکانی لەبەردەمدا شۆڕدەبنەوە. ژنانی کۆچەر چارشێوێکی سپی لۆکەیی لەسەر دەکەن کە لە هەردوو لاوە بەسەر دەموچاویاندا شۆڕ دەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی کەمەریان، ئەم چارشێوانە بەجۆرێك لە کڵاوپێچی ئاوریشمینی قاوەییەوە توندکراون بە تەوێڵیانەوە چەسپ دەبێ. ئەوانە ژنگەلێکی کۆچەریی باڵا بەرزن، بەهێز و زۆر جوان، هەرچەندە لەبەر ئەوەی هەمیشە لەبەر خۆرەتاودان، کەمێك ئەسمەرن. ژنگەلێکی نەرم و نیانن، وێرای برێك ئاخاوتنی زبر کە لەیەکەم دیداردا بەدیاردەکەوێ، بەڵام زوو ون دەبێ بەتایبەت کاتێك چەند بەخششێکی

چوکیان پێ بدەیت. لەگەڵ دیارییەك، ئێمە هەمیشە دڵنیاین لەوەی نەرم و ـیانیان بکەین و لە هەموو جۆرە خزمەتگوزاریەکیان بەهرەمەند ببین .

خێزانێکی کۆچەر هەرگیز بەتاقی تەنیا کۆچ ناکات، بیست خێزانێك، کەمتر یان زیاتر، بەگوێرەی پەیوەندییەکانی خزمایەتی یان ناسیاوی کە نێوانیاندا هەیە کۆدەبنەوە بۆ ئەم ئامانج و ئەم شوێنانە دیاری بکەن کە باشترین لەوەڕگا و سەرچاوەی ئاویان هەیە. ڕەشماڵی هەر خێزانێك بە چەند قامەتێك[1] لەیەکترییەوە دوورن. ئەوان لەوێ، تا لەوەڕی لێ دەمێنێ، دەمێننەوە، دوای ئەوە پاشان بارگە و بنەی خۆیان دەپێچنەوە و دەڕۆن بۆ دەڤەرێکی دیکە کە سەرچاوەی دیکەی نوێیان پێ بدات. لە زستانان ئەم هۆزە کۆچەرانە بەرەو ڕۆژهەڵات نزیك دەبنەوە و لە مانگەکانی کانوونی یەکەم، کانوونی دووەم و شوبات، تا نزیکی قوم و زۆربەی جاریش تا ئیسفەهان دەڕۆن .

مێگەل هەمیشە بەشوێن خێزانە کۆچەرەکانەوەیە، ئەم مێگەلانە لە لایەن خزمەتکارانێکی زۆر کلۆڵەوە ڕایی دەکرێن. ئەم بەدبەختانە کەشوهەوا هەرچونێك بێ و لە هەموو وەرزەکاندا هەرگیز کێڵگەکان جێناهێڵن، هەموو هەشت یان پانزە ڕۆژ جارێك خۆراک وەردەگرن، کە بریتییە لە پارچەیەک کولێرە و پەنیری بزن، کە لە پێستەی خۆشەکراوی کاریلەی دەخەن و لە پشتی خۆیانی دەبەستن. ئەمانە بە کلۆڵی دەژین. بۆ خۆپاراستن لە سەرما و گەرما، جگە لە جلوبەرگە شڕ و پەرپووتەکانیان، فەرەنجییەکی درێژ دەپۆشن کە زۆر لە جلوبەرگی قەشە کاسۆلیکەکان دەچێ .

کاتێك کۆچەرەکان لەوەڕگاکانیان دەگۆڕن و تەنیا لە جێگەی دوور لەوەڕگایان دەست دەکەوێ، گوند بە گوند دەکەن، بەڵام بێ ئەوەی

---

[1] قامەت toise :پێوانەیەکە درێژییەکەی نزیکەی شەش پێ دەبێت (وەرگێڕ).

لەگوندەکان لەناو ماڵەکاندا بمێننەوە، بەپێچەوانەوە سەد هەنگاوێك خۆیان لە گوند دوور دەگرن. بە هۆڕ و خورجین و وشترەکانیان دیوارێکی بازنەیی دروست دەکەن و لەناوەڕاستیدا شەو دەکەنەوە و مەڕوماڵاتەکانیان کە تا ئێوارە ئالیکیان خواردووە لەوێدا گل دەدەنەوە. دانیشتوانی گوندنشینەکان کە لە هەموو شوێنێك زۆر میواندۆستن، هەندێك شتیان پێ دەدەن. ئەوانە بەدبەخت نین، چونکە لە هەموو لایەکەوە بەچاوێکی باش پێشوازیان لێ دەکەن. فارسەکان کە بە هاوشێوەیی لەگەڵ ڕەنگی رەشماڵەکانیان ناویان ناون (قەرە چادر-kara Chadera) (noires tentés) (ڕەشماڵ) دوور لە دوورکەوتنەوەیان، ئەوان خۆشنوودن کاتێك کۆچەرەکان دێنەوە ناو پێدەشتەکانیان، کە ئامادەبوونیان خۆشحاڵی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ئەوان هەمیشە ئەوە دەبیننەوە کە لەگەڵ ئەواندا سەودایەکی بەسوود دەکەن لە کڕین و فرۆشتنی مانگا و مەڕەکانیان وەك ئەوەی لە مەیدان یان ئەو بازاڕانەی کە بۆ ئەم جۆرە بارزرگانییە دانراون .



سەفەرنامەی دووەم

# جۆن مەکدۆناڵد کینیێر

# سەفەرنامەی جۆن مەکدۆناڵد کینیێر بۆ کوردستان

# ساڵی ١٨١٤



سێر جۆن مەکدۆناڵد کینیێر

(کارندەن، ١٧٨٢/٢/٣- تەبریز ١٨٣٠/٦/١١)

## سێر جۆن ماكدۆناڵد كینیێر كێیە؟

سێر جۆن ماكدۆناڵد كینیێر (كارندەن، ١٧٨٢/٢/٣- تەبرێز ١٨٣٠/٦/١١)، لیۆتینان-كۆلۆنێل، گەڕۆگ، جوگرافیناس و دیپلۆمات، كوڕی جۆن مەكدۆناڵدی چاودێری گوومرگ و خاتوو سیسیلیا ماریا كینیێر بوو. ساڵی ١٨٠٢ كاندیدا بووە بۆ قوتابخانەی سەربازیی ئەفسەرایەتی لەلایەن سێر ولیام پێنزلی‌یەوە و تا مردنی هەر بە ناوی مەكدۆناڵد لەناو ڕیزەكانی سوپای هیندی‌دا ماوەتەوە. ١٨٠٤/٩/٢١ بوو بە ئاڵاهەڵگر لە سوپای پیادەی مەدرەس*. ساڵی ١٨٠٧ بوو بە لیۆتینان (مولازیم) و پاشان لە ٢٤ ی نیسانی ساڵی ١٨١٨ بوو بە كۆلۆنێل و وەزیری ئۆفیسی سەركردایەتیی لە مالابار و كانارا. لە ساڵانی ١٨٠٨-١٨٠٩ لەگەڵ مسیۆنی سێر جۆن ماڵكۆڵم (١٧٦٩-١٨٣٣)[1] چووە بۆ ئێران و دوایی بۆ ماوەیەكی كورت لە (بووشەهر) كاری كردووە (١٨١٠) و چەندین سەفەری بەناو ئێران‌دا كردووە و لیستی گەڕان و گەشتەكانی لە پاشكۆی ئەم كتێبە بڵاوكراونەتەوە. دواتر ساڵی ١٨١٠ لە ڕێی بەغداوە چووەتە مووسڵ و دیاربەكر و ئیستەنبووڵ و سەردانی ماگنیزیا و پیرگام و سیمیرنای كردووە و لە ڕێی ئەسپانیا و پورتوگالیشەوە چووەتەوە بۆ ئینگلستان. دوای گەڕانەوەی بۆ

---

* Madres infantry

(1) Major-General Sir John Malcolm

ماوەی چەند ساڵێك سەرۆكی شارۆچكەی سانت جۆرج بووە. ماوەیەكی كەم دوای گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا بەشێوەیەكی چاوەڕواننەكراو فەرمانی پێ كراوە پەیوەندی بە كەتیبەكەیەوە بكات و لە كانوونی دووەمی ساڵی ١٨١٣ لەگەڵ سێر كامبل (١٧٧٦-١٨٢٧) چوونەتە ستۆكهۆڵم بۆ ئەوەی لەرێگەی ڕووسیا و وڵاتی ئێران بگەنە هیندوستان، بەڵام دواتر بە پۆڵەندا و پاشان لەرێگەی نەمسا و هەنگاریا چووەتە كۆنستانتینۆپل. دوایی لەرێگەی ئاسیای بچووك و قوبرس دیسان دەگەڕێتەوە بۆ كۆنستانتینۆپل و دوای ئەوە لێرەوە لەرێگەی ئەرمێنیا و كوردستان و بەغدا دەچێتە بۆمبای و ئەم كتێبەی بەرهەمی ئەم گەشتەیەتی (١٨١٣-١٨١٤) كە چەند ساڵ دوای گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا لە ساڵی (١٨١٨) لە لەندەن بڵاوكرایەوە. كینیێر لەم سەفەرنامەیەیدا، كە ئێمە ئێستە كردوومانە بە كوردی، مەبەستی بووە دوای كاروانی (دە هەزار كەسەكە)ی سەركردەی یۆنانی زەینەفۆن بكەوێ و شوێنپێ و جوگرافیای كاروانەكە بە وردی دیاری بكا. ئەم سەفەرە كە ساڵی ١٨١٤ بۆ كوردستان كراوە و ساڵی ١٨١٨ لە لەندەن بە بەرگێگ بە ناوی (سەفەر بەناو ئاسیای بچووك، ئەرمەنستان و كوردستان لە ساڵانی ١٨١٣-١٨١٤دا)[١] چاپكراوە. هەر هەمان ساڵ سەفەرنامەكە كراوە بە فەرەنسایی و بە دوو بەرگ لە پاریس بڵاوكراوەتەوە[٢] و خۆشبەختانە وا دوای

---

(1) John Macdonald Kinneir, *Journey through Asia Minor, Armenia, and Koordistan, in the years 1813 and 1814 ; with remarks on the marches of Alexander and retreat of the Ten Thousand*. London : John Murray, 1818, 1 vol. (XII-603 p.)

(2) John Macdonald Kinneir, *Voyage dans l'Asie Mineure, l'Arménie et le Kourdistân, dans les années 1813 et 1814, suivi de remarques sur les marches d'Alexandre et la retraite des Dix* Mille[2]. Traduit de l'anglais par N. Perrin, imprimerie de J. Smith , Paris : Gide fils, 1818, 2 vol. (429, 403 p.).

دوو سەدە زیاتر ئەم سەفەرنامەیە بە زمانی کوردی بڵاودەبێتەوە. کینێر ساڵی ١٨٢٣ پۆستێکی بەرزی لە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتیی هیندی وەرگرتووە و ساڵی ١٨٢٤ گوستراوەتەوە بۆ ئێران و لە تاران نیشتەجێ بووە. لە سێپتامبەری ١٨٢٦ لە سەروبەندی جەنگی ڕووسیا-ئێران ١٨٢٦-١٨٢٨ گەیشتە ئۆردووی فەتعەلی شا و ئێران داوای کۆمەگی بەریتانیای دەکرد بەگوێرەی پەیماننامەی تاران، کە ئەگەر هێزێکی ئەوروپایی پەلاماری ئێران بدات ئەوا بەریتانیا پێویستە لە پشت ئێران بوەستێ. کینێر لەگەڵ سوپای ئێران بەردەوام بوو تا کەوتنی قەڵای یەریڤان لە ١٩ ی تشرینی یەکەمی ١٨٢٧ کاتێك سەربازانی ئیڤان پاسکیڤتیش Ivan Paskevitch شارەکەیان داگیر کرد. کەتیبەیەکی ڕووسی بە ئاڕاستەی تەبریز هاتن و سەرۆك وەزیرانی ئێران، عەلی یار خان ئەسەف ئەلدولە ڕای کرد بۆ عەلی بەنجەلو لای کینێر، کە هەوڵی ئاشتەوایی دەدا و ڕووسەکان لەسەر نێوانگیریی کینێر ڕازی بوون و لە (٢٣ی شوباتی ١٨٢٨) پەیماننامەی تورکمانچای Turkmanchai مۆرکرا، ڕاستییەکەی ئەم پەیماننامەیە زیانێکی گەورەی بۆ ئێران بوو و لە هەمان کاتیشدا کۆتایی نفووزی شاندی بەریتانیایی بوو، کە لە پێشوو لە ئێراندا هەیبوو. شایانی گوتنە کینێر هەر لە ئێراندا مایەوە و وەك بالیۆزی وڵاتەکەی و لە ١٧ ی تشرینی دووەمی ١٨٢٩ ویسامی خورشید و شێری ئێرانی وەرگرت و تا ڕۆژی ١٨٣٠/٦/١١ لە تەمەنی چل و هەشت ساڵی لە تەبرێز کۆچی‌دوایی کردوو و شای ئێران ماوەی سێ مانگ پرسەی بۆ دانا .

**بەرهەمەکانی:**

- A geographical memoir of the Persian Empire, 1813, (VIII, 486 p).
- Narrative of Travels in Asia Minor, Armenia, and Kurdistan in 1813–14, with Remarks on the Marches of Alexander the Great and of the Ten Thousand Greeks (Londres, 1818).

# پێشەکی نووسەر

بە پێشکەشکردنی ئەم کتێبە پەرشوبڵاوەی سەفەرەکەم بۆ خوێنەر، تاقە ئامانجم ئەوەیە ئەوەندەی لە توانای مندا بێت بەشدارییێك بێ لە زیادکردنی زانیاریی گشتیی جوگرافیایی و هیواداریشم کە لێکدانەوەی سەفەرنامەی گەڕانەکانم تەواو بێ سوود نەبێ.

لە سەرەتای ساڵی ١٨١٣ بە هاوەڵی لەگەڵ سێر نیل Sir Neil (کە ئەوکات کۆلۆنێل بوو) کامبل Campbell، لە هارویچ[١] Harwich ەوە دەرچووم بۆ گۆتینبیرگ[٢] Gottenburg بە ئامانجی چوونم بۆ کۆنستانتینۆپل لەڕێگەی سوێد و ڕووسیاوە، بەڵام پاشەکشەی کارەستاباری ناپلیۆن، کە لە هەمان ئەو کاتەدا بوو لە مۆسکۆ، بوو بەسۆنگەی ئەوەی ڕێگەیەکی زۆر ڕاستەوخۆتری بۆ کردمەوە و خۆم گەیاندە بارەگەی گشتیی خاوەندشکۆ ئیمپراتۆر ئەلیکساندەر، کە لەو کاتەدا سەرقاڵی ڕەدووونانی فەرەنسییەکان بوو، کاتێك لە درێسد[٣]

---

[١] هارویچ Harwich: شارێکە لە ئینگلستان لە هەرێمی تانرینگ لە ئێسێکس (وەرگێڕ).

[٢] گۆتینبیرگ Gottenbourg: (بە سوێدی Göteborg) شارێکە لە سوێد کەوتۆتە هەرێمی فاستەرگوتلاند لەسەر کەناری ڕۆژئاوای سوێد و دوای ستۆکهۆڵم دووەم گەورەترین شاری سوێدە و گەورەترین بەندەری وڵاتەکەی لێیە (وەرگێڕ).

[٣] درێسد Dresde : (بە ئەڵمانی Dresden) پایتەختی ویلایەتی ساکسۆنیایە لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا (وەرگێڕ).

Dresdeەوە دەرچووم، بەرەو تورکیا لە ڕێگەی نەمساوە درێژەم بە سەفەرەکەم دا.

کاتێك ئینگلستانم بەجێهێشت نیازم وابوو سەردانی هەموو ئەو وڵاتانە بکەم کە دەشێ لەوێوە سوپایەکی ئەوروپایی بتوانێ هێرش بکات بۆ چوونەناو هیندوستان. بەگوێرەی بەدواداچوونی ئەم نەخشەیەم دەبوو من بەشە باکوورییە ڕۆژهەڵاتییەکانی وڵاتی ئێران و ئەو پێدەشتە بەرفراوانە تەی بکەم، کە تا ئەودیو ڕووباری ئۆکیوس Oxus بەئاڕاستەی کەوشەنەکانی ئیمپڕاتۆریای ڕووسیا درێژ دەبێتەوە، بەڵام چەند هێرشێکی چەندبارەبووی جاڕسیی مەترسیدار و بانگ کردنەوەم بۆ مەدراس، لەکاتێکدا گەیشتن، کە هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد، ئەوە وای کرد دەستبەرداری پرۆژەکەم ببم. کتێبی زووبڵاوبووەی بەڕێز ماونت-ستیوارت-ئەلیفیستۆن*، کە پڕییە لە بەڵگەنامەی ڕەسەن و زۆر بەنرخ لەبارەی کابوول و بەشی باکووریی- ڕۆژئاوای سنوورەکەمان، بەڵام بێگومان باشتر وابوو ئەگەر بڕێك زانیاری لەبارەی ڕەوشی ئێستەی ئەم ناوچە بەرفراوانە پڕ لە دانیشتوانەش هەبێ. ئیمپڕاتۆریایەکی وەك ئیمپڕاتۆیای بوخارا، کە بە حوکمی شوێنەکەی، دەکرێ وەك بەربەستێك دژ بە دەستدرێژییەکانی ڕووسیا بۆسەر خاکی ئێمە لە ڕۆژهەڵات حسێب بکرێ.

ئەم نووسراوە دوای گەڕانەوەم بۆ مەدراس Madras کۆتایی هات و لەکاتی زۆری دەست بەتاڵیی، کە لە ئەرکە ڕەسمییەکانم بۆم مابۆوە بۆ ئەم کارەم تەرخان کرد. بێگومان زۆر تەواوتر دەبوو، کە ئەگەر ژمارەیەك تێبینی گەلی پڕ بایەخ هەبوو، کە چەتەکان لەگەڵ جانتاکەم لە کەنداوی فارسی لێیان دزیم، ون نەبووایە. من ڕۆژانەی ئۆرگینالی ڕێگەکانم پاراست بوو، وەك ئەوەی

* M. Mount -Stewart-Elphinstone

زۆر سادەبوون، لە هەمان کاتدا بیرۆکەیەکی دروستیشیان لەبارەی دابونەریتی خەڵکەکە و ڕێگەکانی سەفەرکردنیان لەم بەشەی جیهان نیشان دەدا.

من منەتباری بەڕێز ئارۆسمیس*م بۆ نمایشی نەخشەکانی و وێنەی گشتیی نەخشەکە، هەروەها منەتباریمە بۆ هەموو ئەو بەشانەی کە من بۆخۆم سەردانم نەکردبوون و هیچ هاوڕێیەکیشمان سەردانی نەکردبوون و بۆ ئەوە دەرفەت دەقۆزمەوە زۆر بە پەرۆشانە گوزارشتی خۆم بۆ ئەو جوگرافیناسە پڕشنگدارە دەرببڕم، بۆ ئەو کۆمەگەی کە نەدەژمێردرێ و نە لە ژمارە نایەت و پێشکەشی کردم. ئەو وەسپانەی کە لەناو ڕۆژانەی سەفەرەکەمدا ئاماژەیان بۆ کراوە، لە بەڵگەنامەیەکی دەستخەت وەرگیراوە، کە لەبەر دەستمە و هەروەها ئەو تێبینییە گەردووناسیانەی، کە من و بەڕێز چاڤاس دەماننووسی و ڕاست دەکرایەوە و دووبارە بەگوێرەی ئەو دوورابیانەی دەبردران دەنووسرانەوە، وەرگیراوە. من بە بەردەوامی هەموو ڕۆژێك ئەو ڕێگەبڕینانەم لەناو دەفتەرێکدا تۆمار دەکرد، ئەم کارە (سەرەتا لەلایەن من و دواتر لە لایەن هاوسەفەرە بەدبەختەکەم بەڕێز چاڤاس تۆمار دەکرا). ئێمە ئاماژەمان بە ئاڕاستە جیاوازەکانی ڕێگەکان کردووە، ڕەوشی ئاوابیەکان، ڕێڕەوی ڕووبار و چیاکان، ئاراستە و مەسافەی تایبەتمەندێتیە سرووشتیەکانی ئەو وڵاتەی کە پێیدا تێپەڕ دەبووین تۆمارمان کردووە. بەشی ڕۆژهەڵاتی نەخشەکە لەو بەشەی بیرەوەرییەکانم وەرگیراوە کە لە وڵاتی ئێران ساڵی ١٨١٣ نووسیم، بەڵام لێرەدا بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی کە لە گەشتی کۆتاییم کۆمکردنەوە ژمارەیەك گۆڕینکاری و ڕاستکردنەوەم تێدا کردووە کە پێم وابوو پێویست بووبن. ئەو ڕێگانەی کە هاوڕێکانم گرتوویانەتە بەر بە ڕەنگی شین نیشانە کراون و ئەوانەی کە من گرتوومنەتە بەر لەم دەرفەتە و هەروەها ئەوەی، کە لە گەشتیی یەکەم کاتێك لەگەڵ جەنەڕاڵ جۆن ماڵکۆلم

* M. Arrowsmith

بووم لەکاتی شاندەکەی بۆ وڵاتی ئێران گرتوومانەتە بەر بەڕەنگی سوور نیشانەکراون. ئەم ڕێگەیانە مەسافەیەکی گەورەیان لەسەر نەخشە دەگرت، بەڵکو دەڵێم زۆربەیان بەناوچەگەلێکدا دەڕۆیشتن، کە هیچ ئەوروپاییەك هەرگیز لەوەتای ئەسکەندەری گەورەوە پێی پیا نەنابوو.

هێلەکانی پانایی latitudes (مەودای جوگرافیایی) ئەنگۆرە Angora، ئۆفیوم Afioum ، قەرە-حەسار Kara - Hissar، یوشکات Yousgât، سێسیار Césarée، ئیکۆنیوم Iconium ، ئەدەنە Adana و ئەنتیۆش Antioche لەسەر تێبینییە تایبەتییەکانی هێلی درێژیی من دیاری کراون، کە بە تەواوەتی لەگەڵ دوورایی ڕێگەکە هاوجووت بوون، هەرچی تایبەت بوو بە هێلی درێژیی نەمتوانی بە وردی دەستنیشانی بکەم، بۆیە پشتم بەوە بەست کە بەڕێز ئارۆسمیت لەسەر زانیارییە تایبەتییەکانی من ڕاستی دەکردنەوە.

شوێنی کۆستامۆبۆل Costamboul بەگوێرەی زنجیرەیەك بەرزایی لەسەر هێلی باشووریی وەرگیراو بوون و هێلی پانایی latitude دەستنیشان کرا. من هەموو کۆششێکی خۆم کرد بۆ دەستنیشانکردنی هێلی درێژیی longitude جوگرافیایی بەگوێرەی تێبینیکردنی زەمەنەکان بەڵام ئەو جیاوازییە زۆرەی کە لە کاتژمێری زەریایی هەبوو، ئەو هۆیە بوو کە دەشیا تا ئەو ڕادەیە متمانەیەکی زۆر کەم بەو ئەنجامانە بدەن کە بەدەست دەهاتن. پاشان کێومالْکردنی کەناراوەکانی زەریای ڕەش لە سامسۆنەوە بۆ تەرابزۆندە بە وردییەکی گەورە بە کۆمەگی بەرێز چاقاس دیاری کراو و پاشان پێوانە گرتن و بەراوردکارییەکان، کە لە ڕێگەی ئەو تێبینییە ئاسترۆنۆمیکیانە دیاری کران، کە لە تریپۆلی (تەرابلووسی ڕۆژئاوا) Tereboli و ئۆنییە Ouniehr و تەرابزۆندە Trébizonde کۆکرابوونەوە، کە ڕێگەی پێ داین هێلی ڕێگەکەمان لە تەرابزۆنەوە تا مێردین بکێشین. پاشان هێلی پانایی بابیۆت Beïbout و

ئەرزەرۆم Arz-roum ، لیزە Lyse و بتلیس Betlis و مێردین Merdyn بە بڕێك وردەكاری قەبووڵكراو دەستنیشان كران. لەم دوا سەفەرەمان نەك تەنیا لە بوارێكی بەرفراوان ئاوەرۆ سەرەكییەكانی ئەو ڕووبارانەمان دەست نیشان كرد، كە بەشداربوون لە دروستكردنی ڕووباری دیجلە و فورات، بەڵكوو هەتا گۆڵی نزۆك و چەلۆشمان دۆزییەوە، كە هیچ نووسەرێك پێشتر باسی نەكردبوو. دواتر ئاوەرۆكانی (وان) مان بە وردی وەسف كرد، كە تاڕادەیەک گومانمان لە هەبوونی هەبوو، پاشان بەشوێن شوێنپێی ناوچەكەدا چووین، كە لە مووسڵەوە تا بەغدا درێژدەبۆوە. ئاماژە بە كەلاوەكان كراوە، كە دەكەونە سەر سنوورەكان و بەوردییەكی لەرادەبەدەر ناوە كۆنەكانم پاراستووە، چونكە زۆریان لەڕێڕەوی گەشتەكەمدا هاتوون و هەوڵی زۆرم داوە بۆ ڕوونكردنەوەیان. بەگوێرەی مێژوونووسانی دەورانی كۆن، لەشكركێشییەكانی زەینەفۆن، ئەسكەندەر (تا سنووری ئەو نەخشەیەی كە قەبووڵكراوە) و جۆلیان و هیراكلوس (هەرقەڵ)، هەتا بارستی نەخشەكە ڕێگەی دابێت.

یەكەم لەشكركێشیان دەكرێ بە وردییەكی دیاریكراوەوە بەشوێنی بچین، بەڵام بەدواداچوونی كاروانە دووردرێژو هەمەچەشنەكانی هەرقەل هەروەها تا دواڕادە سەخت بوو و بە سەختییەكی زۆر وێنەیان كێشرا. بۆ ئەوەی ئەم دەرفەتە بقۆزمەوە بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە ڕێز و پێزانینم بۆ هاوڕێم میستەر ڕیچ M. Rich، جێنشینی ئینگلیز لە بەغدا و دكتۆر هاین، یەكەم هاریكاری ئەو دەردەبڕم، هەروەها بۆ بەڕێز كۆلكهوون (كوهوون) M. Colquhoun ، موقیمی ئێستەی ئینگلیز لە بەسرە، بۆ تێبینیی و پەیوەندیگرتنەكانی دەردەبڕم، بۆ لۆتینان سواتسۆن، لە دامەزراوەی مەدراس بۆ ڕاوێژی لەسەر دروستكردنی نەخشەكە، بۆ ڕۆبەرت ئەندرسۆن Robert Anderson، فەرمانبەری مەدەنی لە مەدراس، بۆ ژ.كروفۆرد J. Crawford ، كە ئەركی پێداچوونەوەی كارەكەی گرتە ئەستۆی خۆی.

JOURNEY

THROUGH

# ASIA MINOR, ARMENIA,

AND

# KOORDISTAN,

IN THE YEARS 1813 AND 1814;

WITH REMARKS ON THE

MARCHES OF ALEXANDER,

AND RETREAT OF

THE TEN THOUSAND.

BY

JOHN MACDONALD KINNEIR,

CAPTAIN IN THE SERVICE OF THE HONOURABLE EAST INDIA COMPANY;
TOWN MAJOR OF FORT ST. GEORGE;
AND POLITICAL AGENT AT THE DURBAR OF HIS HIGHNESS
THE NABOB OF THE CARNATIC.

LONDON:
JOHN MURRAY, ALBEMARLE-STREET.
1818.

بەرگی چاپی ئینگلیزیی سەرفەرنامەکە

لەندەن-١٨١٨

# VOYAGE

DANS

## L'ASIE MINEURE, L'ARMÉNIE

ET

## LE KOURDISTÂN,

DANS LES ANNÉES 1813 ET 1814;

Suivi de remarques sur les Marches d'Alexandre, et la Retraite des Dix-Mille,

PAR JOHN MACDONALD KINNEIR,

Capitaine au service de l'honorable Compagnie des Indes, major de place au fort Saint-George, et agent diplomatique auprès du Dorbar de sa hautesse le Nabâb du Carnatic.

TRADUIT DE L'ANGLAIS,

PAR N. PERRIN.

AVEC UNE GRANDE CARTE.

TOME PREMIER.



PARIS,
LIBRAIRIE DE GIDE FILS,
RUE SAINT-MARC-FEYDEAU, N.° 20.

1818.

بەرگی چاپی فەرەنسیی سەفەرنامەکە

پاریس- 1818

# وەسپی پاشالقی ئەرزەڕۆم،
# گەیشتن بە بتلیس

پاشالقی ئەرزەڕۆم* یەکێك لە پان و پۆڕترین و گرینگترین پاشالقەکانی ئیمپراتۆریای تورکە، پلەکەی تەنیا لە خوار پاشالیکی میسرە و هاوشانی پاشالیکی بەغدایە، تا سنووری ئێران و جۆرجیا و بەسەر لیزگیس و مێنگریلیدا تێپەڕیوا و تا سنووری خاکی ڕووسیا درێژدەبێتەوە. دەستەڵاتی پاشا بەسەر تەواوی بەگەکانی کوردستاندا لە لای باشوورەوە تا سێرت و لە ڕۆژئاواشەوە تا عەرەبگیر Arabkyr ڕادەگا. ئەحمەد، پاشای ئێستەکەی ئەرزەڕۆم، حاکمی ئیرایلی بوو وەختایەك ڕووسەکان ئەم شوێنەیان داگیرکرد، هەڵسوکەوتی قارەمانانەی کە لەم دەرفەتەدا نووانـدی، شـەرەفی (وەزیـری ئەعزەم)یـان پێبەخشی، بەڵام پاش ئەوەی لە ڕووتچۆك لە لایەن لۆتوسۆفەوە تێكشکا، دیوانەی ئەرزەڕۆم کرا و لەوساوە تا ئێستە هەر لەوێ ماوەتەوە. ئەم پاشایە، پیاوێکی کارامە و توانایە. دانیشتووانەکەی لەسەر ئەوە کۆکن بڵێین: ئەم پادشایە بە حیکمەتەوە حوکمڕانی ئەم هەرێمە دەکا و پیاوێکی مێشك کراوەیە.

ئەرزەڕۆم[1] لە لای نووسەرە بێزەنتییەکان بە ناوی (ئەرز)** ناسراوە، کە

---

* Arz-Roum

پرۆپۆکیوس باسی (ئارزەنە)ی ئەو دیوی (نیمفاکیوس) دەکا.

** Arz

یەكێك لە گەورەترین شارەكانی ئەرمەنستان[1] بووە و كەوتووەتە ناو پێدەشتێكی جوان، لە چوار یا پێنج میلی خوارووی لقی ئەلیجەكی ڕووباری فوڕاتەوەیە. خانووەكانی بچووك و پیسن، هەندێكیان لە بەرد و هەندێكیشیان لە دار و خشتی قوڕین دروستكراون. پەنجەرەكانی لە جیاتیی شووشە بە كاغەز چەسپ كراون. قەڵاكە بە نزیكەیی كەوتووەتە ناو جەرگەی شار(یان ئەوەی ڕەنگە بە شێوەیەكی دروستتر پێی بڵێین گەڕەكەكانی قەراغ شارەكە)، دەوران-دەورەكەكەی سێ یا چوار میلە و دیوارەكانی لە دۆخێكی باشدان، لە دەورانی كۆندا لەسەر شێوازی كۆن و بورجی گۆشەدار دروستكراون، ئەو بەردانەی كە لە دروستكردنی خانووەكاندا بەكارهێنراون، بەردی نایابی ڕەنگ‌خۆڵەمێشین، لە چیاكانی دەوروبەر وەرگیراون. پاشا و زۆربەی بەشی دانیشتووانە توركەكانی شارەكە لەناو شوورەكەدا دەژین، كە چوار دەرگەی هەیە، بەڵام هیچ دەرگەیەكیان شایانی وەسپێكی تایبەتی نییە. وەك دەڵێن: شارەكە لە پازدەهەزار خێزانی موسوڵمان، سێهەزار و حەوتسەد ئەرمەن و سێسەد ئەرمەنی كاتۆلیك[2] و سێسەد و پەنجا گریك پێك دێ. ئەرمەنەكان دوو كڵێسە و یەك ئەسقەفییە و كاتۆلیك و گریكەكانیش هەر یەكەیان یەكێكیان هەیە. شارەكە نزیكەی پەنجا مزگەوت، بیست خان، حەڤدە حەمامی گشتیی لێن. ئولو-جامی Aoula-Djâmy یا مزگەوتی گەورە، دەڵێن ئەوەندە ماڵ لای خوارەوەی هەیە، بۆ

---

[1] ئێمە بە تێپەڕبوون بە زنجیرە چیای بەرزی (قاپ-داغ)دا چووینە ئەرمەنستان. وەسپێكی كورتی ئەم شانشینەم لە (یادداشتنامەكەم لەبارەی ئێرانەوە)دا بەدەستەوە داوە.

[2] هیچ كاتۆلیكێكی ئەرمەن نایەوێ منداڵەكانی خۆی بكوتێ، چونكە پاپا، وەك ئەوەی ئەوان دەڵێن، بە فەرمانێكی پاپایی كتانی بە فەرمانێكی پاپایی قەدەغە كردووە، ئەگەرنا لە كڵێسە دەردەكرێن.

دالّدەدانی سێهەزار کەس دەبێ. لە حالێکدا ئەگەر هەر هێزێکی گەورەی ئەوروپایی دەست بکا بە داگیرکردنی ئێران یا هیندوستان، بێگومان لە ڕۆژهەلاتی کۆنستانتینۆپل بەولاوە هیچ شوێنێك نییە ئەوەندەی پێدەشتی ئەرزەڕۆم باش بێ بۆ کۆکردنەوەی هێزێکی زۆر. ئەسپ و چارەوی تێدا زۆرن و لە بازاڕی گەورە دەتوانرێ ئالیکی بەهارە و هاوینەی لێ بەردەست بخرێ و دەر و ناوچەکانی دەوروبەری ئازووقەیەکی زۆری گەنم بەرهەم دەهێنن. ڕێگەکانی شارەکە، لەم وەرزەی سالّدا نایاب و زۆر ئاسوودەن بۆ گواستنەوەی تۆپخانە لە هەموو لایەکی ولاتدا. خەلّکی ڕەسەنی شارەکە بەشێکی زۆری ژمارەی ئەو گالیسکانەی کە بەکاریاندەهێنن، بە مانگا ڕایاندەکێشن. خەلّکی شارەکە پێوەندییێکی زۆر توندوتۆلّی بازرگانییان لەگەلّ تەواوی شارە گەورەکانی تورکیا و ئێراندا هەیە، بە تایبەتی لەگەلّ کۆنستانتینۆپل، بەغدا و یەریڤان. کەرەستە سەرەکییەکانی هەناردەکردن بریتین لە قوڕقشم و مس، کە لە کانەکانی چیای تۆرۆس بەرهەم دەهێنرێن و هاوردەکراوەکانیش بریتین لە: پەمۆ، برنج، ئاوریشم، شەکر، قاوە و قوماشی ئەوروپایی. ئەرزەڕۆم ماوەی بیستوچوار سەعات لە (ئەرزەنجان) و چل وهەشت سەعات لە (مووش) و سی وشەش سەعاتیش لە (قارس)ەوە دوورە. چەندین سەرنجدانی دووبارەبووی کات و بەرزایی شارەکە، بۆ پانایی ئەم شارە هێلی پانیی ٣٩° (٥٨)° ی باکووری بەدەستەوە داین.

بەشی گەورەی سپێدەی دواتری ئەو بەیانییەی کە گەیشتینە ناو ئەم شارە، بەکارهێنرا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی باشترین شێوازەوە بۆ گرتنەبەری ئەو ڕێگایەی کە تا بەغدا لە بەرمان مابوو. بابەتی سەرەکیی خواستی ئێمە ئەوەبوو بتوانین شوێن ڕێگەی کاروانە (دە هەزار کەسییەکە) بکەوین، وەك چۆن دەمانزانی کوردستان تەنیا دوو ڕێگەی لێیە: یەکەمیان بە (پالۆ Paulo) و

(دیاربەکر)دا و ئەوی دووەمیشیان بە (بتلیس) و (سێرت)دا دەڕوا. ئێمە ئەوەی دووەممان هەڵبژراد، وەك ئەوەی زۆرتر ڕێی تێدەچوو یۆنانییەکان گرتبێتیانە بەر. چ ئەم ڕێگەیە و چ ئەوی دیکەیان -وەك دەڵێن- سیخناخ بوون بە تاڵانچی. بەڵام ئەم هۆیە بە هیچ شێوەیەك ئێمەی ساردنەکردەوە و وەك چۆن ئەسپەکانی ئەرزەڕۆم بەناوبانگن بەوەی کە ئەسپی بەرزبەرزن و توانایان هەیە و شێوەیان جوانە، بۆیە بڕیارم دا سێ یا چواریان بکڕم و دواتر دەرفەت دەقۆزمەوە بۆ ئەوەی هی دیکە لەسەر ڕێگە بەردەست بخەم. سپێدەیەك ژمارەیەکیان بۆ هێناین، بەڵام هیچێکیان ئەوە نەبوو کە ئێمە دەمانویست، گەورە، چالاك، ئەسپی زۆر گونجاو بوون بۆ کاری ئەسپسواری یا بۆ غارغارێن، بەڵام ئەوەندە تایبەت نەبوون بۆ ڕۆیشتنی دوورودرێژ وەك ئەسپەیلی چکۆلەی عەرەبی. لای من هەموو توخمە ئاژەڵەکان لە ئەرزەڕۆم زۆر جوان بوون، مانگا، بزن و هەتا ئەو سەگانەش کە لێرە قەوارەیەکی زۆر گەورەتریان لە هیی هەموو ئەو دەر و وڵاتانەی وا من تا ئێستە سەرم لێ داون، هەیە. ئەو سەگانە بە قەوارە ئەوەندەی گورگ دەبن، تووکێکی زۆر نایابی درێژ جەستەیان دادەپۆشێ، سەرێکی زلیان هەیە و خۆپەسندییەکەیان بێوێنەیە.

سپێدەی ٢٢ی مانگ کاتی دەرچوونمان دیاریکرد، وێڕای گەڕان و سووڕانمان لە بەشێکی ڕۆژەکەدا، کەچی نەمانتوانی تەتەرەکەمان بدۆزینەوە، ئێوارەکەی بە بیانووی چوونە لای پاشا بۆ پاسپۆرتی ئێمە لە شار دەرچووبوو، بەڵام لە جیاتیی ئەوەی ئەرکی خۆی جێبەجێبکا، شەو لەگەڵ برێك لە هاوڕێیەکانی خواردبوویەوە و تا دەمەدەمی سەعات سێی پاشنیوەڕۆ نەگەڕایەوە. سەعات چوار سواری ئەسپەکان بووین و بە بەرزاییەکانی پشتەوەی شاردا دەرچووین. لە پێنجەمین میلدا، دابەزینە ناو دۆڵێك کە پێدەشتێکی جوان لە دەستەچەپمان و زنجیرەچیایەکی بەرز لە دەستی ڕاستمان

ڕو و بەرانبەر بە ئێمە درێژ دەبووەوە. لە حەوتەم میلدا بەناو جۆگەلەئاوێکی بەخوڕدا پەڕینەوە، کە لە باکوور-ڕۆژهەڵاتەوە ڕاستەوخۆ لەودیو ئاواییی (نەددیکوا)*وە هەڵدەقوڵا. لە هەشتەم میلدا گەیشتینە ئاوایییەکی دیکەی چکۆلە، کە تەتەر[1] و سووریچییەکان[2] بە بیانوی ئەوەی بە خۆیاندا ڕاپەرموون بە شەو سەفەر بکەن، ویستیان لێی بوەستن، بەڵام ئێمە بە هیچ شێوەیەك گوێمان بەو پێشنیازە نەدا و پێمان داگرت لەسەر ئەوەی کە درێژە بە ڕۆیشتنەکەمان بدەین. کاتی دەرچوونمان لەم گوندە، دەستمان کرد بە سەرکەوتن بەسەر زنجیرەچیایەکی سەخت کە خوارووی کەنارەکانی لە سۆنگەی بەفر تووانەوەوە ئاوێکی زۆر و بەخوڕی لێوە دەهاتە خوارەوە. چارەگە سەعاتێك پێش خۆرئاوابوون، گەیشتینە لوتکەی چیایەکە، پلەی گەرما °٤٨ی فەهرەنهایت (١١½) بوو. لەوێوە کەمێك دابەزین و دوای ئەوەی درێژەمان دا بە ڕێکردن بەناو ئەم چیایانەدا، بەردەوام بەناو ئاوێکی بەخوڕی تێژڕۆدا دەڕۆیشتین تا نیوەشەو. ڕووناکیی ئەستێرەکان ئێمەی لەوە گەیاند، کە سووریچییەکان ڕێگەیان ون کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر پێیان دادەگرت و ئەوەیان دووپات دەکردەوە، کە ئێمە لەسەر ڕێگەی ڕاست داین. دواجار بە زەحمەتییێکی زۆر توانیمان وایان لێ بکەین بوەستن، تا ئەوەی ڕۆژ دەبێتەوە. ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ترسناکە لەوێ بوەستین، چونکە

---

* Neddykoi

[1] تەتەر Tartar : نامەبەر یان پۆستەچی کە کاریان گەیاندنی پۆستە بوو (وەرگێڕ).

[2] سووریچی sourudjys : ئەو پیاوانەی کە سەرپەرشتیاری ئاژەڵی بارهەڵگر دەکەن لە کاتی سەفەری کارواندا و بەشێوەیەکی گشتی بەکرێ لە بەرانبەر پارەیەکدا ئەو کارە دەکەن (وەرگێڕ).

ئەو شوێنانە پڕن لە دز. سەرماکە سارد و مووچڕکهێن[1] بوو. جۆری زۆنگاوی و شێی زەوییەکە وایانکرد فەرمان بە خزمەتکارەکەم بدەم قاڵییەکان ڕابخا، بەڵام تەتەرەکە کە هێشتا سەرخۆشییەکەی بەری‌نەدابوو، ڕێگەی لە سووریچییەکان گرت باری ئەسپەکان دابگرن، بە شێوەیەك ناچار بووین لەسەر گیای تەڕ ڕابکشێین. ۲۳ی مانگ لەگەڵ خۆرهەڵاتن، تەرمۆمەتر لە (1½) °۳٦ دا بوو، شەختەیەکی سووك زەوییەکەی داپۆشیبوو، خۆمان لە نزیکی سەرچاوەی ڕووبارێك، کە دواتر زانیمان ئاراسە[2]، بینییەوە: سووریچییەکان سەرسەختانە لەسەر ڕای خۆیان لەبارەی ڕێگەکەوە سوور بوون و نەدەهاتنە خوارەوە، بەڵام گۆڕینێکی ئاڕاستەی قیبلەنوماکە ئەوەی فێرکردین کە ئەوان لەسەر هەڵەن و دوای گفتوگۆ، بەڵام بە ئاسانی نا، توانیمان وایان لێ بکەین ئاڕاستەی پێچەوانە بگرینەبەر. ڕۆیشتین بەرەو باشوور بەناو دۆڵێکی بە پیت، بەڵام نەچێنراودا، بە درێژاییی کەناری چەپی ئاراس Araxes، کە داری بی و ڕیزێك دار و

---

[1] لە باسکردنی داگیرکردنی ئەرمینیادا لە لایەن لۆکیۆلوسەوە، پلۆتارك دەڵێ گەنمەشامی لە ناوەڕاستی قرچەی گەرمای هاویندا دەچێندرێ، لە کۆتاییی یەکسانیی شەو و ڕۆژ لە پاییزدا، پلەی گەرما هێندە سارد دەبێ وەك زستانی لێ دێ، تەواوی ناوچەکە دەگرێتەوە -بەگوێرەی ئەم مێژوونووسە- بەفر دەبارێ، ڕووبارەکان دەیبەستن. ناوچەکە چیاییە، توولەڕێگەکان تەسك و تەنگەبەرن و لە کاتی شەواندا، سوپا ناچار بووە لە چەندین شوێنی زۆنگاودا، کە بەفری لێ توابێتەوە، خیوەت هەڵبدا.

[2] سترابۆن Strabon ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە فورات و ئاراس دوای هەڵڕژانیان لە چیای عەبباسەوە، یەکێکیان بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا و ئەوی دیکەشیان بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوا. ئەمەی دوایی کە بەرەو ئاترۆپاتیا هەڵدەقوولێ، لەناکاو بە ئاڕاستەی باشوور-ڕۆژئاوا وەردەچەرخێ و دوای ئەوەی (مار)، پاشان (ئارتاختا) دەبڕێ، بەناو پێدەشتێکی بەرفراوانی یەکگرتوودا دەڕوا و دەڕژێتە ناو زەریای خەزەر.

درەخت دەوریان دابوو، کە نوای شێر، پڵینگ و بەرازەکێوی بوو. لە شەشەم میلدا ئەو ڕێگەیەمان دۆزییەوە کە سووریچییەکان شەوی پێشوو لێیان ون-کردبووین و لە حەوتەم میلدا، گەیشتینە دەربەندێك، لای ژمارەیەك چینی خوێ کە دوای ئەوەی ئەم چاڵاوە ئاوە لە چەند بیرێکەوە ڕاکێشراوانەمان تێپەڕاند، ڕووبارەکە بەرەبەرە بە هەڵم بووبوو و توێژێکی خوێی لەسەر زەوییەکە بەجێهێشتبوو. پاش ماوەیەك دواتر جارێکی دیکە لە ئاراس پەڕینەوە و لە نۆیەم میلدا، گەیشتینە ئاوایی (تاتووس Tatous)، کە هەشت سەعات یان بیست میلیك لە ئەرزەڕۆمەوە دوورە. ئەو وڵاتەی کە پێیدا دەڕۆیشتین، لەوەڕگەیەکی نایابی هەبوو، کە بەسەر دامێنی بەرازاییەکاندا دەیڕوانی و دۆڵەکانی بەپیتوفەڕ بوون، بەڵام هەمووی لە چۆڵەوانییەکی نەچێنراو بەدەر، هیچی تر نەبوو. سەختیی وەرزەکان و خەوشی نوای بێشەڵانەکان وایان لێ کردووە ژیانی تێدا نەبێ. چەند سەعاتێك لە (تاتووس) بۆ حەسانەوەی خۆمان و ئەسپەکانیشمان وەستاین، شەوی ڕابووردوو هیچمان نەخواردبوو: کاتی دەرچوون لە گوندەکە، سووڕێکمان دا بە دەوری زنجیرەی ئەو گردۆڵکانەدا کە (دۆڵی ئاراس)یان لە بەرچاوی ئێمە دەشاردەوە و لێرەدا ناوی تاتووس-سوو* ی هەڵگرتووە. ڕێگەکە بە ناو وڵاتێکی پچڕپچڕ و بەرز و نزمایدا دەڕۆیشت، کە ناچاربووین بەبێ وەستان سەربکەوین و تا نۆیەم میل دانەبەزین. جارێکی دیکە سەرلەنوی گەیشتینەوە کەناری ئاراس**. ئەم ڕووبارۆچکەیە، لەو شوێنەدا کە ئێمە بۆ یەکەم جار بینیمان، تەنیا جۆگەلەیەکی بچووك بوو و ئەو برە ئاوە زۆرە و زەوەندەی لێ کۆدەبووەوە، سیوحەوت پێ پانیی بوو و قووڵییەکەشی بەو شێوەیە بوو کە ئەسپەکانمان ناچار دەبوون -کەم تا زۆر- بە مەلەکردن بپەڕنەوە.

---

*Tatous-Sou

**Araxe

لە دەیەم میلدا، لە ئاوایی (گورنادە)Gournada[1] ، یەکەم گوند کە لە تاتووسەوە تووشی بووین، وەستاین و دوای ئەوەی بە شوێن کەناری ڕاستی ئاراس‌دا ڕۆیشتین. ماوەی نزیکەی میلێك، زیاتر بە ئاراستەی باشوور ملماننا و ڕووبارەکەمان بەجێهێشت، کە پێچاوپێچ بەناو پێدەشتێکدا بەرەو باکوور شەپۆلی دەدا. حەوت میل بەناو وڵاتێکدا ڕۆیشتین، کە دیمەنەکەی هەمان ئەوەی ئەو دەر و ناوچانە بوو کە تازە باسمان کردن و لە بیستەمین میلدا، بەسەر زنجیرەچیایەکی زۆر بەرزدا هەڵکشاین، ناوی (تاق-داغ Teg-Dâg) بوو. لێرە ئەسپەکانمان هێندە شەکەت بووبوون، ناچاربووین لێیان بگەڕێین چەند سەعاتێك لەناو لەوەڕگەدا بلەوەڕێن.

زنجیرەچیای تاق-داغ بە لای باکوور-ڕۆژهەڵات و باشوور-ڕۆژئاوادا کورت دەبێتەوە، چەند لقێکی لێ دەبێتەوە، پێدەشتێك دەبڕێ کە لەم ساتانەدا بەفر دایپۆشیوە. ئێمە لەم ناوچەیەی کە تێیدا وەستابووین، لە سەرماندا هەڵدەلەرزین، هەرچەندە پلەی گەرما لە سەعات سێی پاش‌نیوەڕۆدا، لە سەرووی (١٦) ٦٨° پلەدا بوو و پێنج سەعات بوو ئەسپەکانمان تا ڕادەیەك حەسابوونەوە بۆ ئەوەی ڕێگەمان پێبدەن بەردەوام بین لە ڕۆیشتن.

بە دەریچەیەکی چیاکەدا، چیای (تاغ-داغ)مان بڕی و لە بیستوسێیەمین میلدا دابەزینە ناو پێدەشتی (خنس Khinis ). لەوێ جگە لە داربی سەر کەناری ئاراس، چەند میگەلێکی بەرخ و ژمارەیەك دارهەرمیی چکۆڵەمان، کە تاقە درەخت بوو لە ئەرزەڕۆمەوە تووشی دەبووین، بینی. لە بیستوپێنجەمین میلدا، چەند زەوییەکی چێنراومان لە دەوروبەری ئاوایی کوردیی (ئامێران - Amerân)مان بینی. لەوێوە ماوەی سێ سەعات بەناو پێدەشتێکدا ڕۆیشتین و

[1] لەم شوێنەدا ڕاستەوڕاست لە (حەسەن‌قەڵا HassaaKalèh)، (تیۆدۆزیۆپۆلیس Théodosopolis)ی کۆن هەڵدەقوولێ.

له سه‌عات نۆی ئێواره‌دا گه‌یشتینه ئاواییی گه‌وره‌ی (گینس یان خنس)، که‌ به‌ڕێز ئانڤێل* وه‌های بۆ ده‌چێ ئه‌و گونده‌ هه‌مان ئاواییی (گیمنیاس)** بێ، که‌ له‌ مێژووی (کشانه‌وه‌ی ده‌ هه‌زار که‌سیه‌که‌)[1]دا ناوی هاتووه‌. گونده‌که‌ که‌وتووه‌ته‌ سه‌ر ڕووباری بینگۆل-سوو، یه‌کێك له‌ لقه‌ سه‌ره‌کییه‌کانی ڕووباری فوڕات، که‌ جاران پێیان وتووه‌ لیکۆس***.

٢٤ی مانگ- خانووه‌کان هێشتا به‌و شێویه‌ که‌ زه‌ینه‌فۆن بۆی باس کردووین، دروست‌کراون و دانیشتووانه‌که‌ی، هێشتا هیچ ئه‌وروپاییه‌کیان نه‌بینیبوو، به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ ئازادییه‌ك بدرێ به‌ خۆمان، به‌سه‌رسامییه‌وه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ی بوونه‌وه‌ره‌کانی ئاسمان بین، تێیان‌ده‌ڕوانین. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا که‌ هه‌موو ئاواییه‌کانی ده‌رودراوسێ ئه‌رمه‌نی بوون، ده‌مانتوانی به‌ جلوبه‌رگ و سیمای ده‌ره‌وه‌یاندا حوکمی ئه‌وه‌ بده‌ین که‌ ئه‌وانه‌ له‌وپه‌ڕی کلۆڵیدا ده‌ژین. ژماره‌یه‌کی زۆر گۆڕی له‌ به‌رد به‌ ده‌وری کڵێسه‌کانیانه‌وه‌ هه‌بوون، وێنه‌ی ئه‌سپ، فیل و مانگایان به‌ شێوه‌یه‌کی ناڕێك له‌سه‌ر هه‌ڵکه‌ندرابوو. سه‌عات نۆ به‌سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌کانمان که‌وتینه‌وه‌ پێبه‌پێی ئاوه‌ڕۆی بینگۆل Bingol ڕۆیشتین، به‌ناو دۆڵێکی تاڕاده‌یه‌ك باش چێنراوی ئه‌م به‌شه‌دا، به‌بێ ئه‌وه‌ی وه‌ك هه‌موو به‌شه‌کانی دیکه‌ی ده‌وروبه‌ر تاقه‌ دره‌ختێکی لێ بێ. له‌ سێیه‌م میلدا، به‌ به‌رده‌بازی بینگۆل‌دا که‌ پانییه‌که‌ی له‌و ناوچه‌یه‌ شه‌ستوهه‌شت پێ بوو،

---

*Anville

**Gymmias

[1] گریکه‌کان له‌ حه‌وت ڕۆژه‌ڕێوه‌ له‌ گیمنیازه‌وه‌ Gymnias ، گه‌یشتن به‌ چیای پیرۆزی تێچه‌س Teches، ئه‌و لوتکه‌یه‌ی که‌ زه‌ریایان لێوه‌ دیار بوو. هه‌روه‌ها ڕۆژانه‌ نزیکه‌ی چل میلیان بڕیوه‌ (که‌ شتێکی مه‌حاڵه‌) له‌ناو وڵاتێکی به‌ به‌فر داپۆشراو و له‌ هه‌موو لایه‌که‌وه‌ ته‌نگ‌پێهه‌ڵچنراودا به‌ دوژمن.

***Lycus

پەڕینەوە. ئاوەکەی هێندە تیژڕۆ بوو، ئەسپەکانمان بە تەواوی لەناو ئاودا بوون. پەنجا پێیەك دوورتر ڕووبارێکی دووەممان بڕی، کە وەك ئەوەی یەکەم قووڵ بوو، بەڵام پانییەکەی نەدەگەیشتە بیستوحەوت پێ[1]. ئەم دوو ڕووبارە لە چارەگە میلیکدا لەو ناوچەیەدا کە ئێمە پێیدا پەڕینەوە، یەكدەگرنەوە. ئاڕاستەکانیان منی سەراسیمە کرد، بە تایبەت کە بینگۆل لەسەر هەموو نەخشەکانی لەژێر دەستمدا، بە یەك ئاڕاستە بەرەو لای ڕۆژئاوا دەڕژێ، لە کاتێکدا لەم شوێنەدا تەواو ڕاست بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆیی. ئێمە کەناری ڕاستمان گرت تا نۆیەم میل. لێرە، سووریچییەکان و تەتەرەکانمان وەهایان نیشان دا، کە حەزدەکەن پاشماوەی ڕۆژەکە لە گوندێکی (دۆمان Doman) ناودا بەسەرببەین، بەڵام وەك چۆن مۆڵەتمان نەبوو، ناچار بووین بڕۆین. لە سووڕانەوەدا بەرەو باشوور، قەراغەکانی بینگۆلمان بەجێهێشت، سەرکەوتینە سەر ئاوەڕۆی جۆگەلەیەکی چکۆلە و چووینە ناو چیاکان. لەنێوان حەڤدەهەم و هەژدەهەم میلدا، گەیشتینە سەرچاوەی ئەم جۆگەلە بچووکەی نزیکی ئەو شوێنە کە چیاکانی تێدا زۆر سەخت و ڕك دەبینران و بەمە پێداهەڵگەڕانی زۆر سەخت بوو. نزیکەی نیو سەعاتمانمان پێویست بوو تا گەیشتینە لووتکەی ئەم بەشە، ئەوەندە سەخت بوو کە لە هەژدەهەم میلدا، گەیشتینە لووتکەی زنجیرەچیای بەرزی (هاموور-داغ Hamur-Dâg)، کە چەند پێیەك ئەستوور بەفری تێکەوتبوو، هەرچەندە پلەی گەرما لە سێبەردا لە (دۆمان Domân) ۱۷ (۷۰°)ی ڕادەگەیاند. بەسەر یەك پێدەشتی بەرفراواندا تێپەڕ بووین، ناوەڕاستەکەی پێچاوپێچ، لە هەزار پێچاوپێچی ڕووباری موراد، یا ڕووباری

[1] ئەم ڕووبارە بەگوێرەی ئەوەی کە دانیشتوان پێمان دەڵێن-لە باشوورەوە دێ و لە چیاکانی هاوسێوە سەرچاوە دەگرێ.

دێزیر* که له باکوور-ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەقوڵا. له باشوور و ڕۆژئاوادا، جگه له چیاکان و بەفر هیچی ترمان بەرچاونەکەوت و له دووریی سی یا چل میل دوورەوە له ڕۆژهەڵات-باشوور-ڕۆژهەڵات، قوولەی سپێتیی (سیپان-داغ Sepân-Dâg) بە سەرووی هەوری شەپۆلداری درێژاییی کەناری چیاکەدا هەڵدەکشا. ئەم چیایانە یەکێك له چیایە بەناوبانگەکانی ئەرمینیان، بەسەر کەناری باکوور-ڕۆژهەڵاتی گۆلی واندا دەڕوانێ و بەرزاییەکەی بە شێوەیەکە تا ئێستە نەوتراوە کەسێك گەیشتووەتە سەر لووتکەی چیاکە[1]. ئێمە بەناو پێدەشتەکەدا شۆڕبووینەوە و له بیستونۆیەمین میلدا، لای ڕەشماڵێکی کوردە کۆچەرەکان وەستاین، لەسەر کەناری جۆگەلەیەکی بچووك کە دەڕژایە ناو ڕووباری موراد، هەڵیاندابوو. خۆمان گەیاندە ناو ڕەشماڵی سەرۆکەکەیان کە دۆستانە پێشوازیی لێ کردین و دوور لەوەی وەك کێوییەکی ناشارستان وەك ئەوەی ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد، شێوازێکی نەرم و نیان و بەڕێزانەی هەبوو. داینیشاندین و فەرمانی دا قاوەمان بۆ بهێنن و نانی ئێوارەمان بۆ ئامادە بکەن. ڕەشماڵەکەی، نزیکەی پەنجا پێ درێژ و سی پێ پان بوو، له قوماشی خوریی ڕەش دروستکرابوو و نۆ ئەستوونی بچووك ڕایانگرتبوو. دیوارەکانی له دار بوون، بە ئاوریشمێکی ئەرخەوانی بەیەکەوە بەسترابوونەوە و نزیکەی چوار پێ بەرز بوون. ڕەشماڵێك لەوسەر شوێنی حەوانەوەی ژنان بوو، یەکێکی دیکە بۆ سەرۆکی هۆزەکە بوو، کە بینیمان لەسەر بالیفێکی ئاوریشم دانیشتبوو، لبادی درێژ له هەر دوو لایەوە لەسەر زەوی ڕاخرابوو بۆ ئاسانکاریی ئەو کەسانەی کە دێنە سەردانی. ئێمە هەر چەند سات‌ێك دەبوو دانیشتبووین، وەختایەك داوای له

---

* Désir

[1] ئەم لووتکە بەرزە له شێوەی قووچەکدایە و هەموو سیمایەکی ئەوەی هەیە وەك ئەوەی بورکانی بێ. گۆگردی زۆر له دەم کەنارەکانی گۆلەکەدا دەبینرێ.

تەرتەرەکە کرد بزانێ ئینگلستان چییە، ئەو درێژەی پێ دا کە قوماشی زۆر چاك و دەمانچەی نایابی لێ دروست دەکەن. مەحموود ئاغا زۆر بە ئارامی وەڵامی دایەوە کە ئەنگلستان شارێکی گەورەیە، چێوەکەی دووسەد سەعاتە، پڕییە لە زمڕووت، لە یاقووت و هەموو جۆرە بازرگانییەکی دەوڵەمەند. ئەم گێڕانەوەیە وا دیاربوو جۆشوخرۆشی سەرسامیی کوردەکەی نەخرۆشاند. هەرچەند هیچ گومانێکی لەسەر ڕاستودروستیی قسەکانی تەتەرەکە دەرنەبڕی، ئەسپەکانی هێنا تا ئێمە بتوانین ببینین. پاشان خواردنی ئێوارە هێنرا، کە بریتی بوو لە گۆشتێکی زۆر، دوو پەنیر، دوو گۆزە شیری مەییو، نانی نایابی زۆر، هەمووی خرابووە سەر سینییەکی مس[1].

سەعات پێنجی ئێوارە ڕەشماڵەکەمان بەجێهێشت و بەسەر زنجیرە بەرزاییەکی باشووری ڕەشماڵەکاندا هەڵگەڕاین، پاشان دابەزینە ناو پێدەشتێك، کە ڕووباری موراد ئاوی دەدا و لە شەشەم میلدا لە ئاوایی (قەرەقوول Karagoul)ی ئەرمەنییان وەستاین. ئەو ڕێگەیانەی کە ئێمە لە ماوەی ئەو ڕۆژەدا گرتبوومانە بەر، تا ڕادەیەك ڕێگەی چاك بوون، لە سەعات دەی بەیانییەوە تا پێنجی ئێوارە، پلەی گەرما لە نێوان ٦٦° تا ٧٠°ی فەهرەنهایتدا بوو (لە ١٥° بۆ ١٧°) و لەگەڵ خۆرئاوابوون بەر سووکە زریانێك کەوتین، تێکەڵ بوو بە هەورەتریشقە. ئەو دەر و ناوچانەی کە ئێمە پێیاندا دەڕۆیشتین، بە گشتی ناوچەی بەپیتوفەڕ بوون، گژوگیایەکی سەوزی جوان دایدەپۆشین و بڕێکی زۆر گەورەی بامێی فەڕەنگیی کێوی بەرهەمدەهێنا. دانیشتووانی ئاوایی

---

[1] لەناو هەموو ڕۆژهەڵاتدا، پارچەیەکی بازنەیی مەغریبییە، بە شێوەیەکی ئاسایی سوورە، بۆ چەرچەف بەکاردێ، لەسەر زەوی ڕادەخرێ و خواردنی سەردەخرێ. دوای خواردن، خزمەتکارە بندەستەکان دوای ئەوەی پاکی دەکەنەوە لوولی دەدەن. (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسایی)

(قەرەقوول) بە هەمان شێوەی هەموو ئەو ئەرمەنییانەی کە من دەرفەتم بۆ هەڵکەوت بیانبینم، لە نەژادێکی کێوی و نامیواندۆست بوون. تەنیا پشت-بەستوو بە پشتیوانیی کەهییە و بە زەبری قامچیلێدان بوو، کە تەتەرەکانمان توانییان چەند برەجۆیەك بۆ ئەسپەکانمان پەیدابکەن. دۆڵی موراد، لەوپەڕی ڕۆژئاوایدا، کە ئاواییی قەرەقوولی لێیە، باشترین لەوەڕگەی جیهان پێكدەهێنێ. زەوی، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی پێدەشتی بانی ئەرمینیا، لەوێ دەوڵەمەند و بەپیتە و ئاووهەواکەی دڵگیرە. وێڕای ئەم هەموو بەخششانە، کەچی بە ئاستەم تاقەکەسێك، یا تەنانەت کێڵگەیەکی چێنراو دەبینین. لەوەڕگەکانی هێندە بەپیتن ئێستە وازیان لێ هێنراوە بۆ هۆزە کۆچەرەکان، کە دەیانەوێ بیانخەنە بندەستی خۆیان. ڕووباری موراد لە دوورەوە خۆی نیشان دەدا، لە باکوور-ڕۆژهەڵاتەوە دێت و هەزار پێچاوپێچ لە ڕێڕەوی خۆیدا دەنوێنێ. پێنج میل دوور لە ئاواییەکە، بەرەو لای باکوور-ڕۆژهەڵات، لەو شوێنەدا کە شەومان تێدا بردە سەر، لەگەڵ بینگۆل یەکدەگرێتەوە[1]. ئەم ڕووبارە گەورەترین ڕووباری

---

[1] وا وێدەچێ سەیر بێ کە جووڵەی ڕاستەقینەی ئەم ڕووبارە ئەوەندە مەودا دووردرێژە لای ئەورووپا نەناسراو بووبێ. ڕووبارەکە، لەناو هەموو نەخشەکاندا، لە ڕۆژئاواوە دەڕوا و لە بریتی ئەوەی لەگەڵ ڕووباری موراد یەكبگرێتەوە، دەڕژێتە ناو لقێك لە لقەکانی فورات. ئەوەیان ئەو وەسپەیە، کە پرۆکۆپۆس لەبارەی فورات و دیجلەوە نووسیویە: (لەناو چیاکانی ئەرمینیادا، کە هێندە لێژ نییە، دوو ڕووبار لە پێنج میلی باشووری تیۆدۆسیۆپۆل Théodosiopolis هەڵدەقوڵێن، ئەوەی ڕاست فوراتە و ئەوەی چەپیش دیجلەیە. ئەوەی دوایی، بەبێ ئەوەی هیچ پێچاوپێچێك بکا، بە ئاڕاستەی ڕاست بەرەو ئارمیدا Armida دەڕوا، ئاوی ڕووباری هیچ ڕووبارێکی تری ناچێتەوە سەر، لە باشووری ئەم شارەوە بەناو وڵاتی ئاشوور Assyrie (واتە ناوچە باکوورییەکانی میزۆپۆتامیای کۆن-و.ك)دا دەڕوات. بۆ فورات بە جۆرێك لە پەرجوو کەمێك دواتر لەژێر زەوی ون دەبێ، ئاوەکە چاڵاوێکی گەورە دادەپۆشێ،

ناوچەکەیە و ناوەکەی (فورات) دەکرێ وەهای بۆ بچین، کە هەمان ئەو ڕووبارە بێ سوپا دە هەزار کەسییەکەی پێدا پەڕیبنەوە. بناوانی، لەژێر دیوارەکانی بایەزیدەوە سەرچاوە دەگرێ و لەگەڵ لقە باکوورییەکەی فورات، لە چیای تۆرۆس نزیك بە (کەببان) Kebban یەکدەگرنەوە. لە دوانزە میلدا، بە ئاڕاستەیەکی ڕۆژهەڵات-باکوور-ڕۆژهەڵاتی (قەرەقوول Karagoul)، گۆلێکی جوانی لێیە بە ناوی (چەلۆ) Chello وە. بەگوێرەی ئەوەی کە دانیشتووانی ناوچەکە پێمان دەڵێن، بە لای کەمییەوە دەوراندەورەکەی یەك ڕۆژەڕێ دەبێ، لەسەر لووتکەی بەرزاییەکی سەرووی ئاواییەکە دەبینرێ و ئاوەکەی لە بەری دەڕوا بۆ ئەوەی سازگار بێ و بۆ خواردنەوە بشێ.

٢٥ی مانگ- لە سەعات هەشتی بەیانیدا، سواری پشتی ئەسپەکانمان بووین و یەك میل و نیو دواتر گەیشتینە کەناری ڕووباری موراد، کە لێرەدا هێندەی (دیجلە) لە مووسڵ پان و تیژڕۆ و قووڵ بوو. یەکەم جار ئەسپەکانمان پەڕاندەوە، پاشان خۆمان بە کەڵەکێك کە لە کەوڵی فووتێکراوی مەڕ درووست کرابوو،

---

درێژییەکەی شەش میلە و بەسەر پانایی دوو میل و نیو، ئەم چاڵاوە دادەپۆشێت و خاکەکەی ئەو هێندە ڕەقەڵانە کە وا پێدەچێ بەسەر زەوییەکی پتەوەوە بڕۆیت. ئەسپەکان، پیادەکان و عارەبانەکان ڕۆژانە بەسەریدا دەڕۆن بەبێ ئەوەی کەمترین دەنگە دەنگی لێوە بێت و هیچ کەند و کۆسپێکی لەژێر پێیان نییە. هەموو ساڵ، خەڵکەکەی ئاگر لە قامیشەڵانەکە بەردەدەن بۆ ڕێگا کردنەوە و وەختایەکیش (با) لەو ماوەیەدا بە توندی هەڵدەکات ئاگرەکە تا ڕەگەکانیش دەستووتێنێت و ئاوەڕۆی تەسکی ڕووبارەکە بەدیاردەکەوێت، بەڵام قوراوەکە دووبارە لەو شوێنە کەڵەکە دەبێتەوە و فۆرمی یەکەمی پێدەبەخشێتەوە. لەوێوە ڕووبارەکە بەرەو دەروناوچەی ئیکلیس یان پەرستگای دیان لە تۆرید دەڕوات: ئەوە لێرەوە بوو کە ئیفگینی، کچی ئەگامنون لەگەڵ ئۆریست Orestes و پیلادس Pilades ڕادەکات و ستاتووی ژنە خوداوەند وەردگرن).

پەڕینەوە. ڕووبارەکە سەرڕێژ و ئاوەکە شێواو و لێڵ بوو. دەبووایە ئەو سێلاوە کە لە ڕێی بەفرتووانەوەوە پەیدابووبوو و لە چیاکانەوە دەڕژایە خوارەوە، لە بەرچاو بگرین. لەو دیوەوە، بەسەر لێژاییەکی نەرماندا سەرکەوتین و هەشت میلمان بەناو خاکێکی بەردەڵان و سەختدا بڕی، کە پڕبوو لە مار و درێژییان دەگەیشتە چوار یا پێنج پێ، ڕەنگیان سوور و هەر بە پێوەدانیان ژەهری خۆیان دەڕژاند. لە نۆیەم میلدا، شۆڕبووینەوە بۆ ناو هەرێمێکی چێنراو بەناوی لیزە Lyse و پاش ئەوەی ژمارەیەك جۆگەلەی بچووکمان بڕی، کە هەموویان بە ئاڕاستەی ڕووباری موراد دەڕۆیشتن، لە دوازدەیەم میلدا گەیشتینە ئاواییەکی ئەرمەنەکان بە هەمان ناوەوە. خەڵکەکەی لەناو کێلگە و مەزرادا سەرقاڵ بوون، هەندێکیان زەوییان دەکێڵا و هەندێکی دیکەیان زەوییان ساز و ڕێكدەخست. بەڵام وا کەوتە بەرچاوم کە هەموویان زانیارییەکی کەمیان لە کشتوکاڵدا هەبووبێ. گاسنەکانیان سادە و ساکار بوون، تەنیا لە تەختەدار پێکهاتبوون، لەلایەن چوار مانگاوە ڕادەکێشران، دەسکەکەیان پارچەیەك داری ئەستوونی بوو و نزیکەی دوو پێ و نیو بەرز بوو و ئەو کەسەی کە ئاڕاستەی گاسنەکەی دیاری دەکرد، لەسەر زینێکی چکۆلە لە پێشەوە دانیشتبوو. دەمودەست هەر دوای گەیشتنمان، سەرمان لە تیرەیەکی لێزگییەکان* دا، کە پێكهاتبوون لە پاسەوانانی پاشای مووش، ڕەشماڵیان لەو ناوەدا هەڵدابوو. وایان نیشان دا ڕێزمان لێ دەنێن کە ڕایانگەیاند تا سنووری حوکوومەتەکەیان پاسەوانێکمان بەگەڵ دەدەن. ئەم هۆزی لێزگییانە مایەی نەهامەتی دەر و ناوچەکانی هاوسێیان بوون، بە شێوەیەکی ئاسایی پاسەوانی کەسایەتییە گەورەکان بوون. ئەوانە تیپێکی بەکرێگیراو بوون، چەکەکانیان لە غەدارە، دەمانچە و خەنجەر پێكهاتبوون، زۆر وەفادارانە خزمەتی ئەو کەسەیان دەکرد کە پارەی پێدەدان، تەنانەت دژی باوك و دایکی خۆشیان دەوەستانەوە.

---

*Lesghys

باڵاییێکی مامناوەنجی، تەواو باڵابەرز، بە ڕەنگوڕوو گەنمڕەنگ، بە سەروسیما بەخۆنازیو و هەرەشەکەر بوون.

٢٧ی مانگ- (لیزە Lyse) حەوت سەعات لە (مووش)ەوە دوورە و لە هەمان دووریی (ئەخلات) و (مەلازگەرد)دایە. دەوروبەری سەعات هەشتی بەیانی، پلەی گەرما (½ ١٤) °٦٤ بوو، لە سەعات (دە)دا، پلەی گەرما (١٧) °٧٠ی دەگەیاند و نیوەڕۆیەکەی (١٩) °٧٤ بوو. لە ئەرزەڕۆمەوە بۆ لیزە، ئاڕاستەی گشتیی ڕێگەکە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: دوو میل ڕۆژهەڵات، دوو میل ڕۆژهەڵات-باکوور- ڕۆژهەڵات، دوو میل ڕۆژهەڵات، یەك میل ڕۆژهەڵات-باشوور، یەك میل باشوور- باشوور- ڕۆژهەڵات، یەك میل باشوور- ڕۆژهەڵات، نیو میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات. یەك میل و نیو باشوور- ڕۆژئاوا، شەش میل باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل و نیو باکوور-ڕۆژئاوا، چوار میل ڕۆژهەڵات، سێ میل ڕۆژهەڵات -باشوور، یەك میل نیو باشوور - باشوور- ڕۆژهەڵات، سێ میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور-باشوور- ڕۆژهەڵات، چواردەمیل باشوور-ڕۆژهەڵات، چوار میل باشوور-باشوور- ڕۆژهەڵات، چوار میل باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور-ڕۆژهەڵات، چوار میل ڕۆژهەڵات-باشوور، سێ میل و نیو ڕۆژهەڵات-باشوور، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل و نیو ڕۆژهەڵات-باشور-ڕۆژهەڵات، یەك میل و نیو ڕۆژهەڵات-باشوور، دوو میل باشوور-ڕۆژهەڵات -باشوور، شەش میل باشوور-ڕۆژهەڵات-ڕۆژهەڵات، دوو میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، پێنج میل و نیو، ڕۆژئاوا چوار میل باشوور- ڕۆژئاوا.

پاشالقی مووش هێندە بەرفراوان نییە، بەڵام جگە لە شارەکانی مووش، بتلیس و ئەخلات، هێشتا چەند ناوچەیەکی دەوڵەمەند بەخۆیەوە دەگرێ.

دانیشتووانی بەشی زۆرینەی ئاواییەکان بریتین لە ئەرمەنە مەسیحیەکان، هەر ئەبرەشییەك (قەشەنشین)، کڵێسەیەك و قەشەیەکی هەن، سەر بە پاتریارشی ئەرزەڕۆمن. چینی خوارەوەی تێدا -بەگشتی- کلۆڵە. بەشێکی دانیشتووان لەوێ بەگشتی ئەوەندەی من پێشتر لە دەرفەتێکدا سەرنجم داوە، پەڕیوەی ناوچە دوورەدەستەکان بوون بۆ بەرهەم و ئابووریی خۆیان، دوای چەند ساڵێك گەڕاونەتەوە بۆ باوەشی خێزانەکانیان. ژنان لەوێ ئیشکەرن و سەرقاڵی چنینەوەی خوری و پەموون. جلوبەرگیان بریتییە لە شەرواڵێکی فشوفۆڵ، پاڵتۆیەك کە تا سەر ئەژنۆکانیان دێت، قایشێکی چەرمیی، کە لە پێشەوە توند گرێ درابوو و دەسماڵێك کە لە دەوری مل و گوێیەکانیان هاڵابوو. ئەرمەنەکان بەشێکیان ڕەعیەتی تورکەکان و بەشێکیشیان ڕەعیەتی بەگە کوردەکانن، بەڵام بە شێوەیەکی چوونیەك لە لایەن ئەم یا ئەویانەوە دەچەوسێندرێنەوە.

٢٩ی مانگ- ئێوارە محەممەد ئاغا پێی وتین: ناچار دەبێ ئێمە بە ڕێگەی واندا بیا، چونکە تاڵانوبرۆیی کوردەکان وای کردووە ئەو ڕێگەیەی کە بە بتلیس و سێرتدا دەڕوا، هاتوچۆی پێدا نەکرێ. بەڵام جیاواز لە شێوەی قسەکردنی پێشتری، بە پێچەوانەوە دڵنیای کردینەوە کە ڕێگەی بتلیس ئارامە. ئێمە هیچ باوەڕمان بە قسەکەی نەکرد، ئەم گۆڕینی بیروڕایەی ئەومان بۆ چەند هۆیەکی دیکە گەڕاندەوە. ئەو پێشتر زیاتر لە چەند جارێك داوای لە تەتەرەکە کردبوو داخۆ ئێمە سەعات، چەك، یا دەمانچەمان پێیە، بەڵام وەڵامی نەرێنیی محەممەد ئاغای لە چاوەڕوانییەکەی بێهیوا کردبوو. ئەو، بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە بمانێرێتە وان، بەو خەیاڵەی کە دروستکردنی ترسێکی ئەوها گەورە، ئێمە ناچار دەکا بەخششێکی پێ بدەین. بەڵام هێشتا لەمەدا بەهەڵە چووبوو، چونکە دەمودەست کە ئەم پەیامە گەیشت، خزمەتکارەکەم نارد (چونکە زۆر گومانم هەبوو محەممەد ئاغا هێشتا چەند کەینوبەینێکی دەسیسەیی دیکەی لە بن

سەربێ) بڕیارێکی یەکلاییکەرەوە بە پاشا ڕابگەیێنێ، کە یا ئەوەتا بچین بۆ بتلیس یان بمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەرزەڕۆم. بە ئارامییەکی زۆرەوە وەڵامی دایەوە کە: ئەگەر ئەمە بڕیاری ئێمەیە، ئەوا ئەو چەند ئەسپێك و ڕێبەرێکمان بۆ دەنێرێ بۆ ئەوەی سبەینێ هەر لە بەیانییەکەیەوە بمانگەیەنێتە بتلیس. سەعات شەشی بەیانی پلەی گەرما (½ ١١) °٥٨ بوو، سەعات نۆ (١٤) °٦٣ و نیوەڕۆ (١٤½) °٦٤ی نیشاندەدا.

٣٠ی مانگ - کەسێك بە سەروسوکوتێکی پیس و ناشیرین و بە شێوەی کوردان خۆی پۆشیبوو، سپێدەکەی زوو بەر لەوەی ئێمە هێشتە جلمان لەبەرکردبێ، هاتە ناو ئەپارتومانەکەمان، بە تورکی قسەی دەکرد، بەڵام هێندە خراپ قسەی دەکرد، کە مەحاڵ بوو تێبگەی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زوو تێگەیشتین ئەو ڕێبەرەیە کە لە لایەن پاتشاوە ڕاسپێردراوە تا بمانگەیەنێتە بتلیس. بە هێمنی لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانیشت و دوای ئەوەی بانگی خزمەتکارەکانی خۆی کرد، کە شڕوشیتاڵلەبەر و جلدڕاو خۆیان پۆشیبوو، هەستی کرد پێویستە شەرافەتمەندانە ڕێبەرییەکە بکات، فەرمانی پێکردن ئامادەی گەشتەکە بن، قاوە، پەنیر و بڕێك شتی دیکەی بچووك سازبکەن، بڕێك شتی ئەوەندە چاك و لە هەمان کاتدا بڕێك شتی گاڵتەجاری لە کاراکتەری ئەم پیرە کوردەدا هەبوو، کە ناچار بووین خۆشمان بوێ. نەوازشەکانی بەرانبەر بە ئێمە، مشوورخۆریی زۆریشی بە شێوەیەك بوون، هیچ شتێك لە ڕێبەریکردنەکەی کە ئێمە لەبارەیەوە وێنامانکردبوو، دەرهەق بە بیروڕا چاکەکەی بە هەڵەیدا نەبردین. سەعات هەشتی بەیانی بەڕێکەوتین و لە کۆتاییی سێیەمین میلدا، گەیشتینە ئاواییەك بە ناوی (پونیك Puink)ەوە، کە لەگەڵ بەگی سەرۆکی ناوچەکە قاوەمان لەوێدا خواردەوە. دواتر بەردەوام بووین لە ڕۆیشتنەکەمان بە ڕێیەکی بەردەڵانی سەر نەرمەڵێژاییەکی ناو

پێدەشتێکدا و لە هەشتەم میلدا، کەلاوەی شارێك و کۆشکێکمان لە دواوەی خۆمان بەجێهێشت، کەوتبوونە بناری چیای (بێلیدجون) Bellydjoun. لە دەیەمین میلدا، لەناو دێیەکی پەرپووتی (ئالْتا-بایەزید Alta-Bayazid) ناودا وەستاین بۆ حەساندنەوەی ئەسپەکانمان و لە سێزدەهەمین میلدا، گەیشتینە لووتکەی چیاکان، ئیتر لەوێوە گۆلی (نازوك)مان Nazouk بەبێ هیچ گومانێك (ئارتوسا) Arthusa ی کۆن بوو، دەبینی. دوای ئەوەی ماوەی یەك میل دابەزینە خوارەوە، گەیشتینە کەناری گۆلەکە، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا سێزدە میل لە بەرچاوم درێژ و لە ناوەڕاستەکەیدا نزیکەی پێنج میل پان بوو. لە لای ئەوسەری ڕۆژئاوایشیدا، بە شێوەیەك تەسك دەبووەوە کە هەر تەنیا نیو میلیك دەبوو. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا کەمتر تەسکتر دەهاتە بەرچاوم. نەبوونی هیچ دارستانێك، هەموو جوانییەکی ڕۆمانتیکیی لێ ستاندبووەوە، تاقە گوندێك کە بەسەر کەنارەکانی گۆلەکەوە بینیمان، ئاواییەکە ناوی (جیسرەت-ئۆکا)* بوو و کەوتبووە ناو نیمچە دوورگەیێك، لە کەناری ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاواوە. ئاوی ئەم گۆلەم تام کرد، سازگار، پاك و خاوێن و دروست بوو بۆ هەموو بەکارهێنانێکی ژیان. بەشوێن کەناری ڕۆژئاوای گۆلەکەوە چووین بەر لەوەی بە چیاکاندا هەڵگەڕێین ڕووەو باشوور، پاشان بەناو جۆگەلەیەکی بچووکدا پەڕینەوە، بە شێوەیەك بوو کە ببێتە یەکێك لە سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە.

لە حەڤدەهەمین میلدا، گۆلی (نازوك Nazonk) لە بەرچاومان ون بوو و لە بەرزاییەکانەوە بەناو پێدەشتێکی چکۆلەی داچێنراودا دابەزین، شەو لەوێ لە ئاوایی جوولەکەکانی (میشی Mishy)دا وەستاین: پێشوازییەکی دۆستانەمان لێ کرا، قاڵی لە سێبەری تەیمانێکدا بەرانبەر بە ماڵی ئاغا ڕاخرا. دیمەنەکە، لەوێوە

---

*Djésiret-Oka

بەسەر پێدەشتێکی سپی و وشك و برینگدا درێژ دەبێتەوە و تا لەوێدا سیپان-داغ، بەرەو ڕۆژهەڵات، دوو خاڵ بەرەو باکوورە. سەعات شەشی بەیانی، پلەی گەرما (٩) °٥٢ و هەمان سەعات لە ئێوارەدا (١٥) °٦٥ بوو.

١ی تەمموز- لە سەعات حەوتی بەیانیدا ڕۆیشتین و لە دوای سێیەم میلەوە پێدەشتەکەمان بەجێهێشت و لە شوێنێکەوە کە وەك لایەکانی دیکە بەرز نییە، دەستمان کرد بە سەرکەوتنە سەر زنجیرە چیای بەرزی (نەمروود-داغ) (نیڤاتی کۆن). لە چوارەم میلدا، بانێك دەبینین، بەشە هەرەبەرزەکانی بەفر داپۆشیبوون و ڕوانینمان دوور دەڕۆیشت تا گۆلی وان. شەش میلمان بەسەر ئەم بانەوە بڕی، لووتکە هەرەبەرزەکانی (نەمروود-داغ Nimroud-Dàg) کەوتبوونە لای ڕاستمان، تا دەیەمین میل، کە گۆلێك لەوێ کەوتە بەرچاومان. بەتلیمۆس، ناوی ئەم ناوچە بەرفراوانەی ناوە (ئارسیس)[1]، کە وا باوەڕ دەکرێ لەوەی (ئارگیش Argich) یا (ئارسیس Arsis)وە وەرگیرابێ، شارێك کە دەکەوێتە کەناری باکووری ئەم گۆلە، درێژییەکەی لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات، ئەوەندی کە من بتوانم باوەڕی پێ بکەم، بیستوپێنج تا سی میلە و پاناییەکەشی بەرەو ناوەڕاست، لە نۆوە تا دوازدە میل دەبێ، بەڵام نیمچە دوورگەکان و کەنداوەکان ژمارەیان هێندە زۆرە، هەرچەندە دەوراندەورەکەی ٩٠ سەعاتەڕێ دەبێ، بە شێوەیەك کە کەشتییەك ئەگەر (با)یەکی باش هەبێ، تەنیا -کەموزۆر- چوار سەعاتی لەوسەری لای بەرامبەرەوە دەوێ بۆ گەیشتن لە (تێدەڤان) Tedevan ەوە بە (وان). ئاوەکەی شۆراوە، بەڵام ئەوە ڕێی لەوە نەگرتووە

---

[1] سترابۆن پێمان دەڵێ گۆلی مارتیانا، کە برێك جار گۆلی شینیشی پێ دەڵێن، ناوەکەی لە ڕەنگی ئاوەکەیەوە هاتووە، گەورەترین گۆلی هەموو ئەرمینیایە و تا سنووری ئەترۆپاتیا درێژدەبێتەوە. هەروەها باسی ئەوەش دەکا کە گۆلێك هەیە پێی دەڵێن ئارسەنا، ئاوەکەی تایبەتمەندێتیی ئەوەی هەیە کە لەکە لادەبا.

ماسیی نایاب بەرهەم بهێنێ. چیای سەرکەشی سیپان داغ لە باکوور، چیای نەمروود لە ڕۆژئاوا و زنجیرەچیای گەورەی (هەتەرەش Hateracch) یا (قەرەیش Karaich) ناو لە باشوور، دەوریان داوە. ئەم چیا هەمەچەشنانە، لەو کاتەوەی کە ئێمە بینیمانن، بەفر داپۆشیبوون و من وای بۆ دەچم ناوی (نیفات Niphates) یەك زنجیرەچیای تایبەت نەگرێتەوە، بەڵکوو بە هەموو ئەم بەشە چیایانەی وڵات دەوترێ[1]. لای باشوور-ڕۆژهەڵاتی، سێ دوورگە پێکدەهێنن، دێرێکی کۆنی ئەرمەنەکان لە یەکێکیاندایە. لەسەر کەناری ڕۆژئاوا و باکووری، شارەکانی ئەخلات (شالات)، ئەرگیش (ئەرزەس Àrzes) و وان (ئەرتەم-ئیتا Artem-ita) -کە ناوەکەی لە زمانی ئەرمەنیدا مانای قەڵا دەگەیەنێ- لێن. بەڵام ناوچەکە لە ڕۆژئاواوە بۆ باشوور، تەنیا دیمەنێکی شاخاوی و تاقانە دەنوێنێ.

لە بەرزاییەکەوە بۆ دۆڵەکە دابەزین، نانی نیوەڕۆمان لە گوندی (تەیروت Teyrout)ی ئەرمەنی یەك میل لە گۆلەکە و چوار سەعات لە (وان)ەوە دوور خوارد. لە دووی پاشنیوەڕۆدا، وەختایەك پلەی گەرما کەمێك دابەزی، بەڕێکەوتینەوە و ئێوارەکەی چوار سەعات یان چواردە میلمان بڕی تا (چۆکارTchokar)، کە ئەویش دانیشتووانەکەی مەسیحین و کەوتووەتە خوارووی ئەوەی دوایی، بەڵام لە هەمان کاتدا لە لووتکە هەرە بەرزەکانی نەمرووەدە. ڕێگەکەمان، بە درێژایی کەنارەکانی گۆلەکە زۆر دڵگیر بوو و لە نیو

---

[1] یەکەمین چیاکانی باشووری فورات کە لە کاپادۆس و کۆماگێنەوە درێژدەبێتەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، پێی دەوترێ تورۆس و هێندێ کەس ناوی چیاکانی گوردیی لێ دەنێن، ئەوانە دۆڵی سۆفین و ئەرمینیا لە میزۆپۆتامیا جیادەکەنەوە. چیایەکە پێی دەوترێ ماسیوس، هاوسێی نیزیب و تیگرانۆسێرتە و دواتر ناوی نیفاتی وەرگرتووە و لێرەوەیە کە سەرچاوەکانی دیجلە دەبینرێن. چیای نیفات، لە بەردەوامیی هەڵکشانیدا، دواتر پێی دەوترێ زاگرۆس و وڵاتی میدیا لە بابل جیادەکاتەوە (سترابۆن).

میلی کەنارەکەدا، چیاکان بە لێژاییەکی نەرم دەگەیشتنەوە بە کەناری ئاوەکە. لە دووەمین میلدا، شاری ئەخلات[1]مان بینی لە پێنج میلی ڕۆژهەڵاتی-باکوور-ڕۆژهەڵاتەوە دوور لە ئێمە بینی. ئەخلات، شارۆچکەیەکە نزیکەی هەزار ماڵە، لە لایەن بەگێکەوە حوکمڕانی دەکرێ و کەوتووەتە یەك میلی ئەوپەڕی باکوور-ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ، وا دیارە ون دەبێ لەناو ئەو هەموو بێستانانەی کە دەوریان داوە. لە حەوتەم میلدا، گوندی (قۆزاق Gozag)ە لە لێواری کەنارێکدا. لە هەشتەم میلدا، گوندی (تایگاك Teygâg)ە، ئەویش کەوتووەتە نزیکی ئاو و چواردەوری دارستانە، لەم هەرێمە شاخاوییەدا دیمەنێکی دڵگیری هەیە. ئاووهەواکەی هێمن و گەرمایەکی زۆری هەیە، بەڵام ئێمە بە بەفرخواردن کە لەسەر قەدپاڵی چیاکان کۆمان دەکردەوە، خۆمان فێنك‌دەکردەوە. گۆلی وان لە ئاوێنەیەکی گەورە دەچوو و بەرزاییەکانی دەوروبەری لە ناو ئاوەکە دەبریسکانەوە، لەسەر کەناری لای بەرانبەر، لە دووریی بیستوپێنج یا سی میلەوە لە ئێمە، شاری (وان)[2]مان دەبینی، کە -کەم تا زۆر- لە ڕاستەوە بۆ ڕۆژهەڵاتە. بارستێکی گەورەی گۆگردمان لەناو شوێنێکدا دی، ڕێبەرەکانمان دەیانوت: لە چیاکانەوە کەوتووەتە خوارەوە. لە دوازدەیەم میلدا ئاوایی و دەروازەی (تێدنان)* کەوتووەتە قولاییی دوورگەیەکی چکۆلە یا کەنداوێك، ئاڕاستەکەی

---

[1] ئەخلات، شارێکە زۆربەی جار ناوی لە مێژووی جەنگەکانی ئەرمینیا، گریکەکان، ئێرانییەکاندا دێت و ئەرمەنەکان بە دەوری خۆیان لە کێشەدان تا بیخەنە ژێر دەستی خۆیان. جەلالەددین، دەستی بەسەردا گرت، بەڵام لە لایەن عەلائەددینی سوڵتانی ڕۆمەوە، کە بنەماڵەکەی ماوەی سەدەیەك لەبن دەستیاندا بوو، خستیەوە ژێر دەستی خۆی، پاشان داگیرکرا. بەم شێوەیە وڵاتانی دوای ئەوە هاتن و چووە بن دەستی دەسەڵاتی تورکان.

[2] ئەوسەری گۆلەکە لەم ناوچەیە بریتییە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

* Tednan

ڕۆژهەڵاتی باشوور-ڕۆژئاوایە. لە سێ میلی ڕۆژئاوادا، ئاوایییەکی دیکەی (شەرباس)** ناو لە باوەشی چیادا دەبینرا، هەرچەندە ئێمە لە وادەی سەفەرەکەمان نزیك دەکەوتینەوە. قەدپاڵی چیاکان بە گوڵێکی کێویی تێکەڵ بە داربەڕووی بچووك و دارهەرمێ ڕازابووەوە. لە سێزدەهەمین میلدا داگەڕاینە ناو دۆڵێك کە زنجیرەچیای (نەمروود)ی لە زنجیرەچیای (هەترەش)* جوێ دەکردەوە. چیایەکی بەرز، لە (مووش)ەوە بەسەر کەناری باشووری گۆلی وان و دەروازەی چوونە ناو ئێراندا درێژدەبێتەوە، لەگەڵ (سەهەند Sahand) و (گیرۆس Girous) یەکدەگرنەوە. ئەم چیایانە لە ناکاو بە ڕۆخی ئاوەکەدا ڕۆدەچوون" کاتێك بەرەو قوولایی و بەرزایی لێژی دەریا دەردەکەوتن،" لووتکەکانیان ڕووتەن و بەردەلان بوون، و بەفر بە درێژایی کاتەکانی ساڵ دایپۆشیوە، بەڵام بەرەو ژێرخان کەمتر نەزۆك بوون، و لە هەندێك جێ قەراغیان بە لق پۆپ دادەپۆشرا. ئەم ناوچەیە پارچەپارچە دابەش بووە بەسەر چەند بەگێکی کورددا کە هەموو لووتبەرزی و دەبەنگییێکی سینۆرە گەورەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتیی ئێمە، لەناو ماڵە قایم و مکوومەکانی خۆیاندا دەنوێنن. ئەو بەگانە زانیویانە چۆن داکۆکی لە سەربەخۆیی خۆیان بکەن دژی فارسەکان و تورکەکان.

گوندی (چۆکار) هیچ شوێنێکی ئاسوودەی تێدا نەبوو، تا سەرخەوێکی تێدا بشکێنین. وێڕای فێنکیی شەو، ناچار بووین قاڵیبەکانمان بەسەر کورسییەکی درێژی لای نوای بەردەرگای کڵێسەیەکدا ڕابخەین، بینایەکی بچکۆلەی شێوە لاکێشەی لە بەردی داتاشراو دروستکراوی لێ بوو، تەنیا چەند

** Sharbas

* Haterach

تیشکێکی کەمی لە چەند پەنجەرەیەکی بچووکی گۆتیکی[1] کلاوڕۆژنەیەکەوە لێ دەهاتە ژوورەوە. هەر گوندێك پاپا یا قەشەی خۆی هەیە، لەناو دێرێك یا شارێکی گەورە پەروەردەبووە و لە لایەن پاتریارشی ئەرزەڕۆمەوە دیاری دەکرێ. ئەبرەشییەکان تەنیا ساڵی یەك جار لە لایەن ئوسقۆف و شەمماسەکانی کڵێسەوە سەریان لێ دەدرێ، ئەوانیش بە بیانووی گەڕان بە دوای هەڵسوکەوت و ڕەفتاری نوێنەرەکانیاندا، دەیانزانی چۆن پارە لە جووتیارەکان بکێشنەوە. لە (چۆکار)، بە ئامانجی چارەسەرکردنی خەڵکانی خۆمان، دوای ئەو سەرەڕۆییەی کە ئێستە گێڕامەوە، بەرخێکمان بە سێ پیاستەر (سێ فرەنك) کڕی. لە نیوەی ڕێگەدا چاومان بە تاقمێکی لێزگییەکان کەوت، بە چاوێکی گومانەوە سەیری ئێمەیان دەکرد و نیشانەی ئەوەیان لێ دەردەکەوت بەتەمابن پەلاماری ئێمە بدەن، لەگەڵ ئەوەشدا لێمان گەڕان. تاوێکی دیکە چەندانێکی دیکەی تەواو سوار و چەکداری وەك تاقمی یەکەممان بینی. لەبەرئەوەی من کەمێك لە پێشەوەی کاروانەکەی خۆمان بووم، هەوڵیان دەدا بموەستێنن، بەڵام هەوڵەکانی ئەوانم وا لێ کرد بێسوود بن، ئەوسا ڕایانکردە لای بەڕێز چاڤاس و بەوە سووریچییەکانیان وەستاند، بە هەوایەکی پڕ لە هەڕەشەوە داوایان لێ کردین: دەچین بۆ کوێ؟ دوای ڕاوێژێکی چەند ساتێك، یەکێك لەوانە غەدارەکەی (چەکێکی بچووکە) ئامادەکرد و خۆی فڕێدایە سەر ئەسپەکانی جانتاهەڵگرەکان و دەستی بەسەر یەکێکیاندا گرت. ڕێبەرەکە و دەستوپێوەندەکانی لەگەڵ ئێمەدا نەبوون، کەچی سەرباری ئەوە وەختایەك بینیمان لێزگییەکان دەستیان بەسەر کەلوپەلەکانی ئێمەدا گرتووە، نەقیزەمان لە

---

[1] زەنگ: پارچە تەختەدارێکی نزیکەی دوو گرێ درێژە، بەسەر سێ یا چوار گرێ پانابیدا کون کراوە. کوونی بچووك بچووکی تێدا کراوە، بە بنمیچی کڵێسەدا هەڵدەواسرێ. بە کوتەکێکی بچووك یا چەکوشێك لێی دەدرێ بۆ بانگکردنی خەڵك.

ئەسپەکانمان دا و دەمانچەبەدەست هەڵمانکوتایە سەریان. ئەو کاتە ئێمە ئامادەبووین و بڕیارمان دابوو بەرگری بکەین، ئەوان وازیان لە نێچیرەکانیان هێنا و ڕوویان وەرگێڕا، بە هەنگاوی خێرا ڕایان کرد بۆ ئەوەی -بە مەزەندەی ئێمە- بە هانای هاوڕێکانیانەوە بچن. لە تەواوی ئەم نوواندنەدا، مەحموود ئاغا لە حاڵەتێکی تەواو بێهەستیدا بوو، پشتی کردبووە دزەکان و نیشانەی ترسێکی گەورەی پێوە دیاربوو. ئەو کاتەی بەڕێز چاڤاس بانگی کرد، تەماشای کرد بێ ئەوەی وا نیشان بدا گوێی لێ بووە. بەوەدا کە کوردەکە و هاوەڵەکانی چەند ساتێك دواتر گەیشتن، بەردەوام بووین لە ڕۆیشتنی خۆمان بەبێ ئەوەی نیگەران بین.

٢- سەعات شەشی بەیانی بەڕێکەوتین، پلەی گەرما لە (١٤½) °٦٤دا بوو. لەوەتەی لە ئەرزەرۆم دەرچووبووین، ئاووهەوا بەرەبەرە خۆش دەبوو و سەرەڕای فێنکیی شەوان، کەچی گەرمایەکە لە ڕۆژدا زۆر بەتاو بوو. لە ماوەی یەکەم پێنج میلدا، ڕێگەکە بەناو دۆڵێکدا، یا زیاد لەوە بەناو پێدەشتێکدا دەڕۆیی، دوو چیای لە یەك جوێدەکردەوە. لە شەشەم میلدا، ڕووباری (بتلیس-سوو)مان لە نزیکی سەرچاوەکەی بڕی و پاشماوەی ڕێگەکەمان بەسەر کەناری دەستەڕاست و بە دەریچەیەکی ناو چیای (هەترەش)دا بڕی، لە هەشتەمین میلدا گوندی (سەحەرSahar) بوو و لە نۆیەمین میلدا، بەناو جۆگەلەیەکی بچووکدا ڕەتبووین تاڤگەیەکی جوانی لای دەستەچەپمان، لەو شوێنەدا کە لەگەڵ بتلیس-سوو Betlis-Sou یەکیدەگرتەوە، دروست کردبوو. لە دەیەم میلدا، سێیەمین جۆگەلە، لەگەڵ دووەکەی دیکە یەکیاندەگرتەوە. ئەم برە ئاوە کۆبووەوە لە کاتی هاتنە خوارەوەیدا لە گاشەبەردێکەوە بۆ گاشەبەردێك، تاڤگەیێکی پێکهێنابوو، کەمێك بەر لەوەی بگەینە ناو بتلیس، دەکرا ببیندرێ. بەگی بتلیس ئەپارتومانێکی لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ ئامادەکردبووین، کە لەوێ

زۆر باش دەبووین ئەگەر ئێمە بمانتوانیبایە بە تەنیا بین، بە شێوەیەك کە کونجکۆڵیی (فزولیەت) دانیشتووانەکە هێندە زۆر بوو، ژوورەکە لە گەیشتنمانەوە تا دەرچوونمان بۆ تاکە ساتێکیش چۆڵ نەبوو. نیو سەعات دوای ئەوەی ئەم ئەپارتومانەمان وەرگرت، بەگ هات سەری لێ داین. پیاوێکی زۆر چاك بوو، شێوازەکانی بەحورمەت بوون، جیاواز بوو لە هەموو دەستوپێوەندەکانی کە خەڵکی کێوی و بێڕێز بوون.

پێم وابوو بەگ زۆر حەزی دەکرد چەکەکانمان تاقی بکاتەوە، بەڵام نیشانی دا زۆر قێزی لە دەمانچەکانمان دەبێتەوە، درێژەی پێ دا کە ئەم دەمانچانە زۆر کورتن و هێندە ڕازاوە نین[1]. بەگ لە میسر بووە[2] و باسی سێر

---

[1] ئەوە بە هیچ شێوەیەك بۆ جوانیی کارکردنی چەکەکە نیە، کە کوردەکان بەدوایدا دەگەڕێن، بەڵکوو لەبەر درێژیی چەکەکە و ڕازاندنەوەی چوارچێوەکەیەتی کە کوردەکان بەدوایدا وێڵن.

[2] بەڕێز کینیێر تێبینیەکی لێرەدا نووسیوە، بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ پەرێزی جەنەڕاڵ بۆناپارت پاكبکاتەوە لە نزیکبوونەوە لە گوللەبارانکردنی بەدبەختانی تارۆس، کە بە ژمارە سێهەزار و پێنجسەد کەس و لە ئۆردووی یافا بوون. ئەو، لافی ئەوە لێ دەدا کە ئەم کردەوەیە لای پاشا بە شاراوەیی ماوەتەوە، ئەو باسی چەندین تورکی دیکەش دەکات، کە لە دژی فەرەنسایيەکان لە میسر و لە سووریە جەنگان، کە نابێ و ناشێ هەبووبێ. بەڵام ئێمە هیچ کاردانەوەیەکمان لەو بارەیەوە نیە و بۆ سەلماندنی ڕاستی، تەنیا بەوەندە دەستبەردار دەبین کە لێرەدا گەواهییەکانی سێر ڕۆبێرت ویلسن لە کتێبی (*History of the British expédition to Egypt*) و کتێبەکەی مایێ بهێنینەوە، کە لە چاپی دووەمی بەرهەمە بڵاوکراوەکەی (*Campagnes*) en *Syrie* et *des Français en Egypte* پاش ڕووخانی "بۆناپارت"یدا، بەم تاوانە قایلە. لە لایەکی دیکەوە، گەواهی پێویستیش سەبارەت بەو ڕووداوە هەیە، هەموو بیروڕایەکی

سیدنی سمیس[1] و کۆمەڵە ئەفسەرێکی دیکەی ئینگلیزی بۆ کردم، پیاوێك زۆر بە چاکی دەیناسی. کوردەکان گەورەترین هۆگری چەکی وا جوانن کە هەرگیز نەمبینیون، جوانیی ئەسپەکانیان و دەوڵەمەندیی جلوبەرگیان وای لێ کردوون هەموویان شانازیکەر بن. وەختایەك سەرۆکێکی کورد دەچێتە مەیدانی جەنگ، کەرەستەکانی زۆر کەم جیاوازییان هەیە لە کەرەستەکانی سوارە کۆنەکانی ئێمە و ئەو عەرەبانەی کە لەژێر ئاڵاکانی سەلاحەددینی گەورەدا دەجەنگان، بێگومان بە هەمان ئەو شێوەیەی ئەوانەی وا ئەمڕۆ شەڕی ئێرانییەکان دەکەن، پڕچەكبوون. سینەیان بە کۆرسێتێکی ئیستیل پارێزگاریی لێ دەکرا، کە بە زێڕ و زیو داپۆشرابوو لە کاتێکدا سوپەرێکی دارینی گچکە، بە چڕی بە بزماری مسی بزمارڕێژ کرابوو، بە شانی چەپیدا هەڵواسرابوو ئەو کاتەی بە کار نەدەبرا. توورەگەیەکی بچووکی دارین لە بزماری برۆنزی بە پشتی ئەسپەوە هەڵدەواسرێ، شمشێرەکەی خۆی هەڵدەگرێ، دەمانچەیەك بە پشتییەوە کراوە، دەمانچەکان و خەنجەرەکەی لەبەرپشتێنی چەقاندووە، بە تەکیەوە شمشێرێکی سووك، توورەگەیێکی بچووك بە لای چەپی زینەکەوە هەڵواسراوە، سێ شمشێری نزیکەی دوو پێ و نیو درێژ بە خۆیەوە دەگرێ، لە لای چەپیشەوە، بە قەڵپووزی زیندا، کوتکێکی ئاسنینی دڕکاوی، کە لە هەموو چەکەکان ترسناکترە و درێژییەکەی دوو پێ و نیووە، برێکیان بە زێڕ و برێکی دیکەشیان بە بەردی گرانبەها ڕازێنراونەتەوە. وەبیرم دێ کە من یەکێکم لەوانە لە مۆزەخانەی چەکخانەی درسدن بینی، تەواو وەك ئەوەبوو کە ئەمڕۆ لە کوردستان بەکاردەهێنرێ. تیرەکان خاڵێکی تیژیان هەبوو، شەش گرێ دەبوو و

سیاسی دەخاتە لایەك، دەیەوێ ڕاستی بخاتەوە شوێنی خۆی. (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسایی)

[1] Sir Sidney Smith

لەوسەری سەرووی پارچەیەکی ئاسنی قورس یا قورقشمە، بێ ئەوەی بخرێتە سەر هێزەکەی کاتێك دەهاوێژرێن.

ئەوەتی لە (لیزە) دەرچووین، ڕێگەکە بەشوێن ئاڕاستەیەکی گشتیدا دەڕۆیشت کە بەم شێوەیە بوو: سێ میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، سێ میل باشوور- ڕۆژهەڵات -ڕۆژهەڵات، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل ڕۆژهەڵات-باکوور، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات-ڕۆژهەڵات، یەك میل و نیو ڕۆژهەڵات -باشوور، دوو میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، دوو میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل باشوور-ڕۆژهەڵات -ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، سێ میل باشوور-ڕۆژهەڵات-باشوور، شەش میل باشوور- ڕۆژهەڵات، سێ میل باشوور-ڕۆژئاوا، دوو میل و نیو باشوور-ڕۆژئاوا، دوو میل باشوور-ڕۆژئاوا، دوو میل ڕۆژئاوا- باشوور-ڕۆژئاوا، پێنج میل باشوور-ڕۆژئاوا-باشوور، سێ میل باشوور-ڕۆژئاوا-، دوو میل باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا.

٣- پیرەمێردە کوردەکەی کە لێرەوە لەگەڵمان هات، ئەو ماوەیە هێندە مشوورخۆری و شەرافەتمەندیی لە ڕێگە نیشان دا، ئێمە بیری ئەوەمان کردەوە پێویست دەکا بەخششێکی لە ئاسایی زیاتری پێشکەش بکەین. بەڵام ڕێی تێنەدەچوو بەمەندە ڕازی ببێ و بە بیانووی پاداشتدانەوەی خەڵکانی بندەستی خۆی، زیاد لەوە چەند ڕووپیەیەکی داواکرد، منیش پێم دا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی دیکە لە ئێوارەدا هاتەوە و داوای لێ کردم وەك قەرز دە پیاستەری پێ بدەم، گفتی پێدام بەیانییەکەی بۆم بگێڕێتەوە، بەڵام درکم بەوە کرد کە ئەم قەرزە هیچ نییە، جگە لەوەی بیانوویێکە بۆ قاچانەوەی پارە لێم، بۆیە

ڕەتم کردەوە و پێم گوت: من تووڕەبووم لەوەی کە هێندە پارەم پێداوە. بینیی هیچ شتێکی لەگەڵ ئێمە نەماوە، بە

تووڕەییەوە دەرچوو و بیست جار زیاتر لە کاتی چوونە خوارەوەیدا بە پەیژەکە، ئێمەی بە گاور ناوبرد، ئەسپەکەی لە حەوشەکە بەستبووەوە، سواری بوو و ڕووی خۆی وەرگێڕا. پێم وایە بەرژەوەندی و ترس تاقە پاڵنەرێکن، تا موسوڵمانێك بتوانێ شەرافەتمەندی بداتە پاڵ مەسیحییەك.

## وەسفی بتلیس، ڕێگەی سێرت

بتلیس، پایتەختی ئەم بەشەی کوردستان، کەوتووەتە ناو دڵی چیاکانی (هەترەش Haterach)، لەسەر کەنارەکانی دوو چۆمی بچکۆڵە، کە دەرژێنە دیجلەوە. لە شێوەدا، هەڵکەوتەکەی لەسەر شێوەی قرژاڵە، قەڵاکەی ئەپارتومانێکی کەونارایە، بەڵام هێشتا جوانە و شێوەی جەستەی مرۆڤە و ڕووبارەکانیش، کە لە چەندین لاوە دەڕژێنە ناویەوە، دەستەکانیەتی. شارەکە ئەوەندە کۆنە، بەگوێرەی گێڕانەوەی کوردەکان، هەر چەند ساڵێك ڕاستەوخۆ دوای کەشتییەکەی نووح لەلایەن یەکێك لە وەچەکانی نووحەوە[1] دروستکراوە. ماڵەکان زۆر باش لە بەردی داتاشراو دروستکراون، سەربانەکانی ڕاستەوڕاستن. ماڵەکان، زۆربەیان باخی دارسێو، دارهەرمێ، دارقەیسی، دارگوێز و دارگێلاسیان بەدەورەوەیە. شەقامەکان -بە گشتی- لێژن و هاتوچۆکردنیان پێیدا سەختە، هەر ماڵێك بۆ خۆی قەڵایەکی چکۆلەیە، وریایی لە وڵاتێکدا کە ئەوەندە گیرۆدەی پشێوییە، بێسوود نییە. هەندێك لە ماڵەکان پەنجەرەکانیان گەورەن و ئەوپەڕی سەروویان بە تاقێکی کەوانەیی وەك

---

[1] بەگوێرەی ئێرانییەکان، ئەو چوار شارەی کە یەکەمجار درووستکراون، بریتین لە: بەلخ لە (ترانسۆکسان- ماوراء النهر Transoxane)، هیرات لە خوراسان، مەراغە لە ئازەربایجان سەر گۆلی ورمێ و هەروەها شاری نەخچەوان. (تێبینیی وەرگێڕی فەڕەنسایی).

باڵەخانە گۆتیکەکان کۆتایی دێت. قەڵاکە، کە بەشێکی خەڵکی تێدا دەژی و بەشێکیشی وێران بووە، پێم وایە دەستکردێکی کەونارایە و کەوتووەتە سەر گاشەبەردێکی دوورەتەریك و بە ئەستوونی لە بۆشایی و ناوەڕاستی شارەوە بەرزدەبێتەوە. ئەو قەڵایە نشینگەی خانە کۆنەکان، یا بەگەکانی بتلیس، لە بەهێزترین شازادەکانی کوردستان بووە، کە ڕق و کینەی بنەماڵەیی لەناوی بردوون. دیوارەکانی لە هەمان ئەو بەردە دروستکراون، کە ماڵەکان و ئەو شوورا نزیکەی سەد پێ بەرزانەی لێ دروستکراون. بتلیس سی مزگەوت، هەشت کڵێسە، چوار حەمام و ژمارەیەك خانی لێیە. دانیشتووانەکەی -وەك دەڵێن- دوانزەهەزار کەس دەبن، نیوەیان موسوڵمان و ئەوەی دیکەش مەسیحیی ئەرمەنین، بیست پردی بەردین لەسەر ڕووبارەکان دروستکراون، هەریەکەیان کەوانەیەکی بەسەرەوەیە. بازاڕەکانی کەرەستەگەلی زۆری سەوزە و کەرەسەی دیکەی لێن، بەڵام بۆ قوماش و شتی لەوجۆرە، تا دواڕادە گرانن و زۆر بە زەحمەت دەتوانین دەستیان بخەین. بازرگانەکان هەندێك جار سەرەڕۆیی دەکەن، قوماش بە کاروانی تەواو چەکدارەوە دێنن. بەڵام ڕەوشی هەرێمەکە بە شێوەیەکە بەردەوام ترسی ئەوەی لێ دەکرێ کەلوپەلەکانیان تاڵان بکەن، یان بیانکوژن.

سێو، هەرمێ، گوێز و هەڵووژە، زۆر بە تەواوی دەگاتە بتلیس، ڕەزی مێوی (گوڵتی Goulty)، گوندێکی شەش میلی دەستی ڕۆژهەڵاتی شارەکە، جۆرە ترێیەکی ئاوا نایاب بەرهەمدەهێنێ، کە دەکرێ باشترین شەراب و براندی (عەرەق)ی لێ دروستبکرێ، بەڵام زەوییەکان -بە گشتی- کراونەتە لەوەڕگا و سروشتی وڵاتەکە، ئەگەر بیروڕای لەسەر ڕواڵەتی دەرەوە لە بارەوە بنیاتبنرێ، کشتوکاڵی میوە و سەوزەی تێدا پەسندترە، وەك لە کشتوکاڵی دانەوێلە. باخچەکانیان لە جۆگەی بچووك یا ئەو ڕێرەوە ئاوییانەوە ئاودەدەن کە لە

ڕووبارەکان یا چیاکانەوە دێن و من بە دەگمەن گەلی نەخوێندەوارم بینیوە ئەوەندەی ئەوان باشتر شارەزای هونەری ئامێری بەئاوگێڕان (هایدرۆلیکی) بێ. بڕێك لە جۆگەکانیان لە دووریی پێنج یا شەش میلەوە ئاو دەگوازنەوە. ئەوانە بریتین لە جێ‌هەڵکۆڵین و چاڵی بچکۆلە، لە دەوروبەری بناری بەرزاییەکانەوە هەڵکەندراون، بەوپەڕی وردەکارییەوە ئاستی ئاوەکە ڕادەگیرێ، بەبێ ئەوەی ناچاربن پەنا بۆ ئامرازی ژماردن ببەن. هەل‌ومەرجێکی نائاساییە، ئەگەر بیربکەینەوە کوردەکان میللەتێکی نەزانن، بێ‌پەروەردە، هەتا ڕەگەزێکی دڕەندەشن، بە شێوەیەکی سروشتی شانازیکەر و جەنگاوەرن، بۆیە ئەگەر باوەڕی ئایینیان لێ دەربێنین، دەبینین داب‌ونەریتی تایبەتیان لەوەتی هێرشەکەی زەینەفۆنەوە هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە. بتلیس، لە لایەن بەگێکەوە حوکمڕانی دەکرێ، کە پاشای مووش دیاریی دەکا، بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە دەستی خانە کوردەکانە، کە وەچەگەلی سەر بە میرنشینێکی دوورودرێژی ئەو پیاوماقوولە دەرەبەگانەن، کە جاران سەرداری هەموو زەوی‌وزارەکانی دەوروبەر بوون. چەند ساڵێك دەبێ، بتلیس بووەتە ڕەعیەتی بابی‌عالی[1] و سەرانەیەکی ساڵانە دەدا.

لە (لیزە)ەوە، ڕێگەکان تا ڕادەیەك باش و شیاون بۆ تۆپ، گالیسکە و هەموو جۆرە عەرەبانەیەك. هەڵبەت ئەم بەخششانە تەنیا لە کاتی هاوین و پاییزاندا دەتوانین لێیان سوودمەند بین، چونکە زستانان وڵات دەکەوێتە ژێر بەفرەوە، بە جۆرێك کە بەفرتوانەوە لە بەهاراندا دەبێتە هۆی سێڵاوی گەورە و پێوەندییەکانی نێوان شارەکان زۆر زەحمەت دەکا. بۆیە من وای دەبینم، شتێکی ئەستەم بێ جەنگ لە هیچ بەشێکی ئەرمەنستانی ڕۆژئاوادا لە ماوەی چوار یا

[1] بابیعالی: بارەگەی سەدری ئەعزەمیی عوسمانی، کە ڕاوێژکار و سەرۆکی شورا و وەزیری ناوخۆی لێ بوو (وەرگێڕ).

هەتا پێنج مانگدا بکرێ. وەك چۆن کشانەوەی دەهەزار کەسەکە هەمیشە مێشکی داگیرکردبووم، لە سەفەرەکانمدا بەناو چەقی بیابانی سوتێنەری عیراق، عەرەبستان و ناو چیایە سەختەکانی کوردستاندا، ناتوانم بیربکەمەوە بەبێ ئەوەی هەستێکی سەرسامیم هەبێ بەرامبەر بەو هەموو ئاستەنگ و کۆسپانەی وا ئەم جەنگاوەرانە، یان زیاتر ئەم پاڵەوانانە، بەرگەیان گرتوون. ڕۆیشتنی سوپایەك ماوەیەکی ئەوەندە دوورودرێژ، بەناو وڵاتێکی ئاوهادا، دوژمنێك لە پێشەوە و دوژمنێکی تر لە دواوە و ڕۆژانە بەرەوڕووبوونەوەی کەمیی ئازووقە، لەناو جەرگەی سەختییەکانی زستانی ئەرمەنستاندا، لە تۆماری جەنگدا شتێکی بێوێنەیە و دەکرێ وەك نموونەیەکی ناوازە ئەژمار بکرێ، بۆ ئەوەی کە کارامەیی و سووربوون دەتوانن بیکەن.(١)

سێ ڕۆژ لە بتلیس ماینەوە، سپێدەی ٧ی مانگ بۆ سێرت، تیگرانۆسێرتی Tigranocerte کۆن دەرچووین. بەو بەرزاییانەدا هاتینە خوارەوە کەماڵی ئاغایان لێ بوو و لە سوورانەوەی دەوری قەڵادا، بەناو بازاڕێکی کۆندا ڕۆیشتین. من تێبینی چەند مزگەوتێکی جوان و کۆلێژێکی چۆڵکراوم کرد، بووبوون بە کەلاوە. پاشان چووینە ناو ژمارەیەك چۆم، کە شارەکە کەوتبووە ناوەڕاستییەوە. ژمارەیەکی زۆر لە ماڵەکان بە گەڵای چڕوپڕی داران داپۆشرابوون. لە کۆتایی یەکەم میلدا ماڵەکانی قەراغ شارمان بەجێهێشت و یەك لەدوای یەك دووجار بەناو ڕووبارەکەدا تێپەڕین، درێژەمان بە ڕۆیشتنی سەر کەناری چەپی ڕووبارەکە دا. زەوییەکە سەخت و بەردەڵان بوو، ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی لە شار دەربچین، ئەو دوازدە کوردە کێوییەی، کە پاسەوانەکانی ئێمەیان پێكدەهێنا، بەردەوام بە هەزار بڕوبیانووهێنانەوە

---

(١) پلۆتارك Plutarque دەڵێ: ئەنتۆنی لە کاتی کشانەوە کارەستبارەکەی ناو ئەرمینیادا، چەندین جار هاواری کردووە: هۆ سوپا دەهەزارییەکە!

دەوەستان. وەختایەکیش دواجار ئێمە خۆشبەختانە بەڕێ‌کەوتین، دەیانویست سواری سەر پشتی ئەو ئەسپانە ببن کە جانتاکانیان لەسەر پشت بوو، بە جۆرێك کە هەر یەکە لەو ئاژەڵە بەستەزمانانە، جگە لە باری ئاسایی کە هەڵیانگرتبوو، دەبوو سەربار یەکێك لەو تاڵانچییانەش هەڵبگرن. ئێمە نەماندەتوانی قسەیان لەگەڵ بکەین، چونکە هیچ کامێکیان نە تورکی و نە فارسییان دەزانی و خزمەتکارەکانی ئێمەش هیچیان بە تەواوی زمانی کوردییان نەدەزانی؛ ڕەوشێك کە کەمێك باش بوو نەبووە هۆی پشێوی. لە سێیەم میلدا، کەناراوەکانی ڕووبارێکمان بەجێ‌هێشت، ڕووبارەکە لەوێدا پازدە پێ درێژ بوو و تیژڕۆییەکەی تا ئەوپەڕی بوو. پاشان لە سووڕانەوە بۆ باشوور- باشوور-ڕۆژئاوا، بەشوێن توولەڕێیەکانی دۆڵێکدا چووین. پاش ئەوەی دوو میلمان لەم دۆڵە بڕی، جۆگەلەیەکی چکۆلە لە دەستەڕاستمان بوو، گەیشتینە شوێنێکی ناوەڕاستی چیاکان و شەشەم میل گەیشتینە ئاواییەکی چکۆلەی شاردراوە لەناو دارگوێزان. لەوێوە بەبێ ئەوەی ڕاوەستین، گەیشتینە سەر بەرزاییی گردێکی بڵیند، پاشان دابەزینە ناو دۆڵێکی ڕۆمانتیکی و باش چێندراو و لە هەشتەم میلدا، گەیشتینە گوندێک بەناوی (ئیولاكEulak). بۆ چەند سەعاتێك لەسەر قەراغەکانی جۆگەلەیەکی چکۆلە و ژێر سێبەری دارگوێزێکی گەورە وەستاین. خۆرەتاوەکە بۆ ئەوان سووتێنەر بوو و کاتی ڕۆیشتن، من خۆم بە سەختی توانیم لەسەر ئەسپەکەی خۆم دابنیشم. چیاکانی دەوروبەر پڕبوون لە بەردی مەڕمەر. لە فێنکیی ئێوارەدا، جارێکی تر سەرکەوتینەوە سەر پشتی ئەسپەکانمان و میل‌ونیوێکمان بەناو دۆڵێکدا بڕی، بەناو چەندەها کێڵگەدا کە باش چێندراو بوون و ڕازاوە بە باخچەی سێو، هەرمێ، توو، هەڵووژە و گوێز ڕەت‌بووین. لە کاتی بەجێ‌هێشتنی ئەم شوێنە دڵڕفێنەدا، سەرلەنوێ چووینەوە ناو ئەو چیایانەی کە بە داربەڕووی بچووك داپۆشرابوون و بە زۆری گوێزی مازوویی

بەرهەمدەهێنن. ڕێگەکە چوار میل بەناو زنجیرە لێژاییەکی شێواو و هەزاربەهەزاری ناو چیاکاندا دەڕۆیشت و زیاد لە جارێك ناچاری وەستان بووین بە فەرمانی پاسەوانەکان کە لەسەر ڕێگە هاواریان دەکرد و بە خۆیان و ئەسپە جانتاهەڵگرەکانەوە بە فێڵ دەچوونە ناو دارستانەکان، بێ‌گومان بۆ دەستبەسەرداگرتنی یەکێك لەوانە بوو. دواتر زانیم ئەوان واخەیاڵیان کردووە باوڵەکەی بەڕێز چاڤاس Chavasse پڕییە لە زێڕ و منیش تێبینی ئەوەم کرد لە هەمان کاتدا سەرنجیان بەتایبەتی بڕیوەتە سەر ئەم باوڵە. لە کۆتایی پێنجەم میلدا بەناو دۆڵێکی تەسك‌وتروسکی نێوان دوو لای چیایەکی دڵگیردا دابەزین، لە کوارتز (بەردی بلووری) و کلینکستۆن و تێکەڵ بە کوارتز پێك‌هاتبوو، بڵندایییەکەی لە هەردوو لاوە بە ئەستوونی بەرزدەبووەوە. دوندی چیاکان بە داربەڕووی شۆڕبووەوە داپۆشراو بوو و سپی بووبوو بە بەفر. ڕووبارێکی تیژڕۆ[1] بەناو دۆڵەکەدا بەرەو باشوور دەڕۆیی. دواتر زانیم ئەوە یەکێکە لەو دوو ڕووبارە کە بەناو بتلیس‌دا دەڕوا. لەتەك ئەم ڕووبارۆچکەیەدا ماوەی دوو میل ڕۆیشتین، تا گەیشتین بەم شیوودەرە، کە لقەکانی درەختەیلی داربەڕوو، دارەڕەش، دارسێو، دارگوێز سێبەریان بەسەرەوە کردبوو. لێرەدا و لە هاتنمانەوە بۆ کوردستان، بۆ یەکەم‌جار کێڵگەی مەرەزەم بینی، بە چەندین

---

[1] لە پێشدا وتم: دوو ڕووبار بەناو بتلیس‌دا تێپەڕ دەبن؛ یەکەمیان ئەوەیانە کە سەرچاوەکەی لە (نەمروود-داغ) Nimroud-Dâg ی نزیك بە گۆلی (وان)ەوە هەڵدەقوڵێ و ئێمە ڕۆژێك بەر لەوەی بگەینە ناو شارەکە، شوێن کەنارەکانی کەوتین. ڕووبارەکە دەردەکەوێ و لەناکاو بەرەو لای باشور-ڕۆژهەڵات وەردەسووڕێ، پاش ئەوەی نیوەی شارەکە ئاودەدا. ئەوە هەر هەمان ئەو ڕووبارەیە کە جارێکی تر لە دۆڵی (شێخ جامی Chek Djama) پێیدا پەڕینەوە. دووەم ڕووبار کە بەناو بتلیس‌دا دەڕوا، لە ڕۆژئاواوە دێ، ئەوەیە کە ئێمە لە ڕۆژی بەجێ‌هێشتنی ئەم شارەوە، دووجار بەناویدا پەڕینەوە.

جۆگەلەی بچووکی لە ڕووبارەوە لێدراو ئاودەدران و داچێندرابوون. لە حەوتەم میلدا، بەسەر پردێکی دارینی تەك پردێکی دیکەی زۆر کۆن کە لە بەرد درووست کرابوو، پەڕینەوە، لە حەوتەم و نیو میلدا، گەیشتینە دێی (شێخ جامی Chek-Djama)، شوێنێکی هەژار و کلۆڵ، لەوێ وەستاین بۆ ئەوەی شەو تێیدا بمێنینەوە. بەگی بتلیس پێی وتبووین پاسەوان و ئەسپەکانمان تا سێرت دەمانگەیێنن، بەڵام بە گەیشتنمان بۆ (شێخ جامی Chek-Djama)، ڕێبەری پاسەوانەکان ئێمەی ئاگەدارکردەوە کە فەرمانی بۆ هاتووە یەکسەر و بەبێ‌دواکەوتن بگەڕێتەوە بۆ بتلیس و ئیبراهیم ئاغا، ئەو سەرۆکەی کە لە ئاوایەکی دوو میل دوور لێرەوە نیشتەجێیە، ئەوەی پێویست بێ دەمانداتێ. خۆشبەختانە ئێمە نامەیەکمان بۆ ئەو ئیبراهیم ئاغایە هێنابوو، بە پەلە بۆمان نارد. لە سەعات حەوتی سپێدەدا پلەی گەرما (١٧°) ٧٠°، لە سەعات دەدا (٢٠°) ٧٦° و لە نیوەڕۆدا (٢١°) ٧٩° و لە کاتی خۆرئاوابووندا (١٩°) ٧٤°ی نیشان‌دەدا.

٨ی مانگ. لە کاتێکی زۆر زووی سپێدەدا، ئیبراهیم ئاغا سەری لێ‌داین و پێشوازیمان لێ کرد، وا دیاربوو سەرەتا ئامادەیە هەمان پاسەوان و هەمان ئەو ئەسپانەمان بداتێ، کە ئێمە لە بتلیسەوە پێیان هاتبووین، بەڵام زوو ڕاکەی خۆی گۆڕی و تکای لێ‌کردین خۆمان بگەیێنینە (شێخ جامی)، کە ئاواییەکانی هاوسێی ژمارەی پێویستی ئەسپیان لێیە. بیرۆکەی گلدانەوەمان لەم شوێنەدا، مایەی خۆشنوودیی ئێمە نەبوو، بەڵام باشترین سیاسەتمان ئەوەبوو، کە خۆمان لە چارەنووسمان بێ‌دەنگ بکەین و پاسەوانەکەمان بە بەخششێکی پارەی باش بنێرینەوە و بۆ خۆشمان دەستمان کرد بە پیاسەکردن بەناو ئاوایی و باخچەکاندا. لەم وڵاتەدا هەموو جۆرەکانی چارەوێ -پێم وابوو- زۆر باش سەرکەوتوون، مانگاکان بە هەمان شێوەی ئینگلستان قەڵەون و ئەسپەکان بەهێز، خێرا و چاك پێك‌هاتوون، بەڵام دانیشتوان مایینیان لا پەسندترە و لەو سۆنگەیەوە کە مایینەکان باشتر لە ئەسپەکان تا

ئەوپەڕی بەرگەی گەرما و سەرما دەگرن. من چەندین جار دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخساوە تێبینی ئەوە بکەم، کە دوای بڕینی ڕێگەیەکی دوور، لە کاتی گەرمادا، ماین و ئەسپەیلی یەختە زۆر کەمتر گیرۆدە دەبن، وەك لە ئەسپەیلی کەحێل. کە وایە سەخت نییە ئەوە وەبیر بهێنینەوە، کە ئەوانەی دوایی زیاتر هەستیارن و لە ئەنجامدا زۆر زووتر لەوانەی یەکەم ماندووتردەبن. عەرەبەکان زیاتر بەلای ماین دەچن، بەو هۆیەوە کە ماینەکان وەك ئەسپان ناحیلێنن و لە کاتی لەشکرکێشییەکانی شەوانەیاندا خیانەتیان لێ ناکەن. گەنم و جۆ و بڕێك جاریش وا دیارە برنج، تاقە جۆری دانەوێڵەیە، کە لە کوردستان بچێندرێ، بەڵام سەوزەیەکی زۆری بڵاوی وەك کاهوو و خەیار و کەلەرم .. هەیە.

٩. لە سپێدەیەکی زوودا ئەسپیان بۆ هێناین، بەڵام پێش ئەوەی ڕێگەمان بدەن کەلوپەلەکانمان باربکەین، ئیبراهیم ئاغا، تێی‌گەیاندین زۆر حەز لە لوولەی دەمی دارسەبیلەکەم دەکا. هەرچەندە چاك دەمزانی من دواتر پێویستم پێی دەبێ، سەرەتا ڕەتم‌کردەوە، بەڵام دوای پێداگرتنێکی زۆر، لە سەعات هەشتدا کە دەرچووم، ناچاربووم قەننەکەم و سەد پیاستەرم بەسەر کوردەکاندا دابەش‌کرد، لەدەست‌بدەم. دوای یەکەمین نیو میل، بەسەر کۆمەڵەچیایەکدا هەڵگەڕاین، کە کەوشەنی ڕۆژئاوای دۆڵەکە بوو. لە دووەم میلدا گوندی (سێپرا Sepra) م بینی، نشینگەی ئیبراهیم ئاغایە لەسەر کەناری ئەوبەری ڕووبارەکە و دوو میل لە ڕۆژئاواوە دوورە. لە سێیەمین میلدا، ڕووبارەکە لە بەرچاومان ون بوو، لەو شوێنەدا بەناو خەرەندێکی چاییدا بەلای ڕاستدا تێپەڕدەبێ. بەردەوام بووین لە سەرکەوتن بۆ ماوەی سێ سەعات. ئەوەندەی کە لە لوتکەکە نزیك دەبووینەوە، بەرزایی و گەورەیی زنجیرەچیاکان بەرەبەرە زیاتر دەبوون، دارستانەکە هێندە چڕبوو، ئێمەی بە تەواوی لەدەست قرچەی گەرمای خۆرەتاو ڕزگارکردبوو و بە گەیشتنە لوتکەی چیاکە، بەلای ڕەشماڵێکی چکۆلەی کوردە کۆچەرەکاندا ڕۆیشتین، لەناو خاکێکی ڕووتەن و نزیکی کانیاوێك

جێگیربووبوون. ئەو خەڵکانە لەسەر شیر، پەنیر و نانی داربەڕوو دەژین. ڕووکاری دەرەوەیان بێ‌ئەندازە هەژاریانی نیشان‌دەدا. قژیان درێژ و پەرت‌وبڵاو، دەکەوتە سەر دەم‌وچاو و شانیان و هەموو جل‌وبەرگیان تەنیا شەروالێکی خراپ بوو، کەلەکەکانی دادەپۆشین. لە کۆتایی سێیەم سەعاتدا، کاتێك گەیشتینە سەر لوتکە، لەوێوە دیمەنی هەموو ناوچەکە و لێواری زنجیرەچیایەکمان، کە بە کۆمەڵێك دۆڵ لێك جیادەبوونەوە، لێ دیار بوو، نیشانەی پیت و فەڕیان پێوە دەرکەوتبوو و وا دیاربوو پڕن لە داری بەردار. بەناو ڕێگەیەکدا هاتینەخوار، یان زیاتر بە توولەڕێگایەکدا دابەزین هەم زۆر ترسناك و زۆر سەخت بوو. لە کاتژمێر چواردا یا لە دەیەم میلدا، بەناو ئاوایییەکدا تێپەڕبووین ناوی (ئوراك Eurak) بوو و کەوتبووە ئەودیوی چیاکان. لە یازدەم میلدا، گەیشتینە قووڵایی و دوای ئەوەی جۆبارێکمان بڕی، کە لە ڕۆژئاواوە هەڵدەقوڵا، دەستمان کرد بەسەرکەوتنە سەر چیایەکی دیکەی سەر کەناری لای بەرانبەر. لە سیازدەم میلدا، لەسەر کانیەك وەستاین، بۆ حەسانەوەی ئەسپەکانمان، یا بۆ ئەوەی لێیان بگەڕێین لە گژوگیای زۆروزەوەندی دەوروبەر بخۆن. لە سەعات سێی پاش‌نیوەڕۆدا بۆ بەردەوام بوون لە وەسەرکەوتنی چیا، دوای ئەوەی سەعات و نیوێك ڕۆیشتین، گەیشتینە لوتکەی ئەو زنجیرەچیایەی وا پشتەکەی هێندە سەخت بوو کە بۆ دابەزین ناچاردەبووین پێ لە زەوی بچەقێنین. لێژایییەکە، لەوانەبوو سێ میل درێژ بێ و ڕێگەکە لە هەمووان نامۆتر بوو، من پێم وایە هەرگیز ڕێگای ئاوا سەختم نەبینیبێ. بەشێکی لە گاشەبەردی داتاشراو و بەشێکیشی لە بەردی زل‌زلی خڕ پێك‌هاتبوو، زۆربەیان شوێنیان گۆڕدرابوو، لە کاتێکدا هەندێکی تر ئەوەندە لووس بوون، ئەستەم بوو ئەسپەکانمان بە قاچی داخراوەوە پێیدا بڕۆن. لە نۆزدەم میلدا، لای ڕاستمان بەناو دۆڵێکی بچووك، هەرێمی ڕۆمانتیکی (تەسیل Tasil )مان لێ دیاربوو؛ لە دوو ئاوایی پێك‌هاتبوو و پشتیان بە ڕەزێکی زۆر بەرفراوان دەبەست، کە پێویستی هاوسێکانیشی دابین‌دەکرد. لە بیستەم میلدا بە جۆبارێکدا پەڕینەوە، بەردەوام بووین

بە کەناری ڕۆژئاوادا، بەناو دۆڵێکی تەسك و تەنگەبەردا شۆڕبووینەوە، کە کوردەکان تێیدا سەرقاڵی دروێنەی جۆرێك گەنمی دەگمەن بوون. وەرزی دروێنە لێرە لەوەی بتلیس لەپێشتر بوو. ڕێگەکە لە درێژاییی حەوت میلدا، بەناو ڕەزان و بەرز و نزمییەکانی دۆڵێکدا دەکشا و لەکاتی شەو ڕاکشاندا چووینە ناو ئاوایيەکی کلۆڵی (تەسکین Teskin) ناو. ناچاربووین لە دەرەوە هەر لە بەر هەوایەکی کراوەدا بخەوین، هەتا بە پارەش نەمانتوانی برێك شیر یا پارچەیەك نان پەیدابکەین، ئیسکۆرتەکە تەواوی شەو نەخەوتن، بۆ ئەوەی ڕێگە لەوە بگرن لە لایەن گوندییەکانەوە تالان بکرێین.

١٠. لەگەڵ گزینگی خۆرەتاو دەرچووین و بە بەرزاییەکانی چیایەکدا هەڵگەڕاین، لە پشت (تەسکین Teskin) بەرزدەبووەوە، ئەو چۆمەمان بەجێ‌هێشت، کە لە ڕۆژئاواوە هەڵدەقوڵا. لە سێیەم میلدا، بەناو زەوییەکی بەرز و نزمدا دابەزین و لە پێنجەم میلدا ئاواییەکانی (تاغ Tâg) و (تۆلان Tolan) مان لە پشت خۆمانەوە بەجێ‌هێشت؛ یەکەمیان لە دەستەڕاستمان و دووەمیش لە دەستەچەپمان، لە چەند دوورییەکی کەمی ڕێگاکەوە. لە یازدەهەم میلدا، دەبوو لە ئاواییەکی فراوان و گەشەسەندووی (حەلەسنی Halasni) ناودا بوەستین، ئەویش وەك دوو ئاواییەکەی دیکە، ڕووکارێکی لە هەموو ئەو گوندانە چاکتر و پاکتری هەبوو، کە تا ئەوکات بینیبوومان. ئەو گوندانە لە بەرد و چیمەنتۆ دروست‌کرابوون، پاش ئەوە بە چینێك گەچ داپۆشرابوون و هەر ماڵێك بۆ خۆی قەڵایەك بوو و پێك‌هاتبوو لە بورجێکی چوارگۆشە و چواردەورەدراو بە دیوارێکی تاڕادەیەك ئەستوور، بۆ ئەوەی دانیشتووانەکەی پارێزراو بن لە هەر هێرشێکی سوارەکان، یا تەقەی چەکی ئاگرینی تفەنگەکان. لە دەیەم میلدا، پێمان نایە ناو سێرت و یەکسەر چووینە ماڵی ئاغا، بینایەکی بەرفراوانی قایم، چەند خەندەقێك بە دەوریەوە بوو. پاسەوان لە بەردەرگە ڕایگرتین و ئاگاداری کردینەوە، کە هیچ کەسێك ڕێگەپێدراو نییە بە چەکەوە پێ

بنێته ناو شوورای دیوارەکان. ئەوکات محەممەد ئاغا دەمانچەکان و خەنجەرەکەی دانا و توانیی بچێته ناو قەڵاکە، ئێمەش ناچاربووین ماوەی نزیکەی دە دەقیقە چاوەڕوان بین، ئەوسا ڕێگەیان داین بچینە ژوورەوە. سەرۆکمان لەژێر هەیوانێکی کراوەدا بینی، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بە دەورەوە بوو، داوایان لێ کردین دانیشین، بەڵام تێبینیمان کرد، ئەو شوێنەی کە بۆ دانیشتنی ئێمەیان دیاری کردبوو، چونکە لەوپەڕی خوارووی هەیوانەکە بوو، سەرسووڕمانی خۆمان نیشان دا و مەودایەک خۆمان کێشایە دواوە. ئەم بزاوتەی ئێمە بوو بە هۆی پێکەنینی زۆری سەرۆك، بەڵام سەلماندی هەڵس‌وکەوتی ئێمەی چەندە بەلاوە پەسند بووە، بەوەی شوێنێکی زۆر شەرافەتمەندانەتری لە نزیکی خۆی پێشکەش کردین و دوای ئەوە یەکسەر فەرمانی دا دارسەبیل و قاوەمان بدەنێ. سەرۆك تەنیا چەند وشەیەکی کەمی تورکیی دەزانی، بەڵام مەلا یا قەشەکەی لەوێ بوو و تا ڕادەیەکی باش بە زمانی فارسی قسەی دەکرد، پێی وتین، ڕێگەی ڕاستەوخۆ بۆ مووسڵ لە جەزیرەی ئیبن‌عومەرەوە، بە هۆی تاڵان‌وبرۆی کوردەکانەوە بووەتە ڕێگەیەکی نا کردەنی، بەبێ جیاوازی گەڕۆکەکان و کاروانەکانی تێدا ڕووت دەکەنەوە (حاکمی جەزیرە لە هەموویان خوێنخۆرترە. ئەو درێژەی پێ‌دا و گوتی: من ئامۆژگاریتان دەکەم ڕێگەی دیاربەکر بگرنەبەر). وشەکانی وا دیاربوو هەموو هیوایەکی دوورتری گرتنەبەری شوێنی گەشتی دەهەزار کەسەکەی بەبا دا. کە وایە دەبێ گەشتە سەختەکەمان بەم‌زووانە کۆتاییی پێ بێ، بەڵام -لەگەڵ ئەوەشدا- لەو باوەڕەدا بووین، کە دەشێ ئەم سەرۆکە بتوانێ ئیسکۆرتێکی بەهێزمان پێ بدا و بە ناوی خۆیەوە بمانپارێزێ. دانیشتووانی قەڵاکە لە دەوری ئێمە بە پەلە بوون، وەك ئەوەی ئێمەمانان دوو حەیوانی کێوی بین. ئەوان هەرچییەکیان لە بەرچاودا دەبەخشرا، وەریان‌دەگرت و هەڵیان‌دەگرتەوە. هەرچەندە ئێمە هەوڵمان دەدا وریابین، هەموو شتێکی مایەی وروژاندنی ئارەزووی ئەوان لە بەرچاویان بشارینەوە. لای ئێوارە، سەرۆك سواری ئەسپەکەی بوو و بیست کەسێك بە پێ

دوای‌کەوتن، سەری لە پێدەشتەکە دا، تا بەدوای کاری جووتیارەکاندا بچێ. بەگوێرەی داب و نەریت، لەگەڵ خۆرئاوابوون، قاڵی لەسەر بەرزیی بورجەکە ڕادەخرێ، هەموو کەسەکانی ماڵەوە ڕادەکەن بۆ نوێژی ئێوارە. نوێژ لە لایەن مەلاکەی هاوڕێمەوە دەکرێ. نوێژەکە هێشتا بە تەواوی کۆتایی نەهاتووە، کە هەر کەسە دادەبەزێ بۆ نان‌خواردنی ئێوارە، کە بریتییە لە خوراردنێکی گەورەی شۆربا و پڵاو. هەر یەکێکیش بەگوێرەی ڕیزەکەی خۆی دادەنیشێ.

١١. سپێدەکەی لەلایەن ئاغاوە ئاگەدارکراینەوە، پێنج یا شەش سەعاتی مێتاڵی لەگەڵ خۆی هێنابوو، تا ئێمە سەیریان بکەین. داوای لێ کردین پێی بڵێین ئەوانە نرخیان هەیە؟، ئایا دەتوانن قیمەت بکەن؟ بەڵام بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی ئێمە بکا، گفت‌وگۆکەی گۆڕی و باسی دێرینیی شارەکەی کرد. ئەوەی لێ زیادکرد کە جاران ئەم شارە لە جیهاندا زۆر بەناوبانگ بووە و دەتوانین بەدوای کەلاوەکانی‌دا بچین؛ ـلە لایەکەوە- تا ئاوایی (واموورWamur)ی چوار میلی دوور و ـلەو لای دیکەوە- تا کەوشەنی خابووری دوو میل لەوێوە دوور. کاتی دەرچوونمان، ئاپۆرایەکی نەخۆش هاتبوون بۆ چارەسەری. یەکێک لەناو ئەوانە، کوڕێکی تازەخونچەی بوو. پێی وابوو دەتوانم بە سێ ڕۆژ چیم دیوە، بۆی بگێڕمەوە. ئەو گەلانە تا ئەو ڕادە زۆرە سادەلەوح و ساویلکەن، پێیان وایە زانیاری و بەهرەی ئەوروپاییەکان پیرۆزن.[1] دواجار هەموو ئەو ماوەیەی کە ئێمە لەم شارە ماینەوە، نەمانتوانی بۆ چرکەساتێکیش پشوو بدەین.

---

[1] لەناو دەستکەوتووەکاندا کە ڕۆژهەڵاتییەکان بەرانبەر بە ئەوروپاییەکان هەیانە، ئەوان بەردی فەیلەسووفیان لایە. چەند ڕۆژێك پێش گەیشتنم بە بەسرە، بەڕێز کۆڵکیهۆن، نیشتەجێی (موقیم) ئینگلیز لەم شارە، پەیامێکی لە فەیلەسووفێکی عەرەبەوە پێ‌گەیشتووە و داوای چاوپێکەوتنێکی تایبەتی کردووە، بۆ ئەوەی ڕازی نهێنییەکی زۆر گرینگی بۆ بدرکێنێ. بەڕێز کۆڵکیهۆن پێشنیازەکەی قەبووڵ کردووە. بۆ سبەی

نامۆی نهێنیپارێز هاتووە، لە بەردەم ئەژنۆی موقیمدا بەچۆکداهاتووە و هەوڵی داوە ماچی بکا. وتی، هاتووە خۆی خستووەتە بەر پارێزگاریی ئینگلیزەکان، بۆ پاراستنی ژیانی لە چەوساندنەوەی بەربەرییانەی بەردەوامی هاونیشتمانییەکانی. کە بەوەیان زانیوە دەتوانێ هەر کانزایێکی میتاڵی بگۆڕێ بە زێڕ، ویستوویانە ئەشکەنجەی بدەن، تا ڕازی نهێنییەکەی لێ دەربهێنن. لێی زیاد کرد، تازە لە زیندانی 'غەران' ڕای کردووە، لەوێ ماوەیەکی درێژ لە لایەن شێخی غەرانەوە برسی و زیندانیی کراوە. جا ئەگەر بەڕێز کۆلکیهۆن بیەوێ و ڕێگەی بدا لە کارگەکە بمێنێتەوە، ئەوا نهێنییەکەی بۆ ئاشکرا دەکا. هاوڕێکەم پەیمانی دایێ پەنای بدا و عەرەبەکەش گفتی پێ دا، بەرانبەر بە نیشاندانی بەڵگەی بەهرەداری خۆی لەم بوارەدا. عەرەبەکە خۆی کێشایەوە، کەمێك دواتر بە خۆی و دەفرێکی کانزاییی بچووك و خەڵووزەوە هاتەوە. وەختێك دەفرە کانزاییە بچووکەکە بەپێی پێویست گەرم بوو، عەرەبەکە چوار پارچەکاغەزی بچووکی لە گیرفانی خۆی دەرهێنا، هاڕدراوەیەکی سپیی تێدا بوو، تکای لە بەڕێز کۆلکیهۆن (کەهوون) Colquhoun کرد پارچەیەك قوڕقشمی بۆ بهێنن، ئەویش گەڕا و چوار گوللەی دەمانچەی دۆزییەوە، کێشای، بەبێ ئەوەی بارستەکە بە کیماگەرەکە بڵێ. ئەوەی دوایی گوللەکانی لەگەڵ هاڕدراوەکە خستە ناو دەفرە کانزاییەکە و پاش ماوەیەك هەمووی توایەوە. بیست دەقیقە دواتر، عەرەبەکە تکای لە بەڕێز کۆلکیهۆن کرد، دەفرە کانزاییەکە لەسەر ئاگرەکە لابا و بیخاتە بەرهەوا، بۆ ئەوەی لێی بگەڕێ ساردببێتەوە: دواتر ناواخنەکەی لە لایەن بەڕێز کۆلکیوهۆنەوە هێنرایە دەرەوە و ددانی بەوەدانا کە پارچەیەك زێڕی زۆر پاکە و بارستەکەی هەر هەمان بارستی چوار گوللەکەیە. زێڕەکە لە بازاڕ بە نەوەد پیاستەر خەملێندرا. مەحاڵ بوو عەرەبەکە توانیبێتی نیشتەجێ (موقیم) دەستخەڕۆ بکا، چونکە هەر کە دەفرە کانزاییە بچووکەکە خرایە سەر ئاگرەکە، دەستی لێ نەدا و لەوەش کەمتر مایەی وێناکردن، ئەوە بوو کە دیاری بکرێ عەرەبێکی هەژار بە چ پاڵنەرێك توانیی دیارییەکی نەوەد پیاستەری بدا بە نەجیبزادەیەکی ئینگلیز. بەڕێز کەهوون Colquhoun تکای لێ کرد بەیانی بێتەوە، بەڵام شەو، لە لایەن شێخی (غەران Gran)ەوە دەیڕفێنن و بە یارمەتیی

---

چەند پیاوێکی چەکدار دەرگەی ماڵەکەی دەشکێنن و دەیخەنە ناو بەلەمێك، دواتر ئیدی لەگەڵ خۆرهەڵاتن لە بەرچاوان ون دەبێ. ئێمە نەمانتوانی دیاریی بکەین داخۆ ئەو بەدبەختەیش وەك سانت لیۆن Saint-Léon، نهێنیی دروستکردنی زێڕی زانیوە، بەڵام ئەوەی قورساییەکی گەورە دەدا بەو بیروڕایانەی، ئەوەیە کە چەوساندنەوەی دڕندانەی هاونیشتمانییەکانی بووە.

## وەسپی سێرت، ڕێگەی ماردین

شاری سێرت وا دەردەکەوێ، چ ناوی و چ شوێنی، هەروەها ترادسیۆنی دانیشتوانەکەی، دەیگێڕنەوە ئەو جێگەیە کە ڕێی تێ دەچێ ئەم شارە شوێنی شاری (تیگرانۆسێرت Tigranocerte)ی کۆنی گرتبێتەوە کە پلۆتارك لە ژیانی لۆکیۆلوس دا باسی کردووە. تیگرانی بەناوبانگ، پادشای ئەرمەنستان،[1] درووستی کردووە و ناوی لێ ناوە و کردوویە بە پایەختی دەوڵەتە بەرفراوانەکەی. کاتی هێرشەکانی بۆ سەر سوریە و کاپادۆس، ئەو زیندانییانەی وا بە دیلی گرتوون، لەوێی نیشتەجێی کردوون و سەرکەوتنی لۆکیۆلۆس ڕێگەی پێ دەدا ئەو زیندانییانە بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان. وێڕای ئەمە، شارەکە بایەخی خۆی پاراستووە، تا ئەو دەورانەی کە لە لایەن

---

[1] تیگران لە لایەن لۆکیلوسەوە لە چەند میلی ئەم شارەدا شکا و لەوانەیە لەسەر کەناراوەکانی خاپوور بووبێ. ئەو -بەم بۆنەیەوە- ئەم ڕستەیە بۆ دەربڕینی ژمارەی کەمی دوژمنەکانی بەکاردەهێنێ، "ئەگەر ئەوان وەك نوێنەری تایبەتی بێن، ئەوا ژمارەیان زۆر زۆرە، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەشەوە وەك دوژمن بێن، ئەوا ژمارەیان زۆر کەمە." ئەو یۆنانییانەی کە لە شارەکەدا بوون، خیانەتیان بۆ ڕۆمانەکان کرد، بۆیە شارەکە تالآن کرا. لەپاڵ گەنجینەکانی دیکەدا، لۆکیلوس هەشت هەزار تەلان [تەلان دەکاتە ٢٠ تا ٢٧ کیلۆگرام- و. کوردی] پارەی زیوی لەم شارە دۆزییەوە. بەگوێرەی سترابۆن، تیگرانۆسێرت یەکێك لە شارە پڕ دانیشتووانەکانی جیهان، لە چاوتروکانێکدا بوو بە بیابان، لۆکیلوس ڕێگەی بەو دانیشتووانە دا کە خەڵکی سووریە و کاپپادۆس Cappadoce بوون، بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

عەرەبەکانەوە داگیرکراوە. سێرت، ئەمڕۆ لەوە زیاتر کە شارۆچکە، یا گوندێکی گەورەیە، هیچی تر نییە؛ کەوتووەتە ناو پێدەشتێکی چکۆلەی لە هەرچوار لاوە چیای بەرز دەورەدراو، کە کەمێك دوورە لە ڕووبارێکەوە، کە لە یەککگرتنی دوو جۆگە پەیدابووە، و بتلیس ئاودەدا. ئەم ڕووبارە لەناو کوردەکاندا ناوی خاپوورە. ڕۆمانەکان ناوی (نیسفۆریوس Niecphorius)[1] ی پێ‌دەڵێن. شارەکە سێ مزگەوتی بچووك، قوتابخانەیەکی ناوەندیی (کۆلێژێك)[2] و یەك کڵێسەی ئەرمەنی تێدان. دانیشتووانەکەی ژمارەیان سێ‌هەزار کەسە، بەشێکیان موسڵمان و بەشێکیشیان مەسیحین لە تایەفەی ئەرمەنی، مەسیحیی کلدانی، بڕێك نەستووریشی تێدا دەژی. خانووەکان بە هەمان شێوەیماڵەکانی (هەڵەسنی) دروستکراون، کەچی -لەگەڵ ئەوەشدا- بە قەبارە زۆر گەورەترن و بورجەکانیان لە لوتکەدایە. ئەپارتومانەکان گومەزدارن و هەر یەکێکیان هۆڵێکی کراوەی لەوپەڕی پشتەوە هەیە، وەك ساڵۆن، بۆ پێشوازیکردن لە میوانان بەکاردەهێنرێ. بە هەمان شێوە، سەربانێکی پان کە دانیشتووانەکەی هاوینان لەسەری دەخەون. سەرباری ئەوە، هیچ ئاسەوارێکی بەرچاوی تێدا نییە و ناکرێ چاوەڕوانی دۆزینەوەی هیچ ئاسەوارێك ببین لە وڵاتێکدا کە بینایەکانی زۆر بە دەگمەن لە کەرەستەی درێژخایان دروستکرابن. سەرەڕای ئەوە، چەندین ئەستێرکی لەبەردهەڵکەنراو سەرنجیان ڕاکێشاین، بۆ کۆکردنەوەی ئاوی باران نەبوون، وەك ئەوەی لە عەرەبستان و سوریە هەیە، بەڵکو هیی کانیاوەکان بوون؛ فێنکایییەکەیان هەتا لە ڕۆژە هەرە گەرماکانیشدا، زۆر خۆشە.

ناوچەکانی دەوروبەری، بە شێوەیەکی تا ڕادەیەك باش بە چاکی داچێنرابوون. ئەو دەمانەی کە ئێمە بەناو گوندا تێپەڕدەبووین، گوندییەکان سەرقاڵی دروێنە بوون.

---

[1] ڕووباری نیسفۆریۆس -تاسیتوس گوتەنی- بە ئەندازەیەك پانە، کە بەشێکی زۆری دیوارەکانی تیگرانۆس دەشوا (Ann.I.15.c.iv)

[2] collège: کۆلێژ، واتە: قوتابخانەی ناوەندیی، یا بە واتەی کۆڕیش دێت (وەرگێڕ).

ئەم بەرهەمی درویّنەیە دابەش ناکریّ و لە کێلگە ناهێنریّتەوە، تا نەکوتریّ و نەخریّتە ناو گویّنی، میتۆدیّك کە -بیّ‌گومان- شەڕی لیّ‌دەکەویّتەوە لەو شویّنانەدا کە دابەشبوونی موڵکداریّتییان هەیە. بەڵام لێرە، بەرهەمەکە هیی سەرۆکی هۆزە، ئەو دابەشی دەکا بەسەر خەڵکەکانی کاری پیّ‌کردوون و ئەوان وەك پاریّزەر و پشتیوانی خۆیان تەماشای سەرۆکی هۆز دەکەن. واسالەکان[1] جیاوازییەکی زۆریان هەیە بۆ سەرۆکەکانیان. ئەم سەرۆکانە زۆر بە نەرمی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و تەنانەت تا ڕادەی هۆگربوون لەگەڵیان دیّنەخوارەوە بۆ ئاستی ئەوان، بەڵام یەك وشەی سەرزاریان یاسایەکە. ئەم سەرۆکانە، دەسەڵاتی ژیان و مەرگیان بەدەستە، حەوشەیەکی بچووکیان هەیە و هەرگیز بەبیّ دوازدە خزمەتکاریّك نایێنە دەرەوە. بابەتی پرسی گفت‌وگۆکردنیان، بریتییە لە دەورەی کۆنی بنەماڵەکەیان، سەربەخۆیی دووردرێژیان کە بانگەشەی ئەوەی بۆ دەکەن لە دەورانی نوحەوە هەیانبیّ، پاتریارشی گەورەیانە. بیّ‌گومان ئاسان نییە وڵاتێکی ئاوا داگیربکریّ کە چەندین دۆڵی تەسك و تەنگ بڕیبیّتی، ڕێرەوی سەخت و هەڵەمووت و چیای پڕهەڵدێری هەبیّ، دانیشتووانەکەی بتوانن -بەبیّ ئەوەی ترسی ڕاونانیان هەبیّ- پەنای بۆ بەرن. لەویّ ماوەی چەندین مانگ، دابینکردنی خواردنێك لە شیری بزنەکانیان و نانی گویّز دەست‌دەکەویّ. لە کاتێکدا لە زستانی سەختدا لەپاڵ دەگمەنیی ئالیك و ئازووقەدا، ناچاردەبن هێندە نەبا سوپایەك پێك‌بهێنن بۆ خۆکێشانەوە یا جیابوونەوە بە شێوەی دەستەی بچووك بچووك، کە لەم یان لەو حاڵەتەدا مەترسی کوشتنیان لەسەرە. کوردەکان بیّ‌باوەڕن، ئەوەندە کەم ڕێز لە حەقیقەت دەگرن کە هیچ درۆیەك نایانترسێنیّ، بە مەرجێك بەرژەوەندی خۆیانی تێدا ببیننەوە. ئیرەیی بە بێگانان دەبەن، دڕن و هیچ پەروەردەیەکیان نییە، بەڵام لێواولێون لە نیشتمانپەروەری، خۆیان زۆر بە

[1] واسال: کەسانێك بوون، ئاغا زەویی بە جوتیارەکان دەدا تا بیکێڵن، لەبەرانبەردا ئەوان خزمەتیان پێشکەش بە ئاغا دەکرد. (وەرگێڕ).

بەختەوەر دەزانن کە لە پەنای ئەو چیایانەی زێدی لەدایکبوونیاندا، دوور لە ڕاوەدوونان بژین. ئەوەندەی تورکان لە ئاستی ژنەکانیان دڵڕەق نین، ژنەکانیان بۆیان هەیە ڕوخساریان نەشارنەوە و لە نزیکبوونەوەی پیاوان ڕانەکەن. ڕێزگرتنیان بۆ مردووان بێسنوورە، هەمیشە کۆتەڵ لە یادەوەریی ئەوانەدا بەرز ڕادەگرن، کە ژیانێکی پیرۆز ژیاون. جلوبەرگیان ئاساییە، لەم بەشەی هەرێمەکەدا بریتییە لە ڕۆبێکی قوماشی لۆکەی سپی، بەڵام لە ناوچە دراوسێیەکانی بتلیس و مووش، جۆرە قوماشێکی خەتدار دروستدەکەن، لە قوماشی تارتان* دەچێ. سەرۆکی سێرت، بە هەموو مانای وشە، پیاوماقووڵێکی بەرز و باڵادەستی دەرەبەگە و ئەوەندە لە دۆق و کۆنتەکانی سەدەکانی دوازدە و سێزدەی ئێمە جیاواز نییە.

١٢. من بە دوای ئەوەدا دەگەڕام پاسەوانێکی چاکمان بداتێ بۆ جزیرە، کە شەش سەعات دوور بوو، لەجیاتیی ئەو ڕێگەیەی کە بە دیاربەکر یا ماردیندا تێپەڕدەبێ و لانی کەم ماوەیەکی شەش یا حەوت ڕۆژ دەبێ. بەڵام ئەو گوێی خۆی لە هەموو بیانووەکانی من کرکرد و پێی وتم، نایەوێ ژیانی خەڵکەکانی بندەستی خۆی بخاتە مەترسییەوە لە پڕۆژەیەکی ئاوا ترسناکدا، بەڵام نامەمان دەداتێ بۆ هاوڕێکانی تا ماردین و ئەسپمان بۆ دەنێرێ، وەختێك ئەوەندە دەحەسێینەوە تا ڕێگەکەمان تەواو بکەین. هیچ پاڵنەرێکم نەبوو بۆ ئەوەی گومان لە سەرڕاستییەکەی بکەم. وەك دواتر بۆم دەرکەوت، ئێمە ملمان بۆ ڕای ئەو دا، نیوەڕۆ زوو بەڕێکەوتین. دوای ئەوەی سێ میلمان بەناو پێدەشتی سێرتدا بڕی، دەستمان کرد سەرکەوتن بە زنجیرە شاخێکدا کە کەوشەنی شاری سێرت بوو لە باشووردا. لە چوارەم میلدا، هەرێمی شیروان بوو، لە دوو ئاوایی پێكهاتبوو. لە شەشەم میلدا، گەیشتینە سەر لوتکەی چیاکە، لەوێوە خابوورمان دەبینی، لە باکوورەوە دەهات و

* تارتان: جۆرە قوماشێکی خوری میل میلی چەپ و ڕاستە، لە ئۆسکۆتلەندە لەبەردەکرێ. (وەرگێڕ).

پێچی دەکردەوە بۆ ناوەڕاستی چیاکان. ئەم ڕووبارە لە چوار میلی شارەکەدا بەناو پێدەشتی سێرتدا تێپەڕدەبێ. ئەمە بێ‌گومان-ئەو ڕووبارەی (سەنتریتCintrites) بوو، کە سوپا دەهەزار کەسیەکە هێندە زەحمەتیان بووە لە پەڕینەوەیدا و زەینەفۆن وەك سنووری نێوان کاردۆخ و ئەرمینیا دیاری دەکا و بەگوێرەی ئەم مێژوونووسە-دووسەد پێ پانیی بووە و تەنیا لە یەك جێگەدا ڕێگەی پەڕینەوەی هەبوو. ڕوباری خابوور، پێم وایە نزیکەی هەشتا پێ پانییەکەی بێ، زۆر تیژڕۆیە و بەردەبازی پەڕینەوەی نییە، تەنیا لەو شوێنەدا نەبێ، کە ئێمە پێیدا پەڕینەوە. بەڵام هەموو ڕووبارەکانی ڕۆژهەڵات، هەمان ئەو گۆڕینە هێندە گەورەیەیان هەیە، کە ئەم ڕووبارانە بەگوێرەی کاتە جیاوازەکانی ساڵ- تەنیا دەبنە مایەی تەفرەدانی ئەو کەسانەی وا بە هەڵە ئەم ڕەوشە هیچ لە بەرچاو ناگرن. بەفر توانەوە لە دەمەدەمیی کۆتاییی مانگی ئادار، یا سەرەتای مانگی نیساندا ئاوەکەی فرەتر دەکا. لە یەکەمین ڕۆژەکانی حوزەیرانەوە تا کۆتاییی تەمووز دەستدەکەن بە کەمکردنەوە. ئاوی هەڵقوڵاو لە بناری بەرزاییەکانەوە تا کۆتاییی دەیەم میلە. بەشوێن نوایەکەوە بووین لە دژی ئەوە زەردەگرە سووتێنەرە، لەناو دارستانێکی بەڕووی سەر کەنارەکانی خاپوور، کە پلەی گەرما لەژێر سێبەری دارەکاندا (٣٥,٥°) ١٠٠°ی نیشان دەدا. هەر لەو شوێنە ماینەوە، تا گەرمایەکە کەمبووەوە و ڕێگەی پێدراین بەردەوام بین لە ڕێگە دووروودرێژەکەماندا بە کەناری چەپی ڕووبارەکەدا. لە دوازدەیەم میلدا، بەسەر پردێکی بەردینی کۆنی پێنج تاقدا پەڕینەوە. لەودیوی پردەکە، زنجیرەیەکی نەپچڕاوەی بەرزی سپێتیی بەردینمان بینی، دۆڵێکی تاریکی دەبڕی، شاتۆیەك بووە بۆ کوشتنی چەندەها ئینسان، بەگوێرەی خەبەری ڕێبەرەکانمان کە پێیان دەگوتین هەموو دانیشتووانی ناوچەکە هێندە تالانچین، باکیان نییە لەوەی تاوانێك بکەن، وەختێك دڵنیابن لەوەی کە بەرەوڕووی هیچ بەرگرییەك نابنەوە. لە نۆزدەهەم میلدا، گەیشتینە شوێنێکی (ئۆشوو) ناو. جۆرە گوندێکە کە لە یەك قەڵا پێکهاتبوو،

کەوتبووە سەر بانێك و ژمارەیەك بەرزایی خۆڵین لە دەوروبەریدا هەبوو. بەر لەوەی ئێمە بگەینە ئەو شوێنە، شەو داهاتبوو، بەڵام ڕووناکیی زێڕینی تریفەی مانگ زەویی ڕووناك دەکردەوە و سیمای درێژی کوردەکان کە لە سەریانەوە تا پێیان سەرتاپا سپیان پۆشی بوو، دەبینران، سووك و سانا لە بورجەکان خلۆردەبوونەوە. لە دەرگامان دا، پێنج یا شەش کەس دەرگەکەی کردەوە، ئێمەیان بردە ناو حەوشێك، ئەوکاتەی تەتەرەکە وتوویژێکی کورتی لەگەڵ سەردەستەکە هەبوو، کە لە بەرزاییی قوللەی بورجە گەورەکە، یا قوللەی دۆنژۆنەوە، وەك ئەوەی لەناو قەڵا کۆنەکانی خۆمان لای ئێمە وای پێدەڵێن، قسەی لەگەڵ دەکرد. بە فەرمانی ئەو، بن‌دەستەکانی ئێمەیان بردە سەر بانیژەی دەرگەکە، تا سپێدەی بەیانی تێیدا حەساینەوە. لە کاتی دەرچوونماندا، خزمەتکارەکان ئەو دیارییەیان ڕەتکردەوە کە پێشکەشمان کردن، ئەوە یەکەمجار بوو لە ساتی دەرچوونمانەوە لە کۆنستانتینۆپل ئاوا ڕەفتارمان لەگەڵ بکرێ.

١٣. ئەو توولەڕێگەیەی کە ئێمە گرتمانە بەر، بەناو وڵاتێکی پێچاوپێچدا دەڕۆیشت، کە گەنم و جۆیەکی زۆری بەرهەمدەهێنا و لای چەپ کەوشەنی زنجیرەچیایەکی بەرز بوو. لە چوارەمین میلدا، هەرێمی (هەربۆ-پاریHerbo- Pari) بوو، لە ژمارەیەك ئاوایی پێكهاتبوو، ئێزدییەکانی[1] تێدا دەژیان، ئەوانەی کە شەیتان دەپەرستن یا نوێژی بۆ دەکەن. لە دەیەم میلدا، گەیشتینە قەڵای (ڕەدوانRedouân)، بینایەکی وەك ئەوەی ئۆشۆ Ouchu دروستکرابوو و شوێنی نیشتەنیی سەرۆکی ئێزیدییەکان بوو، بەسەر بەرزاییەکەوە بوو، کە دەیڕوانیە لقی ئەرزەنی دیجلە و سەدان کۆختەی بەدەورەوە بوو، ئێزیدییەکان، ئەرمەنەکان و کلدانییەکانی تێدا دەژیان. سەرۆکی هۆزەکە لەوێ نەبوو، بەڵام پێشوازییەکی گەرممان لە لایەن براکەیەوە لێ کرا، ئێمەی بردە ناو بێشەلانێکی فراوان، لە گەڵا و لقی درەختان دروستکرابوو،

---

[1] بڕوانە: وەسیی پاشانشینی بەغدا، نووسینی بەڕێز ڕۆسۆ، کونسوڵی گشتیی فەرەنسە لە بەغدا، لاپەڕەکانی: ٩٧، ٩٨، ١٨٥، ٢١٠، بەرگی یەکەم، ١٨٠٩.

هەموو دوو یا سێ ڕۆژێك شوێنەکەی دەگۆڕن. ئەو کاتە کەوتبووە بەشی دەرەوەی قەڵاکە. چەند ساتێك لەناو ئەم ماڵە گوندییەدا حەساینەوە. هەموو خەڵکی گوندەکە گردبوونەوە بۆ بینینی ئێمە، بەڵام خانەخوێیەکەمان وا دیاربوو ڕاهاتبوون گوێڕایەڵیی بکەن، بە ناچاری لێی قەدەغەکردن جاڕسمان بکەن. لەناو ئەو خەڵکانەدا، تێبینیی ئەرمەنییەکم کرد، بەرانبەر بە ئێمە تا ئەوپەڕی ڕاست و ڕەوان بوو، پێم وابوو تەواو شارەزای هەموو دەوروبەرەکە بێ، جێگەی متمانەی تەواوی ڕێبەرەکەی بوو. هەرچی ئێزدییەکان بوون، بە دوژمنداری لەگەڵ مەسیحییەکان دەژیان، ئەم تایەفە نامۆیە ناوی ئەو جەنەڕاڵە عەرەبەی هەڵگرتووە، کە کوڕەکانی عەلیی کوشتن، شوێنی تەرخانکراوی خۆیان هەیە بۆ عیبادەتی خۆیان. لە ئاستی مەزهەبیدا، هەموو ئەوەی دەتوانم بە دڵنیاییەوە بیڵێم، ئەوەیە کە ڕێزگرتوون یا بە جۆرێکی تر لە ڕۆحی شەیتانیی دەترسن، بۆیە نابێ کە ئەوان ئامادە بن، باسی بکەین، بەبێ ئەوەی جووڵەیەکی ترسانی نائاساییان تێدا دەربکەوێ. هێشتا لە مووسڵ گڵکۆی دامەزرێنەکەیان 'شێخ ئادی' نیشاندەدەن، هەرچەندە دامەزراوەی سەرەکییان دەکەوێتە ناو چیاکانی شنگاڵ و هێشتا لەم بەشەی کوردستاندا[1] پەرتوبڵاون، پشتاوپشت ڕقیان لە موسڵمانانە کە زۆر جەنگی خوێناوییان لە دژی تایەفەی ئەوان ئەنجامداوە. ئەم ئێزیدییانە ڕەگەزێکی ئازا و چالاکن، نە شەراب و نە هیچ ئارەقێکی بەهێز ڕەتناکەنەوە و هەرچەندە وەك بنەما ڕەقن بەو شێوازەی کە پێی پەروەردەکراون، بەڵام لەسەر چەند خاڵێکی ئایینی سنگیان فراوانە و لە سەرووی حوکمدانی پێشوەختی هاوسێکانیانەوەن.

ئەرمەنییەکە ئاگاداری کردینەوە لە بەردەمی ئەواندا تفنەکەین، چونکە - بەگوێرەی ئەو- ئەوە گەورەترین جنێوە بتوانین پێیان بدەین. چەند ساتێك دوای

---

[1] پێیان وتم ژمارەی بنەماڵە ئێزیدییەکان لەنێوان 'ئەرزەن' و 'جزیرە'دا دەگاتە دە هەزار بنەماڵە، یەکەمیان شارێکی کۆنە و جاران پێیان وتووە 'تۆسیا'، کەوتووەتە تەك گۆلێك لە هەشت سەعاتی 'ڕێدوون 'Redoun'دا.

گەیشتنمان، گەنجترین برا لە براکانی بەگ هاتە ناو ئەپارتمانەکەمان، ڕەفتارە ڕەقەکەی، هاوشێوەی ڕەفتاری ڕێزگرتووی ئەوی دیکە بوو؛ بەسەر قاڵییەکاندا ڕۆیشت، بەبێ ئەوەی پێڵاوەکانی دابکەنێ؛ لەسەر بالیفەکانمان دانیشت، بەبێ ئەوەی چاوەڕوان بکا پێی بڵێین دابنیشە، چەندین جار ڕوویەڕوو تەماشای دەکردین و هەموو ئەو کارانەی خۆشی دەیکردن، قاقایەکی پێکەنینێکی درێژیان لەگەڵدا بوو.

دەمەدەمی سەعات دوو بوو، ئەسپی تازەیان بۆ هێناین، بەڵام وەك چۆن دەمەقاڵییەك لەسەر جانتاکانمان کرا، خزمەتکارە ئیتاڵیاییەکەم یەکێك لە دەمانچەکانی سوارکرد و هەڕەشەی لە چەند خزمەتکارێك کرد. ئەم کردەوەیە گەمژانەیە و شانازیکردنی سەربەخۆبوونی ئیزیدییەکان، ترساندنی لە ڕوودانی چەند کارێکی نارەوا. من هەوڵم دا ئەم شەڕە هێور بکەمەوە، بەڵام پێویست نەبوو، هەر بەوەندە دەستەبەردار بوون، بە چاوێکی قووڵی سووکەوە تێی بڕوانن و بۆ سزادانیشی یەکسەر جێگۆڕکێ بکەن. سەعات سێی پاش نیوەڕۆ سواری پشتی ئەسپەکانمان بووینەوە، پلەی گەرما (°٣٠) °٩٨ی نیشان دەدا. دابەزینە سەر کەناری ڕووبار، بە بەردەبازێکدا پەڕینەوە. سەرچاوەی ئەم لقەی ڕووباری دیجلە بە شوێنێکدا دەڕوا، پێی دەوترێ (سوزانSuzan)، مەودایەک دوور لە بتلیس، لە باکوورەوە بەرەو باشوور- ڕۆژهەڵات دەڕوا؛ پانییەکەی نزیکەی شێست پێ دەبوو، بەڵام ئاوەکەی لە سەرەوە نەدەگەیشتە ئەژنۆی ئەسپەکانمان. دوومیل و نیومان بە کەناری ڕووبارەکەدا بڕی و لە ئاواییەکی (گیوەرسGiverss) ناو وەستاین، بۆ ئەوەی کات بڕەخسێنین بۆ خانەخوێیەکەمان، کە لەگەڵمان هاتبوو، تا بتوانێ تیپێکی سوارە کۆبکاتەوە بۆ هاوەڵیکردنمان. ئەو وڵاتەی کە بەناویدا تێپەڕدەبین، دەوڵەمەندە بە دانەوێڵە، لەم شوێنەدا بە هەورازێکی بچووکدا سەرکەوتین، دەگەیشتە لوتکەی چیاکە لای دەستەچەپمانەوە. ئێمە لە نیوەی بەرزاییی ڕێگەکەدا بووین، وەختێك

سەرۆکە ئێزیدییەکە هاورێ ئەرمەنییەکەی نارده لای ئێمە، داوای بەخشیشی دەکرد، لەبەرئەوەی دەگەڕێتەوە ناو ماڵی خۆی. وای پێوتین و هیوای خواست ئێمە چەند شتێکی جوانی وەك نیشانەی یادەوەریی بدەینێ. دەشێ پازده ڕووپیەی زێر ڕازیی بکا، ڕۆیشت و ئێمەی لەبەر ڕەحمەتی ده دوازده تاڵانچیی چەکداردا بەجێهێشت. سەرەتا نەیدەویست خۆی پارەکە وەربگرێ، بەڵام به تەتەرەکەی گوت بیداته ئەرمەنییەکە، چونکه داییێ، وەك ئەوەی ئێمه بینیمان، وەختێك پێی وابوو سەیری ناکرێ. چەند ساتێك دوای ئەوەی ئەرمەنییەکه گەیشت، له من نزیك بووەوه و گلەیی کرد که ڕێبەرەکەی یەك پیاسەریشی پێ نەداوە؛ پارەکانی گیرفانیی دەرهێنا، به شێوەیەك کردیەوه که -جگه له من-کەسی تر نەیبینێ و نیشانی دام. وای دەرخست که ئارەزوویەتی بۆی پڕبکەم له پارە، بەڵام من ڕەتمکردەوه داواکەی بەجێبێنم. بەم وشانه، لەناکاو لەرەی دەنگی گۆڕا، ئەوەنده بێ حەوسەڵه بوو، چەند سەعاتێك پێشتر خۆی دەستوداوێن پاك دەنوواند. له شەشەم میلدا، گەیشتینه شوێنێك، چەند بنەماڵەیەکی کورد له ئەشکەوتێکی هەڵکەندراوی قەدپاڵی چیاکاندا دەژیان. له نۆیەم میلدا، گەیشتینه لوتکه، به ڕاست و چەپدا درێژدەبووەوه و دواجار بەسەر بانی دیاربەکردا دەکرایەوە. له سێزدەمین میلدا، سووکەلێژاییەك ئێمەی گەیانده پێدەشتێکی داپۆشراو به بەرهەمی دروێنەی زۆری گەنم و جۆ. دانیشتوانەکەی سەرقاڵی کاری بەروبوومەکانیان بوون. به بینینی ئێمه، به دەستی پڕ له گوڵەگەنمەوه هوروژمیان هێنا. که تێپەڕبووین، داوایان لێ کردین چەند پیاسەتەرێکیان بدەینێ، بۆ ئەوەی گورێکیان به بەردا بێتەوه لەسەر دروێنەکردن بەردەوام بن. بەشی زۆرینەی ئەو گەنمەی که دیاربەکر بەکاریدێنێ، بەرهەمهێنراوی ئەم پێدەشتەیە، که دەشێ چل سەعات یا سەدوبیست میل درێژ بێ و خاکەکەی له باریدایه ساڵی دووجار بەروبووم بدا. له هەژدەهەمین میلدا،

قەڵا و ئاواییی "باشبووت" مان لە بناری زنجیرەچیایەکی نزم بەجێهێشت، بە هەمان ئەو ئاڕاستە تەریبە کە ڕێگەکەی ئێمە لە دوو میل دووری لای ڕاستدا دەبڕێ. لێرە ڕێگەکان، کە لە دەرچوونمانەوە لە بتلیس، دەکرێ وەك ڕێگەیەکی ناتەواو تەماشابکرێ. ڕێگەکان تا ئەو ئەندازەیەی کە بەرەو ناو پێدەشتەکە دەچووینە پێش، باشتر و هەتا نایابتریش دەبوون. لە بیستەمین میلدا، نۆرەکە گۆڕدرا، لە ئاواییەکی (کیڤەرسۆKiverso) ناوی کلدانەکان وەستاین. ئۆردووی کەهیە، یا ئەو شوێنەی کە پاشای دیاربەکری لێ بوو، بە خۆی و سوپایەکی دووهەزار کەسییەوە لە چوار میلی ئەو گوندەدا بوو، لە نزیکی کڵێسەیەك کە ماوەی چەند مانگێك دەبوو گەمارۆی دابوو. تازە ئێمە نیو سەعات دەبوو دانیشتبووین، چەند نوێنەرێکی خەڵکە سەرەکییەکانی دانیشتووان هاتن، لێمان پاڕانەوە پێوەندیی خۆمان بەکاربهێنین لای کەهیە، بۆ ڕزگارکردنی کڵێسە سووتاوەکە، شوێنێکی پیرۆز و زۆر کۆن. دوای ئەوەی هۆی ئەم دەمەقاڵێیەی لێ پرسرا، پادشا وەڵامی دایەوە، کە ویستوویە بڕەپارەیەکی زۆرتر لە هاووڵاتیان داوابکا، بەڵام (مێرجۆری Mercuri)، کە کڵێسەکەی تێدایە، ئەم داوایە بووەتە هۆی ڕاپەڕینی سێسەد کلدانی و ئەرمەنی کە دانیشتووانی ناوچەکە پێکدەهێنن. ئێمە گفتمان پێدان لەگەڵ کەهیە قسەبکەین، بەڵام بێهیوا بووم لەوەی کە ناوبژیی ئێمە هیچ سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەنسیب بێ. سەعات سێی پاش‌نیوەڕۆ، پلەی گەرما (٥١°) ١٠٠°ی نیشاندەدا و کاتی خۆرئاوابوونیش (٢٢°) ٨٠° بوو. چەند میلیك بەر لەوەی بگەینە ئاوایی، یەکێك لە دەستەکەی ئێمە تێبینیی کرد سەگێک چاودێریی جوجەڵەیەکی دەکرد، بەرەو لای سەگەکە چوو و بەبێ ئەوەی لە ئەسپەکەی بێتە خوارەوە، لەسەر زەوی هەڵی‌گرت. کارامەییەکەی لە لایەکی ئەسپەکەوە بۆ لای دیکە و بۆ لای ئێمە و لە نزیك بوونەوەی لە کەسێك، ئەوەی بۆ سەلماندم

که ئەم نمایشە لای ئەم گەنجە کوردە ئاساییە و دواتر زۆری تر دووبارە دەکاتەوە. دواتر کوردەکە لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی کێشایەوە و خوی خزاندە ناو کونجێکی مێرگەکە، -بێ‌گومان- بۆ ئەوەی لەگەڵ نێچیرەکەی شێو بکا و چیتر نەمبینی باسیان بکەن، تا بەیانیی سبەی کە ناردیان بەخشش‌ێکیان لێ داوا کردم.

١٤. ئەو بەڵێنەی کە ئێمە بە ئەرمەنەکانمان دابوو، لای کەهیە دەخالەت بکەین بە قازانجی هاوڕێکانیان، وای لێ کردن سبەینێکەی کاتێکی زوو ئەسپەکان بهێنن. ئێمە هێشتا لە شەش سەعاتی ڕێگەکەداین و سەعات‌ونیوێکی دیکە دەگەینە ئۆردووی تورك، کە لە سێ‌چارەگە میلی کڵێسەکەدایە، بینایەکی چوارگۆشە لەسەر لێژاییی گردێك ئەوەندە ڕێکخراو نییە، دەشیا لە ماوەی کەمتر لە نیو سەعاتدا بە یەك تیپی جەنگی بگیرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، گەمارۆکە ماوەی دوو مانگی خایاندووە، هەردوولا هیچ تاقە بریندارێکیشیان نەبووە و ئۆردووی تورك لە سۆنگەی پشێوی و ئەو نانیزامییەوە کە باڵیان بەسەردا کێشابوو، زیاتر لە گوندێکی جوانی ئینگلستان دەچوو، وەك لە ئۆردوویەکی ئەفسەران بەرامبەر بە دوژمن. محەممەد ئاغا کە بە پەلە بوو بچێتە دیاربەکر، لەجیاتیی ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕێگەی ماردین بگرێتەبەر، چوو کەهیە بدۆزێتەوە، تا سەربوردەکەی بۆ بگێڕێتەوە. کە ئێمە گەیشتینە ئۆردوو، چاومان بە بەیرەقدار Beyrakdâr یا 'ئاڵاهەگر'[1] کەوت، ئێمەی ئاگادارکردەوە کە ڕابەرەکەی ئەسپی ئامادەی هەیە، بمانگوازێتەوە بۆ دیاربەکر. بۆ زانیاری پرسیم: دووریی ئۆردووی ماردین و دیاربەکر چەندە؟ وەڵامی داینەوە: نزیکەی سێ سەعات بۆ ئەم یا ئەویان دەبێ و ڕێگەکە بە هەمان شێوە بێ‌کێشەیە. وەك ئەوەی من نیازم وابوو بچم بۆ ماردین، پێم وابوو ئەوە ژیرانەترە ڕاستەڕاست

---

[1] بەیرەقدار Beyrakdâr: ئاڵا هەڵگر یان هەڵگری ئاڵای ئینکشاری لە سوپای عوسمانیدا، کە نیوەی سوور و نیوەی زەرد بوو (وەرگێڕ).

بۆی بچم، لەبریی ئەوەی دەورەی ١٨ سەعاتی (ماوەی نێوان ئەم شار بۆ ئەو شار) ببڕم بۆ خۆشییەکی تەتەرەکەمان.[1] بەم شێوەیە داوام لە کەهیە[2] کرد ڕێبەرێکمان بداتێ، دەستبەجێ بۆی دابین‌کردین. ئەم ئەفسەرە چل ساڵێك دەبوو، سیمای لەڕ و لاواز بوو، لەسەر جۆرە قەنەفەیەکی دارینی ئاسان هەڵگیراو دانیشتبوو، بە بالیفی زەردی گرانبەهای قەدیفە و کەنارەی زێڕ داپۆشرابوو، ڕەشماڵەکە پڕبوو لە خەڵك، بەڵام شوێنێکیان بۆ ئێمە لە دەستەڕاستی کەهیە تەرخان‌کرد بوو، کە پێمان وابوو نەخۆشە و داوای پزیشکی لێ کردین. وەختێك پێمان ڕاگەیاند حەزدەکەین بچینە ماردین، نەک بچینە دیاربەکر، سەرسامیی خۆی دەربڕی و گوتی تەتەرەکە ئاگاداری کردووەتەوە، ئێمە دەمانەوێ بچین ئەمەی دوایی ببینین (بەڵام -لە لایەکی دیکەوە- درێژەی پێ دا: ئێوە دەتوانن ڕێگەی لە هەموان ڕاستەوخۆتر بگرن و بەیرەقدار ڕاسپێردراوە ئاگادارتان بێ). ئەوکات ماڵئاواییمان لێ کرد و سواری ئەو ئەسپانە بووین کە بۆمان ئامادەکرابوون، ئۆردووەکەمان بەجێ‌هێشت، دوای ئەوەی توانیمان کۆتایی بەو شەڕە بهێنین کە لەگەڵ گوندییەکان هەیبوو.

بە زەحمەت یەك میلمان بڕیبوو، کاتێک یەکێك لە سوارەکان بەتاو ڕای‌کرد و پێی‌ڕاگەیاندین ئۆردووی ناو کڵێسەکە دەرچوون. کەچی ئێمە دەمانڕوانیە ئۆردووەکە، دەمانبینی زۆر سەریان لێ شێواوە، هەندێکیان تەقەیان لەیەك و بە ئاسماندا دەکرد، لە کاتێکدا هەندێکی دیکە ئەسپەکانیان بە هەموو ئاڕاستەیەکدا دەبرد. سوپای تورك، نە پاسەوان و نە پێشقەڕەوڵ، هیچێکی نەبوو و هەتا بە پێویستیشی نەزانیبوو گەمارۆی کڵێسەکە بدا، بە شێوەیەك کە ئەسپەکان دەیانتوانی لە هەر کاتێکدا بێ، بچنە دەرەوە و بەدوای ئازووقە و ئاودا بڕۆن. پێنج میلمان بەناو

---

[1] ئامانجی لە چوون بۆ دیاربەکر، ئەوە بوو لەوێ جۆرێك لە قوماش بکرێ، لەم شوێنە دروست‌دەکرێ، بۆ ئەوەی دواتر بە قازانجێکی زۆرتر لە بەغدا بیفرۆشێتەوە.

[2] دوای پادشا، شوێنی کەهیە یەکەمینە.

کێڵگەیەکی گەنم و جۆدا بڕی و لە ئاوایی (تیلمووز Tilmouz) دابەزین، ئەسپەکانمان لەوێ گۆڕی. لای ڕاست زنجیرەچیایەکی بەرز بە تەریبی ڕێگەکەی کورت دەکردەوە. لە پاییندا، لقێکی دیجلە کە جاران پێیان وتووە (نیمفۆیس Nimphœus) پێچ دەکاتەوە و لە لای چەپیشدا، لە دووریی هەشت میلدا، زنجیرەچیایەکی دیکەی بەرز دەبینرا، بەرەبەرە لێی نزیك دەبووینەوە. (تیلمووز Tilmouz) گەرماکەی لەڕادەبەدەر بوو. ئێمە سەرسامی خۆتێهەڵقورتێنی (فضولیة)ی بەرگەنەگرتووی کوردەکان بووین، کە ئەپارتمانەکانیان ئەوەندە پڕخەڵك دەکەن، دەترساین بخنکێین. من پێشتر تێبینیم کردبوو، هەرچەندە لە سەروبەندی دروێنەداین، گوندەکان لە هەموو کاتێکی ڕۆژدا پڕن لە خەڵك. هەر کرێکارێك لە گونددا بیستوچوار پارە، یا نزیکەی حەوت پێنس ڕۆژانە وەردەگرێ و جگە لەوە ئەوەندەی بشتوانێ بیخوا، نان، پەنیر و شیر وەردەگرێ.

سەعات سێی پاش‌نیوەڕۆ (تیلمووز)مان بەجێ‌هێشت، پلەی گەرمار (٢٩°) ٩٦°ی نیشان دەدا و هەشتی شەو گەیشتینە ئاواییەك لە خاکی (گەریزلار Gerizlar) و شەوەکەی لە بانیژەی ماڵێك جێگیربووین. لە نیوەی ڕێگەدا، ئاوایی (تەپە Teppa)مان لە سێ چارەگەمیلی ڕێگەکە، کە بەلای ڕاستدا دەڕۆیشت، بەجێ‌هێشت. بەرزاییەکان لەم ناوچەیەدا بەرەبەرە نزم دەبوونەوە و لەسەر کەناری (باتمان‌سوو)، کە لە دووریی چوار میلی ڕێگەکەدا دەڕژا، گردێکی جوانی لێ بەرزدەبووەوە. دانیشتوانی (گەریزلار Gerizlar ) بریتین لە مەسیحیی کلدانی و نەستووری، کە بە هەموو جۆرێک بایەخیان پێ‌داین و خزمەتیان کردین. ئێوارەکەی دڵگیر بوو، نمایشێکی تا ڕادەیەك خۆشنوود بوو ببین هەموو دانیشتوانی شار؛ پیاو، ژن، منداڵ بەسەر بانی ماڵەکانەوە کە هەموویان لە هەمان بەرزاییدا بوون، سەرگەرم بوون. پیاوەکان لەسەر قاڵییەکان ڕاکشابوون و دارسەبیلی درێژیان دەکێشا، ژنەکانیش شیریان دەدایە منداڵەکانیان، یا گەنمیان دەکوتا و

منداڵەکان -لە لایەکەوە- هاواریان دەکرد، سەگەکانیش -لە لایەکی دیکەوە- دەوەڕین. لە کاتێکدا جووکەی بەردەوام و خەمباری حاجیلەقلەقەکانی هەڵنیشتووی سەر کونی ئاگرادانەکان، تابلۆیەکی گەرم و زیندووی ئاواییەکی ڕۆژهەڵاتیی نیشاندەدا. حاجیلەقلەق کە ڕۆژهەڵاتییەکان وەك باڵندەیەکی پیرۆز سەیری دەکەن، بەهاران بەدیاردەکەوێ. هێلکە دەکا و خۆی جووجەڵەکانی بەخێودەکا و مانگی ئاگستۆس یا ئەیلوول کۆچدەکا و -وەك دەڵێن- خۆی دەگەیێنێتەوە بیابانەکانی حەبەشە. من زیاتر لە جارێك بینومە جرجێکی گەورەیان هاوێشتوە بۆ ئەو ئاژەڵانەی کە ناتوانن هەرسیان بکەن.

١٥. سەعات هەشتی بەیانی بەڕێکەوتین، دوای ئەوەی پێنج میلمان بەسەر زنجیرەچیایەکی نزمدا بڕی، کەم کەم لە لای چەپ نزیك دەبووینەوە. بە خێرایی شۆڕدەبووینەوە بۆ ئاوایی (ئۆسمان-خوی Otmân-Khoi)، لە چارەگەمیلی سەرووی ڕووباری باتمانسوو[1] و ئەو لقە ڕووبارەی دیجلە کە بەناو دیاربەکردا دەڕوا. ئەم ئاواییە کەوتووەتە سەر لێژاییی چیایەکی بەردین، ژمارەیەکی زۆر هەڵکۆڵینی دەستکردم تێدا بینی. بڕێکیان لە ڕێگەی دەرگا و پەنجەرەکانەوە تیشکی خۆریان بۆ دەهات و لە ئەستوونی دیاری جوان دروستکرابوون. ئەمانە زستان بۆ خەڵکی گوندەکە و هاوینانیش وەك ئەستەوێڵ و ئاخوڕ بۆ مەڕوماڵات بەکاردێن. هەرچەندە ژمارەیان لەناو هەموو کوردستاندا زۆرە، بەڵام هیچیان کردەیەکی هاوچەرخ نین. سەرۆکی ناوچەکە کەسێکی پایەبەرزە، کە هەشت یا دە ئاوایی لەژێر دەستدایە، بە نەفرەتەوە پێشوازیی لێ کردین و وای بۆ چووبوو ئێمە ناتوانین گوێمان لێی بێ و ڕێبەری

---

[1] بڕێك لە تورکەکان (بولیسپێنا Boulespena ) یا (باریما Barima )ی پێ دەڵێن، دانڤێڵ D'Anville دەڵێ: ڕێیتێدەچێ ئەو دیجلەیە هەمان ئەو ڕووبارە بێ کە لای (پلین) دەهەزار کەسیەکە سەرچاوەکانیان بینیوە.

ناردبووه دوامان تا ئەو فەرەنگییە گاورانە (فەرەنسایی گاور) بباتە لای خۆی، کەچی -لەگەڵ ئەوەشدا- زۆر ڕووخۆشتر بوو، کە بەیرەقدار پیێ گوت ڕابەرەکەی حەزدەکا بایەخمان پێ بدرێ. قاوەیان بۆ هێناین و فەرمانی دا ئەسپەکەی و چەکەکانی بۆ ئامادەبکەن، چونکە دەیەوێ هاوڕێیەتیمان بکا تا (بەیرام-خۆی Byram-Khoi)ی ئەوبەری کەناری دیجلە. نزیکەی یەك میل لە کەناری چەپی (باتمان‌سوو Batman-Sou) هاوەڵیی کردین، لە گەڕانەوەدا، لێرە خزمەتکارەکانی فەرمانیان بۆ هات جلەکانیان لە بەربکەنەوە و خۆیان ئامادەبکەن بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە. ئاماژەی بۆ دوو پیاوی کرد لە هەر ئەسپێك بۆ ڕێ‌گرتن لە ڕووداو، لەبەر تیژڕۆیی و قووڵیی ڕووبارەکە، چونکە لە لایەکی دیکەوە نەماندەزانی ئەم ئاژەڵانە دەتوانن بەبێ مەلەکردن لە ڕوووبارەکە بپەڕنەوە، یا نا. زیاتر لە جارێك پێم وابوو شەپۆلی ڕووبارەکە دەمبا و ئەم بەدبەختییە یەکێك لە خەڵکی هاوەڵەکەی ئێمەی گرتەوە، کە ناچاربوو واز لە ئەسپەکەی بهێنێ. بە نیو میل (باتمان‌سوو)مان لە سەرووی دووئاوانەکە بڕی، لە شوێنێك کە پانییەکەی سەدوبیست پێ بوو و لەم وەرزەدا -بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی پازدە ڕۆژێك پێشتر- لە هەمووی نزمتر بوو.

بە سەلامەتی گەیشتینە کەناراوەکەی ئەوبەر و بەلای شوێنێکی خیزەڵاندا تێ‌پەڕین، ئەوەندە بە ڕووەك داپۆشرابوو، ئەسپەکانی لە بەرچاوی ئێمە شاردبووەوە. لەودیو نیو میلەوە، گەیشتینە ئەو لقە ڕووبارەی کە بەناو دیاربەکردا دەڕوا، ئەوەندەی ڕووباری باتمان پان بوو، بەڵام قووڵییەکەی لەو کەمتر بوو. دوای ئەوەی بە بەردەباز بەبێ زەحمەت پەڕینەوە، گەیشتینە ناو پێدەشتی میزۆپۆتامیا و هەرێمی (بەیرام-خوی)، کە لە سێ گوند پێك‌دێ، لە لایەن بەکر ئاغای سەرۆکی کوردەوە بەڕێوەدەبرێ. لە گوندێکی بچکۆلە وەستاین و لەبەر زۆر گەڕانمان، توانیمان گۆزەیەك شیر دەست‌بخەین. مەحاڵ بوو ئالیك

بدۆزینەوە بۆ ئەسپەکان و جانتاکانمان بە چوار کەری بەدبەختی ئاوایی (موورزاMourza)ی شەش میل دوورتر گوازرانەوە. ڕێگەکە بەناو وڵاتێکی بەرز و نزم و بەرهەمهێندا دەڕۆیشت. لە نۆیەم میلدا، بەلای چەپدا زنجیرەچیایەکی زۆر نزم هەبوو، بەڵام لای ڕاست پێدەشتەکە تا چاو بڕی دەکرد، هەر درێژ دەبووەوە. لە ئاوایی (موورزا) هەتا کەرەکانیشیان لێ سەندینەوە، دانیشتووانەکەی تەنانەت بە خۆیاندا ڕاپەرموو بەربەرەکانیی بەیرەقداریش بکەن، کە چوو لە گوندێکی هاوسێ بەدوای چەند کەسێکی ڕاسپێردراودا بگەڕێ. لە هەمان کاتدا ناسیاویمان لەگەڵ (دەللیباشێك Delhibâch)، یا ئەفسەرێکی بەکر ئاغا پەیداکرد، بەختی ئەوەمان بوو لە گوندەکە چاومان پێ بکەوێ. لە ڕێگەی ئەوەوە و بە یارمەتیی چەند ڕووپییەیەك ئەوەندە ئازووقەمان دەستکەوت، بتوانین هێشتا شەش میل تا ئاواییەکی (مەترا Mathra) ناو ببڕین، کە پلەی گەرمای تێیدا دوای خۆرئاوابوون (٢٣،٥°) ٨٥°ی نیشاندەدا.

١٦. سەعات شەشی بەیانی بەڕێکەوتین، پلەی گەرما (١٧°) ٧٠°ی نیشاندەدا، کەمێك دوور لە ئاواییەکە، بە زنجیرەچیایەکی بەرزدا هەڵگەڕاین، چەمانەوەیەکی بە لای چەپدا پێكدەهێنا و بەناو وڵاتێکی چێندراودا ڕۆیشتین، دوای ئەوەی حەوت میلمان بڕی، گەیشتینە ئاوایی (کیان-خوی Kian-Khoi)، نشینگەی بەکرئاغا. بۆ شوێنی حەوانەوە، ژوورێکی دوورودرێژیان داینێ، یەك پەنجەرەی بچووك ڕووناکی لێوە دەهاتە ژوورەوە. گێژ و وڕ بە قرچەی گەرما و شەوی پێشووتریش هیچ نەحەسابووینەوە، هیوامان خواست چەند ساتێك سەرخەوێک بشکێنین، بەڵام هیوایەکەمان بێهودە بوو. تازە دانیشتبووین کە سەرۆك، بە خۆی و سی لە دەستوپێوەندەکانییەوە هاتنە ژوورەوە. دەبوو هەموو ئەو شتانەی کە هەمانبوو، چەکەکانمان، سەعاتەکانمان... هتد پێی نیشان

بدەین. سەعاتەکان و مۆرەکان، وا دیار بوو بە دڵی بوون، بەڵام بۆ دەمانچە ئینگلیزییەکانمان کە ئەوەندە کورت و سادە بوو، بە قێزلێبوونەوە ڕەتی‌کردنەوە. یەکێك لە مۆرەکانی من، کە لە کێرانگۆریوم* دروست‌کرابوو، بەکر ئاغای سەراسیمە کرد، یەکسەر وای بۆ چووبوو دەبێ ئەڵماس بێ و دەری‌خست ئارەزوویەتی ببیا. بەڵام من دڵنیام کردەوە کە ئەوە ئەڵماس نییە و تێم‌گەیاند ئەگەر ئەڵماسیش بووایە، هێندە گرفتار نیم تا لە بەرچاوی هەموو خەڵك بۆی بەجێ‌بهێڵم، لە کاتێکدا من بەناو خاکی ئەودا دەڕۆم. زەردەخەیەکی کرد و دەستی خستە ناو گیرفانی، پاکەتێکی چکۆڵەی لێ دەرهێنا. پاشان دوای ئەوەی دە یان یازدە پارچەکاغەزی کردەوە، پارچە کریستاڵێکی کۆنی دۆزییەوە، وا دیار بوو لۆکس بێ و داوای لێ کردین پێی بڵێین نرخەکەی چەندە و لێی زیاد کرد، بە پارەیەکی گەلێك زۆر دەستی خستووە. بۆ ئەوەی بیروڕای بەرزی ئەو، کە لەبارەی گەنجینەکەیەوە هەیبوو، بەفیڕۆنەچێ، وەڵامیمان دایەوە کە گەوهەرەکەی نرخێکی گرانبەهای هەیە. دوای ئەوە، گورج سەرلەنوێ خستییەوە ناو زەرفەکە و نایەوە ناو گیرفانی.[1] هێشتا نیو سەعاتێك تێپەڕ نەبووبوو، ژوورەکە وا گەرم بووبوو بەرگە نەدەگیرا، هەوا هێندە خنکێنەر بوو، ئێمە تکامان لێ کرد بەشێکی خەڵکەکە بکەنە دەرەوە، بەڵام وەڵامی دایەوە: ئەوانە لە هەموو شوێنێك و بۆ هەر شوێنێك بچێ، لەگەڵیدان و ئەگەر ئێمە بەدەست ئەم کۆمەڵگایەی ئەوەوە ماندوو ببووینایە، وای دەکرد خۆمان ئازاد و ئاسوودە ببین. ئەو ڕێزێکی زۆر کەمی لە بەیرەقدار دەگرت، یا تا ڕادەیەکی زۆر بە هیچ شێوەیەك هیچ ڕێزێکی لێ‌نەدەنا و ئەوەی زیاد کرد، هەرگیز دیقەت لەوە ناکا

---

* کێرانگۆریوم: Kairngorum زنجیرە چیایەکە لە ناوچەی ئیکۆس. (وەرگێڕ)

[1] ئەمە کردەیەکی تەواو نایابە، چونکە ڕۆژهەڵاتییەکان -بە گشتی- چاکترین شارەزان لە بەردی گرانبەهادا.

فەرمانەکانمان بخوێنێتەوە و ئەگەر کەهیە بە خۆی و سوپاکەیەوە دراوسێی نەبووایە، دوودڵ نەدەبوو لەوەی دەست بەسەر جانتاکانماندا بگرێ، کە لە قازانجیدا دەبوو. بە ناچاری مانەوە لەگەڵ ئەم دڵڕەقە، بەشی زۆری ڕۆژەکەمان لە کڵۆڵیدا بەسەربرد و بەیرەقدار کە چیتر هیچ خزمەتێکی ئێمەی بۆ نەدەکرا، دیارییەکمان پێشکەش و بەڕێمان کرد. دوای چاوپێکەوتنێك کە بەخششمان تێدا پێشکەش بە چەند کەسێکی دارودەسەتەکەی بەکرئاغا کرد، دواجار پێمان کرا پێنج ئەسپ دەستبخەین، دەوروبەری ئێوارە بۆیان هێنایین، سەرۆك ئێمەی دڵنیا کردەوە کە ناتوانێ زیاترمان بۆ پەیدابکا و گوتی، تەتەر و خزمەتکارەکان دەخرێنە سەر جانتاکان. ئەوان سەرەتا ڕەتیان کردەوە، بەڵام هێندەی نەبرد ناچاربوون ملی بۆ بدەن، چونکە سەرۆك هەڕەشەی لێ کردن بیانکوژێ و فەرمانی دا ئەسپەکان بهێنن. ئێمە زوو ناچاربووین هێوری بکەینەوە و یەکێك لە سوارەکانی ڕاسپارد هاوڕێیەتیمان بکا تا مێردین، لە سێرتەوە بۆ (کیان-خوی Kian-Khoi)، ناوچەکە دەوڵەمەندە بە کەتان و گەنمەشامی، بەڵام لە بەرانبەردا نە دارستان و نە میوەی تێدا نییە. لە (بایرام-خوی Byram-Khoi) ڕەوشی خاکەکە بە تەواوی دەگۆڕێ و زوو دواتر گەیشتینە چیای (ماسیۆس Masius)، کە زۆر سەختە. لێرە دیمەنەکە فرەچەشنەیە بە ڕەزی وڵات داپۆشراوە، بەشێکی دارودرەختی بچووك دەگرێتەوە کە زۆر لە دارهەڵوژەی کێوی دەچێ. لە هەشتەمین میلدا، لە چیاوە بۆ ناو دۆڵێکی تەسك و تەنگەبەر دابەزین، سەعات یازدەی ئێوارە بوو، تریفەی ڕووناکیی بریسکەداری مانگەشەو ڕێگەی پێ دەداین لە چەند دوورییەکەوە دیوارەکانی قەڵای (حوسینا Housyna) ببینین، کە لەسەر گاشەبەردێك دروستکرابوو و شوێنی نشینگەی ئیبراهیم ئەفەندی،[1] سەرۆکی دەستڕۆیشتوو بوو. دوای ئەوەی

---

[1] لە تورکیا هەموو پیاوێکی ڕیشدار ناسناوی ئەفەندیی هەیە. ئەم ناونانە بەسەر هەموو کەسێکدا دەسەپێ، فەرمانبەری مەدەنی بێ. ئەم ناوە هاوتای ناوی میرزای ئێرانییە، بە

به سواری ئەسپ بە دەوری دیوارەکانی ئەم باڵەخانە فراوانە، بەرچاوە بە بەرزاییەکەی سووڕاینەوە، چووینە ناوی و بەژێر کەوانەی گوتیکی* گوندێکی کەلاوەی باڵەخانەیەکدا ڕۆیشتین، پێمان خستە سەر زەوی لە حەسارێکدا، لەوێوە بە پەیژەیەکی لە گاشەبەرد داتاشراودا ڕۆیشتین و حەوشێکی دیکەمان بڕی، بەسەر بانێکی دارین، ڕازاوەدا بە قاڵی و بالیف سەرکەوتین، لەوێدا ژمارەیەك کەس چاوەڕوانیان دەکردین. گێژ وڕ بووبووین بەدەست ماندوویێتییەوە، وەك ئەوەی ئێمە تێی کەوتبووین، دوای کورتەپشوویەك، لێی خەوتین و لەزەتی ئەوەمان بوو دواجار کەمێك بحەسێینەوە.

١٧. کاتێك ئەفەندییەکە ئەسپەکانی بۆ ئامادەکردین، سبەینەکەی لە سەعات هەشتی بەیانیدا کۆشکەکەیمان بەجێ‌هێشت و چواری پاش‌نیوەڕۆ بە خۆشییەکی زیادی لەڕادەبەدەرەوە گەیشتینە مێردین، دوای بڕینی ڕێگەیەکی هەشت سەعاتی یا بیست‌وچوار میل. دوای شەش میل، ڕێگەکە بەناو دۆڵی (حوسینا Housyna)دا تێپەڕ دەبوو، درێژیی کەناری ڕووبارێکی بچکۆلە بوو، پاشانشینی دیاربەکری لە پاشانشینی بەغدا جیادەکردەوە. گردۆڵکەکان بە ڕەزی ترێ داپۆشرابوون و قووڵاییی دۆڵەکە بە بێستانی میوەجات، کە دارقەیسی، دارقۆخ و دارتوو و دارگوێزی تێدا زۆر دەبوون. لە حەوتەم میلدا، دۆڵەکەمان بەجێ‌هێشت و زیاتر بەرەو باشوور ڕوومان وەرگێڕا و لە ڕێگەکەمان بەردەوام بووین، بە ڕێگەیەکی ئەستەم و بەردەڵاندا ڕۆیشتین. لە نیوەی ڕێگەکەدا،

---

جیاوازیی ئەوە کە لێرە میرزا دەکەوێتە پێش ناوی کەسەکە، بەڵام ئەوەی ئەفەندی دەکەوێتە دوای ناوەکە. (تێبینی وەرگێڕی فەرەنسەیی).

* گوتیك یا گوتیتیکی بە عەرەبی (قوطیة) تەواوی ئەو گەلە جیرمانیانە بوون کە لە کۆن و سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا. دواتر لە سەدەی بووژانەوەدا بە هونەری بیناسازیی سەدەکانی ناوەڕاست ناسرابوون. (وەرگێڕ)

سوارەی بەکرئاغا کە وەك ڕێبەر خزمەتی دەکردین، بەخشیشێکی چاکمان - بەگوێرەی خۆمان- دایێ، بۆ پاداشتدانەوەی خزمەتەکانی، بەڵام وا دیاربوو وێناچێ پێی ڕازیبێ و پێی وابوو دەتوانێ ئێمە بتوقێنێ. لە ڕاوەستاندا، نێزەکەی خستە سەر سینگم و بە نەڕەی دەنگێکی پڕهەڕەشە، داوای بەخشیشی کرد، ئەسپەکەم وەرچەرخاند و خۆم لە چەکەکەی لادا. دەمانچەکەم لە دەستمدا بوو، هەڕەشەم لێ کرد؛ دەیکوژم ئەگەر بچووکترین جووڵە بکا. کارەکە تەنیا چەند ساتێك بوو، پشتی وەرگێڕا، کە بەرگری منی بینی، چیتر لە من نزیك نەکەوتەوە. وێڕای ئەوەی چاك دەیزانی هیچ ترسێکی لە محەممەد ئاغا نییە، کە -بە عادەتی خۆی-وەك تەماشاکەرێکی ئارام مایەوە و قەناعەتی وابوو مەترسیدارە خۆی لەگەڵ کوردەکان بەراورد بکا. بە گەیشتنە سەر لوتکەی بەرزاییەك، شار و کۆشکی (مێردین) لە دووریی حەڤدە میلەوە دەبینران، ڕاستەوخۆ بە توولەڕێیەکی یەکجار سەختی وەك تەنگەبەریی دیاریکراوی ناو ڕەزاندا دابەزین. بەناو دۆڵێکی بەردیندا، کە ئەو بەرزاییانەی بەجێمانهێشتبوون، جیای دەکردنەوە لە شارەکەی کەوتبووە سەری. لێرە، کوڕەکەی ئەفەندی، کە لە (حوسەیناوە) هاوەڵمان بوو، داوای کرد لێی ببوورین، چونکە -لێی زیادکرد- پێش ماوەیەك یەکێك لە دانیشتووانی مێردینی کوشتووە، دەترسێ پێ بنێتە ناو ئەم شارە.[1] کوردەکەی دیکە، ئەو پاڵەوانەی کە لەگەڵیدا جەنگام، ئەویش هات بە شێوازێکی زۆر خاکییانە داوای لە تەتەرەکە کرد شەفاعەتی ئەوەی بۆ بکا تا ئەو دوورییە لە بەرچاو بگرن کە هاوڕێیەتیی ئێمەی کردووە. بە خزمەتکارەکەم وت: شتێکی زیاتری بدەنێ و هەردوو پیاوەکەم هێندەی نەبرد لەناو چیاکان ونبوون، ئەم خەڵکانە وا خەیاڵ

---

[1] ئەم دڕندایەتییانە دەتوانن بیرۆکەیەك لەبارەی حوکوومەتی تورکەوە لە هەرێمەکاندا بخەنە ڕوو، کە دەسەڵاتی پاشایان تێدا لە کەوشەنی شاری نیشتەجێی خۆیدا دەوەستێ.

دەکەن ئینگلیزەکان گەنجینەی زێڕیان هەیە، بۆیە ناچاریان دەکەن ئەوەندەی دەکرێ- پارەیان لێ بقاچێننەوە. لە بیستەمین میلدا، دەستمان کرد بە پێداهەڵگەڕانی چیایەکی بەردین، کە شاری مێردینی لەسەر بنیاتنراوە و دوای چەندین پێچاوپێچ چووینە ناو شارەکە. چووم شوێنێك لای هاوڕێ پیرە ئوسقوفە گەورەکەم بگرم، کە پێشوازییەکی دۆستانەی لێ کردین.

ئەم ئێوارەیە چەند بە لەززەت دیاربوو، پاش ئەو ماندووبوونەی کە چێشتمان و ئەو مەترسییانەی کە بەرەوڕوومان بوونەوە، لە دوورەوە دەمانڕوانییە هەموو ماندووبوونێک، بەبێ ئەوەی خەیاڵمان بۆ ئەوە بچێ کە هێشتا ماندووبوونی زۆر سەخت ماوە، بەرگەی بگرین. بەردەوام لە لایەن یا دزەکان یا ئەو خەڵکانەی وا ئەرکی پاسەوانیی ئێمەیان پێ سپێردرابوو و لەو گوندانەیشدا کە تێیاندا دەوەستاین، بەدەست تەنگ‌پێ‌هەڵچنینی جووتیارەکانەوە، بەرەوڕووی کوشتن دەبووینەوە. دەتوانین ئەوە دووپات بکەینەوە، کە لەوکاتەوەی (تەرابزۆن)مان بەجێ‌هێشتووە، تا گەیشتنمان بە مێردین، لە ترس و وریایی و ئاگادارکردنەوەیەکی بەردەوامدا بووین. بانیژەی ماڵی ئوسقوفی گەورە بەسەر دیمەنێکی نایابی پێدەشتی بەرفراوانی میزۆپۆتامیادا دەیڕوانی، جاران پڕبوو لە چەندین شار و ئاوایی، بەڵام ئەمڕۆ گۆڕاوە و بووەتە بیابانێکی بەرفراوانی بەجێ‌هێڵدراوی پڕ لە عەرەبی ئاوارە، کە زۆربەی جار دێن ڕەشماڵەکانیان لەسەر چەندین کەلاوەی ئەم شارانە هەڵدەدەن.

لە ڕەئسولعەین Ras-Ulein (ڕێسێنا Resena ی کۆن- سەرێ کانی)، هەشت سەعاتی باشووری ڕۆژئاوای مێردین، خانەخوێیەکەمان کەلاوەی پەرستگایەکی نایابی بینی. هەشت یا دە ئەستوونی نایابی مەرمەڕ لەناو لمدا ڕۆچووبوون و عەرەبەکان پێیانڕاگەیاندبوو، هێشتا ژمارەیەکی زۆر زۆری دیکە

لەژێر زەویدان. ئەم شوێنە ناوەکەی لە سەرچاوەی خاپوور، (شابوراس Chaboras)ی کۆن وەرگرتووە کە کەوتووەتە نزیکی ئاوایییەکە و -بەگوێرەی گێڕانەوەی هاوڕێیەکەم-جۆگەلەیەکی جوان لە زەوییەوە بە هێزێکی سەرنجڕاکێش هەڵدەقوڵێ، جۆبارێکی گەورەی لێ دروستدەبێ، تاڤگەیەك لە سەرروویەوە هەیە. لە پێنج سەعاتی باشوور-ڕۆژئاوای مێردین، گوندێك هەیە، پاشماوەی شارێکی کۆنمان تێدا بینی. لەوانەی کە مابووەوە، پاشماوەی پردێك بوو کەموزۆر بە تەواوی مابووەوە. (یەنگۆ-شەهر Yengui-Chehr)، گوندێکە بیست سەعات لێرەوە و پێنج سەعات لە حەڕڕانەوە دوورە، ئەویش کەوان و چەندین پاشماوەی دیکەی مەزنایەتیی یەکەمی پێشکەشدەکا. تەنیا چەند شتێکی کەم ماوە، یا -باشتر وایە بڵێین- هیچێکی ئەوتۆی شاری بەناوبانگی حەڕڕان نەماوەتەوە. (نیسفۆریۆم Nicèphorium) کە ئێستا ناویان ناوە (ڕەققە Racca)، ئوسقۆفی گەورە سەری لێ داوە و وەك شارێکی گەورە باسی بۆ کردم، شارێك کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی عەرەبی تێدا نیشتەجێبوون و چەند پاشماوەیەکی جوانی بەخۆوە گرتووە. لە لایەکی دیکەوە، بە درێژی باسی دارا و نوسەیبین دەکەم، خاکی دەوروبەری مێردین کە ئەوەندە بەپیتە، بەبێ چاندن، لە ساڵێکدا چوار یا پێنج لە سەد دەدا. سێ سەعات لە ڕۆژئاوای شارەکەوە، ئاوایییەك بە ناوی (کەلبەین Kelabyn)ەوە، یا هەزارجاران هەیە، ناوێك کە لە پیت و فەڕی دەوروبەریەوە هاتووە. خاکەکەی، وەختێك لەناو دەستدا دەگوشرێ، وای لێ دێ وەك ئەوەی لەگەڵ ڕۆن تێکەڵ کرابێ. پێم وایە هەمان جۆری خاکی دەوروبەری ئەنتاکیاشی هەیە.

لە سێرتەوە بۆ مێردین، ڕێگەکە بەم ئاڕاستەیەیە کە لێرەدا دەیخەمەڕوو: سێ میل و نیو، باشوور، دوو میل باشوور-ڕۆژئاوا، پێنج میل باشوور-باشوور-ڕۆژائاوا، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات-باشوور، یەك میل باشوور-باشوور

ڕۆژئاوا، سێ میل و نیو باشوور-ڕۆژئاوا، شەش میل ڕۆژئاوا-باشوور، یەك میل ڕۆژئاوا-باكوور، دوو میل باكوور-ڕۆژئاوا، سێ میل و نیو ڕۆژئاوا-باشوور-ڕۆژئاوا، سێ میل و نیو ڕۆژئاوا-باشوور، دوو میل ڕۆژئاوا-باكوور-باشوور، سێ میل باشوور-ڕۆژئاوا-باشوور، یەك میل ڕۆژئاوا-باكوور-ڕۆژئاوا، دوو میل ڕۆژئاوا-باكوور، یەك میل ڕۆژئاوا-باشوور، دوو میل ڕۆژئاوا، دوو میل ڕۆژئاوا-باكوور، دوو میل ڕۆژئاوا-باكوور-ڕۆژئاوا، سێ میل باكوور- ڕۆژئاوا، دوو میل باكوور-ڕۆژئاوا، سێ میل باكوور-ڕۆژئاوا، دوو میل باكوور-ڕۆژئاوا-ڕۆژئاوا، چوار میل باكوور-ڕۆژئاوا- باكوور، سێ میل ڕۆژئاوا-باشوور-ڕۆژئاوا، دوو میل باشوور-ڕۆژئاوا-ڕۆژئاوا، دوو میل و نیو ڕۆژئاوا-باكوور، دوو میل و نیو ڕۆژئاوا-باكوور-ڕۆژئاوا، سێ میل ڕۆژئاوا-باشوور، یەك میل باشوور-ڕۆژئاوا-روژئاوا، دوو میل باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل و نیو باشوور-ڕۆژهەڵات، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، هەشت میل باشوور-ڕۆژئاوا، چوار میل باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-ڕۆژئاوا-باشوور، یەك میل باشوور-ڕۆژئاوا، یەك میل ڕۆژئاوا-باشوور، سێ میل باشوور-باشوور-ڕۆژئاوا، سێ میل باشوور، یەك میل ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-ڕۆژئاوا، نیو میل باشوور، یەك میل و نیو باشوور-باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور، دوو میل باشوور، شەش میل باشووور-ڕۆژئاوا، یەك میل باشوور-ڕۆژهەڵات، دوو میل باشوور-ڕۆژهەڵات-ڕۆژهەڵات، شەش میل باشوور-باشووور -ڕۆژئاوا.

١٨- سبەینێیەکەی، خانەخوێیەکەمان هات و چەند بەردێکی گرانبەهای زۆر جوان و چەند مەدالیایەکی سلۆقسی یەکەمی پێشکەش کردین، جووتیارێك لە کاتی زەوی کێڵاندا لەناو گۆزەیەکی ژێرزەویی چیای (تۆر) دۆزیبوویەوە، ئوسقوفی گەورە چەند دانەیەکی کەمی پارەی پاراستبوو، بەڵام بەشی زۆریان تووابوونەوە. پلەی گەرما

لە سەعات حەوتی بەیانیدا (١٢،٥°) ٦٠°، نیوەڕۆ (٢٢°) ٨٠° و لە خۆرئاوابووندا (١٧°) ٧٠° نیشان‌دەدا.

شاری ماردین، شوێنی ڕۆمانیی شاری (مەردەسMardes)ی گرتووەتەوە. ئەم شارە کەوتووەتە سەر لێژاییی باشووری چیایەکی سەخت و بەردەڵان. لوتکەی چیاکە قەڵایەکی لێیە، ئێستا وێران بووە. مێردین دیوارێکی بەردینی بە دەورەوەیە، چێوەکەی نزیکەی دوو میل و نیوە، لە قەڵاکەوە دەست‌پێ‌دەکا، بە شێوەی نیوەمانگ بە دەوریدا دەسووڕێتەوە. ماڵەکان تا ڕادەیەکی چاك بۆ شارێکی تورکی دروست‌کراون و زۆربەی ماڵەکان زۆر کۆنن. حاکمی شار پایەی ڤۆیڤۆدە [1] (قوماندانی سەربازی)ی هەیە و پاشای بەغدا دیاریی دەکا. دانیشتووانەکەی تێکەڵەیەکن لە تورك، عەرەب، کلدانی، نەستووری، کاتۆلیك، ئەرمەنی، جوو و یەعقوویی، هەروەها چەند سەد بنەماڵەیەکی گەبر [2]

---

[1] ڤۆیڤۆدە waiwode ou voyvoda : واتە سەرکردە یا ئەمیر بە زمانانی سلاڤی. پێش ئەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی وڵاتانی سلاڤ داگیر بکات. پادشاکانی ئەو ناوە پێیان دەوتن ڤۆیڤۆدە. دواتر لەسەردەمی داگیرکردنی ئیمپراتۆریای عوسمانی بەکارهێنانی زاراوەکە هەر مایەوە بەڵام بۆ ئەو حاکمە مەسیحیانە بەکاردەهێنرا، کە لەژێر سێبەری دەسەڵاتی عوسمانیدا لە هەردوو ویلایەتی ڤالاشیا و مۆلداڤیا حوکمڕانییان دەکرد. ڤۆیڤۆدە یەکسان بوو بە سنجاق بەگەکان لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا (وەرگێڕ).

[2] گەبرەکان یا (گیبرەکان) Guébres: وەچەی ئێرانییە کۆنەکانن، مەزهەب و باوەڕی دینیی خۆیان و تەواوی داب و نەریتیان پاراستووە. کاتی لەشکرکێشیی عەرەبەکان بۆ سەر ئێران، ناچارکراون نیشتمانەکەیان و چەوسێنەرە دڕەندەکانیان بەجێ‌بهێڵن. ئەو بەدبەختانە بەدوای نوایەکدا لە هەرێمە هاوسێکانیاندا گەڕاون و ژمارەی زۆرترینیان پەنایان بردووەتە بەر دوورگەی 'گوزروات' کە هێشتا وەچەی دواتریان و بەکارهێنانی کەونارایان لەوێ دەبینین. ژمارەی ئەوانەی کە ئەمڕۆ لە ئێران ماونەتەوە، لە چوارهەزار

(زەردەشتی)، یا ئاگرپەرستی لێیە، کە بە دزییەوە مەزهەبی ئایینی خۆیان جێبەجێدەکەن و مردووەکانیان، وەك ئەوەی لە بۆمبای، یەزد.. هتد دەکرێ، دەخەنە لوتکەی بورجێك، بۆ ئەوەی هەڵۆکان بیانماشنەوە.

ڕۆژی دوایی نامەم بۆ موتەسەللیم[1] نووسی، بۆ ئەوەی تا نوسەیبین ئەسپمان بداتێ. ئێوارە وەڵامەکەی هاتەوە. ئاگەداری کردمەوە کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بۆم پەیدا دەکا، بەڵام ئامۆژگاریی کردم بوەستم، تا کاروانێك دەڕوا، چونکە ئەو بیابانەی کە نوسەیبین و مووسڵ لەیەك جیادەکاتەوە، بە هۆی تاڵانوبرۆی ئێزیدییەکانی شنگاڵەوە، لەڕادەبەدەر ترسناکە. ئەم تایەفە جەسوورە ژمارەیان دەگاتە دوو ملیۆن کەس و چەند ساڵێکە هێزیان تا ڕادەیەك پەرەی سەندووە، بۆ ئەوەی ئەو زەویوزارانەی کە هاوسنوورن، بیانخەنە ژێر دەستی خۆیان. ئێزیدییەکان لەناو گوندەکان، یا زیاتر ناو ئەشکەوتی ژێرزەویی لاپاڵەکانی چیای شنگاڵدا دەژین، ئەو زنجیرەچیا بەرزەی کە لە باشوور-ڕۆژهەڵاتی مێردینەوە پێدەشتی میزۆپۆتامیا دەبڕێ. لێرەوە چەوساندنەوەی دڕندانەی پێڕەوانی محەممەد (موسوڵمان)، ناچاریان کردن پەڕیوەی ناو چیاکان بن، ئەمڕۆش شەڕێکی بێپسانەوەیان لەگەڵدا دەکەن. ئەو خاکەی کە دەیچێنن، ئەوەندە بەپیتوفەڕە، دەستبەرداری گەنمی هاوسێکانیان بوون. چیاکانیان سەرچاوەی کانیاوی فرەیە و لەوەڕگایەکی نایابی هەیە، لە کاتێکدا قەیسی، ترێ و هەنجیری شنگاڵ بەناوبانگن و باشترینن لە هیی عیراقی عەرەبی. من تەنیا چەند شتێکی کەم لەبارەی داب و نەریت و باوەڕی ئایینیی ئێزیدییەکانەوە دەزانم، لەم ڕووەوە لەوەی هەموو

---

خێزان زیاتر نابێ، هەموویان لە شاری یەزد دەژین و ژمارەکە دەشێ هێشتا هەموو زۆر کەمتر بێتەوە و بەگوێرەی خەملاندنەکان لێرەوە تا چەند سەدەیەك هەر بەتەواوی نامێنن. (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسەیی).

[1] موتەسەللیم: وەکیلی پاشا لە بەڕێوەبردنی کارگێریی ویلایەتدا (وەرگێڕ)

نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات دەچن؛ دابەش بوون بۆ چەند هۆز یا بنەماڵەیەک، لە لایەن شێخەکانەوە حوکمڕانی دەکرێن، کە دەسەڵاتی دنیایی و ڕۆحییان لە دەستدایە. ئەم هۆزانە کەموزۆر یەکگرتوون، بۆ پاراستنی ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان. ئەشکەوتێکی قووڵ بە قەدپاڵی چیایەکی بەرزی (عەبدولعەزیز Abdoul-Aziz) ناوەوەیە، لە سێ سەعات دووریی باشوور-ڕۆژهەڵاتی (مێردین)دایە، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵدا، قوربانیی خۆیانی تێدا پێشکەش بە شەیتان دەکەن، کاتێک گەوهەر و پارچەزێڕ و پارە فڕێدەدەنە ناو کەندەڵانەکە. ئەم کەندە هێندە قووڵە، هیچ ئامێرێکی ئاوپێو نەیتوانیوە بگاتە قووڵاییی. گومانی ئەوە دەکرێ کە تا ناوچەی دۆزەخ شۆڕببێتەوە. ئەو ئێزیدییانە جلوبەرگیان هەمان جلوبەرگی تورکەکانە. هێزیان بریتییە لە تیپی سوارەی غەیرەنیزامیی چەکدار بە نێزەی درێژ، شمشێر و دەمانچە و ئەسپەکانیان نایابن و دەتوانن بەرگەی ماندبوونی زۆر بگرن. لە هێرشەکانیاندا، قەتڵوعامی ئەوانە دەکەن کە پەلاماریان دەدەن، هەموو شتێکی لێ دەسێننەوە و لێی دەگەڕێن لە بیاباندا بمرێ.

١٩. سەعات شەشی بەیانی، پلەی گەرما (١٧°) ٧٠° و سەعات دە (٢٣°) ٨٤°، نیوەڕۆ (٢٩°) ٩٦°، سەعات سێی پاشنیوەڕۆ (٢٨،٥°) ٩٥° و کاتی خۆرئاوابوون (٢٤°) ٨٦°ی نیشاندەدا. ئاگەدارکردنەوەیەکمان لە موتەسەللیم پێگەیشت، بە خۆی و تیپێکی سوارەوە دەرچووە بۆ پاککردنەوەی ڕێگەی دیاربەکر لەو دزانەی کە ماوەیەکە ڕێگەکەیان تەنیوە.

# دەرچوون لە مێردین، گەیشتن بە مووسڵ

هەر چەند خولەکێکی پاش‌نیوەڕۆ ئەسپەکان گەیشتن. فەرمانم بە سووریچی دا ڕێگەی دارا Dara بگرێتەبەر، چونکە من لە کاتی یەکەم گەشتمدا بۆ ئەم ناوچەیە، تەنیا چەند دوورییەکی دیاریکراوم لە پاشماوەکانی ئەم شارە بینیبوو. خواحافیزیمان لە خانەخوێ بەڕێز و هاوڕێ قەشەکەمان (ئارشەڤێکەمان) کرد و سەعات یەك بە بەرزاییدا لەو شوێنەدا کە ماردینی تێدا هەڵکەوتووە، بە ڕێگەیەکی سەخت و بەردیندا کە دەشێ زیاتر لە دوو میل درێژ بێ، دابەزین. دامێنی ئەم چیایە، ئاوایی سانت- ئێلیجە Saint-Elidja ی لێیە، ئەو ناوەیان لێ‌ناوە، چونکە - بەگوێرەی دانیشتووانەکان- ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر ئێلیی لێ چووەتەوە بۆ ئاسمان. لە هەشتەم میلدا بە ئاوایی بودری Budriدا ڕەت‌بووین، بەردەوام ڕێگەکەمان بە داوێنی چیای ماسیوس Masiusدا درێژدەبووەوە، تا لە نۆزدەهەمین میلدا، کە لە پاشماوەکانی دارا Dara نزیك‌دەبووینەوە، بەناو کونێکی نەرمەلێژاییەکدا دابەزین، سەرنجی ڕاکێشاین. کاتێك چووینە ناو ئاواییەکە، یەکەم شت سەرسامی‌کردین، ژمارەیەکی بێ‌شوماری ژێرزەمینی مردووان، بە بارست و شێوەی هەمەچەشن لە داوێنی چیاکەدا هەڵکەندرابوون؛ لە چینێکی بەردینی ئەستووری داتاشراو پێك‌هاتبوون، وا دیاربوو شارەکە کەرەستە بیناسازییەکانی لێرەوە ڕاگوێزتبێ. یەکەمین ئەو ژێرزەمینانەی کە من پێوامن، هەشت پێ درێژی و پانییەکەشی پێنج پێ دەبوو. تاقێکی تابووتی لە یەکێك لە لاکانیدا بوو و دەرگایەکی کەوانەییش لەسەر لاکەی

دیکه. دەشێ سەدان و زیاتریش ژێرزەمین لەوناوە هەبووبێ. داوێنی چیاکە لە لێژاییەکی چارەگە میلیدا هەمووی گرتبووەوە. پاشان لە ڕێگەی کونێکی چکۆلەی ناو چیاکەوە کە لە سێ لاوە بەردی لێ بردرابوو، سەرکەوتینە سەر تەختاییەکی لووس و بێگرێ، بەرزیی سی یا چل پێ دەبوو. لەوێوە ڕوانیمانە ژێرزەمینی مردووەکان، کە نەدەژمێردران و لە ژمارە نەدەهاتن؛ بڕێکیان بیست پێ لە ئاستی زەوییەوە بەرزبوو، دووانیان نەخش و نیگاری یۆنانیان لەسەر بوو، بەڵام نەخشەکان ئەوەندە سووابوون، نە دەمانتوانی ڕازەکانی بخوێنینەوە و نە کۆپیشیان بکەین. ئەشکەوتێکی جوان لە کۆتاییەکەیدا هەبوو، بێگومان لەوانەیە گڵکۆی کەسایەتیەکی هەڵکەتوو بێ، هەشتا پێ درێژی و چل پێ پانیی بوو، ڕووبەرەکەی لە هەموو لایەکیەوە دەستی پێدا هێندرابوو، لە ڕێگەی توونێلێکی ژێرزەوییەوە، بە ژێرزەمینەکانی تەنیشتیەوە بەسترابووەوە. بەرزییەکەی ئێستە نزیکەی پازدە پێ دەبێ، بەڵام جاران ڕەنگە زۆر لەوە زۆرتربووبێ، هەروەك ئەوەی ئێستە نیوەی پڕە لە خاشاك. جاران لە بەرزاییی کونی گومەزە بەرزەکەیەوە ڕووناکیی بۆ چووە، ئەویش بە ڕوخسارێکی زۆر جوان داتاشراوە و لە ڕاستیشدا ئەمە سەیروسەمەرەترین و جوانترین بەشی هەڵکۆڵینەکانە. جۆرێك لە سەکۆ یا گالەرییەی بە دوازدە تاقی کەوانەیی ڕاگیراو، هەرسێ لای بە خۆیەوە گرتووە، لە کاتێکدا لە لای چوارەم کەوانەیەکی ئەستووری نیمچەبازنەیی هەیە، بە نەخش و نیگاری جوان ڕازێنراوەتەوە و لە بەشی پشتەوەی گالەرییەکەشدا بە ئاڕاستەی ڕوو لە سەربانەکە، ژمارەیەك کەوانەی بچووك هەن، بۆ ڕازاندنەوە بەکاردەهێندرێن؛ هەمووشیان لەسەر شێوازی ڕۆمانیایی دروستکراون. لای ڕۆژهەڵاتی بۆشاییی بچووك لە شێوەی تابووتدا، کە بەگوێرەی هەموو ئەگەرەکان ئێسکوپرووسکی کەسێتییەکە، ئەم باڵەخانەی یادگارییە نایابەی دروستکردووە. جا ئەگەر لە ڕووی نەخش و نیگار و شێوەی دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەشکەوتەکەوە حوکم بدەین، کە بەکاردێ بۆ چوونە ناو

ئەشکەوتەکە، ئەوا من وای بۆ دەچم هەموو ئەمانەی لە دەورانی ژوستینیان Justinien دورستکرابێ، هەستیار و قەشەنگ، نەخشێکی بەرزی نەخشکراو لەسەر لایەکی، نوێنەری فریشتەیەکە (ڕەمزی ڕۆح) دەورەدراوە بە فریشتەکان کە بەرزبوونەتەوە بۆ ئاسمان. لە سەرەوە دەستێك دیارە، پێشوازی لە ڕۆحی ڕۆیشتووەکان دەکا و لە بەشی خوارەوەشیدا کۆمەڵێك ئێسكوپرووسك و کەللەسەر هەن، لەسەر لای دیکەی دەرگاکە نەخشێندراون، گوزارشت لە فشۆڵیی ژیانی مرۆیی دەکەن. ئەستەمە نەخشەکان لە یەك جیابکرێنەوە، چونکە وا دیارە بە مەبەست شێوێندراون، یان بە شێوەیەکی دیکە بە تەواوی تێكشکێندراون. کە لە ژێرزەمینەکان دەرچووین، چووینە زیارەتی کەلاوەکانی ئەو قەڵا بەنێوبانگەی کە جاران شوورەی ڕۆژهەڵات[1] بووە.

---

[1] ئەوە بۆ ئەم مەبەستەیە کە شاری دارا لە چواردە میلی نوسێبین و چوار ڕۆژەڕێی دیجلەدا، پڕبووە لە دانیشتووان و شارێکی پڕ لە خەڵک و ڕازاوە بووە. کۆششی ژوستینیان Justinian پشتگیریی لە کارە خێراکانی ئەنستاسیۆس Anastasius کردووە بۆ بونیاتنان، بەبێ پێداگرتن لەسەر شوێنە کەمتر گرینگەکانی دیکە. دەکرێ شاری دارا وەك نموونەیەکی ئەندازەی عەسکەریی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تەماشا بکەین. شارەکە دوو شوورەی دیواری هەبووە، ماوەی نێوانیان پەنجا پێ پانایی بووە. ڕێگەیەکی دڵنیای هەبووە بۆ خۆکێشانەوە لەناو کۆشکەوە. شوورەی ناوەوە نموونەیەکی هێز و جوانی بوو، ئەوەی من پێوام، بۆم دەرکەوت شەست پێ لە ئاستی زەوییەوە بەرزە و بەرزیی هەموو بورجەکان سەد پێ بوون. کونەمەتەرێزەکان، کە لەوێوەوە گەمارۆدراوەکان دەتوانن بەرپەرچی دوژمن بدەنەوە، بچووکن، بەڵام زۆر جۆراوجۆرن. ئەفسەرەکان کە ئەرکی پاراستنی شوێنەکەیان پێسپێردراوە، بە درێژایی شوورەکە لەژێر هۆڵی دووانە دەبن و لە بەرزایی بورجەکانەوە سێیەمین سەکۆی فراوان و زۆر بەهێز بەرزدەبێتەوە. دیواری دەرەوە بۆ من وا دیاربوو نزمتر بێ، بەڵام بەهێزتر بوو و هەر بورجێك بە شوورەیەکی چوارینەیی دەپارێزرێ. خاکەکەی ڕەق و بەردەڵانە و بەر لە کرێکاری کانەکان دەگرێ و لای

به دڵنیاییەوە هەڵکەوتە جوگرافیاییەکەی وا بەدیارناکەوێ هێزی پێبەخشێ، چونکە چیاکان لە سێ لاوە شوێنەکە کۆنترۆڵیان‌کردووە، بەڵام لە باشوورەوە بە ئاڕاستەی پێدەشتی میزۆپۆتامیا، پێدەشتێکی بەرفراوان دەکرێتەوە. دەتوانین لەناو ئەم دۆڵەدا بەشوێن بناغەی شوورە و بورجەکاندا بچین، کە لە بەردی گەورەی داتاشراو دروست‌کراون. هێشتا شوێنەوارەکانی بەسەر گردێکی بەردینەوە دەبینرێن، لە بناری چیای ماسووس جیادەبێتەوە. دەوراندەورەکەی، دەشێ دوو میل و نیو بێ، جۆگەلەیەکی چکۆلە کە بەو شوێنەدا دەڕوا، وای کردووە چەند خێزانێکی کورد و ئەرمەن لەناو ئەم کەلاوەیەدا جێگیربن. جگە لە شوورە و بورجەکان، پاشماوەی چەندین باڵەخانەی دیکە گەواهیی گەورەیی و یەکەمیی دارا دەدەن. بەشێکی زۆری پانتایی ئەو زەویەی کە دەکەوێتە شوێنی ئیشەکە، لەژێرەوە

---

باشوور-ڕۆژهەڵاتیشەوە، کە زەوییەکەی زۆر شیاوترە بۆ پێوەچوون و شێوازی کارکردنیان دواکەوتوو بووە؛ بە کارێکی نوێ کە لەسەر شێوەی نیوەمانگ دەچێتە پێش، داکۆکیی لێ دەکرێ. ئەندازیارەکان بەهرەیەکی ناوازەیان لە ڕاکێشانی ئاو لە ڕووبارەکانەوە بۆ دانیشتووان نوواندووە. هیچ شتێك لەیادنەکراوە تا کارەکان بێ‌هوودەبن. بۆ فریادڕەسیی گەمارۆدراوەکان و ڕێگەگرتن لەو زیانانەی کە لە لافاوی دەستکرد یان سروشتییەوە پەیدادەبن. ماوەی شەست ساڵ دارا وەفای بۆ بیروڕای دامەزرێنەکەی بوو و ئەمە ئیرەییی فارسەکانی دەورووژاند. فارس بەردەوام سکاڵای لەدەست بونیاتنانی ئەم قەڵایە بوو، بەو پێیەی کە پێشێلکردنی ئاشکرای پەیماننامەی ئاشتیی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریایە- گیبۆن Gibbon. دوای ئاگربەس لەگەڵ کاباد، ئەنستاس شارێکی بەهێزی لە دوازدە میلی نوسێبین و سێ میل و نیو دوور لە سنووری ئێران دروست‌کرد و ناوی ئەستاسیای لێ نا- پرۆکۆپیوس Procopius. ئەم شارە پاشان ناوی دارای وەرگرت، ئەوە لێرەوەیە کە بیلساریۆسی بەناوبانگ نشینگەی خۆی وەك قوماندانی ڕۆژهەڵات لەو شارە دانا و لە جەنگێکی گەورەی ژێر شوورەی ئەم شارەدا بەرەو ڕووی فارسەکان بووەوە.

چەماوەتەوە و بەلایەکی‌تردا چووە.. لە شوێنێك‌دا ئەشکەوتێکی بەرفراوانم بینی، بە چوار ئەستوونی گەورە ڕاگیرابوو و تا ڕادەیەکی زۆر لە ئەستێڵی گەورەی کۆنستۆنتینۆپل دەچوو. ناوەڕاستی ئاواییەکە، کەلاوەی کۆشکێکە (کە ڕێی تێدەچێ ئەوە بێ کە پرۆکۆب باسی‌دەکا، یا کەلاوەی کڵێسەیەك بێ)، درێژاییی سەد پێ و پانایی شەست پێ بووە. بناغەکانی هەموویان بە تەواوی ماون و پێك‌دێ لە ژمارەیەکی زۆری تونێڵی ژێرزەویی ژوورەکان، بە دالآنێکی تەسك دەگەن، درێژییەکەی چل پێیە. دەرگەکە هێشتاکە هەر ماوە، بەشێکی لەحیساب‌نەهاتووی دیوارەکان بەرگەی خراپبوونی سەردەمیان گرتووە و زەوییەکەی داپۆشرابوو بە پارچە ئەستوونی پچرپچڕی شکاو و بەشی سەرەوەی ئەستوونەکانیش لەسەر شێوەی کۆرینتیانیی Corinthian هەڵچنراون، کە هەموویان وا دیارە لە بەردی ناوچە هاوسێکان وەرگیراون. جگە لەوە، پاشماوەکانی باڵەخانەکە -کە ئێمە ئێستە باسمان کرد- هێشتا پارچە و کەوانەی چەندین پێکهاتەی مەزنی پێوە مابوو. هاوڕێکەم، بەڕێز چاقاس، نەخشەی دەرگەی خوارووی شارەکەی کێشا، دیوارەکە ١٠ (دە) پێ ئەستوور و بەرزیی شەست پێ بوو؛ لە بەردی بچووك دروست‌کرابوو، کە بە چیمەنتۆیەکی نایاب پێکەوە نووساوبوون و بە پارچەی گەورە داپۆشرابوو، تا ڕادەیەك بە بورجێك دەچوو سێ دەرگای بە کەوانە لە خوارەوە و شەش پەنجەرەی لە سەرەوە هەبێ، لەوێوە دیمەنەکە بەسەر پێدەشتەکەدا دەڕوانێ. تەواو نزیك لەوە و لە ناوەوەش، پردێکی سێ کەوانەیی، هەروەها پاشماوەکانی دالآنێکی جوان کە بە دەروازەی چوونەوەژوورەوەی کۆشك دەگاتەوە، هەن.

کەلاوەکانی دارا دیمەنێکی جوانیان هەیە، کاتێك لە پێدەشتی وڵاتی میزۆپۆتامیاوە بۆی دەڕوانی، بەڵام ڕەوشەکە هیچ کەڵکێکی وای نییە، جگە لە ئاوی زۆر، کە ئەمە لە ڕاستی‌دا یەکەم بایەخ و گرینگییە لەم بەشەی جیهان‌دا.

ژمارەیەکی زۆری حاجی‌لەقلەق بەسەر بەرزیی دیوارەکانەوە بوو و هێشتا بەشداری لە بەخشینی خەفەت و فرمێسك بەچاودا هاتنەخوارەوەدا دەکەن، کاتێك سەر لە پاشماوەکانی ئەم شارە دەدەی کە جاران بە پلە نایابەکەی بەناوبانگ بووە. چێژمان لە شیرینیی خەوێکی هێمن وەرگرت لە بەرزیی کۆختەی قەشەیەکی نەستووریان و ڕۆژی ٢٠ی مانگ لەگەڵ خۆرهەڵاتن بەڕێ‌کەوتین بۆ نوسێبین

چەند ڕۆژێك بوو هاوڕێکەم، هاوسەفەری ماندووبوونەکانم، بەڕێز چاڤاس، بەدەست ئازارێکی توندی سەرئێشەوە گیری‌خواردبوو، ئەم بەیانییە هەستی‌دەکرد ئەوەندە نەخۆشە، بە ئەستەم هێزی ئەوەی هەبوو بەسەر پشتی ئەسپ بکەوێ. هۆی ئازارەکەی، حەمامێك بوو لە ماردین خۆی تێدا شوشت، یەکسەر دوای ئەوە خۆی خستە بەر بای پەنجەرەیەك. ڕێگەکە بەناو پێدەشتێکی بەپیت‌دا دەڕۆیشت، بەڵام دانەچێنراو بوو. دەیەم میل، کەلاوەی کۆشکێکمان لە دوای خۆمان بەجێ‌هێشت، ناوی قەسری جیهان Dijhân-Kasri بوو،[1] پێنج لە بورجەکانی و بەشێکی شوورەکانی هێشتا هەر مابوون. هەژدەهەمین میل، گەیشتینە ئاوایی نوسێبین، کە لە ناوەڕاستی کۆنەشاری نەسیبیسی ناسراوی مێژووی جەنگەکانی نێوان ڕۆمانەکان و فارسەکان‌دا دروست‌کراوە. باشترین شوێنی حەوانەوە کە ئەم گوندە کلۆڵە بتوانێ پێشکەشی ئەو هاوڕێ بەدبەختەمی بکا، بەکرێم گرت. ئازارەکانی هێندە بە خێرایی پەرەیان‌دەسەند، دوای ماوەیەکی کەم کەوتە وڕێنەکردن. یەك دەنکە دەرمانی ڕشانەوەم پێ دا، بەڵام زۆر کەم یا هەر کاریگەریی نەبوو. بەرەبەری ئێوارە چوار دەنکە حەبی کالۆملم دایێ. بەوپێیەی کە گەرما دابەزی، زۆر باشتر بوو و سبەینێ بەیانی ئەوەندە هێز و گوڕی دابوونە خۆی، بە ڕادەیەك کە لەبرێتیی ئەوەی

---

[1] Dijhân-Kasri جیهان قەسری، کۆشکی جیهان. یەکەمینی ئەو ناوە (قەسر) عەرەبییە و دووەمیشیان (جهان) فارسیە. (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسەیی)

بگەڕێنەوە بۆ ماردین، وەك ئەوەی من پێشتر پێشنیازم بۆ کردبوو، نیازی بوو بەردەوام بێ لە گەشتەکەی بۆ مووسڵ. هەرچۆنێك بێ و لە هەر ڕەوشێكدا بێ، من بڕیارم دابوو هاوڕێکەم کەمێك پشوویدا، بەر لەوەی ڕێگەی بیابان بگرینەبەر. ژمارەیەکی زۆر لە بازرگان و تاتار لە نوسێبین گردبووبوونەوە، بە نیازی پێکەوەنانی قافڵە caffila (کاروان) یا کاروانەیلی بچووك بوون، لە ترسی ئەوەی بە تەنیا سەفەر نەکەن. من زۆر حەزمدەکرد -ئەگەر شیاوبێ- خۆمان لەم ئاپۆرەیە بەدووربگرین، چونکە ئەمە چەند ڕۆژێك دەخایێنێ و وامان لێدەکا زیاتر بکەوینە بەر پەلاماری ئێزیدییەکان، هەر ساتێك زانیارییان لەبارەی بزاوتی کاروانەکانەوە پێ بگا، لە کاتێکدا گەشتیاری سادەی تەنیا، بەبێ ئەوەی ببێتە سەرچاوەی نیگەرانی، بۆ خۆی تێپەڕدەبێ. ڕای محەممەد ئاغا ئەوەبوو کە دەبێ هەمووومان بەیەکەوە سەفەر بکەین و وەك ئەوەی دواتر دەرکەوت، ئەو بۆ ئەمە پاساوی باشی خۆی هەبوو.

٢٣- سەعات حەوتی بەیانی تیرمۆمەتر ٨٠ (٢٣)ی نیشاندەدا، سەعات دە ٩٤ (٢٩) و نیوەڕۆ ٩٦ (٣٠) و سەعات سێی ئێوارە ٩٨ (٣١) بوو. من دەرفەتی فێتکیی ئێوارەم قۆستەوە بۆ ئەوەی سەری کەلاوەکانی ئەو کۆنەشارە بدەم، کە ڕووبەرێکی گەورەی بە کەناری ڕووباری میگدۆنیوس Mygdonius ەوە بوو. ڕووبارەکە بچووکە، بەڵام تیژڕۆیە. هێشتا بناغەکانی دیوارێك دەناسرێنەوە، کە وا دیارە بە درێژاییی چەند بەرزاییەك درێژبووەتەوە، لە باکوور-ڕۆژهەڵات بە ڕووباری میگدونیوس و لە باشوور بە زۆنگاوێك پارێزراوە. دەوراندەوری، بەگوێرەی لێکدانەوەی من، دەشێ نزیکەی سێ میل یا زیاتریش بێ. کڵێسەی سانت-ژاك، پاترۆنی نوسێبین، باڵەخانەیەکی بچووك کە هیچ شتێکی شایانی سەرنجی تێدانییە، نیوەی لەناو لمدا نوقمبووە. نەخش و نیگاری ناوەوە پێكهاتووە لە چوار ئەستوونی کۆرینتیان کە ڕووگەیەك لەنێوان دەرگەکان و پەنجەرەکاندا ڕادەگرێ، بەدەرنییە لە ڕێكوپێکی و تابووتێکی جوان لەژێر گومەزەکەیدا دانراوە. دووسەد پێ دوور لە

کڵێسەکە، تێبینیی پاشماوەی دالآنێکم کرد، لە پێنج ئەستوونی گرانێت پێك‌هاتبوو و هێشتا بەپێوەبوو. هەر یەکێکیان تاقە بەردێك بوو، بەڵام تەنیا پازدە پێم -کە ئەمڕۆ دیار بوو- لێ دەبینی. زیاتر لە نیوەی ئەستوونەکان، پێی وتم لەناو لمدا شاردراونەتەوە. گەورەترین بەشی فەزا کە شارەکەی داگیرکردووە، ئەمڕۆ بە ڕەشماڵی ڕەشی کوردەکان داپۆشراوە، کە مێگەلەکانیان لە کەناری ڕووباری میگدونیوس دەلەوەڕێنن. دەڤەرەکە لەنێوان ئەوان و عەرەبەکانی تەی Tyeی هۆزی بەهێز و کەونارادا دابەش کراوە. ئەم هۆزەی دوایی هەر بەناو سەر بە پاشای بەغدا بوو، بەڵام بە ڕاستی سەرداری هەموو دەڤەرەکە بوو، کە لە نوسێبینەوە تا مووسڵ درێژ دەبێتەوە. بە بیانووی هاوەڵێکردنی ئەو کاروانانە کە بەناو بیاباندا دەڕۆن، ئەم عەرەبانانە باج لە هەموو ئەوانە وەردەگرن کە بەناو دەڤەرە هاوسێکانیاندا ڕەت‌دەبن.

٢٤- بەڕێز چاڤاس Chavasse بەیانی زۆر باشتربوویبوو، بەڵام -لەگەڵ ئەوەش‌دا- حوکمی ئەوە نادەم زۆر باش چاك‌بوویبێتەوە، تا بەرگەی ماندووبوونی ڕێگەیەکی وەها دوورودرێژ بگرێ، گەرچی ئێمە هیچ فریاگوزارییەکمان نەبوو و ماڵەکەمان جێگای بەزەیی‌پێداهاتنەوە بوو. بەڵام من -وێڕای ئەوەش- بڕیارم دا هێشتا چەند ڕۆژێك لە نوسێبین بمێنینەوە، بۆ ئەوەی لێ‌بگەڕێم هاوڕێکەم گوڕ و هێزی بۆ بگەڕێتەوە .

ڕۆژی ٢٧ی مانگ، بەڕێز چاڤاس Chavasse هێز و گوڕی ئەوەندە تێ‌هاتبوو، بە هاوەڵیی سێ تەتەر و بیست یا سی گەشتیاری تر ئەم گوندەمان بەجێ‌هێشت. بە میگدۆنیوس‌دا بەسەر پردێکی چکۆلەدا تێ‌پەڕین و دوازدە میلمان بەناو پێدەشتێکی تا ڕادەیەك بەپیت و فەڕی باش کێڵدراودا بڕی. لای چەپ چیای ماسیوس Masius بوو، لای ڕاست زۆر دوور، زنجیرەچیای بەرزی شنگاڵ بوو. چەندین جۆگەلەی بچووك پێدەشتەکەیان دەبڕی، بەڵام نە درەختێک، نە پنچکەگیایەکی لێ نەبوو، تا لە تیشکی گەرمی سووتێنەری خۆر بمانپارێزێ.

سەعات دەی بەیانی، تێرمۆمەتر ٩٦ (٣٠) بوو، نیو سەعات دواتر، ئێمە گەیشتینە ڕەشماڵی عەرەبەکانی هۆزی تەی. لەوێ دەمویست داوای هێزێکی پاسەوانیی هەشت یا دە سوارە بکەم، تا مووسڵ. ڕەشماڵێکی بچووکی ڕەشیان داینێ، نزیکەی پێنج پێی چوارگۆشە بە بەرزیی چوار یا پێنج پێ، نەیدەتوانی ئێمە لە گەرما بپارێزێ. تینی گەرماکە هێندە بەهێزبوو، دەترسام کوشندە بێ بۆ بەڕێز چاڤاس، کە سەرلەنوێ وڕێنەکردنەکەی دەستی پێکردەوە. پەیامێکم بۆ شێخ نارد، بۆ ئەوەی تکای لێ بکەم هێزێکی بچووکی پاسەوانیمان پێبدا، بەوەی وا ئاگاداریشمانکردەوە خۆی چی دیاریبکا، ئێمە دەیدەینێ، ئەگەرنا بە تاقی تەنیا دەڕۆین. سەرەتا بە پێشنیازەکە ڕازیبوو، بەڵام هەر زوو دواتر پەیامێکی نارد کە هەموو پیاوەکانی لە لایەکی دیکە نراونە بەر کار، بۆیە پێویستە من کاروانەکە ببەم تا جەزیرەی ئیبنعومەر، لەسەر کەناری دیجلە. سەرۆکی سێرت ئێمەی ئاگادارکردبووەوە، لەبەر میزاجی خراپی دانیشتووانەکەی، سەر لەم شوێنە نەدەین. ڕێگەکە سەد میل درێژترە لەوەی ئەگەر بەناو بیاباندا بڕۆین. ئەم دوو هۆیە وایان لێ کردم بە توندترین شێوە دژی ئەم پلانە بوەستمەوە، بەڵام نە گفتپێدان و نە هەڕەشەکردن وایان نەکرد شێخ بڕیاری خۆی بگۆڕێ. هۆی هەر هەموو ئەمانەش محەممەد ئاغا بوو، دەترسا لەو بیابانە ئێمە لە لایەن ئێزیدییەکانەوە پەلامار بدرێین. ئەم ناپاکە، لای شێخ پیلانی گێڕابوو دژی ئێمە. ڕۆژێکی تەواو و شەوێك لەم شوێنەماینەوە و ڕۆژی ٢٨ی مانگ، لەگەڵ خۆرهەڵاتن، پیرەمێردێکی عەرەبی بڕواپێکراوی شێخ هاتە لامان. من شەش ڕۆبلی زێڕم خستە ناو چنگی و تکام لێ کرد نفووزی خۆی لای شێخەکەی بەکاربهێنێ، بۆ ئەوەی هەشت یا دە پیاوێك پەیدابکەین و ڕێمانبدەن بە تەنیا بڕۆین. زەردەخەنەیەکی کرد، پێی وتین ئەسپەکانمان ئامادەبکەین، چونکە هێزێکی پاسەوانیمان لە ئاواییەکی پێدەدا، لەبەرئەوە دەبێ پەلە بکەین.

کاتێك لە مۆڵگەکەمان دەرچووین و سەرنجم دا، خەمباری ئەوە بووم چەند گەشتیارێکی دیکەش لەدوامانەوەن. من پێشبینیی شتێکی وا باشم لە هاوڕێیەتییەکی لەم شێوەیە نەدەکرد. ترسمان هێندە لە جێگەی خۆیدا نەبوو، چونکە ئەوەندە زۆری نەبرد کاتێك گەیشتینە ئاواییی شیرەك Shirak،[1] لە هەشت میلی مۆڵگەکە، ڕاپانگەیاند ئەوان ناتوانن بەبێ هێزێکی پاسەوانیی هەشتا یا سەد کەسی بەناو بیاباندا بڕۆن. ئەوەی هێشتا زیاتر بۆ ئێمە مایەی بەدبەختی بوو، ئەوەبوو کە سێ کەسی لەناو ئاواییەکە دۆزییەوە، کاروانی جەڵەبیان بەجێهێشتبوو، دوای ئەوەی لە بازاڕ تاڵانکرابوون بۆ بیست لەکی پیاستەر. حاجی حوسێن، بروابێکراوی شێخ، وتی ناتوانێ لە سێ پیاو زیاترمان پێ بدا و پێویستە بەو ژمارەیە قایلبین، یا بە دیجلەدا بەناو جەزیرەدا بڕۆین. ئەو بۆ خۆی ئەو بڕیارەی دابوو، کە وێڕای نارەزایەتیی من سەری جەزیرە بدەین. بۆیە بڕیارم دا زیاتر لە هەر دەرفەتێکی دیکە خۆم لە پرسەکە هەڵقورتێنم. چارەنووسی هاوڕێکەم پەیوەست بوو بە پێشهاتی بەردەممان. من لەسەر ئاو و ئاگر بووم بگەمە مووسڵ، کە ڕێی تێدەچێ لەوێ هاریکاریی پزیشکێکمان پێ بگا و هەرچی شتێك پێویست بێ، بۆی بکرێ. ئەگەر ڕێگەی ڕاستەوخۆ بگرین، ئێمە بیابانەکە بە تاقە شەوێك دەبڕین، دەنا دەبێ ماوەی چەندین ڕۆژ بکەوینە بەر قرچەی گەرمای خۆرێکی سووتێنەر. تووڕەبووم بە دەست ئاستنزمیی محەممەد ئاغاوە، بە جیا گرتم و بە توندی ئەنجامە شوومەکانی ئەم ڕەفتارەیم بۆ لێکدایەوە، ئەگەر سەرسەختانە پێداگری لەسەر ئەو ڕێوشوێنەی خۆی بکا، بەڵام ئەو هەر کەڕ و لاڵ مایەوە و نەیبیست و هاوڕێکەم دەبووە قوربانیی ترسنۆکی و خیانەتی ئەم تاوانبارە. کاتێك بینیم ئەستەمە بیروڕاکەی پێ بگۆڕم، تکام لە حاجی حوسێن کرد ڕێگەمان بدا لەو

---

[1] ئەوەی وا دیارە سیسۆبانیوم Sisobanum بێ، کە پرۆکۆپیوس باسیدەکا، گەمارۆدراو و لە لایەن بلیسێر Bélisaireەوە دەستبەسەرداگیراوە.

ئاواییە بمێنینەوە، تا ئەوکاتەی هاوڕێکەم هێز و گوڕێکی بۆ دێتەوە. بەڵام ئەو ڕەتی‌کردەوە و لەگەڵ تاوهەڵاتن، بیست‌ودوو میل ڕۆیشتین بۆ ئەوی بگەینە ئاوایی چەڵی-ئاغا Chelly-Aga.

ڕێگەکە بەناو پێدەشتێکی بە شێوەیەکی ناتەواو داچێندراودا دەڕۆیشت، چەند ئاواییەکی بەخۆگرتبوو. بەناو چەندین جۆگەلەی بچووکدا پەڕینەوە، لە چیای ماسیوسەوە دەهاتن و بە خێرایی بەرەو باشوور دەبوونەوە. زۆربەی زۆری ئاوی ئەم جۆگانە لەناو پێدەشتەکە ون‌دەبوو. کاتێك گەیشتینە ئاوایی چەڵی-ئاغا، جارێکی دیکە بێ‌هوودە هەوڵمدا ڕێگەی ڕاستەوخۆ بگرینەبەر. سێ‌سەد پیاستەرم پێشکەش بە حاجی حوسێن کرد، ئەگەر بمانگەیەنێتە مووسڵ. بەڵام کاتێک ئەو ویستی مل بۆ خواستەکەم بدا، کەسەکانی دیکە ڕێگەیان پێ نەدا. ڕەوشی بەڕێز چاڤاس هەر وەك خۆی بە خراپی مایەوە و سەرباری لاوازبوونی، کە بە زەحمەت دەیتوانی لەسەر ئەسپەکەی دابنیشێ، ئێمە ناچاربووین بیست میل ببڕین و بەشێکی زۆری ئەو کاتانە لە بەر چرقەی خۆرەتاو بووین. تیرمۆمەتر پلەی ١٠٠ (٣١) بوو. زەوی وشك و سووتاو بوو و ڕووناکی‌دانەوەکەی بەرگەنەگیراو بوو. کەمێك دوای دەرچوونمان لە چەڵی-ئاغا، بەناو ڕووبارێکی چکۆلەدا پەڕینەوە، بەرەو چیای ماسیوس دەڕۆیی. ئێمە بەناو وڵاتێکی ناهەموار و بەردەڵان‌دا دەڕۆیشتین. هەندێك ناوچە بەرهەمێکی زۆری گەنم، گەنمەشامیی هیندی و لۆکەی لێ چێندرابوون. لەگەڵ خۆرئاوابوون، لە ئاوایی ئیبراهیم وەستاین، وەك عادەتی بە هەناسەی مرۆڤە خۆتێهەڵقورتێنەکان بۆگەن‌بووین. ساتە شوومەکە گەیشت. بەڕێز چاڤاس لەسەر فەرشێکی بن درەختێك ڕاکشابوو، لە حاڵەتێکی بێ‌هۆشیی تەواودا بوو، بۆ ئەوەی بەدبەختیمان زیاتربێ؛ نەمدەتوانی نە یەك کەوچك شۆربای پێ بدەم و نە ئازارەکانیشی کەم‌بکەمەوە. هێلکەی کوڵاو و خەیاری سەوز، تاقە شت بوون لە بەردەستمان‌دا بوون. محەممەد ئاغا هیچ بەزەییەکی نیشان‌نەدا، بێ‌گومان

حەزی‌دەکرد بمانبینێ هەردووکمان دەمرین، بۆ ئەوەی خۆی بکاتە خاوەنی کەوڵەکەمان. ئەوە نیگەرانیی من و ئەو بێزارییە بوو کە لە ناخم‌دا بوو، ئەستەم بوو شەو چاو دابخەم و سبەینەکەش بەدوای ئەوەوە بووم داوا لە عەرەبەکەی قوماندانی هێزە پاسەوانییەکە بکەم چەند ڕۆژێك لەو شوێنە کە لێین، بوەستێ، یا ڕێگەی ڕاستەوخۆ بگرێتەبەر. بەڵام وەڵامی دامەوە کە سەبارەت بە وەستان -وەک من ئاواتەخوازبووم- نابێ بیری لێ بکەمەوە، چونکە کاتی ڕۆیشتنمان قەتڵوعام دەکرێین و لە لایەن شێخەوە فەرمانمان پێ کراوە بە ڕاشکاوی ڕێمان‌نەدراوە لە هیچ جێگەیەك بوەستین یا ڕاستەوخۆ بچینە ناو مووسڵ. کاتی گفت‌وگۆکەمان، تەتەرەکەمان دەنگی بەرزکردەوە و بە شێوازێکی بێ‌شەرمانە وتی: عەرەبەکە بۆ ئەوە نییە، گوێڕایەڵم بە. قین‌هەڵگرتوو لە بەدنمەکی و سووکایەتیی ئەم تاوانبارە، کۆتاییم بە قسەکانی هێنا و خۆشبەختانە بە هەموو هێزێکمەوە گوچانێکم لەناو سکی دا، یەکسەر خوێن بە دەم‌وچاوی‌دا هاتەخوارەوە و چەند هەنگاوێك کشایەوە دواوە، خەنجەرەکەی دەرهێنا، بەڵام من بێ‌وەستان فەرمانم پێ‌دا هەرگیز خۆی نەخاتەوە بەرچاوم.

وەختایەك گەرمایەکە کەمێك کەم‌بووەوە، بەسەر پشتی ئەسپەکانمان کەوتینەوە و دوای ئەوەی بیست‌وشەش میلمان بەناو وڵاتێکی هاوشێوەی ئەوەی پێشتردا بڕی، دابەزینە ناو دۆڵی دیجلە. هێندەی نەبرد گەیشتینە جەزیرە، کە کەوتبووە ناو دوورگەیەکی داخراوی خواروخێچ. کەمێك بەر لەوەی بگەینە ناوشار، عەرەکان و پاسەوانەکانمان کە پێك‌هاتبوو لە دوازدە جوتیاری کورد، بەرەو لای من هاتن و جڵەوی ئەسپەکەی منیان گرت و بە شێوەیێکی ناشیرین و بێ‌ئەدەبانە داوای بەخشیشیان لێ کردم. وەڵامەکەی من ئەوەبوو: مادام پێچەوانەی من ڕێگەتان گرتووە، نامەوێ هیچیان بدەمێ. لەگەڵ ئەم وشانە شمشێریان بەرەو سینەی من ڕاکێشا و هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردم. بەڵام من

بەربەرەکانیم‌کردن و سووربووم لەسەر ڕەتکردنەوەکەم و پێم وتن: دەبێ ئەم داوایە لە تەتەرەکان و گەشتیارەکانی دیکەش بکەن، کە بە داخوازیی ئەوان بەگەڵ ئێمە کەوتوون. منیان بەجێ‌هێشت و چوونە لای گەشتیارەکانی دیکە و چەند سەد پیاستەرێکیان لەوان قاچاندەوە و ئەمە مایەی ڕەزامەندییەکی بێ‌سنووری من بوو. شاری جەزیرەی بن عومەر، شوێنی کەلاوی ڕۆمانیی بێزابدێ Bezabdé[1] گرتووەتەوە. شارەکە لەناو دوورگەیەکی لمینی دیجلەدا بەرزدەبێتەوە، دەوراندەوری نزیکەی سێ‌هەزار میلە و هەموو لایەکانیشی بە چیا دەورەدراوە. شارەکە دیوارێکی بەرگریی بە بەردی مەیلەوسپی هەیە، ئەمڕۆ بۆتە کەلاوە.

دوای ئەوەی لە لقی دیجلە پەڕینەوە، کە لای باشوور دەوری‌داوە، بە دەرگایەکی کۆن‌دا چووینە ناو شارەکە و دوای ئەوەی نزیکەی نیو میلمان بڕی، بەناو ماڵانی کەلاوە و چۆڵ‌دا، گەیشتینە بەشی دانیشتووانی شارەکە، لەوێ لەناو کاروانسەرایەك حەواینەوە. هەر دەم‌ودەست پاش گەیشتنمان، بە فەرمانی بەگ لەناو ژوورێکی بچووکی بێ‌پەنجەرەدا، هەشت پێی چوارگۆشە زیاتر نەبوو و هەوا نەدەهاتە ژوورەوە، لە ڕێگەی دەرگەوە نەبێ کە بەسەرمان‌دا داخرابوو، زیندانی‌کراین. گەرمایەکە بەرگەنەگربوو و هەڵمی تەویلەکە، کە لە ژێرەوەی ئێمەوە بوو، هێشتا زیاتر سەخت بوو. من نیگەرانی ژیانی بەڕێز چاقاس بووم، کە تا ئێستەش بەردەوام بڕێك هێزی جەستەیی هەر تێدا مابوو، بەڵام لە هۆش و گۆش کەوتبوو و هەموو شتێکی لەدەست‌دا بوو. بەرەبەری ئێوارە دەرگای زیندان کرایەوە، پەیامێکم لە بەگەوە بۆ هات، پێی ڕاگەیاندم پێکەوە لەگەڵ پاشماوەکەم،

---

[1] ئەم وەسپە -وا دیارە- هاوجووتی ئەو وەسپەیە کە نیردا جۆزیف کردوویە. بەگوێرەی ئەم مێژوونووسە، هاوسنووری نوسێبین بووە و لە هەموو لایەکەوە بە ڕووباری فورات دەورەدراوە.

دەبێ پارە بدەین. ئەوە بە ئەوانی تریش ڕاگەیێندرا، بڕی دووهەزار پیاستەر، ئەگەرنا تاڵاندەکرێم و دەکوژرێم. بە گەیشتنی پەیامێکی ئاوها قەناعەتم هێنا کە هیچمان بۆ نەماوەتەوە، جگە لەوەی بەخشینە باشەکەمان بدەین و هەرچی زووترە خۆمان لە چڕنووکی ئەم تاڵانچییە ڕزگاربکەین. من ئەو هەواڵەم بە هاوسەفەرەکانم گەیاند. ئاگادارمکردنەوە کە بەگ دزێکی کردەیە و ئەستەمە فەرمانەکەی پێ بگۆڕین. من ئامادەم نیوەی پارەکە بدەم، بە مەرجێك ئێوە ئەو پارەیەی کە ماوە، بیدەن و ئەوەشم وت: من زۆر خۆم خۆشحاڵم دەبینم بە نرخێکی ئاوا ڕزگاربببین. ئەوان پەڵپیانگرت کە پارەیان پێ نییە و تکایان لێ کردم پارەکە بە تەواوی بدەم و گفتیان دامێ کاتی گەیشتنمان بە مووسڵ، پارەکەم بدەنەوە. من کاراکتەری ئەو پیاوانەم بە تەواوی بۆ ئاشکرابووبوو، ڕەتمکردەوە مل بۆ داواکەیان بدەم و پێم ڕاگەیاندن دەتوانن بیر لە پێشنیازەکەم بکەنەوە و لە ماوەی سەعاتێکدا بڕیاری خۆیانم لەم بارەیەوە پێڕابگەیێنن.

ئەم هەواڵە ترس و بیمی لەناو تاقمەکە بڵاوکردەوە، هەندێکیان دەگریان، هەندێکی دیکەیان وەك نیشانەی بێهیوایی پەنجەیان دەگەست، هەموو نەفرەتیان لە عەرەبەکە دەکرد و تاوانباریاندەکرد کە دەستخەڕۆیکردوون. محەممەد ئاغا ئەوەندە پەشۆکابوو و لە هەمان کاتدا هێندە ترسابوو لە ژیانی خۆی، بە خۆیدا ڕانەدەپەرموو هەتا زاریشبکاتەوە؛ ترسی لەدەستدانی بازرگانییەکان و لەوانەیە ژیانی خۆیشی، سەرباری بەرچاوتەنگی و دوای چەندین ئاخ و هەناسەکێشان، ئەوان پارەکەیان خستەڕوو و بۆ بەگیان نارد. وا دیاربوو ڕازیبووە و پەیامی بۆ ناردم کە حەزدەکا سپێدە بمبینێ. ڕێگەیاندان لەسەر سەکۆی کاروانسەراکە بخەوین و خزمەتکارەکەم کە گۆشتاوی مریشکی بۆ بەڕێز چاڤاس دروستکردبوو، کەمێك هۆشی هاتەوە بەر و لە ڕۆژانی پێشوو زۆر باشتربوو.

٢٩- بۆ ئەوەی بگەمە لای بەگ، زیاتر لە میلێکمان پێویست بوو تا بڕۆین بڕۆین بەناو داروپەردووی ئەو ماڵانەدا کە ماوەیەکی زۆرە ڕووخاون. گەیشتینە بەردەم دەرگەی باڵەخانەیەکی گەورەی لەبەرد دروستکراو، کە دەیڕوانیە سەر لقی سەرەکیی ڕووباری دیجلە؛ بەگوێرەی هەموو ئەگەرەکان، باوەڕ بەوە بکرێ کە ئەوە جاران شوێنی پاشایەك بووە، بەڵام ئەمڕۆ لە بارستێکی کەلاوە زیاتر هیچیتر نییە. بەناو چەند حەوشەیەکدا ڕۆیشتم و دوای ئەوەی بە پەیژەیەکی ناڕێكدا هەڵگەڕام، بینیم بەگ لەناو ئەپارتومانێکی وێرانەی ئەوپەڕی ڕۆژئاوای بیناکەدا دانیشتووە. پێم وابوو پەنجا ساڵێك دەبێ، باڵای یەکجار بەرز و سەروسیمای هەر لە تاڵانچی دەچوو. بانگیکردم لە بنەبانی پەنجەرەیەکی نزیك بەو دانیشتم، دەستیکرد بە قسەکردن؛ سکاڵاکردن لەوە کە کاروانەکان زۆر بە دەگمەن نەبێ، یا هەرگیز، بەناو خاکەکەیدا تێپەڕنابن. وتیشی ڕێگەمنادا بڕۆم، تەنیا بەو مەرجە نەبێ کە بە پاشای بەغدا و مووسڵ بڵێم ڕێگەکە دڵنیایە و هەموو هەوڵێکی خۆم بدەم لە دواڕۆژدا هەموو بازرگانەکانیان بە جەزیرەدا تێپەڕبن. پەیمانم پێ دا چیی دەوێ بیگەیێنم. دواجار ڕێگەی دام بڕۆم، بەڵام بەر لەوەی ئەپارتومانەکە بەجێبێڵم، پێی ڕاگەیاندم هێزێکی پاسەوانیمان پێ دەدا تا زاخۆ. گەرچی پێشنیازەکەی دووربوو لەوەی ڕازیمبکا، بەڵام بە خۆمدا ڕانەپەرموو هیچ ناڕەزایەتییێك نیشانبدەم. خۆم گەیاندەوە کاروانسەرا، بۆ ئەوەی خۆمان بۆ دەرچوون ئامادە بکەین، لە ترسی ئەوەی نەبادا داوایەکی تر بخاتە سەر شانم، بەر لەوەی بە سەلامەتی لەم شوێنە دەربچم. نیوەڕۆ سواری پشتی ئەسپەکانمان بووین و بە سەر پردێکی پاپۆڕیی سەر لقێکی گەورەی دیجلە (کە سەدوچلوچەند پێ پان بوو)دا پەڕینەوە، ڕووبارەکە قووڵ و تیژڕۆ بوو. کاتێک گەیشتینە کەناری ئەوبەری، دەستمانکرد بە هەڵکشان بەسەر چیاکانیدا کە تا قووڵاییی ئاوەکە دەهاتنە خوار و دوای دوو میل ڕۆیشتن، دووبارە دابەزینەوە بۆ کەنارەکانی ڕووبارەکە. چوارەم میل بە جۆگەلەئاوێکی

چکۆلەدا کە لێرە دەڕژێتە ناو دیجلە، پەڕینەوە. لە پازدەهەم میل‌دا کەنارەکانی ئەم ڕووبارە نایابەمان بەجێ‌هێشت و بیستەمین میل لە ئاواییەکی مەسیحیەکان لە نەهرەوان وەستاین، بۆ ئەوەی شەو لەوێ بمێنینەوە. لە ماوەی هەموو ڕۆژەکەدا زنجیرە چیایەك بە لای چەپ‌دا تەریب ڕێگەکەمانی دەبڕی، تورکەکان پێی دەڵێن جوودی-داغ Djuda-Dâg و یەکێك لە دانیشتووانەکانی نەهرەوان Nâhrvân منی دڵنیاکردەوە، کە زۆر جار پاشماوەکانی کەشتیەکەی نوحی بەسەر لوتکەیەکی بەرزی ئەودیو گوندەکەوە بینیوە. دانیشتووانەکەی تا ڕادەیەك زۆرن لەناو ئەم چیایانەدا، بریتین لە مەسیحی لە مەزهەبەیلی نەستووریی کلدانی و ئەرمەنی، خەریکی گەنم و جۆ چاندن لەناو دۆڵەکە و ڕەزەوانی لە قەدپاڵی دا دەکەن.

٣٠- بەڕێز چاڤاس تەواوی شەو بە قووڵی خەوت و نزیکی بەیانی ئەوەندە باش بوویوو، دەمانتوانی لەگەڵ تاوهەڵاتن بەڕێ‌بکەوین. ڕێگەکە بەناو پێدەشتێك‌دا دەڕۆیشت، لای ناوەڕاست زنجیرەچیای زاخۆ بوو، هەمان ئەو چیایە کە -بەگوێرەی هەموو ئەگەرەکان- بەری لە هەموو پێشەوەچوونێکی سوپا دەهەزار کەسیەکە گرتووە و ناچاری‌کردووە کەناری دیجلە چۆڵ‌بکا. دوازدەمین میل بە بەردەبازێك‌دا نزیکەی نیو میل بە یەکتربڕێك لەگەڵ خابوور و هیزل‌سوو تێپەڕبووین. ڕووبارێکی زۆر گەورەیە، لە باکوورەوە دێ. ئێمە گەیشتینە کەناری ئەوبەری، کاتێك ئەو هێزی پاسەوانییەی کە بەگی جەزیرە پێی‌دابووین، کاروانەکەیان ڕاگرت و نیازی خۆیان ڕاگەیاند کە دەگەڕێنەوە ماڵ و داوای بەخشیشیان کرد. کوردەکان دەیانویست دووسەد پیاستەرم لێ بقاچێننەوە، ناچاربووم نیوەیان بدەمێ، ڕۆیشتن و بەم دەستکەوتە چاوەڕواننەکراوەیان ڕازی‌بوون. حەڤدەهەم میل زۆر بە زەحمەت بە بەردەبازێك‌دا ڕەت‌بووین، بەناو شوێنێك‌دا کە ئەوێ پانیە گەورەکەی وای لێ کردبوو کەمترین قووڵاییی هەبێ. ئێمە لەسەر پردێکی دەوروبەری سێرت، بە ڕووباری خاپووردا پەڕینەوە، وەك

چۆن هیچ کەس، جگە لەو کۆمەڵەیەی کە لەگەڵ خۆمان بوو، نەیاندەویست لە بەردەبازەکەوە بەم ڕووبارەدا بپەڕنەوە. ئەم هەلومەرجە بە گەورەترین خۆشحاڵییەوە، لەو کاروانەی جیاکردینەوە کە ناچاری پێچکردنەوەیێکی درێژ بوو و لە هەژدەهەم میلدا چووینە ناو شاری زاخۆ، نشینگەی کاپووتپاشا Pasha Caput، سەرۆکی سەربەخۆی کورد. زاخۆ شارۆچکەیەکی بچووکە، بەڵام هەڵکەوتنی لەناو دوورگەیەك بە ڕووباری خابوور دەورەدراو، کردوویە بە شوێنێکی ئاوەدان. سەرۆك لەناو کۆشکێکی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی شاردا دەژیا، بە میهرەبانی و میواندۆستییەوە پێشوازیی لێ کردین، بەڵام ئاگاداریکردینەوە کە دەبێ لە ماوەی چەند سەعاتێکدا دەربچین و لە پێشدا کەسێکی ناردبوو بۆ ئاوایییەکی هاوسێ، بۆ ئەوەی شوێنی حەسانەوەمان بۆ دابینبکا. ویستم بگەڕێمەوە سەر ئەم بڕیارە دڵڕەقانەیە، چونکە بەڕێز چاڤاس لەوپەڕی بێهێزیدا بوو و گەرما تەواو کاریتێکردبوو، بەڵام کوردەکە هیچ بەزەیییەکی نەبوو. لەوەتای دەرچوونمانەوە لە جەزیرە، بە ئاڕاستەیەکی باشوور-ڕۆژهەڵاتدا ڕۆیشتووین، بەڵام گومان و وریایی پاسەوانی هێزەکەمان ڕێگەیان لێ گرتووم بە ڕەفتاری ڕێكوپێك بجووڵێمەوە. بەم شێوەیە سەعات سێی پاشنیوەڕۆ، ئەو ساتانەی کە تێرمۆمەتر ١٠١ (٢٠)ی لە بەر سێبەردا نیشاندەدا، ناچاربووین زاخۆ بەجێبێڵین. بێهێزیی بەڕێز چاڤاس ناچاریکردین بە ئەسپەکەوە بیبەستینەوە، بەڵام ئازایەتییەکەی سەرسووڕهێن بوو و هێندەی پێی بکرابایە، هەرگیز دەستبەرداری نەدەبوو.

کاتی دەرچوونمان لە کۆشکەکە، بە لای باشووردا سووڕاینەوە و چووینە ناو دۆڵی زاخۆ-داغ، زنجیرەچیایەکی بەرز و سەرکەش بە ئاڕاستەیەکی تا ڕادەیەک ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوادا دەڕوا و لە ڕۆژئاوادا درێژدەبیتەوە تا کەناری دیجلە. دوای ئەوەی دە میلمان بەناو بەردەڵان و بەرزایییەکاندا بڕی، دۆڵەکە

بەسەر پێدەشتێك‌دا دەکرایەوە و لە چەند دوورایییەکی دەستەڕاست‌دا دیجلەمان بینی. بەناو باشوور-ڕۆژهەڵات-ڕۆژهەڵات‌دا سووڕاینەوە و لە دەیەمین میل‌دا وچانێکمان دا و لە ئاواییی ئەمیرئاغا، ڕەعیەتی پاشای ئامێدی،ماینەوە. شەو ڕاشکابوو، کاتێك گەیشتینە ناو حەوشەی ماڵی زابت، بینیمان لە سەربانی ماڵەکەی لەگەڵ بیست کەس لە پیاوەکانی شێوی‌دەکرد. بە پەیژەیەکی بەرتەسك‌دا سەرکەوتین و فەرمانی دا فەرشەکانمان لە شوێنێکی هەرە لاچەپی بانیژەکە بۆ ڕابخەن. محەممەدئاغا و بەشێکی کاروانەکەی کاتی وەستانمان لە زاخۆ بینی. لە نزیکی زابتەکە دانیشتن، بێ ئەوەی فەرموویان لێ بکرێ، بەشداری نانخواردنی ئێوارە بوون. من کە لە پشتەوە لەگەڵ بەڕێز چاڤاسی هەژار مامەوە، بێ‌هێزییەکەی ئەوەندە بوو، فرمێسکی زۆر گەرمم بۆ سەلامەتیی ڕشت. خۆ ئەگەر لە حاڵێك‌دا ئێمە ناچاربووین وەك ئەوەی تا ئێستە وابووە، بە ڕۆژ لە بەر گەرمای خۆردا قۆناغی درێژ ببڕین، ئێستە دەتوانین و ڕێگەمان پێ‌دراوە بە قۆناغی کورت و لە فێنکاییی شەودا سەفەربکەین. هاوڕێکەم کەمێك بووژایەوە.

پاشای ئامێدی لەسەر ئەو خاکەی کە ئێمەی وا لێین، هەر بەناو سەر بە بەغدایە، بەڵام -بە هەموو مانای وشەکە- شازادەیەکی بەرەبابی و سەربەخۆیە، وەچەی پشتاوپشتی ماڵی پادشای عەبباسییە، باووباپیرانی لەوەتای ڕووخانی تەختی خەلافەتی بەغدا، هەمیشە میرنشینی ئامێدییان لەبن دەست‌دا بووە. ئەم پادشایە یەکێك لە سەرۆکە هەرە بەهێز و دەوڵەمەندەکانی کوردستانە. کۆشکی پاشا لە ئامێدییە، شاری بەهێز و مەحکەمی سێ ڕۆژەڕێ لە باکووری مووسڵەوە دوورە. میرنشینەکەی سی‌ویەك هەرێمی پڕ دانیشتووان بەخۆوە دەگرێ و بەپیت و فەڕ لە دانەوێلە و ڕەزەوانی‌دا، دانیشتووانەکەی کورد، نەستووری، کلدانی و کاتۆلیکن.

٣ی ئاگستۆس- بەیانییەکەی کاتی دەرچوونمان، زانیمان زابت داوای دووسەد پیاستەر بەخشیش دەکا، ئەگەرنا دەست بەسەر کەلوپەل و جانتاکانماندا دەگریٚ. ڕازیبووم نیوەی بدەم و نیوەکەیتر تەتەرەکان بیدەن. ئەمجارە ئەوان کەوتبوونە حاڵەتێکی کەم تا زۆر بێهیوایی، نەفرەتیان لە کەللەڕەقیی خۆیان دەکرد وەك هۆی مایەپووچبوونیان و ڕایانگەیاند هەموو قازانجی شتومەکەکانیان بەشی خەرجییان ناکا لە بەغدا. حاجی حوسێن، خزمەتکاری نهێنیی شێخی تەی، کە بە داوای من تا ئێستە ئێمەی بەجێنەهێشتووە و تاقە کەسی ناو تاقمەکە بوو بە دەستپاکی دەجووڵایەوە، هات و داوای لێ کردم ڕێگەی بدەم بگەڕێتەوە. پێی وتین: بە بەردەبازێکی شەش یا حەوت میلی سەر ڕووباری دیجلەدا دەڕوا و بە یەك تاقە شەو دەگاتەوە ئۆردووەکەی. بیست ڕووپیەیەکم دایێ، لە پاداشتی ئەوەدا کە چاوی لەسەر ئێمە بووە، ڕەزامەندیی نیشان دا و تکای لێ کردم لای پاشای مووسڵ دەخالەت بکەم بۆ ئەوەی والیی مووسڵ ژنەکەی و منداڵەکانی کە گلی دابوونەوە، بیانگێڕێتەوە بۆی. وا دیارە جاران لە خزمەت پاشای پێش پاشای ئێستەدا بووە، لە دەمەقاڵێیەکدا، یەکێك لە خزمەتکارەکانی پاشای کوشتووە. وەختایەك سەردارەکەی دەکوژرێ، ڕادەکاتە ناوشار و دەبێتە پەنابەر لەناو هۆزەکەی، بەڵام ژنەکەی و منداڵەکانی بە فەرمانی حاکمی نوێ دەستگیر دەکرێن و حەوت ساڵ دەبێ حاجی حوسێنی بەدبەخت هیچ کەسێکی لە خێزانەکەی نەبینیوە. گفتم پێ دا هەرچییەکم پێ بکرێ، بۆی بکەم. بەڵام لێم نەشاردەوە کە هیچ هۆیەك نییە بێهیوای بکا لەوەی کە کۆششەکەمان سەرکەتووبن. پاشان دەستی ماچکردم و بە چاوی پڕفرمێسکەوە بەجێیهێشتم. ئەو بەردەبازەی کە پیرەمێردە عەرەبەکە بۆی باسکردم، هەر کەمێك لە ئاسکی مووسڵ دووربوو و -بەگوێرەی هەموو ئەگەرەکان- هەمان ئەو ناوچەیە بوو، کە

ئەسکەندەر لە ڕووبارەکەدا لەگەڵ سوپاکەی پێش جەنگی ئەربیلا پێیدا پەڕیونەتەوە، چونکە ئەوەیان تاقە شوێنە لە نێوان جەزیرە و مووسڵدا، دەتوانین بە بەردەباز لەم وەرزەی ساڵدا پێیدا بپەڕینەوە بۆ ڕووبارەکە. چواردە میلمان لەناو دەڤەرێکی کراوەدا بڕی و بە ئاراستەی باشوور-ڕۆژهەڵات و تا ئاوایی (ناموور Namur)، کە ئێزیدییەکانی تێدا دەژین، ڕۆیشتین. دیجلە کە ئێمە کەم کەمە لێی نزیك دەبووینەوە، لە دەستەڕاستمان بوو و لە دوورایییەکی زۆری دەستەچەپیشمان زنجیرەچیای زاگرۆس[1]مان دەبینی.

ئەوەتی لە مێردین دەرچووین، بە کەمی دار و درەختمان بینیوە، وێڕای ئەوەی کە وڵاتەکە بەشی زۆری فرە بەپیت و فەڕ بوو بۆ دانەوێڵە، دیمەنێکی ڕووتەن و وشکانی هەبوو. گڕی گەرماکەی زۆر بەتین بوو، گەرمای خۆر هێشتا زیاتر بەرگەنەگیراوتر بوو وەك لەوەی تا ئێستە تاقیمانکردبووەوە. زیاد لەوە، من بیرم لەو ماندووبوونە پەرجووئاسایە دەکردەوە کە ئێمە بەرگەیمان گرت. لەپاڵ ئەوەدا، ستایشی ئازایەتیی هاوڕێکەمم دەکرد کە بەرگەی نەخۆشییەکانی دەگرت، بێ ئەوەی یەك بۆڵەبۆڵ بکا. ئێزیدییەکان لەم ئاوایییە (ناموورNamur)دا بە شێوەیەکی دۆستانە پێشوازییان لێ کردین. شیر، پەنیر و نایابترین نانیان بۆ بەرچایی بەیانی بۆ هێناین و هەشت سوارەی تەواو چەکدار فەرمانیان پێ کرا بمانگەیێننە قۆناغی دواتر. من بێ‌ئەندازە نیگەرانبووم بۆ بەڕێز چاڤاس، ئارەزووم بوو ڕۆژەکە بە تەواوی هەر لە ئاوایی ناموور Namur بمێنینەوە، بەڵام نازانم ئەوە بە فیتی مەحموود ئاغا و تەتەرەکانی دیکە بوو، یا لەبەر هۆی دیکە، کە نەیاندەویست ڕێگەمان بدەن زۆر لەناو ئاوایییەکە بمێنینەوە. بەم شێوەیە دوای حەسانەوەیەکی یەكسەعاتی، فەرمانمان بۆ هات بەسەر پشتی ئەسپەکانمان بکەوینەوە، خۆر هێشتا

---

[1] کیونت کیرسQuiutus Curtius و سترابۆن Strabo، پێی دەڵێن چیاکانی گۆردیان .Gordiennes

له نیوەڕۆدا بوو. برای سەرۆکی ئێزیدییەکان وەك سەرکردەی هێزەکەی پاسەوانی بەگەڵمانکەوت. کاتی سەفەرەکە هەزار پرسیاری لێ کردم سەبارەت بە داب‌ونەریتی ئەوروپاییەکان و لەوانەش پرسیی: داخۆ چەند ئێزیدی لە ئینگلستان هەیە؟ وەڵامیم دایەوە، خەڵکی ئینگلستان ناوی ئێزیدییەکانیان هەر نەبیستووە. بەم وەڵامە تا دوا ڕادە سەرسووڕماو بوو و پەنجەی بۆ تورکەکان درێژکرد: "ئەم ناڕەسەنانە،" وتی، "بە ئێمە دەڵێن ناپاك، بەڵام هەرچۆنێك بێ من لەگەڵ دە کەس لە هاوڕێکانم هەست‌دەکەم دەتوانم سەدان لەم سەگانە ڕووت‌بکەمەوە." شازدە میل بەناو وڵاتێکی هەر لە هەمان جۆردا ڕۆیشتین، بە گرتنەبەری ئاڕاستەی باشوور-ڕۆژهەڵات-باشوور، دیجلە لە دەستەڕاستمان مایەوە بە دووریی پێنج میل و چیای زاگرۆس لە دەستەچەپدا. کۆتاییی شازدەهەمین میل، لەناو ئاواییەکی ئێزیدییەکان، ناوی هەترا Hatarra بوو، ماوەی چەند دەقیقەیەك پشوویێکمان دا و پاشان هێشتا شەش میلمان نەبڕیبوو کە گەیشتینە ئاواییی تەلیسقۆف Teliskofی کلدانەکان، لەوێ ڕێگەیان دا شەو بمێنینەوە. لەوەتای دۆڵی زاخۆمان بەجێ‌هشتبوو، وڵاتەکە کەمتر ناهەموارتر دەبوو و خۆمان لە پێدەشتێکی بەرفرواندا بینییەوە، کە ڕۆژهەڵاتی چیای زاگرۆس، باشووری زێی گەورە و ڕۆژئاوای دیجلە و باکووریشی چیاکانی زاخۆ و ئامێدی بوو. ئەم پێدەشتە لە مێژوودا بەناوبانگە بەوەی کە شانۆی چەند ڕووداوەیلی لەبیرنەکراو بوو؛ زەینەفۆن و سوپا ئازاکانی پێیدا ڕەت‌بووبوون، لێرە ئەسکەندەر جەنگی ئەربیلای بردەوە و چەند سەدەیەك دواتر ئیمپڕاتۆر هیراکلۆس دەسەڵاتی نایابی خەسرەو پەروێزی تێکشکاند. لەو شوێنە پاسەوانە ئێزیدییەکانم ناردەوە، داوای هیچ بەخششێکیان لێ‌نەکردم، خۆیان کشاندنەوە و خۆشحاڵ بوون بەوەی کە پێم دان. بەگوێرەی ئەو ماوە کەمەی کە من بینیم، بۆ دەرکەوت ئەم تایەفە نایابە نەژادێکی مرۆییی زۆر نەرم‌ونیانترن و زیاتر هەستی نەجیبزادەیی و بەخشندەییان هەیە وەك لەو دانیشتووانە تێکەڵەی

ئاشوورستان، کە تورکەکانی تێدا تەمبەڵ، لووتبەرز و چەقاوەسوون، عەرەبەکان شانازیکەر، ناشارستانی و دڵڕەقن و مەسیحییەکان ترسنۆك و خیانەتکارن.

زۆر بە میوانەدۆستی لە لایەن کەشیشی کلدانییەکانی ئاواییەوە پێشوازیکراین، سەربانێکی لە ماڵێکی تایبەت بۆ تەرخانکردبووین. ئەوە ئاسوودەگییەك بوو کە ئەوەتی لە ماڵی ئارشەڤێکی چاك لە مێردینەوە دەرچووبووین، نەمانبینیبوو و تەنیا ئێمە نرخیمان دەزانی، چونکە بەردەوام یەخەگیری خۆتێهەڵقورتێنی و گەمژەیی بەربەرییە بێهەستەکان دەبووم. بەڕێز چاڤاس باشتر لەوەی من چاوەروانی بووم، بەرگەی ڕێگەی دەگرت، وێڕای ئەوەی کە سکاڵای بوو هێشتا خۆر کاری لە مێشکی دەکرد. بەڵام تەنیا ڕۆژێکمان مابوو بگەینە مووسڵ، هەستم بە ڕەزامەندیی دەروونم دەکرد بە گەیشتنە ئەم شارە، حەسانەوە و خواردن و کۆمەگییەکانی پزیشك کەم کەمە لەش‌ساغییان بۆ دەگەڕاندەوە.

وەك پێشوو بەردەوامبووین لە ڕێگەکەمان بەناو پێدەشتەکەدا، دیجلە لای ڕاستمان و بەرزاییەکانیش لای چەپمان بوون. پێنجەمین میل ئاواییەکی باتمە Batma [باتووفە] ناوی کلدانییەکان بوو، دەیەم میلیش ئاوایی تەلکێف بوو. ڕێگەکان زۆر لەباربوون. ئەوەتی دۆڵی زاخۆمان بەجێ‌هێشتبوو، ڕێگەکە بەردەوام باشتر دەبوو. دەبێ لەو شوێنەی نێوان تەلکێف Tilkiff و زابدا، بەگوێرەی من، جەنگی ئەربیلا Arbelles و نەینەوا Ninevèh ڕوویدابێ و وادیارە سروشت لەزەتی وەرگرتووە کە ئەم پێدەشتەی دروستکردووە بۆ جەنگێك. بەدەر لە زنجیرەیەك گردۆلکەی نزم و بڕێك لێژاییی نەرم، زەوییەکە هیچ بەربەستێکی نییە بەرانبەر بە پێشەوەچوون و جووڵەی سوپایەلی بە ژمارە هەرە زۆر و هیچ لەو وەسفە وردترنییە کە کیونیتس کیورتیوس بۆ ئەم وڵاتەی کردووە.[١] بیست‌وتۆیەم میل

(١) کیونیتس کیورتیوس Quinte-Curce دەڵێ: داریوش هەشتا هەنگاو لەو دیو

گەیشتینە مووسل و یەك میل بەر لەوەی بچینە ناو ئەم شارە، دوو گردی دەستکرد و شوورەیەکی گەورەمان بڕی، ڕێی تێدەچێ پاشماوەکانی نەینەوای کۆن بن. یەکەمین گرد، دەشێ دەوراندەورەکەی سێچارەگە میلێك و بەرزییەکەشی هەمان ئەوەی سویس بێ. بەڵام ئەوی دیکە دەوراندەوری ئەوەندە گەورەنەبوو، بەڵام بەرزییەکەی باڵاتر و گڵکۆی یوونس پێغەمبەری لێ بوو. ئاواییەك لە دەوروبەریدایە، ناوی نوونیا Nonniaیە، جووەکان دێن بۆ زیارەتی ئەم گلکۆیە، کە تەنیا شوێنەوارێکی بچووك و ناچیزە و گومەزێکی گڵینی لەسەر دروستکراوە. دەڵێن شوورەی شارەکە لە لایەن نادرشاوە، کاتێك ئەم شازادەیە شارەی مووسڵی گەمارۆدابوو، دروستیکردووە. بەڵام ئەم بیروڕایە بۆ من بناغەیەکی وا پتەوی نەبوو، چونکە درێژبووەوەی ئەم پاشماوەیە هێندە لەحیسابنەهاتوو بوو، نەمتوانی لە کاتی یەکەم سەفەرمدا خەیاڵیبکەم و قایمکارییەکی لەو شێوەیەی مەیدانیش بە هیچ شێوەیەك نابێ کاری سوپایەکی وەك هیی نادرشا بووبێ. من گومانم لەوەدا نییە کە ئەم شوورەیە دەبێ بریتی بێ لە پاشماوەی شارێکی کۆنی وەك نەینەوا یا لاریسا، کە زەینەفۆن وەسپی کردووە.

---

ڕووباری لیکۆس Lycus، زێی گەورە Zâbی ئێستەوە، چووەتە پێش و خێوەتی لەناو کێڵگەیەکی گەورە هەڵداوە، هیچ دار و درەخت و درەختۆکەیەکی لێ نەبووە، بە جۆرێك کە چاو دەیتوانی لە دوورەوە تەنەکان بەدیبکا. ئەو زەوییانەش کە بەرزایی بوون، داریۆش فەرمانی دا تەختیانبکەن. هەر بەگوێرەی هەمان نووسەر، وا دیارە ئەسکەندەر لە ماسۆدانیاوە لە سەرووی مووسڵ بە دیجلەدا ڕەتبووە و دوو یا سێ ڕۆژ پێش جەنگەکە گەیشتووە؛ بێگومان لە باکووری زێی گەورە شەڕیکردووە، چونکە داریۆش لە ڕاکردنەکەیدا ئەو ڕووبارەی بڕیوە و تا نیوەی شەو نەگەیشتووەتەوە ئەربیلا. مامیوم Mammium، چوار ڕۆژ لە ئەربیلاوە دوورە، وا باسکراوە کە کەوتووەتە تاڤگەی نەفتnaphte کە ئەمە بێگومان قەرەقوش Kerkouchی مۆدێرنە.

بەسەر پردێکی بەلەمی‌دا لە دیجلە پەڕینەوە و چووینە ناو مووسڵ، بەڵام ئەو خۆشییەی وا ئەم شارە پێی بەخشیم کە ئێمەی خستە کۆتایی ناسۆرەکانمان، لەبەر ڕەوشی ترسناکی بەڕێز چاڤاس، تەموومژاوی بوو، بە جۆرێك کە ڕەوشی ترسناك تێك‌چووبوو، پشێوییەکانی زۆر زیاتر بوون و سەخت بوو بە زەحمەتێکی زۆر بگاتە شار. فەرمانم بە سووریچی دا بمانباتە ماڵی قەشەی کاپوسینیك، پیاوێك لە تەمەنێکی باش‌دا، نامەم پێ بوو بۆی، زانیارییەکی زۆری لە پزیشکی‌دا هەبوو. گەلێك چاکتر لای دکتۆرێکی وڵات قەبووڵ‌کراین، چووینە ماڵەکەی، بەڵام باوکە قەشە ناچاربووبوو دوو ڕۆژ پێشتر بچێتە سەردانی پاشای ئامێدی. ئەمە کارێکی چاوەڕوانەنەکراو و بەدبەختانە بوو، چونکە تاقە کەس بوو لە شارەکە و گەڕەکەکە چەند زانیارییەکی پزیشکیی هەبوو. وەك چۆن پشێوییەکانی نەخۆشیی هاوڕێکەم وەك سروشتی نیشانەکانی زەرداو بوو، ئەمە وای لێ کردم بەو ئەنجامە بگەم کە پێویستە بحەسێتەوە و چارەسەری کالۆمێل (کە تاقە دەرمانی بەردەستم بوو) بە ژەمی بچووك وەربگرێ. بۆیە بڕیارم دا حەبی کالۆمێل، کە دەنکی دوودانەیی تێدابوو، بەیانیان و ئێواران دەمداێ بیخوا. جگە لەوە، چا و شۆربا و چەند خواردنێکی دیکەی سووکم پێ دا. بەڵام دوای پێنج ڕۆژ هیچ گۆڕانکارییەکی بینراو لە ڕەوشی لەش‌ساغیی‌دا بەدی‌نەکرا؛ وڕێنەی بەردەوام و هیچ سەرچاوەیەکم لە بەردەست‌دا نەما و سەرەنجام وام لێ هات کەڵەکێك و چادرێکی چەسپاو بگرم، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە بە دیجلەدا بیگەیەنمە بەغدا بۆ لای دکتۆر هاین، پزیشکی نشینگەی بەغدا، پیاوێکی زانا و خاوەن شارەزاییەکی زۆر لە پیشەکەی‌دا. لەسەر پاشا وەستام کە بەڵێنی‌دابوو یارمەتیم بدا و فەرمانی دا کەڵەکێك ئامادەبکرێ. من وەسپێکی شاری مووسڵم لە کتێبەکەم "Persian memoir"دا کردووە و ئەوەی لەبارەی شارەکەوە پێویست بێ، گوتوومە. بۆیە پێویست‌ناکا دووبارەی بکەمەوە. مووسڵ شارێکە کۆن و تاریکە، بە خێرایی لەناو فەرامۆشی‌دا گرینگیی کەم‌دەبێتەوە.

## دابەزین بەناو ڕووباری دیجلەدا - مەرگی بەڕێز چاڤاس[1]

ئێوارەی ٨ی ئاب/ئاگستۆس، سواری کەڵەکێك، کە لێرە پێی دەڵێن بەلەمی دیجلە، بووین. کەڵەکەکە درێژیی هەژدە یا بیست پێ و پانییەکەشی چواردە پێ دەبوو و لە داری قامیش و تەختەداری بەیەکەوەبەستراو دروستکرابوو، بە پێستی کەوڵکراوی پفکراوی مەڕ پێکەوە و بە شێوەیەکی ئەستوونی ڕاگیرابوو. کونێکی چکۆلە یا دەمەوانەیەك لە بەشی سەرەوەیدا هەبوو، بە چەرم بەسترابوو، بە شێوەیەك کە بتوانرێ هەر دوو یا سێ سەعات جارێك هەوای تێبکرێ. سەکۆچکەیەك یا خانووچکەیەك لە ناوەڕاستی کەڵەکەکەدا دانرابوو و بە لباد داپۆشرابوو. دوو قەنەفەیان بۆ ئێمە دانابوو و چەند کلاوڕۆژنەیەکی کراوە یا پەنجەرۆکەیەکیش هەبوو، ڕێگەیان بەوە دەدا هەوایەکی فێنکی ئاوی دیجلە بێتە ژوورەوە. هەرچەندە ئاوەکە کەمی کردبوو،

---

[1] لە چاپە ئینگلیزییەکە بۆ ئەم سەرباسە نووسراوە (مەرگی بەرێز چاڤاس)، هەرچی وەرگێرە فەرەنسایيەکەیە کردوویە بە (نووسەر دادەبەزێتە ناو دیجلە)، کە بەراستی وەرگێرە فەرنساییەکە زۆر هەقی بووە، چونکە نووسەر تەنیا بە دوو یان سێ دێر باسی مەرگی چاڤاس دەکات، بەڵام نووسەر مەبەستی بووە ناوی هاوڕێکەی بە بەرزی ڕابگرێ و لەوە زیاتر دڵی نەهاتووە ناونیشانێکی دیکەی بۆ دابنێ. بۆیە من لە وەرگێرانە کوردییەکە کردم بە (دابەزین بەناو دیجلە - مەرگی بەرێز چاڤاس)، کە پێم وایە زۆر دروست ئامانجە دەپێکێت (وەرگێری کوردی).

بەڵام ڕووبارەکە هێشتا ئاوێکی بەلێشاوی هەر مابوو. حەوتی ئێوارە کەناراوەکەمان بەجێ‌هێشت و بە یاریدەی دوو سەوڵ بەردەوام‌بووین، شەو دەرچووین، تێکڕا نزیکەی چوار میل و نیومان لە سەعاتێك‌دا دەبڕی. کەناراوەکانی ڕووبارەکە، لە هەر لایەکەوە دووسەد یارد ئاوی تێدابوو، بە داربی و خەیار داپۆشرابوو، نیشتەنیی کاتی یا ڕەشماڵی ڕەشمان لەوێ دەبینی، هیی بێستانچییەکان بوو. لەوێوە، هەمووی لم و بیابان بوو. من لەگەڵ خۆرەتاو خەبەرم بووەوە و بیست دەقیقە دواتر کەوتمە سەرنجدان؛ کەناری لای ڕاستی ڕووبارەکە نزم‌بوو و دەکرا ئاسانتر ئاو بدرێ. زنجیرەیەك گردۆڵکەی نزم بە درێژیی دەستەچەپ هەبوو. لە سەعات پێنج لەسەر کەناراوەکان تێبینیی ژمارەیەك عەرەبم کرد، لەوێ چادریان هەڵدابوو؛ پێم وایە بێستانچییەکانی گەنمەشامی و کاڵەك بوون. ئاو بە هۆی مۆتۆرێکەوە کە زۆر بەکاردێت، لە ڕووبارەکەوە دەڕژێنرێتە سەر کەناراوەکانی دیجلە و فوڕات و زۆربەی جار لە لایەن گەڕۆکەکانەوە وەسپ‌کراوە. سەعات پێنج و نیو، بە بەربەستێکی زۆر کۆن‌دا تێپەڕبووین، پێی دەڵێن نەمروود Nimrood، کە ڕێی تێ‌دەچێ لە دەورانی ئەسکەندرەوە هەبووبێ و پادشایانی کۆنی ئاشوورییەکان بە مەبەستی ئاودێریی لە دیجلەوە بۆ ناوچە هاوسێکانیان درووست‌کردبێ. ئەو پردە لە بەرد دروستکراوە و ئەم‌لا بۆ ئەولای دیکەی ڕووبارەکەی دەبڕێ، بەڵام من گومانم هەبوو بەشێکی زۆری بەربووبێتەوە. ئاوی ڕووبارەکە یەک پێ دابەزیبوو و خێراییەکەی بە جۆرێك بوو، دەترسام کەڵەکەکەمان نوغرۆبێ. بە لای ڕاست‌دا، بە ماوەی میلێك گوندێکی بچووک هەبوو، لای کەناری ئەوبەر، لە شوێنێك کە پێی‌دەڵێن نەمروود-خۆی Nimrood Khoi ماوەی چل دەقیقەیەك وەستام، بۆ ئەوەی کەمێك شیر و چەند کاڵەکێك دەست‌بخەم. ناوچەکە لە هەردوو لای ڕووبارەکە ئەوەندەی چاو بڕبکا، تەنیا بیابانێکی فراوان

بوو. دوو سەعات دوای بەجێهێشتنی نەمروود-خۆی Nimrood Khoi، لای ڕاستمانەوە ڕیزە گردێکی ڕووتەن و بەیار بوو، ڕووبارەکەش زۆر بەرفراوان بوو، هەندێک تەنکاو و دوورگەی لێدەبووەوە. سەعات دوازدە گەیشتینە زێی گەورە، کە بە سێ لقی زۆر جیاکەرەوە دەڕژێتە ناو دیجلە. گوندێک لە یەك میلی سەرووی لقی سەرەکیی ئاوەکەدا بوو، ناوی سەحاف Sehaff بوو. دیجلە هەر بە بەرینی، بەڵام بە تەنکایی، دەڕۆیی و قەراغەکانی نزم و لە هەر لایەکیشەوە تەماشات دەکرد، بیابانێکی لماوی بوو. سەعات دوو دەقیقەیەک کەم، گڵکۆی سوڵتان عەبدوڵڵا Sultan Abdallaمان بینی، کەوتبووە سەر بەرزاییی گردێکی کەناری دەستەچەپ. لێرە دیجلە دابەشدەبێ و دوایی لە خوارتردا یەكدەگرێتەوە، دوای ئەوەی دوورگەیەکی دوو میل درێژ دروستدەکا. سەعات پێنجی پاشنیوەڕۆ بڕێک بێشەڵان لەسەر کەناراوەکان بەدیدەکرا. لە سەعات پێنج و نیودا دوو گۆڕی شکۆدار دەبینرا. لە شەشدا، پاناییی ڕووبارەکە نیو میل دەبوو، دوورگەکانی بەردین و کەناراوەکانی نزم و بە گیای وشکی لاسکدرێژ و دەوەنی گەڵاورد داپۆشرابوون. لە سەعات شەش و نیودا زنجیرە گردێکی بەردینمان لەسەر کەناری دەستەچەپ بڕی، پێی دەڵێن جەبەل حوسێن Gebal Hussein[1]. ئیدی ئێستە تاریکیی شەو هێندە ئەنگوستەچاوە، ڕێگەی لێگرتم لەودیوەوە هیچ شتێك ببینم. ماوەی نۆ سەعات و نیو ڕۆیشتین و لە شەشی بەیانیدا، لە خەو هەڵسام و جلەکانمم لەبەرکرد. ئەوەتی چووبووینە ناو کەڵەکەکە، بەڕێز چاڤاس هیچ نەبزووتبووەوە، بە ئازارێکی زۆرەوە جووڵەیەکی کرد و توانیم چەند کەوچکێك شۆربا و شەرابی پێبدەم. سپێدە و ئێوارە چام داییێ، وا دیاربوو لە هەر خواردنێکی دیکە زیاتر سوودی لێ بینی.

---

[1] چیای حوسێن.

١٠ی مانگ: کاتژمێر ٧ی بەیانی، زنجیرەیەك بەردەڵان لەسەر کەناری لای دەستەڕاستەوە، قەڵایەك بەناوی مەکوە Mackoah ، لەناو بیابانێکی لماوی بەرفراواندا دەبینرا. سەعات ١١ لە گەرووی زێی بچووك پەڕینەوە، یەك زنجیرە بەرزایی لە کەناری دەستەچەپ بوو، ڕووبارەکە و دوورگەکە فراوان و لار دەبوونەوە. سەعات یازدە و نیو گڵکۆی پیرێکی موسڵمان بە ناوی حاجە Hadjaوە، لەسەر کەناری دەستەچەپ و یەکسەر دوای ئەوەش زنجیرە چیایەکی حەمرین Hamran ناو لەسەر کەوشەنی کەناری لای ڕاست دەبینرا. پانیی ڕووبارەکە زیاتر لە نیو میل بوو، لەگەڵ ژمارەیەك دوورگە یەکدییان دەبڕی. یازدە و پەنجا دەقیقە، کەلاوەی شارێکمان لەسەر بەرزیی گردێکی سەر کەناری چەپ بینی، ئاوی ڕووبارەکە تا بنەکەی هاتبوو و لەسەر لای کەناری بەرانبەریش، دیوار و بورجی بینایەکی گەورە هەبوو، پێی‌دەڵێن جەبەل کولوسا Gebal Kulusa، یا نوێژخانەی چیا. سەعات دوازدە لە کەناری ڕاستدا بەرزاییەکان دەکشانەوە بۆ ناو بیابان. کەناری چەپیش تەخت و بە دەوەنی گەڵای ورد و داری بی و گژوگیای درێژ داپۆشرابوو. سەعات چواری پاش‌نیوەڕۆ بە لای کانێکی نەوتی ڕەش یا قیردا ڕەت‌بووین، بەر لەوەی لێی نزیك‌ببینەوە، بۆنیمان دەکرد. ئەم نەوتە لەسەر زەویی بناری زنجیرە بەرزاییەکی بچووك دەهاتە دەرەوە، بە درێژیی کەناری ڕووبارەکەش بۆ ماوەی نیو میل هەر ئاو بوو. ڕووبارەکە لێرە پانییەکەی شەش‌سەد پێ بوو و وڵاتەکە لە هەموو لاوە هەر تەنیا بیابانێك بوو بۆ خۆی. سەعات چوار و نیو، چیاکانی جەبەل حوسین Gebal Hussein ونبوون و پێدەشتێکی لماویی بێسنوور لەلای ڕاست شوێنی گرتەوە. ماوەی ئەم بیست‌وچوار سەعاتەی دوایی، هیچ ئافەریدەیەکی مرۆییم نەبینی، بەڵام سەعات پێنج چەند ڕەشماڵێکی عەرەبیم لەسەر کەناری لاچەپ بینی و تەواو نزیك بەوانیش بڕێک کێڵگەی گەنمەشامی هەبوو:

ڕووبارەکە بەرفراوان و کەمێك قووڵ بوو، پانتاییەکی لماویی دەبڕی. دوورگە لمینەکان بە جۆرێك داربی داپۆشراوبوون. سەعات شەش و نیو بارستاییی ئاوی دیجلە بە شێوەیەکی بەرچاو فراوانەدەبوو و بە دروستکرنی چەندین دوورگەی چکۆلە، دابەش‌دەبوون بۆ چەند دوورگەیەکی لەیەك‌جیاواز. سەعات نۆ، نەماندەتوانی چیتر هیچ ببینین، چوومەوە ناو کابینەکە. ئەو ئێوارەیە بەڕێز چاڤاس باشتر دیاربوو و دەیتوانی هەڵبستێتەوە و کەمێك نان و شەرابی خوارد، وای تێ‌گەیاندم ئەو هیچ هیوایەکی نەماوە و هەست‌دەکا لە کۆتایی نزیك‌بووەتەوە، جا ئەگەر مەرگ دەیتۆقێنێ، درێژەی پێ دا، تەنیا لەبەر ئەو خۆشەویستە نزیکانەیە کە زۆر پێیانەوە پەیوەستە. هەموو هەوڵێکی خۆم دا تا زاتی بنێمە بەر، بەڵام چەند ساتێك دوای ئەوە خۆی خستەوە ناو نوێنەکەی و نیوەی شەو بەبێ ئازار و بەبێ ئەشکەنجە دوایین هەناسەی کۆتاییی دا. بەڕێز چاڤاس پیاوێکی بەگزادە و کەسێکی زۆر لەبەردڵان بوو و سەرنجڕاکێش و خاوەن خەسڵەتێکی گەورە و بەهرەدار بوو، شارەزاییەکی قووڵی لە نووسەرانی دەورانی کۆندا هەبوو و هێشتا زانایەکی ماتماتیك بوو و ئێمە لە داهێنانی چەندین ئامێری گونجاودا بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەی زانستەکان، قەرزاری ئەوین. ١١ی ئاگستۆس، سپێدەکەی دوایین ئەرکی خۆم بەجێ‌هێنا و لە شوێنێکی چەپەکی قەراغی ڕووباری دیجلە ناشتم، یادەوەریی خەسڵەتە پەسندەکانی و کۆتاییە خەمبارەکەی وێنەیەکیان لەسەر ڕۆحم بەجێ‌هێشت، لە هیچ کات و سەردەمێك‌دا لە بەرچاوم ون‌نابن.

چواری بەیانی گەیشتینە تکریت، گوندێکی قوڕین، کەوتووەتە ناو زنجیرە بەرزاییەکی بەردینی سەر کەناری ڕاستی ڕووبارەکە. بیرتا Birthaی کۆن، کە سەدەی یانزهەم بارەگەی سەرۆکی ژاکۆبیتەکان[1] بووە. لێرە یەکێك لەو

[1] کەوتووەتە سەر بەرزاییەك، ماوەیەکی زۆر بارەگەی سەرەکیی تەیمووریەکان بووە.

ئیسکۆرتە تفەنگدارانە، کە پادشای مووسڵ بەگەڵیدابووم، بینیم زۆر جارسکەرتر بوو لەوەی سوودێکی هەبێ، بۆیە دەرم کرد. ماوەی شەش سەعات بەردەوامبووین لە ڕۆیشتن. خێرایی ڕووبارەکە کەمنەدەبووەوە. هەردوو کەناری ڕووبارەکە ماوەی چەند مەسافەیەکی دوای تکریت چێنراوبوون بە کاڵەك و خەیار و ئاوی پێویستیان هەبوو بۆ ئاودێریی، لە ڕێگەی ئەو ئامێرەوە ئاو دەدەران، کە پێشتر باسمکرد. چەند ماوەیەك دواتر بە لای ڕاستدا، زنجیرە چیایەك هەبوو، ناوی جەبەل کورن Gebal Kurin بوو. دیجلە دوای تکریت زۆر فراوان دەبێ. سەعات نۆ و بیست دەقیقە گڵکۆ و گوندی گەورەی ئیمام دۆر Imaum Dour لە لێژاییی گردۆڵکەیەکی نزمی لماویدا ماوەی نیو میل دوور لە کەناری چەپەوە دەبینران. گڵکۆی ئیمام گومەزێکی بەرزە لە شێوەی چوارگۆشەدا، لەگەڵ قوبەیەك کە بە شێوازی ئارشیتیکتۆری عەرەبی بوو. دۆرا Dura، ناوی کۆنی ئەم ناوچەیەیە و ئەوانەی مێژووی کۆنیان خوێندووەتەوە، پێی ئاشنان؛ بەوپێیە کە ئەو شوێنە بووە ڕۆمانەکان دوای مەرگی ژۆلیان Julian لەوێ بە دیجلەدا پەڕیونەتەوە و جێگرەوەکەی پەیماننامەیەکی کارەستباری ئیمزاکردووە، کە -بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە- دەستی لە نوسێبین و هەرێمەکانی ئەودیوی دیجلە هەڵگرتووە بۆ فارسەکان. هەردوو کەناری ڕووبارەکە داپۆشرابوون بە مەکینەی ئاودێریی شووتی چاندن cultivation of water melons، کە باشترین میوەی وڵاتە، بێستانچییەکان بەشێکی زۆریان لێ دەنارده بەغدا. ئەوەتی لە مووسڵ دەرچووین، یەکەمجارە دارخورما دەبینم، سەعات یازدە و نیو پاشماوەی کەلاوەی گوندێکی قوڕینم کە پێی دەڵێن ئەسکی بەغدا Eski Bagdad، لە کەناری دەستەچەپ بینی و ڕووبارەکە لەوێ دەبێتە دوو لق، پانایییان وەکوو یەکە، دوورگەیەکی یەک میل درێژ دروستدەکا. دوازدە و نیو، پاشماوە قوڕینەکانی شاری شیناسم Shinas لە

کەناری دەستەڕاست بینی. دیجلە لێرە پانییەکەی لە نیو میل زیاترە و وڵاتەکە هەر چۆڵەوانی و بیابانێکە بۆ خۆی.

سەعات دووی پاش‌نیوەڕۆ، پاشماوەی نایابی قەڵایەکی بەرز، کە پێی دەڵێن ئەلعاشق al-Ashuck یا دۆست، لە نزیکی چوار میلی کەناری لای ڕاست دەبینرێت، دوای ئەوە یەکسەر لە بەرانبەر کەلاوەی شارێکی بەناوی مەشیک Mashiick یا خۆشەویست دەبینرا. عەرەبەکان نەریتێکیان هەیە، ڕێزی ئەم دوو شوێنە دەگرن. ئەم دوو شوێنە هاوشێوەی Hero و Leanderن، جیاوازییەکە ئەوەیە لێرە ژنەکە لە ترسی خۆشەویستەکەی پردێك بۆ ئاسانکاریی پەڕینەوە لەسەر ڕووباری دیجلە بنیات‌دەنێ. قەڵای ئەلعاشق کەلاوەیەکی جوانە، بەڵام زۆر دووربوو، نەمتوانی بە وردی بیپشکنم. لێرە ڕووبارەکە هێشتا هەر بووە بە دوو لق و ئێمە ئەو لقەی لای ڕاستمان گرت و سەعات سێ کەوتینە بەردەم شاری سامەڕا، کە کەوتووەتە کەناری دەستەچەپ و دانیشتووانەکەی دووهەزار کەسە و چارەگە میلێک لەو شوێنەوە دوورە کە هەردوو لقەکەی تێدا یەك‌دەگرنەوە. سامەڕا، سامیری کۆن، نشینگەی دڵخوازی بڕێک لە خەلیفە عەبباسییەکان بووە و ئاسەواری شارە کۆنەکە هێشتا ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەوی شارەکە دەگرێتەوە، زۆربەی دەشێ بەوە بناسرێنەوە گلکۆ و پەرستگەی ئیمام محەممەدی مەهدیی لێیە، کە لە سامەڕا نێژراوە. باڵەخانەیەکی نایاب لە خشت، لەگەڵ دوو گومەز و دوو منارەی جامی ڕەنگاوڕەنگی پێوەیە، کۆشکێك کە عەرەبەکان زۆر پێی سەرسامن، شێوەی جوانیی کاتێك تیشکی خۆری لێی دەدا، دەبریسکێتەوە. لەوێوە زۆر دوور نا، بورجێك بە شێوەیەکی قوچەکی دروست‌کراوە، بەرزییەکەی سەرنجڕاکێشە و لایەکانی نایابن و پەیژەیەکی تا ئەوپەڕی نایاب لە دەروازەی دەرەوەی ئەم بورجەدایە، ئێستر و ئەسپ بەو هۆیەوە دەتوانن بگەنە بەرزییەکەی. لە دووریی

یەك میل و نیوی شارە نوێیەکە و باکووری ڕۆژهەڵات و کەناری دەستەچەپی ڕووباری دیجلە، کەلاوەی کۆشکەکانی خەلیفەکان دەبینرێ، دیارە جاران باڵەخانەیەکی بەرفراوان و گەورە بووە، لە قوڕ و خشت دروستکراون. بەڵام هەرچەندە لە پلەی یەکەمدا و نایاب بوون، چیتر شتێکی وەهایان لێنەماوەتەوە شایانی بایەخپێدان بێ. هێشتا دەتوانین پاشماوەی ئەو دیوارانە ببینین کە لە دەرەوە و لەناو بیابان درێژدەبنەوە. سەختە قەبووڵی بکەین چۆن توانراوە شوێنێکی ئاوا هەڵبژێردرێ بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی دانیشتنی پادشایەکی بەهێز؟! ناوچەکە لە هەردوو لاوە ئەوەندەی چاوبڕبکا بیابانێکی قاتوقڕە، هیچ ڕێگەیەکی نییە، بەبێ درەخت، تەنانەت بەبێ درەختێکی بچووکیش، بتوانێ ببێتە نوایەك دژ بەو گەرما بەتینە، کە لە ئەنجامی تیشکدانەوەی خۆرەوە لەسەر لمی سپی پەیدا دەبێ. گەواڵەهەورێك پڕ تۆزوخۆڵی چڕ ڕووپۆشی کەشوهەوا دادەپۆشێ و گڤەگڤی تۆز و بای ناو بیابان، سەرباری دیمەنی داماوی و خەمناکیی شوێنەکە. لەگەڵ ئەوەشدا، سەبارەت بە عیراقی عەرەبی زۆر ڕاستە، هەر کوێیەک ئاوی هەبێ یا بۆی بهێنرێ، ئیدی سەوزاییشی لێ پەیدادەبێ، بەڵام لێرە کەنارەکان بەرزن و دیجلەش بەرین و تەنکە،[1] لەوەوەیە کە ئاودێریی ناوچەکە هەمیشە زۆر بە سەختی بەڕێوە دەچێ.

سەعات پێنجی پاشنیوەڕۆ، لە چەند دوورییەکی کەناری چەپەوە، پاشماوەی شارێکی گەورەی گوین Goen ناو دەبینرا، لە دیواری قوڕینی گەورە پێکهاتبوو، چەندین بورج و ژمارەیەك گۆڕی لێبوون. لێرە ڕووبارەکە دەبێتە چەند لقێك. سەعات شەش و چارەگ، پاشماوەی کۆشکی کەلمولە سەروا Kalmaula seroi ناو لەسەر کەناری چەپ دەبینرا. سەعات شەش و نیو، پاشماوەی شوورا و بورجەکانی شارێکی گەورە، لە دووریی یەك میلی کەناری

---

[1] لە یەك شوێندا، لە دووریی یەك میلی کەنارەوە بۆ کەنار.

چەپەوە دەرکەوتن. ئەم کەلاوانە، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی کە دەستم‌خستن، ماوەی چەند میلێك بەناو بیاباندا درێژدەبنەوە و دەکرێ سەرنج‌بدرێ کەناڵێك لە ڕووباری دیجلەوە ڕاکێشرابوو، ئاوی بۆ بناری دیوارەکانی شووراکە دەگواستەوە. ئەو کەلاوانە پێیان دەڵێن ژودسیە Judsea [ئۆدێسا] و بەبێ هیچ گومانێك شوێنی شاری بەناوبانگی ئۆپیس دەگرنەوە، کە بەگوێرەی وەسپەکانی زینۆفۆن، دەبێ کەوتبێتنە شوێنێکی ئەم ناوچەیە. ڕای دکتۆر ڤینسنت Dr. Vincent ئەوەیە کە شاری ئۆپیس Opis کەوتووەتە شوێنی بەیەك‌گەیشتنی ئۆدورنە Odorneh و دیجلە Tigris، بەڵام ئێمە هیچ شوێنەوارێکی ئەم شارەمان لەم شوێنە نەبینی.[1] کەم‌وزۆر بەرانبەر بە ژودسیە Judsea، کەناڵێك ئاو بۆ شاری دیگەل Degel دەبا، کەوتووەتە دوازدە سەعاتی بیابانەکە. سەعات حەوت، هەوارێکی گەورەی بیابانشینە عەرەبەکان و بێستانی کاڵەکمان بینی. حەوت و نیو لە دووری دوو میلی زنجیرەی نزمی گردۆڵکەی بەردینەوە، لەسەر کەناری چەپ، هۆزی عەرەبی ئەلبوفەدج Albufedge و کەناری ڕاستیش هۆزی جومعە Jumaی لێ‌دەژیا. سەعات نۆ تاریکییەکی ئەنگوستەچاو بوو و نەمتوانی چیتر تێبینییەکانم تۆمار بکەم.

---

[1] زوسمیوس Zosimus لە مێژووی کشانەوەی ژۆلیان-ەکەیدا، دوای تێپەڕبوونی ڕووباری دیجلە بە تەیسیفون Ctesiphon، ناوی ژمارەیەك شار دەبات لەسەر کەناری ئەم ڕووبارە و هەروەها لەسەر کەناری ڕووباری دیالە، کە پێی وایە دوراسە Duras یە و دەڵێ سوپای ڕۆمانی لەوێوە لەسەر پردێك پەریونەتەوە. باروفتا Barrophta بێ‌گومان باچوا Bacowa یا بەعقووبەیە Bakooba، نۆ سەعات لە بەغداوە دوورە. نیشانابا Nishanabaی دەللی عەباس و سیومتارای Sumtnara سامەڕا. شوێنەکانی سیمبرا Symbra، ئاسیتا Accetta و مارمۆسا Maromsa، ددانی پێدادەنێم کە هیچ زانیارییەکم لەسەریان نییە. بەڵام پاشماوەی شارە وێرانبووەکانی کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە کە تا ئێستە ماونەتەوە، دەتوانن شوێنی بڕێك لەم ناوچانە دەست‌نیشان‌بکەن.

ڕۆژی ١٢ ی مانگ، سەعات سێی پاش‌نیوەڕۆ، دابەزیم بۆ ئەوەی ڕێژگەی ئۆدورنە Odorneh بپشکنم، تا ئێستە ناوی کوفری-سوو Kufri suی هەڵگرتووە، ڕووبارێکی بچکۆڵە و نەرمڕۆیە. تا ئێرە ڕووبارەکە بۆ مەلەکردن دەشیا، بەڵام نەماندەتوانی زیاتر لەوە بچینە خوارەوە. سەعات حەوتی بەیانی، لەسەر کەناری لای ڕاست، زنجیرەیەك لم و بەرد کە یەکەم بوونی شارێکیان بە ناوی زومبوور Zumboor دەگەیاند، لەسەر کەناری هەردوو لای بەرانبەر بە پاشماوەی کەناڵێك بوو. دوای ئەوەی ئێمە دەوروبەرەکانی کفر -سوومان بەجێ‌هێشت، ڕووبارەکە زۆر بەرتەسکتر دەبووەوە، بەو پێیە پانیی ئاسایی نزیکەی سێ‌سەد پێ بوو. توندیی بایەکە خەریك بوو کەڵەکەکەمان پارچەپارچە بکا. ناچاربووین ماوەی چەند سەعاتێك خۆمان لەژێر کەنارێکی زۆر بەرزدا بپارێزین. سەعات سێ و نیو، گوندی سوویدیە Suedia ی دەورەدراو بە دارخورما بوو، پانیی ڕووباری دیجلە نیو میل کەمتر لە خوارووی ئاوایییەکە بوو. سەعات شەش و نیو، جۆگەلەیەکی جوان لەسەر کەناری لای چەپ، ئاوایییەکی سویدیە Suedia ناو هەبوو، چواردەوری دارخورما، دارقەیسی، دارهەنجیر و دارتوو بوو. سەعات هەشت گەیشتینە دێی مونسورگ Monsourg. نیوەی شەو گەیشتینە ناوچەی [دەغارە] دوخارە Dokhara کە - وەك دەڵێن- بەپیتترین ناوچەی پاشالقی بەغدایە.

١٣ی مانگ سەعات پێنجی بەیانی لەسەر کەناری لای ڕاست، دێی سوعادیە Swadia . لەم شوێنەوە تا بەغدا هەردوو کەناری ڕووبارەکە داپۆشرابوون بە ئامێری ئاودێری و بێستانی کاڵەك. ماوەیەك دابەزیمە ناو ئاوایییەکی باکووری کازمەین Kazameen و دوو ئەسپم لەوێ بەکرێ‌گرت، لەگەڵ خزمەتکارەکەم، محەممەد ئاغا سواری ئەسپ بووم ڕوو بە بەغدا و جانتاکەم لەسەر کەڵەکەکە بەجێ‌هێشت، نیوەڕۆ گەیشت. کاتێک هاوڕێکەم،

بەڕێز هاین، بەرپرسی موقیمییەی (بەریتانی لە بەغداد)م بینییەوە و لەوساوە پێم وابوو ئیدی ماندووبوونم بە کۆتایی گەیشت. لەو ڕۆژانەی دووایی‌دا، محەممەد ئاغا پێشتر چەند لووت‌بەرز و بەسام بوو، بەو ئەندازەیە گۆڕابوو بە کەسێکی چرووک و نزم و گوێڕایەڵ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا کردەوە ناپەسەندەکانیم هەر لەبیر نەدەکرد. کاتێك گەیشتمە بەغدا، بە ڕیسواکردنەوە دەرمکرد و لەوەبەدوا لێم قەدەغەکرد خزمەتکاریی ئینگلیزەکان بکا. لەدوای ئەم ڕۆژەوە پاش ئەوە هەر زوو ڕۆیشت و گەڕایەوە بۆ ئیستەنبووڵ، بەڵام هاوڕێ بەدبەختەکەم ئەوەندە نەژیا و بەهۆی گرەی تاوی گەرماوە لە ئەربیل مرد.

## چەند تێبینییەك سەبارەت بە كشانەوە دەهەزار كەسییەكە

"دوای جەنگی كوناكسا Cunaxa، یۆنانییەكان دەستیان كرد بە كشانەوە بەبێ وەستان و دوای كشانەوە لە سەنگەر[1] و كەناڵەكانیان بۆ دیواری ناوەندیی میدیا، كە لە خشتی سووركراو و بەقیر پێكەوەنووساو دروستكرابوو و پانیی بیست پێ و بەرزییەكەی سەد پێ و درێژییەكەشی ٢٠ بیست فەرسەخ دەبوو. ئەم دیوارە -وەك مێژوونووسەكان دەڵێن- زۆر دوور نەبووە لە بابل. لەوێوە هەشت فەرسەخیان بڕیوە و بەناو دوو كەناڵی دیجلەدا پەڕینەوە و تا گەیشتوونەتە شارێكی گەورەی سیتاك Sittace ناو، لە پازدە[2] قۆناغی ڕووبارەكە".

---

[1] یۆنانییەكان بەهۆی ئەو سەنگەر و كەناڵانەوە وەستێنران، كە پردی دارخورمایان لەسەر دروستكرابوو. بینیان دانیشتووان شەرابی دروستكراو لە دارخورما و سركە، لە كوڵاندنی خورما دروستدەكەن. عەرەبەكان هێشتا شەراب یا *عەرەق* لە ئاوگی گوشراوی دارخورما دەردەهێنن، بەڵام هەروەها گونجە *sgunjah* بەهێزیش دەردەهێنن، لەجیاتیی شەكر بەكاریدەهێنن، لەوساوە من زانیاریم لەسەر دروستكردنی سركە نییە.

[2] بە مەزەندەكردنی هەر قۆناغێك بە نەوەد و چوار و نیو باڵا، هەروەك ئەوەی نووسەری بەرجەستەی گەنجی ئانارسیش كردوویە، ئەوا دەبێتە چوارسەد و حەڤدە و نیو باڵا (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسایی). (باڵا: toise پێوانەیەكە درێژییەكەی نزیكەی شەش پێ دەبێ. تێبینیی و.ك).

ڕێی تێدەچێ جەنگی کوناکسا لە نزیکی ئەنبار Anbar یا فەلووجە Felugia هەڵگیرسابێ، بەڵام هەموو دیاردەکان زیاتر بەرەو باشوور بۆ شوێنێکی نزیکتر لە بابل دەچن. ئەمڕۆ هیچ ئاسەواری دیواری میدیا نەماوە و بڕە پاشماوەیەک ماوە نزیك بە هەرەمی عەقرقووف[1] Agarcuff، وا بەدیاردەکەوێ پاشماوەی شاری کۆنی سیتتاك بێ. پێم وانییە ئەم مەزەندەکردنە بنچینەیەکی پتەوی هەبێ، چونکە ئەویش دەکەوێتە ئەوپەڕی باشوور و -کەموزۆر- هەشت میل لە دەریاوە دوورە، لە کاتێك‌دا سیتاکس -بەگوێرەی گێڕانەوەی زینۆفۆن- تەنیا پانزە قۆناغ یا دوو میل لە دیجلەوە دووربووە. بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ڕەنگە ڕووبارەکە لە ماوەی چەندین ساڵدا کشابێتە دواوە، لە کاتێك‌دا ڕەنگە شارەکەش زۆر لەوە گەورەتر بووبێ، وەك ئەو پاشماوەیە کە بەڵگەی بوونی شارەکەن. دەکرێ بەشوێن پاشماوەی کەناڵێکی جوانی سەر ڕووباری دیجلەدا بچین بۆ ماوەی چەند میلێك لە هەردوو لای عەقرقووف Agarkuff و دووریی کەناراوەکانی فیسکوس Physcus، کە ئێستە پێی دەڵێن کوفری-سوو Kufri su، لەسەر ئەو کەنارەیە کە شاری ئۆپیسی Opis لێیە، ئەوە تەواو هاوجووتە لەگەڵ گێڕانەوەکەی زەینەفۆن کە دەڵێ *"کاتێك یۆنانییەکان لەسەر دیجلە بە پردێکی سی‌وحەوت بەلەمی[2] پەڕینەوە، (٢٠) فەرسەخ (٧٠ میل) ڕۆیشتن بە چوار ڕۆژ تا کەنارەکانی ڕووباری فیسکوس و شاری ئۆرپیس"*. زەینەفۆن ئەوە دووپات‌دەکاتەوە کە فیسکوس سەد پێ پانە، بەڵام کفری-سوو، تاکە ڕووبارە کە دەرژێتە ناو دیجلە لەم هەرێمانە و هەتا کاتێك لە لوتکەی خاڵی بەرزیی‌دایە، لە زستان و بەهاردا تا ئەو ئاستە گەورە نییە. من ئەو

[1] عقرقوف: ناحیەیەکە لە قەزای ئەبوغرێب لە بەغدا (وەرگێڕ).

[2] هەموو پردەکانی سەر ڕووباری دیجلە بەو شێوەیەن، کەڵەکی بەستراوی بەیەکەوە لەنگەرگرتوون.

ناوچەیەم پشكنی و لەو شوێنەدا هەڵدەكشێ كە ڕووبارەكە دەرژێتە دیجلەوە و ئەوە دەبێ شوێنی شاری ئۆپیس بێ، بەڵام ئێمە بچووكترین شوێنەوارێكی ئەوە نابینین، بۆیە دەشێ بیرمان بۆ ئەوە بچێ كە شارێك لە چەند سەعاتی كەمی ڕوو بە باكووری نزیكی ئەو شوێنەدا هەیە. لەگەڵ ئەوەش‌دا كەلاوەی شارێكی زۆر گەورە دەبینین، لەگەڵ پاشماوەی كەناڵێك یا لەوانەیە ئاوەڕۆی ڕووبارێك، پانییەكەی هەمان ئەو پانییەیە كە زەینەفۆن ئاماژەی پێ‌داوە.

"لە ئۆپیس یۆنانییەكان سی فەرسەخ (١٠٥ میل) یان بڕیوە تا كۆشكێكی سەر بە پارایساتیسەكان Parysatis ڕۆیشتوون. ئەوانەی كە دیجلە كەوتبووە دەستەچەپیان، ٢٠ فەرسەخ (٧٠ میل) تا زاباتوس Zabatus یا زێی گەورە ڕۆیشتوون". ماوەكە بە تەواوی پەیوەستی هەمان ئەو ماوەیەیە كە وا لە نێوان ڕووبارە پێشتر باسكراوەكە و بەردەبازێك كە لە دە یا لە دوازدە سەعاتی مووسڵەوەیە، بەڵام هیچ ئاماژەیەك بۆ زێی بچووك ناكا، كە یۆنانییەكان دەبێ لە ڕێگەی گەڕانەوەی خۆیان‌دا لە چ شوێنێك پێیدا پەڕیبنەوە. لەوانەیە بتوانین مەزەندەی‌بكەین كە ڕووباری دوایی و فیسكوس هەر هەمان ڕووبارن و لەوساوە ئەم ڕووبارە ڕێگەی خۆی گۆڕیبێ و ئەمە لە وڵاتێكی پان و لمین‌دا دیاردەیەكی نائاسایی نییە. لە كۆتاییی یەكەم ڕۆژی كشانەوەیان‌دا لە دێی پارایساتیسەكان Parysatis، شارێكیان لەسەر كەناری ئەوبەری ڕووبارەكە بینیوە بە ناوی كۆناك Coenacەوە، "لەوێوە بەربەرەكان لەسەر پشتی كەڵەكی لەپێست‌دروستكراو نان، پەنیر و شەراب[1] *دەگوێزنەوە*". شاری تكریت بڵێی وەڵامی ئەو وەسپەی شاری كۆناك بداتەوە؟

---

[1] هەموو بازرگانی دیجلە لەنێوان مووسڵ و بەغدا تا ئێستا بەسەر كەڵەكی دروستكراو لە قامیش دەكرێ، كە بە پێستی پفكراو پێكەوە بەستراونەتەوە.

ڕۆژی یەکەم دوای پەڕینەوە بە زابدا،[1] یۆنانییەکان دوورییەکی کورت دەبڕن. بەڵام ڕۆژی دواتر سپێدەکەی بەڕێدەکەونەوە، دەگەنە شارێکی گەورەی کەلاوەی لاریسا Larissa ناو، کە جاران میدییەکانی تێدا ژیاون. دیوارەکانیان بیستوپێنج پێ پانیی بووە و بەرزیی سەد پێ و دوو فەرسەخ (٧ میل) بازنەیی بووە و تەواوی لە خشت بووە، بەدەر لە بناغەکەی کە بە بەرزیی بیست پێ لە بەرد بوۆە.[2] لە نزیکی شارەکە هەرەمێکی بەردین بە ڕووبەری سەد پێی چوارگۆشە و بەرزیی دووسەد پێ بەرزدەبێتەوە. ڕواڵەت و ئەدگارەکانی ئەم شوورانە نائاسایی بوون و ئەم ئەهرامانە نزیك لە ئاوایی نوونیا Nunia[3]بوون بەرانبەر بە مووسڵ و شوێنیان لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە بوو و دوورییان لە بەردەبازی زێی بچووك بوو، هەموو شت هاوکارە تا ئەوە هەر کەلاوەی شاری لاریسا خۆی بێ، ڕەنگە ناوەکەی لەگەڵ ئەوەی نەینەوا هاوبەش بێ.

---

[1] لە جەنگێکدا کە کراوە، زەینەفۆن تێبینی کردووە، کە بەربەرەکان ئەوانەی کە هەڵادەهاتن لەسەر پشتی زینەکانیان تەقەیان کردووە، کە بەم شێوەیە دەتوانن بەوپەڕی خێرایی ئامانجێکی نایاب بپێکن..

[2] دیوارەکانی مووسڵ زۆربەیان لە بەرد دروستکراون، کە ئەمە دیاردەیەکی نایابە لەم بەشەی جیهاندا.

[3] ئایا پێوەندییەکی دیاریکراو لەنێوان ناوی نوێی نوونیا Nunia و ئەوەی نینووس Ninusدا هەیە؟ لاریسا ناوێکی یۆنانییە، گومان دەکەم کە ڕۆژهەڵاتییەکان هەرگیز ئەم ناوەیان لێ نابێ. بۆشایت ڕای وایە کە ئەم شارە ڕێسانی موسا بێ، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ئەوە لە هەموو شتێك هاوجووتە لەگەڵ شوێنی شاری مووسڵ. من لەو بڕوایەم کە ڕێسانی موسا دەبێ زیاتر راس ئەلعەین یان راسرا بێ (هەروەك ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی وای پێدەڵێن)، کە ئەمە شارێکی زۆر کۆنە لە مێزۆپۆتامیا (وڵاتی نێوان دووڕووبارەکە).

*"لەوێوەوە لە کاروانی ڕۆژێكدا شەش فەرسەخ (٢١ میل) تا قەڵایەکی گەورەی کەلاوەی میسپیلا Mespila ناو کە جاران مێدییەکانی تێدا دەژیان، بناغەی دیوارەکان لە بەردی داتاشراو و پڕ لە سەدەف دروستکرابوون بە پانیی پەنجا پێ و بە هەمان ئاستیش بەرزییەکەی. لەم شوێنەدا دیوارێکی خشت هەبوو، ئەویش پەنجا پێ پانی و پەنجا پێ بەرزی و شەش فەرسەخ (٢٧ میل) بازنەکەی بوو. لە مووسڵەوە گوندێکی گەورە هەیە، ناوی تێلێکیف Telikoftە، چەندین گردۆڵکەی لم و زبڵدانی لێیە، کە ئاماژە بە هەبوونی شارێك دەکەن لە ڕابوردوودا. لەم شوێنە پاشان چوار فەرسەخ (١٢ میل) ڕۆیشتوون، لە ناوچەکانی نزیك بە چەند دێیەک دابەزیون، "گەنمەشامییەکی زۆری هەبووە".*

دەبینین کە لە یادەوەرییەکانی ڕۆژانەمدا هاتووە، وێڕای ملهوڕیی کورد و تورکەکان، کەچی ئەم پێدەشتە جوانە کە چەند ئاواییەك دەگرێتەوە، تا ئێستەش بەپیتە بۆ گەنمەشامی، "ڕۆژی سێیەم بەرەو پێشەوە و بەناو وڵاتێکی کراوەدا ڕۆیشتوون، کە لە لایەن تیسافێرنەکان Tissaphernesەوە تەنگیان پێهەڵچنراوە. ڕۆژی پێنجەم (ڕۆژێکیان بە پشوو بەسەربردووە)، کۆشکێکیان بینیوە، کۆمەڵێك گوندی بەدەورەوە بووە، ڕێگە بەرەو ئەم کۆشکە بە هەڵگەڕان بووە بە گردی بەرزدا کە لقێکی چیاکان بوون و لە بناریەوە گوندێك هەبووە. بە مەزەندەکردنی چوار فەرسەخ (١٤ میل) بۆ هەر ڕۆژێك لەو دوو ڕۆژەی دەرچوونی دواییەوە، دووریی تەواو لە لاریساوە شازدە فەرسەخ (پەنجاوشەش میل) دەبوو، بە دانانی هەر فەرسەخێك بە سێ میل و نیو. لە نێوان مووسڵ و زاخۆدا، من چەند زنجیرەچیایەکی بەرزم تووش‌هات، بە تایبەتی ئەوەی نێوان هەتارا (هەترە) Hatarra و ناموور Namur، کە بە تەواوی هاوجووتە لەگەڵ ئەوەی کە مێژونووسی یۆنانی زینۆفۆن وەسپی‌دەکا." ئەوان سێ ڕۆژ لە ناوەندی بەرزاییەکاندا وەستان، پاشان دابەزینە پێدەشتەکە. لەوێ ئارد و جۆی زۆریان بینی، بەڵام لە لایەن تیسافێرنەکانەوە تەنگیان پێهەڵچنرا و

ناچاریانکردن له یەکەم دێی سەرەڕێیاندا دابەزن.[1] پاشان شەست قۆناغ ڕۆیشتن، دوژمن نە ڕۆژی دواتر و نە ڕۆژی دوای ئەوە بەدیارنەکەوتەوە. ڕۆژی چوارەم دوژمن خۆی نیشانداوە و یۆنانییەکان لە دێیەکی نزیکی دیجلە دادەبەزن، لە لایەکەوە زنجیرە چیایەکی بەرز و لە لایەکی دیکەوە لەسەر ڕووبارێکی زۆر قووڵ دەبن، کاتێك بە نووکی نێزەکانیان دەنگیان دەدا، هەتا کۆتاییيان لەسەر ئاو دەرنەدەکەوت. پێشەکی سوپاکە کە نەیتوانیوە لەوە زیاتر بچێتە پێشەوە، بە باشی زانیوە بکشێتەوە دواوە. جەنەڕاڵەکان فەرمانیان بە دیلەکان داوە زانیارییان پێ بدەن سەبارەت بەو دەوروبەر و ناوچە هاوسێیانە. ئەوان پێیان ڕاگەیاندن زنجیرە چیایەك لە باشوور بابل بە وڵاتی میدیا دەگەیێنێ. ئەوەیان ئیزافە کرد کە ڕێگەیەکی دیکە هەیە لە ڕۆژهەڵات، دەچێتەوە بۆ سووسا Susa و ئەکباتان Ecbatana، دەڵێن پاشای فارس بەهاران و هاوینان لەوێ بەسەردەبا و سێیەمیشیان لە ڕۆژئاوا، لە ڕێگەی دیجلەوە بۆ وڵاتی لیدیا Lydia و ئیۆنیا Ionia دەڕوا و دواجاریش چوارەمین ڕێگە -بە قسەی ئەوان- بەناو چیاکاندا دەیانگەیێنێتە باکوور، بۆ ناو وڵاتی کاردۆخییەکان؛ ئەو گەلەی کە ئەوانە دەیانگوت: "لەناو ئەو چیایانەدا دەژین، جەنگاوەرن و ملکەچی پادشاکانیانن".

باوەڕم وایە هیچ گومانێك لەوەدانییە کە ئەو زنجیرە چیایەی وا کاروانی یۆنانییەکانی تێدا وەستا، هەر هەمان ئەو زنجیرەیەیە کە ئەمڕۆ بە زاخۆ داغ Zaku Dag ناسراوە و چەند هۆی پێکەوە هەن، پشتگیریی مەزەندەکەم دەکەن: یەکەم- ئەم زنجیرە چیایە بەرزە پێدەشتەکە کەموزۆر بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات و

[1] زەینەفۆن تێبینی ئەوە دەکا کە فارسەکان ناچاربوون ئەسپەکانیان ببەستنەوە یا هەتا شەتەکیانبدەن بۆ ڕێگەگرتن لە هەڵاتنیان. ڕەنگە پێویست نەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لە ڕۆژهەڵات ئەمە عادەتە و لە هیندوستان دابی سوارەکانی ئێمەش بووە.

ڕۆژئاوا دەبڕێ، بەوە دیجلە لە هەموو لایەکەوە بە زنجیرەیەك بەرزاییی لەبڕیننەهاتوو زۆر لێژ کۆتایی دێت. دووەمیان- وا پێناچێ یۆنانییەکان پێشتر هیچ زنجیرە چیایەکی ئاوا بەرزیان بڕیبێ، چونکە لەم حاڵەتەدا دەبوو بوەستن لەبەر ڕووباری خاپوور، کە ڕاستەوخۆ دەڕژێتە ناو دیجلە لە باکووری چیاکانی زاخۆ. بەڵام زینۆفۆن دوای ماوەیەکی درێژ ئەوجا باسی ئەوە دەکا. بۆیە گوماندەکەم لەشکرە دەهەزار کەسییەکە بینویانە ناتوانن ئەم ناوچەیە چیایی و ئەو ڕووبارە لێرە ببڕن.[1] یۆنانییەکان جارێکی دیکە چوونەتە ناوەوە و ئەو شیوەیان بڕیوە کە گەیاندوونیە ئامێدی. کەوایە ئەوان کەناری چەپی خاپوور واز لێدەهێنن، کەمێك خۆیان لە ناوچە هاوسێیەکانی سێرت نزیكدەکەنەوە. لێرەدا چوار ڕێگە هەیە لە هەتراوە بە ئاڕاستەی زۆر جیاواز: یەکێکیان بۆ مووسڵ و بەغدا دەڕوا، دووەمیان بۆ هەمەدان (ئەکباتانی کۆن)، لە ڕێگەی ڕێڕەوێکی دەربەند Derbund یا دەرگەی ئاسنین iron gate ناوەوە، سێیەمیان لە ئامێدی بە چوونە ناو زاخۆ داغ و چوارەمیشیان بەناو میزۆپۆتامیادا لە ڕێگەی بەردەبازی دیجلەوە، لە چەند میلی باکووری ئەسکی مووسڵ.

"دوای کاروانێکی سەخت کە حەوت ڕۆژی خایاندووە، گەیشتوونەتە وڵاتی کاردۆخییەکانKarduques، دەگەنە ئاواییەك، کەوتووەتە سەرووی

---

[1] یەکێك لە ڕۆدیانەکانی سوپا پێشنیازی پەڕینەوەی کرد بەسەر پردێکی نائاسایی‌دا کە پێكهاتبوو تەنیا لە چڵەداری توند بەستراو بە پێستی فووتێکراو. من زیاتر لە جارێك ئەم هەوڵدانەم بینوە و بێ‌گومان ڕەنگە پلانەکە چاك کرابێ، دەشێ بەهۆی بەکارهێنانی بێ‌ئەندازەوە بێ لە لایەن سوپاکەمانەوە. پێستەکان سووك و گوازراوە بوون، هەموو دەم ئاسان بوو دەستیانبخەن و کاتێکیش پڕ هەوا دەکران و پێکەوە دەبەستران، پشتگیریی هەڵگرتنی قورساییەکی لەڕادەبەدەر دەبوون، هەروەك ئەوەی دەتوانین هەموو ڕۆژ لە دیجلە و زاب ببینین.

پێدەشتێك، تا ڕووباری سەنتریت Centrites درێژدەبووەوە. ئەم ڕووبارە دووسەد پێ پانیی بوو و ئەرمێنیای لە وڵاتی کاردۆخ جیادەکردەوە".

ئەم ڕووبارە کە زەینۆفۆن باسی‌دەکا، بێ‌گومان هەمان ئەو ڕووبارەیە کە لای ڕۆمانییەکان بە نیکفۆریۆس Nicephorius و لای کوردەکان بە خاپوور Kabour ناسراوە. لە نزیك سێرت، کە من وای بۆ دەچم لەشکرە دەهەزار کەسییەکە پەڕیبەنەوە، پانیی ڕووبارەکە و بارستی ئاوەکە، بە تەواوی هاوجووتن لەگەڵ ئەو وەسپەی کە زینۆفۆن کردوویەتی و لەسەر نەخشەکەی منیش بە شێوەیەك لە شێوەکان هاودوورین.[1] مێژوونووسی یۆنانی لە زۆر جێگە باسی خالدییەکان دەکا، لە بیرەوەرییەکانی خۆی‌دا وەك گەلێکی ئازا و جەنگاوەر وێنایان دەکا، من لە شوێنی دیکە وتم: ژمارەیەکی زۆر تایفەکانی خالدییەکان تا ئێستەش لە کوردستان دەژین.

*"دوای ئەوەی لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئەوان پێنج فەرسەخ (۱۷ میل و نیو) بەناو پێدەشتی ئەرمێنیادا ڕۆیشتن، گردۆڵکەکان بەرزاییان بۆ سەرکەوتن ئاسان بوو و گەیشتینە ئاواییەك، کۆشکێکی لێ‌بوو و برێک لەماڵەکان بورجیان بەسەرەوە بوو. لەم شوێنەوە بە دوو ڕۆژ دە فەرسەخ (۵۵ میل) دەبڕن و دواجار دەگەنە ئەودیو سەرچاوەکانی دیجلە و پاشان بە پازدە فەرسەخ (۵۲ میل و نیو) بە سێ ڕۆژ گەیشتنە کەناراوەکانی ڕووباری تێلیبووس Teleboos".*

دوای پەڕینەوە بە ڕووباری سەنتریت Centritesدا، کە بەگوێرەی من هەر ڕووباری خابووری ئێستەیە، دەهەزارەکە -وەك بەدیاردەکەوێ- بەو ڕێگەیەدا دەچن کەمێك بەرەو ڕۆژئاوا، من خۆشم بەوێ‌دا ڕۆیشتم، چونکە -بە

[1] کاتی تێپەڕبوونییان بەناو کاردۆخییەکان‌دا، بە زۆری شەرابیان لە هەموو ئاواییەك بینیوە. ناوچە هاوسێیەکانی ئامێدی لە کوردستان هێشتا بەناوبانگن بە نایابیی شەرابەکانیان.

دڵنیابییەوە- ئەوان گۆلی وانیان نەدیوە. من پێم وایە سەرچاوەکانی دیجلە، کە زینۆفۆن ناویان دەبا، لقی ئەرزنی Erzin ئەو ڕووبارە بن و ئاشکرایە ڕووبارێکی بە تێلیبووس ناو ئاماژەی پێ‌کراو، تەنیا ئەو ڕووبارەیە کە ئێستە بە شاری مووش‌دا تێپەڕدەبێ. زینۆفۆن دەڵێ کە "ڕووبارەکە وێڕای ئەوەی کە بەرتەسك بوو، بەڵام جوان بوو، چەند ئاواییەکی جوان لە کەنارەکانی هەبوو و ناوچەکە پێی دەڵێن ئەرمێنیای ڕۆژئاوایی".

ڕووباری مووش بچووکە، کەنارەکانی دڵگیرن و مووش خۆی زیاتر بەیەك‌گەیشتنی کۆمەڵێك ئاواییە، وەك ئەوەی شارێك بێ. لەنێوان خاپوور و موراددا هیچ ڕووبارێك نییە، جگە لەوەی مووش. ئێمە بینیمان تاقە ڕووبار کە یۆنانییەکان پێیدا پەڕیونەتەوە، لەنێوان ڕووباری سەنتریت Centrites و فوڕات‌دا، ڕووباری تێلیبووسە. من بۆ ئەوە دەچم باوەڕ بهێنم کە ئەوان لە شوێنێکی نزیکی مووش‌دا ڕەت‌بوون، چونکە ئەگەر بەرەو لای ڕۆژهەڵات بڕۆیشتبانایە، گۆلی وانیان دەبینی و ئەمە لە بینینی چاودێرێکی وەك زینۆفۆن ڕزگاری نەدەبوو. ئەگەر دوورتر لەوە بەرەو لای ڕۆژئاوا بڕۆیشتبانایە، لە نزیکی سەرچاوەکەی دیجلە نەدەپەڕینەوە. وەك ئەوەی زینۆفۆن دووپاتەی دەکاتەوە، ئەوان بە شێوەیەکی ڕاستەوڕاست بەرەو باکوور ڕۆیشتوون. "لەو شوێنە پازدە فەرسەخ (٥٢ میل و نیو) دەڕۆن، دەگەنە کۆشکێك، کۆمەڵێك گوندی بەدەورەوە بووە. لە کاتێك‌دا لەم شوێنە دابەزیون، بەفرێکی زۆر باریوە، بڕیاریان‌داوە ماوەیەك لەوێ بوەستن. لەوێ لەناو شیوێك پڕۆژەی پەلاماردانیان بۆ دادەنێن، سێ ڕۆژ دەڕۆن، دەگەنە کەنارەکانی فوڕات، کە ئاوەکەی تا ناوقەدیان بووە".

ئەو ماوەیەی نێوان تێلیبووس و فوڕات کە یۆنانییەکان بڕیویانە، سەرەتا پازدە فەرسەخ (٥٢ میل و نیو)، پاشان سێ ڕۆژ ڕۆیشتوون. ئەستەمە ئەو

دوورییە لەگەڵ ئەوەی نێوان موراد و ڕووباری مووش‌دا بگونجێنرێ. ئەم ڕووبارەی دوایی سەرچاوەکەی لە چیاکانی نەمروودەوەیە، نزیك بە گۆلی وان و لەگەڵ لقێکی دیکە لە ڕۆژئاوای مەلازگرد تێکەڵدەبنەوە. ڕووباری مووش هەشت یا دە فەرسەخ (٢٨ یان ٣٥ میل) بە خەتێکی ڕاستەوڕاست لە ڕووباری مورادەوەیە، ئەوە لقی سەرەکیی ڕووباری فوڕاتە و هەمان ئەو ڕووبارەیە کە -بێ‌گومان- دەهەزار کەسیەکە پێیدا پەڕیونەتەوە. زینۆفۆن، لە گێڕانەوەی یادەوەریەکەی‌دا، دەبێ دوورییەکانی لێ تێك‌چووبێ. بەگوێرەی ئەو، سوپاکە کە لەژێر سەرکردایەتیی ئەودا بووە، زۆر دوورتر لەوە دەڕۆن کە بۆ لەشکرێکی ئاوا گەورە پێویست بووە، تەنگ‌پێ‌هەڵچنراو لە لایەن دوژمنەوە ناچاربووە ڕێگەی خراو بگرێتەبەر و بەسەر چیای زۆر ڕژددا سەربکەوێ. ئەوان لە ڕووباری موراد زۆر زیاتر بەلای ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەدا پەڕیونەتەوە کە من و بەڕێز چاڤاس لێی پەڕینەوە، هەر وەك ئەوەی هەوڵی ئەوەم داوە بیسەلمێنم.

ئەوان چل‌وپێنج ڕۆژیان ویستووە بۆ ڕۆیشتنیان لە ڕووباری فوڕاتەوە بۆ ترابزۆن، لە کاتێك‌دا ئێمە هەمان دووریمان بە یازدە یان دوازدە ڕۆژ بڕی. بەڵام بێ‌گومان ئەستەمە خەیاڵبکەین دەشێ سوپایەکی گەورە لەناو وڵاتێکی دوژمن و چیایی‌دا، ئاوا بە خێرایی دوو ڕێبواری سادە بڕوا، بەبێ چاودێریکردنی جانتا و بە ڕێك‌وپێکی ئەسپ لەدوای ئەسپیان لە بەردەست‌دا بووبێ. بە لەبەرچاوگرتنی وەرز و سروشتی سەختی ناوچەکەش، ئەوەی وا سەرسامم دەکا ئەوەیە کە ئەوان توانیویانە پانتاییەکی وەها گەورە لەم کاتە کورتەدا ببڕن.

"گوتیان سەرچاوەکانی ئەم ڕووبارە (فوڕات) لەم شوێنەوە دوورنییە، پازدە فەرسەخ (٥٢ میل و نیو) دەبێ لە سێ ڕۆژدا، بەناو پێدەشتێکی داپۆشراو بە چینێکی ئەستووری بەفردا. لەم چەند ڕۆژانەی دوایی‌دا ڕۆیشتن زۆر سەخت بوو، زریانێك لە باکوورەوە هەڵیدەکرد، سیمای سەربازەکانی بەستبوو. بەو

پێیەی دارێکی زۆریان لە شوێنەکە دۆزییەوە کە تێیدا دابەزیبوون، هەموو شەوێك ئاگریان دەکردەوە. پاشان هەموو ڕۆژەکەی دواتر بەناو بەفردا زۆریان لە برسان خەریكبوو دەمردن. لەگەڵ شەو داهات، دەچوونە ناو ئاواییەك و ئەوانەی نەیاندەتوانی بەردەوام بن لە ڕۆیشتن، ناچاردەکران شەو بەبێ خواردن و بەبێ ئاگر بمێننەوە و ئەم بێبەریکردنە ژمارەیەکی زۆری لەناوبرد. بڕێکیشیان هەروەها بە تریسکەدانەوەی بەفر چاویان لەدەستدابوو، یا توندیی سەرماکە پەنجە و پێی بەستبوون و بەجێدەهێڵدران، بڕێک لە ئەفسەرەکان بەوە چاوەکانیان لە کاریگەریی بەفر دەپاراست کە بە چشتێکی ڕەش چاویان دادەخست.[1] بە بەردەوام جوولاندنی پێیەکانیان، پارێزگارییان لە پێیان دەکرد و شەوانەش پێڵاوەکانیان دادەکەند.

ڕۆژی دوایی گەیشتنە بڕێک ئاوایی، میوانداریيان لێکردن، ماڵەکانیان لەژێر زەوی دروستکرابوو و دەرگەکەی وەك ئەوە وابوو بیریك بکەیتەوە، بەڵام پانییەکەی لە ناوەوە فراوانتردەبوو. ڕێگەیەکیان بۆ ئاژەڵەکان دروستکردبوو، کەچی خەڵکەکەی پەیژەیان بەکاردەهێنا بۆ دابەزینە ناوی.[2] لەناو ئەم ماڵانەدا بزن، مەڕ[3]، مانگا و باڵندە لەگەڵ بێچووەکانیان دەبینران. هەروەها گەنم، جۆ و میوەی[4] لێبوو، دانیشتوانەکەی بیرەیان لەناو کووپەدا دەپاڕاست، لێیان دەڕژا و سەرئاو دەکەوت، بە کەفچڕینێکی تێکەڵاو لەگەڵ قامیشی گەورە و بچووك، بێ ئەوەی تێکەڵببن. وەختێك ئەمانەی دوایی

---

[1] ئەمە دابێکە ئێستەش لە ئەرمێنیا و کوردستان بەکاری دەهێنن.

[2] ئاواییە ئەرمەنییەکان ئەمڕۆ هێشتا هەر بەهەمان شێوە وەك ئەوەی بینمان دروست دەکرێن.

[3] چەندین جار ئەوەم بۆ ڕێکەوتووە تێبینیمکردووە هێشتا ژن و پیاو و منداڵ و ماڵات لەناو هەمان ماڵدا پێکەوە دەژین.

[4] هێشتا گەنم و جۆ لەو وڵاتە دەچێنن.

وشكدەبوونەوە و دەیانخستنە ناو دەمیان و دەیانمژی. شەرابەکە زۆر بەهێز بوو و زۆر باش بوو، ئەوانەی کە پێی ڕاهاتبوون پێیان نایاب بوو.[1] پاش هەشت ڕۆژ مانەوە لەم شوێنە و، دوای ئەوەی ڕۆیشتن، سەرۆکی گوندەکەیان وەك ڕێبەر خستە تەک خۆیان و کوڕەکەشیان بە بارمتە بۆ نیازپاکیی باوکیان لەگەڵ خۆیان برد. سەرۆك سوپاکەی بەناو پێدەشتێکی کاکی‌بەکاکیی بە بەفر داپۆشراودا برد. دوای سێ ڕۆژەڕێ ڕۆیشتن، کریسۆفۆس بە توندی ئازاری سەرۆکی گوندی دا، لەبەر ئەوەی تووشی هیچ ئاواییەك نەبوون. بەڵام سەرۆکی گوند وەڵامی دایەوە کە هیچ ئاواییەك لەم هەرێمەدا نییە. سەرۆکی گوند شەو هەڵات، چونکە کریستوس لێی دا، کوڕەکەشی لە بندەستی یۆنانییەکان بەجێ‌هێشت. دوای حەوت ڕۆژ ڕۆیشتن، تێکرا پێنج فەرسەخ (١٧ میل و نیو) لە ڕۆژێكدا، گەیشتنە کەناری فاسیس Phasis کە پانییەکەی سەد پێ درێژ دەبوو".

لە ڕێگەی ئەرزەڕۆم، لە کەناراوەکانی موراد، من لەگەڵ بەڕێز چاڤاس سەرەتا ڕووباری ئاراسمان بە سی‌وپێنج میل، پاشان ڕووباری بینگۆلمان لە شەست‌ونۆیەم میل‌دا بڕی. ئەم دوو ڕووبارە هەردووکیان گەورە و قووڵ و تیژڕۆ بوون و ئەوەی دواییان بیست‌وشەش میل لە مورادەوە دوورە. من ئاماژە بەم ڕەوشە دەکەم، چونکە -بەگوێرەی من- دەمەوێ ئەوە بچەسپێنم کە یۆنانییەکان دوورتر لە ئێمە، لەوانەیە بە ئاڕاستەی ئەخلات و مەلازگرد، لە ڕووباری فوڕات پەڕیبووبنەوە. پاشان چەند ڕۆژ ڕۆیشتوون، بەبێ ئەوەی تووشی هیچ کەس ببن، چونکە لە ڕۆژئاوا لە موراد پەڕیونەتەوە، لە دوورییەکی زۆر کەم لەیەکتر تووشی بینگۆل و ئاراس بوون. بارستی ئەو ئاوەی کە مانگی دیسەمبەر بەم ڕووبارەدا دەڕوا، بە هەمان شێوەی ئەوەی دوایی ڕۆژەکانی حوزەیران، کە ئێمە

---

[1] کاتی مانەوەم لە ئەرمێنیا، هیچ جۆرە شەرابێکی لەو جۆرەم نەبینی.

پێیدا پەڕینەوە، گەورە بووە.[1] بینگۆل چەند میلێك لە ڕۆژهەڵاتی دێی قەرەقوول Karagool دەڕژێتە ناو ڕووباری موراد. ئێمە بەشەو گەیشتینە کەناری ئەم ڕووبارە و پێیدا پەڕینەوە، بە جۆرێك کە ئێمە زۆر سەرووتر لێی پەڕینەوە. یۆنانییەکان نەیانتوانیوە تووشی بینگۆل ببن، ماوەیەکی زۆریان لە بەردەمدا بووە ببیرن، پێش ئەوەی بگەنە ئاراس، کە لەوێوەوە بەرەو باکوور-ڕۆژهەڵات ڕۆیشتوون. لەگەڵ ئەمەش‌دا، زینۆفۆن دووپاتەی‌دەکاتەوە کە سوپاکەی لە نزیکی سەرچاوەکانی ڕووباری موراد پەڕیوەتەوە، کە دەکەوێتە چیاکانی خوارووی بایەزید. ئەوەش زیاددەکا کە ئاوەکە نەگەیشتووەتە ناوقەدیان، ئەوە بەڵگەیەکی زۆر یەکلاییکەرەوەیەی‌ترە، کە سوپای یۆنان لە ناوچەیلی هاوسێی سەرچاوەکە بوون و لەوشوێنەی کە ئێمە لێی ڕەت‌بووین، پەڕیونەتەوە. بەردەبازی پەڕینەوەی نییە و بارستی ئاوەکەشی هەرچەند بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆین، زیاددەکا. زیاد لەوەش زەینەفۆن دووبارەی‌دەکاتەوە کە سوپای یۆنان دوای پەڕینەوەیان لە فورات، سێ ڕۆژ بەناو پێدەشتێك‌دا ڕۆیشتوون. من لە تۆماری ڕۆژانەکەم‌دا ئەوەم بەدیارخستووە کە ڕووباری موراد بەناو پێدەشتێکی بەرفراوان‌دا تێپەڕدەبێ، کە پانییەکەی زۆر بەرفراوانە، بە جۆرێك کە ئەمە لە ئەرمینیا دەگمەنە. وەختێك لەسەر لوتکەی ئەو چیایە سەیری‌دەکەین، دەڕوانێتە قەرقووڵ و بە ئاڕاستەی باکوور-ڕۆژهەڵات هەڵدەکشێ. دوای ئەوە تا چاو بڕدەکا هیچ پێدەشتێکی ئاوها درێژەوەبوو نابینرێ بەرەو ڕۆژئاوای مووش، کە سوپای یۆنانی لەناکاو خۆی لەوێ بینیوە، لەناو لێژاییەکی زۆر لێژدا داخراو کە ناتوانرێ لە چیای تۆرۆس بۆی بڕۆی. بۆیە من گەیشتمە ئەو

---

[1] مانگی کانوونی یەکەمی ١٨١٠ کە چوومەتە سەر هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات، بارستی ئاو زۆر زۆرتر بووە لەوەی لە ماوەی تەمموزی دواتر کە بەسەری‌دا پەڕیمەوە.

ئەنجامەی کە ئەو ڕووبارەی وا زەینۆفۆن بە فاسیس Phasis باسیدەکا، ناکرێ جگە لە ڕووباری ئاراس ڕووبارێکیتر بێ، کە تا ئەمڕۆش بڕێک ئەرمەن هەر پێی دەڵێن فاسیەن-سووPhasian su. بەڵام ئاستەنگی هەرە گەورە هەڵبەت لەوەدا بەدیاردەکەوێ: گونجان لەنێوان دووریی فوڕات و فاسیسدا کە - بەگوێرەی زەینۆفۆن- ئەو ڕووبارەیان کەوتووەتە نێوان ڕووباری موراد و ڕووباری ئاراس. یۆنانییەکان چواردە کاروان ڕۆیشتوون تێکڕا پێنج فەرسەخ (١٧ میل و نیو)یان لە ڕۆژێكدا بڕیوە، کە بە هەمووی حەفتا فەرسەخ یا دووسەد و چلوپێنج میلیان لە نێوان فوڕات و فاسیسدا بریوە. لە کاتێكدا دەبینین فوڕات و فاسیس تەنیا حەفتا میلیان نێوانە لە هێڵی درێژیی ٤٢°دا و هەردوو مەودا لە نێوان هەردووکیاندا ناکرێ بگونجێن. بۆیە من پێم وایە ئەوان بە ڕووباری ئاراسدا پەڕیونەتەوە، ئەمە مایەی گونجاندن نییە، تەنیا ئەگەر مرۆ پیی وابێ ئەوانە لە لایەن نەخشەدانەرانی ڕێبەرەکانەوە هەڵخەتێنرابن و لە ئەنجامدا چەندین ڕۆژ ڕۆیشتبن، بەبێ ئەوەی چووبنە پێش و گومانیشبکرێ کە سەرۆکی ڕێپیشاندەرەکە خۆی ڕزگارکردبێ لە دەستیان، چون -بە ڕای من- دووبارەی دەکەمەوە، مەحاڵە سوپایەکی دەهەزار کەسی بتوانێ لە ماوەیەکی ئاوا دوورودرێژی ڕۆیشتندا، پێنج فەرسەخ (١٧ میل و نیو) لە ڕۆژێكدا لەناو وڵاتێك ببڕێ، ئەستووریی بەفر هەموو دۆڵ و شیوەکانی بە سەختی داپۆشیبێ. زینۆفۆن دەڵێ کە فاسیس سەد پێ پانیی بوو، ئەوەی کە زۆر گونجاوە بە شێوەیەکی باش لەگەڵ ڕووباری ئاراس لەژێر ٤٢° ی هێڵی درێژیدا ڕێكدێتەوە.

"لە کەناراوەکانی فاسیس کە دەرچوون، لە دوو کاروانی دە فەرسەخ (٣٥ میل)دا شالیبیەن Chalybians و تاوشیەن Taochian و فاسیەن Phasians کە لەو ڕێڕەوە مۆڵیانخواردبوو، دەگەیشتە ئەو پێدەشتەی وا بەناو چیادا

دەڕۆیشت. دوای ئەوەی دوژمنەکانیان ڕاونا، دابەزینە ناو پێدەشتەکە، بە شێوەیەك گەلێك گوندیان بینی، هەرچی پێویستیان بووایە هەیانبوو. لێرەوە گەیشتینە وڵاتی تاوشیەنەکان Taochians، کە لە پێنج کارواندا سی فەرسەخ (١٠٥ میل)یان بڕی و دوای ئەوە بەناو وڵاتی چالبیەکان Chalybiansدا ڕۆیشتن، لە ماوەی حەوت ڕۆژدا پەنجا فەرسەخیان بڕی (١٧٥ میل). ئەوانە گەلێکی لە هەمووان جەنگاوەرتر بوون، یۆنانییەکان ڕێکەوتیان کردبێ، بەم شێوەیە وێرایان بەرگری بکەن. پاشان گەیشتنە ڕووباری هارپاسوس Harpasus کە پانییەکەی چوارسەد پێ دەبوو".

لێرەدا دەبینین یۆنانییەکان بە چواردەڕۆژ کەمتر لە نەوەد فەرسەخ نابڕن، یا سێسەد و پازدە میل لە کەناراوەکانی فاسیس بۆ کەناراوەکانی هارپاسۆس[1]، کە بۆ هەر ڕۆژێك دەکاتە شەش یا حەوت فەرسەخ (٢١ یان ٢٢ میل)، بەبێ هیچ ڕاوەستانێك لەناو وڵاتێکی شاخاوی و ماوەی سەرمای سەختی زستاندا، بە بەفربارین ناچاربوون بەرپەچی هێرشە بەردەوامەکانی دوژمنێکی جەنگاوەر بدەنەوە. ئەگەر لێرە پێویست بێ بە شێوەیەکی تایبەتی لەم بارەیەوە پشت بە گێڕانەوەکانی زینۆفۆن ببەستین، ئەستەمە ئەو شوێنە دیاری بکەین کە لە ماوەی چواردە ڕۆژدا ئەو سوپایە تێیدا سووڕاوەتەوە. لەوەساتەوە ئایا چوونەتە ناو جۆرجیا یا مینگریلیا، وەك ئەوەی بڕێک کەسایەتی ڕایان وایە، تەنیا ناچارنەبوون لە ڕێگەی کوریوس Cyrus یا فاسیس Phasisەوە ببپەڕنەوە. بەڵام ئەگەر دووەمجاریش بەم ڕووبارە مەزنەدا تێپەڕیبوونایە، پێش ئەوەی بگەن بە تەرابزۆن، ئەوەی وا دیارە بە دڵنیاییەوە نەگەیشتوونەتێ. کەوایە من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە ئەو ڕووبارەی پێی دەڵێن هارپاسوس، هەر هەمان ئەو ڕووبارەیە کە

---

[1] هارپاسوسHarpasus : یەکێکە لە لقەکانی ڕووباری مایاندار لە کاریا. (وەرگێڕی کوردی)

تا ئەمڕۆ ناوی هارپا-سوو Harpa su ە، لە ناوچەی قارس هەڵدەقوڵێ. ئەوە یەکەم ڕووباری گەورەیە کە دەکەوێتە نێوان ڕووباری ئاراس Araxes و تەرابزۆن Trebisond، بەدەر لە لقێکی فورات کە بە ئەرزەرۆمدا تێپەڕدەبێ. من وای بۆ دەچم یۆنانییەکان لەو ڕێگەیە نەپەڕیونەتەوە. ئەگەر پێشیدا پەڕیبنەوە، ئەوا لە شوێنێکی نزیك بە سەرچاوەکەی پەڕیونەتەوە. لە سەرێکی ترەوە، ئەستەمە لەم ڕێگەیەوە بگەنە تەرابزۆن، بەبێ پەڕینەوە لە ڕووباری هارپا-سوو Harpa suو ڕووباری تیۆرا Tehorah یا بایەبووت-سوو Byaboot su ، کە پێشوو پێیان وتووە بووس Boos و تاقە ڕووبارەی گەورەیە لەسەر ڕێگە. دوای ڕووباری فاسیس Phasis (یا ئاراس Araxes)، یۆنانییەکان بە دوو ڕووباری گەورەدا پەڕیونەتەوە، ئەوانیش هارپاسۆس Harpasus و ئەو ڕووبارەیە کە سکیتەکان Scythians لە ماکرۆنەکان Macronians جیادەکاتەوە. من پێم وایە ئەوە هەمان ئەو ڕووبارە بێ، کە ئەمڕۆ بە ناو ئیسپارە Ispiraدا دەڕوا.

"بە ڕووباری هارپاسۆس‌دا ڕۆیشتن و بە وڵاتی سکیتەکان تێپەڕبوون و لە چوارده ڕۆژدا (٢٠) فەرسەخ (٧٠ میل)یان بەناو پێدەشتێك‌دا بڕی، چەند ئاوایییەکی لێبوو. سێ ڕۆژ وەستان، لەم شوێنەدا ٢٠ فەرسەخ (٧٠) میل بە چوار ڕۆژەڕێ تا ئاوایییەکی گەورە و دەوڵەمەندی گیمنیاس Gymnias ناو دەبڕن. حوکمڕانی ئەم وڵاتە پێشنیازی بۆ یۆنانییەکان کرد بە پێنج ڕۆژ بیانگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە زەریا ببینن. بە پێنج ڕۆژ گەیشتنە چیایەکی پیرۆز، کە پێی دەڵێن چەچەس Theches و هەر کە پیاوەکانی پێشەوە زەریایان بینی، دەستیان بە هاوارێکی گەورە کرد: لەوێوە دە فەرسەخ (٣٥ میل) بە سێ ڕۆژ ڕۆیشتن، بەناو وڵاتی ماکرۆنییەکان‌دا تێپەڕبوون. لە کاروانی یەکەم ڕۆژدا بەناو ڕووبارێك‌دا پەڕینەوە، خاکی ماکرۆنییەکان و ئەوەی سیکتییەکان لەیەك جیادەکاتەوە. درەختی زۆر بەرز نا، بەڵام زۆر نزیك لە یەکتری، کەناراوەکەیان

داپۆشیبوو، یۆنانییەکان دەمودەست بە پەلە ژمارەیەکی زۆریان لێبڕییەوە، بۆ ئەوەی زوو لەو شوێنە دەربچن. ماکرۆنییەکان بۆ بەرگریکردن لە ڕێڕەوەکە ئەولای بەرانبەریان گرتبوو. بەردیان دەهاوێشتە ناو ڕووبارەکە، بەڵام نەدەگەیشتە پیاوەکانی ئێمە. بۆیە یۆنانییەکان هیچ زیانێکیان پێنەگەیشت. ماکرۆنییەکان دوای ئەوەی کەوتنە دانوستان و ڕێککەوتن، دۆستانە چوونە ئۆردووی یۆنانییەکان، لە بڕینەوەی دارەکاندا یارمەتییاندان تا بتوانن بپەڕنەوە بۆ ئەوبەر. ئازووقەشیان کە لەبەردەستیان دابوو، پێدان و بوون بە ڕێنیشاندەریان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، تا لە وڵاتەکەیان پەڕینەوە و گەیشتنە چیای کۆلخیەن Colchians. یەکێك لەوانە چیایەکی زۆر بەرز بوو، گەیشتن پێی ئەستەم بوو و کولخییەکان لەسەر ئەم چیایە بۆ شەڕ وەستابوون. وەختێك یۆنانییەکان گەیشتنە لێژاییەکە، ژمارەیەکی زۆر ئاواییان بینی پڕ لە هەموو ئازووقەیەك. ئەفسەرەکان ژمارەیەکی زۆر شانە هەنگوینیان بینی و هەر کەسێك لەو هەنگوینەی خواردبوو، هۆشی لەدەستدەدا و قاچ و دەستی لەکارکەوتن و تووشی ڕشانەوە و لاوازیەکی ئاوها بوون، کە هیچ یەکێك نەیدەتوانی لەسەر پێی خۆی بوەستێ. ڕۆژی دواتر لە هەمان کاتدا هەموویان چاكبوونەوە و لە ماوەی دوو ڕۆژدا ڕۆیشتن. حەوت فەرسەخ (٢٢ میل و نیو)ڕ و گەیشتنە ترابزویس Trapezus، شارێکی یۆنانی، کە خەڵکێکی زۆری تێدا دەژیا و کەوتووەتە سەر کەناری زەریای ئیوکسین Euxine، کە کۆڵۆنییەکی سینۆپییەکانە Sinopians، بەڵام لەژێر دەستی کۆلخییەکاندایە".

وەك ئەوەی یۆنانییەکان ناچاربوون درەختەکان ببڕنەوە بۆ ئەوەی بپەڕنەوە، بەردەکانی ماکرۆنییەکان ناگەنە لای بەرانبەر، بۆیە ئەم ڕووبارە دەبێ زۆر گەورە بووبێ، ئەمڕۆ تاقە ڕووبار لە ترابزۆن کە لەگەڵ ئەم وەسپەی زینۆفۆن هاوجووت بێ، ڕووباری بایەبووت-سووە Byaboot-su [ڕەنگە بایبورت

ڕاستربێ و]، کە جاران بە بوواس Boas و ئەکامپسیس Acampsis ناسرابوو، دەشێ یۆنانییەکان لەنێوان بایبووت و ئیسپرا پەڕیبنەوە. بەگوێرەی ئەو ماوەیەی کە ١٠ هەزار میل لە شوێنی پەڕینەوەڕا لە ڕووباری ماکرۆنییەکان تا ڕووباری تەرابزۆن، جیاوازییەکی ماددیی ئەوەندەی نییە لەو ماوەیە کە لە نێوان ڕووباری بوواس Boas و ئەم شارەدا هەیە. بەگوێرەی زینۆفۆن، یۆنانییەکان پێنج ڕۆژەڕێ ڕۆیشتوون، دوای پەڕینەوە بەم ڕووبارەدا بۆ گەیشتن بە تەرابزۆن. ئەمڕۆ ئێمە پێنج ڕۆژمان پێویست بوو بۆ ئەوەی لە تەرابزۆنەوە بگەینە بایبووت و ماوەی بیست‌وحەوت فەرسەخ (چل فەرسەخ و نیو یان نەوەدوچوار میل). سەرباری ئەوە، ئەو ماوەیەی کە لە لایەن زەینەفۆنەوە خراوەتە بەردەست، زۆربەی جار زێدەڕۆییی تێدا کراوە و لە سەرووی ڕاستیەوەیە. بەڵام تایبەتمەندییەکی سروشتیی ئەوەیە وەختێك دەبینین بۆ لێکچوونی سروشتیی وەك ڕووباری گەورە و چیای بەرز بەرز، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو وەسپانە یا نزیکیی ئەو شوێنانەی کە نووسەر خستوونیە بەردەست، تایبەتمەندێتی نایابی هەیە، ئێمە ناچاردەبین متمانەیەکی تەواو بە خەمڵاندنەکانی بکەین؛ وەک چۆن نووسراوەکەی دوای گەڕانەوەی بۆ یۆنان نووسراوەتەوە و ڕێی تێ‌دەچێ - هەروەك تێبنییم کردووە- لە بەر یادەوەریی خۆی‌دا نووسیبێتیەوە. لە نزیکی گیمیشخانە Gemishkhana چیایەك هەیە، هاوجوتە لەگەڵ چیای چەچەس Theches و سەرباری ئەوە دەتوانین لە سەرەوە و لە ڕۆژێکی ساف‌دا پردی ئیۆکسین ببینین.

"دوای سێ ڕۆژ مانەوە لە تەرابزۆن، نەخۆشەکانیان هەڵگرت، پیرەکان، ژن، پیاو و منداڵان و ئەوانی دیکە بە ڕێ‌دا ڕۆیشتن و بە سێ ڕۆژ گەیشتنە سیراسونت Cerasunt، شارێکی یۆنانی لە کۆلخییەکان Colchians، نزیك بە زەریا و کۆلۆنییەکی سینۆپە."

له سیراسونتەوە ڕێگەی ڕاستەوخۆ بە زەریای ترابزۆن‌دا ٩٠ میلە و بە دڵنیاییەوە ڕێگەی زەوینی، کە بەناو وڵاتێکی ئەوەندە سەخت‌دا دەڕوا، دەبێ زۆر درێژتر بێ. بەم شێوەیە سوپای یۆنان سی میلی لە ڕۆژێك‌دا بڕیوە (١٠ فەرسەخ)، لە وڵاتێك‌دا کە بە ددان‌پیاانانی زینۆفۆن خۆی سەختەڕێگە بووە. ئایا دەبێ باوەڕ بەوە بکەین کە دەیڵێ؟

"ئەوان لێرە دە ڕۆژ وەستان، سەرژمێریی سەربازەکان کرا، ٨٦٠٠ کەس بوون، هەموو ئەوەی کە لە دەهەزار کەس مابووەوە. ئەوانەی دیکە یا بە چەکی دوژمن کوژران، یا ئەوەتا بەفر و هەندێکیشیان بە نەخۆشی مردبوون. پاشان بە وڵاتی موسینوسەسیان Mosyncecians، شالیبیەن Chalybians، تیبارنیەن Tibarenians‌دا ڕۆیشتن و بە هەشت ڕۆژ گەیشتوونەتەوە کۆتۆریا Cotyora، شارێکی یۆنانی و یەکێك لە کۆلۆنەکانی سینۆپ."

ئەم شارە دەشێ کەوتبێتە نزیکی شاری ئۆردوو Ordu، کە من و بەڕێز چاڤاس شەوێك لەوێ ماینەوە. بەم شێوەیە دەبێ یۆنانییەکان وەك ئێمە پەڕیبنەوە بۆ ئەو وڵاتەی کە کەوتووەتە نێوان ئەم شارە و شاری سیراسونت - Cerasunt. بەڵام دەشێ تا لەو ناوە دوورتر لەوە ڕۆیشتبن، بە جۆرێك کە ناچاربووبن شەڕی یەکێك لە هۆزە مۆسیۆنیستەکان بکەن و ئێمە دەبینین لە هەشت ڕۆژ کەمتریان نەویستووە تا خۆیان لە سیراسونتەوە بگەیێننە کۆتۆریا، کە ئەمە ماوەیەکە لە سی‌وچوار میل (١٠ فەرسەخ و نیو) زیاتر نییە و بە دڵنیاییەوە ئەو وڵاتەی کە پێیدا ڕۆیشتوون، زۆر کەم ئاستەنگتر بووە لەوەی نێوان ترابزۆن و سیراسونت، کە تەنیا بە سێ ڕۆژ بڕیویانە. ئەمە دەریدەخا کاروانەکانیان نائاسایی بوون و ئەستەمە حیساب لەسەر خەمڵاندنەکانیان بکەین. کۆتۆریا بە دڵنیاییەوە کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی تیرمۆدون Thermodon، وەك ئەوەی هیکتانۆیموس Hecatonymus دووپاتەی‌دەکاتەوە، چونکە لە

قسەکردندا سەبارەت بەو ئاستەنگانەی کە سوپای یۆنان دەبوو لە کاتی پەڕینەوەی فلاگۆنیادا بەسەریاندا زاڵ ببێ، دەبێ باسی سێ ڕووبار بکەین: تیرمۆدۆن Thermodon، ئیریس Iris و هالیس Halys، کە بە جیکیل ئیرمەق Jekil Ermak و قزل ئیرمەق Kizil Ermak ناسراوە و بە سایەی دانڤێلەوە لەودیو دەروازەی کاپ بۆنا Cape Boonaوە دانراون. لەو شوێنەدا کە ئێستا ئۆردووی Ordu لێیە. بەڵام وا دیارە ڕەنگە کەوتبێتە دووریی حەڤدە یا هەژدە میلی ڕۆژئاوا شوێنێك کە پێی دەڵێن یازوون Yasun و تا ئێستە پاشماوەی جوانیی شارەکە دەبینین. دوای وەستانی چل‌وپێنج ڕۆژ لە کۆتۆریا، یۆنانییەکان دواتر بە پاپۆڕ لە ڕێگەی (با)ی گونجاوەوە لە تەواوی ڕۆژ و شەوی دواتردا گەیشتوونەتەوە سینۆپ، لە هارمین Harmineی یەکێك لە بەندەرەکانی شارەکە لەنگەریان گرتووە. سینۆپ ئێستا بە هەمان ناوەوە یەکێکە لە شارە زەرياییە گەشەسەندووەکانی زەریای ڕەش و کەوتووەتە پانیی ٤٢° پلە باکوور، سەر هێڵی درێژیی٣٥° و ٥° بەرەو ڕۆژهەڵات.

"لە سینۆپ Sinope پاپۆڕیان گرت و لە ڕێگەی دەریاوە بە دوو ڕۆژ گەیشتنە هێراکلیا Heraclea ، شارێکی یۆنانی و کۆلۆنییەکی میگارییەکان، کە کەوتووەتە وڵاتی ماریاندییەنەکان نزیك بە نیمچە دوورگەی ئاشیرۆسیاس کە هێراکولەس Hercules لەوێ دابەزی، -وەك دەڵێن- بۆ هێنانەدەرەوەی "سێربییەکان لە دۆزەخ"، وەك بیرەوەریی یادگاری لەشکرکێشییەکە، خەرەندێکی دوو ئاست قووڵی دروستکرد. هێراکلیا Heraclea دوای گەڕانەوەی دەهەزار کەسەکە بوو بە کۆمارێکی بەهێز، سەروکاریی بازرگانیی ئیوخین دەکا، تا ئەوکاتەی بەهۆی بەشدارییەوە لە جەنگەکانی میترادییەکاندا لەگەڵ ڕۆمانەکان وێراندەبێ. لەو ساتەوە بووە بە ناوچەیەکی تورکی، شارێك

پێی دەڵێن ئیرەکلیErekli، کەوتووەتە سەر هێڵی درێژیی ٣٣° پلە و ١٩° پلە بەرەو ڕۆهەڵات و هێڵی پانیی ٤١° پلە و ١٧° پلە بەرەو باکوور.

لە هێراکلیا Heraclea یۆنانییەکان لە ڕێگەی بیتونیا Bithynie و تازەینیا تیراسەوە چوون بۆ خریسۆفۆلیس، شارێکی خالیدوانەکان، ئەمڕۆ پێی دەڵێن سکیوتاری و یەکێك لە گەورەترین گەڕەکەکانی کەنار شاری ئیستەنبوولە.

## ڕێگەی بەغدا بۆ بەسرە

## لەگەڵ تێبینی گەلێك لەبارەی دارخورما و ئەسپی عەرەبی[1]

وەك چۆن لە یادداشتەکانمدا لەبارەی ئێرانەوە وەسپێکی بەغدام[2] کردبوو، تەنیا ئەوەم بۆ ماوەتەوە لێرە چەند سەرنجێکی سەربار کە لەم وڵاتە زۆر سەرنجڕاکێشە بۆم دروستبووە، بگوازمەوە. لە ماوەی سێ ساڵدا، ئەوەتی لە بەغدا دەرچووم، دوو پادشا کۆچیدواییان کردووە و دەسەڵاتی حوکمڕانیی ئێستە لەودیو شووراکانی شار زیاتر بڕناکا. خوارووی کوردستان ملکەچی سەرۆکەکانی خۆیەتی و هەموو وڵات کە لە بەغداوە تا ئاوڕێژگەی فوڕات درێژدەبێتەوە، لەژێر دەسەڵاتی سەرۆکە عەرەبەکانی مەنتەفیکە، کە لە سووقی شیوخ (سوق الشیوخ) Shoogooshugی نزیکی قوڕنە جێگیرن. جێنشینی ئێران کە سەرداری کرماشانە، بەشداریی خۆی لە زۆر ناوچەی سنوور دەسەپێنێ و بەردەوام هەڕەشە لە شارەکە دەکا.

لە یادداشتەکانمدا لەبارەی ئێرانەوە، دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت بڕێك تێبینی سەبارەت بە کەلاوەکانی قەسری شیرین بنووسم، کە پێم وابوو کۆشکی

---

[1] لە وەرگێڕانە فەرەنسییەکەدا ئەم بەشە لە دوای بەشی (یادداشت لەبارەی هێرشی سەر هیندوستانەوە) چاپ کرابوو، بەڵام ئێمە وەکوو چاپە ئینگلیزییەکە ئەم بەشەمان هێنایەوە شوێنی خۆی (وەرگێڕ).

[2] Geographical Memoir of the Persian Empire. London, 1 813, in-4°.
یەك بەرگ، لەگەڵ نەخشەیەك بەجیا (تێبینیی وەرگێڕی فەڕەنسی).

یەزدەگەرد Kilae Yezdejerd بووە، وهیراکل دوای جەنگی نەینەوا ویرانی کردووە. هاوڕێی دڵسۆزم میستەر هاین Mr. Hine، نیشتەجێی ئینگلیز لە بەغدا بە وەکالەت، خۆشحاڵی کردم کە بڕێك تێبینیی پێدام، دەرفەتی هەبووە لە چەند گەشتێك‌دا کۆیان‌بکاتەوە. ناوچەیەك هەیە لە سێ فەرسەخی ڕۆژهەڵاتی شاری زەهاو، شوێنی حەلوانی کۆنی گرتووتەوە، وەك دەڵێن شوێنی مانەوەی دڵخوازی خەسرەو پەروێز[1] بووە و کەوتووەتە شوێنێکی زۆر قایمی سەر لووتکەی چیاکان و کەلاوەیەکی گەورەی لێیە، ئەشەکەوتەکانی زۆر بەرفراوان و دەوراندەورەکەی دوو یا سێ فەرسەخ (٣ یا ٢,٥ فەرسەخ) دەبێت. چوون بەرەو ئەوێ هێندە سەختە، نوایەکی ئارامی بۆ پادشاکانی زەهاو دابین کردووە، لە کاتێك‌دا ئەگەر بەرەوڕووی هەر هەڕەشەیەك یا پەلاماردانێك ببنەوە. لەبن لاپاڵی قەڵاکەی پێدەشتەکە، کۆمەڵێك خشتی پەرش‌وبڵاو لێرەولەوێ لەسەر زەوییەکە کەوتوون، بیرۆکەی ئەوە دەدا کە کەلاوەکانی شارێکی گەورەبن، خەڵکی ولاتەکە زۆردا Zordaی پێ‌دەڵێن. هاوڕێکەم وای بۆ دەچێ ئەم کۆشکە ئەوە شارەیە کە نووسەرە بێزەنتینییەکان پێی‌دەڵێن دەستگەرد Dastagherd، ناوی شێواوی یەزدەگەردە Yezdejerd. بەڵام من پێم وانییە ئەم بیروڕایە ڕاست بێ، چونکە یەزدەگەرد ناوێکی ناسراوە لای یۆنانییەکان و لەناو زۆر گێڕانەوەی مێژووی ولاتەکەیان‌دا هەیە. من زیاتر بەلای ئەوەدا دەچم کە گۆکردنی بێزەنتینی ڕاست و دروست بێ و ئەم باڵەخانە نایابە بەتالان بردن و تێکدانی لە لایەن ڕۆمانەکانەوە، هەرگیز پێی‌ناوترێ یەزدەگەرد Yezdejerd، بەڵکوو پێی‌دەوترێ دەستگەرد Dastagherd و وشەکە بە واتەی شار دێ، شوێنی حەوانەوەی پێدەشت، ناونانێك کە بە چاکی بەسەر حاڵەتی قەسری شیرین‌دا جێ‌بەجێ‌دەبێت. کۆشکەکانی دەستگەرد -دەڵێن- کەوتبوونە

---

[1] ئەوە هەر هەمان ئەو ناوەیە کە یۆنانییەکان ناویان ناوە Cosroës.

سەر کەناراوەکانی ڕووباری سیلا Silla یا دیالە Diala و بەدڵنیاییەوە هەرگیز سوپای هیراکلوس بە ڕۆژهەڵاتی ئەم ڕووبارەدا نەپەڕیوەتەوە، بەڵکو بەرەو باکوور ڕۆیشتووە، لە ڕێگەی ڕاڕەوی دەربەندەوە Derbend چووەتە ناو ئێران. کەلاوەکانی قەسری شیرین Kisr Shirin کەوتوونەتە لێوارەکانی لقێکی ڕووباری دیالە، لە کاتێکدا ئەوەی یەزدەگەرد زیاتر بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەم ڕووبارە بووە. مێژوونووس و گێڕانەوەکانی ئێران دەڵێن: خەسرەو پەرویز حەوت کۆشك یا تەلار (قەسر)ی لەسەر شەرەفی شیرین دروستکردووە و لە هەموان بەناوبانگتر هالولا Hallowlaیە لە نێوان حەلوان و کۆناك، لە شەش یا حەوت فەرسەخی شاری کۆناکی وڵاتەکەیان (٩ یا ١٠ فەرسەخ). ئەم شوێنە بەتەواوی هاوجووتە لەگەڵ شوێنی کەلاوەکانی قەسری شیرین و پێم وایە هالولا Hallowla و دەستگەرد Dastagherd هەردووکیان یەك شوێنن و ناوەکە بە تێپەڕینی کات گۆڕدراوە و ئەمەیش بە شێوەیەکی باو لەم بەشەی جیهان ڕوودەدا.

بەلەمێکم بەکرێ گرت و ١٥ی ئاگستۆس، بە بەلەم چوومە ناو دیجلە و نیوەڕۆ ئاوی ڕووبارەکە زۆر کەمبووبووەوە، بەڵام هێشتا تا ڕادەیەك تیژڕۆ بوو بۆ ئەوەی بە حەوت ڕۆژ بمگەیەنێتە بەسرە. لەگەڵ (با)ی هەڵکردوو لە باکوور-ڕۆژئاوا دەرچووین و پێنجی ئێوارە کەلاوەکانی تەیسەفوونمان لە لایەك و ئەوەی سلووقیمان لە لایەکی دیکە بەجێهێشت. لێرەوە تا کوت، ئاواییەکی عەرەبیی بچووك هەیە، دەکەوێتە سەر ڕێگەی بەغدا - بەسرە. وڵاتەکە لەسەر هەردوو کەناری ڕووبارەکە تەنیا بیابانێکی چۆڵوهۆڵە، ئەوپەڕی کەنارەکە تا دووریی بیست یا سی یاردە، بە بێشەڵانێکی ئەستوور داپۆشراوە، بۆ کشانەوەی ئاژەڵە دڕەندەکان بەکەڵك دێ. کاتی شۆڕبوونەوەمان بەم ڕووبارەدا، ژمارەیەك شێرمان بینی، لە بەر خۆرەتاو پاڵکەوتبوون، شەو گوێمان لە نەڕەی ترسناکیان دەبوو.

حەوت میل لە سەرووی کووت Koute، بەلەمەکە چەند سەعاتێك لەسەر یەکێك لە کەڵەپردە کۆنەکانی پردێکی دارین وەستا، تاقە پردی سەر دیجلەیە -پێم وابێ- مووسڵ دەبڕێ و چەند سەدە دەبێت دروستکراوە و کەسیش نازانێ کێ دروستیکردووە و ناوی چی بووە، ناوی سەردەمی دروستکردنیشی نازانن. یەکسەر بەرانبەر بە کووت، کەناڵێکی گەورە هەیە پێی‌دەڵێن های، ڕووباری دیجلە و ڕووباری فورات بەیەكدەگەیەنێ و ئەو ئاوە تا ئەو شوێنە دەپارێزێ کە تێیدا دەبێتە دوو لق و پێی‌دەڵێن (ئامۆ) و (ئەخیر جەهیرەت) Aher Jehirat. یەکەمیان بۆ کەشتییەوانی دەشێ، کاتێك دیجلە بە تەواوی ڕووبارەکە ئاوی پێدا دەڕوا، بەڵام کاتێك ئاوەکەی نزم‌دەبێتەوە، دەتوانی تەنیا بە لقی دووەم بپەڕیتەوە. ماوەی زستانان و پاییزان، هەردوو لقەکە بەکەڵکی پەڕینەوە نایێن. هەردوو لقەکە لە ناوچەی غەڕاف Ghorof یەكدەگرنەوە و پێی‌دەڵێن سەبیل Sebbil، بەڵام پێش گەیشتنی بە ناو فورات، کەناڵەکە جارێکی دیکە دابەش‌دەبێت بۆ ژمارەیەکی زۆر کەناڵی بچووك، هەر یەکەیان ناوی جیاوازی خۆی هەیە. بەڕێز دکتۆر کۆلکهۆن Dr. Colquhoun زیاتر لە جارێك بەم کەناڵانەدا ڕەت‌بووە، پێی وتم کەنارەکانی بە بێشەڵانێك داپۆشراوە، پڕیە لە شێر. لەسەر لقی ئامۆ، سەری لە کەلاوەکانی شارێکی گەورە داوە، کە گومان دەکرێ ئەوەی واسیت بێ، شوێنێکی دەوڵەمەند و پڕبووە لە دانیشتووان لە دەورانی خەلیفەکان. باشووری کوت، بەشێکی گەورەی بیابانی هەردوو کەنارەکە کاتی هەڵستانی ئاوی ڕووبارەکە دەکەونە ژێر ئاو، بەوپێیەی وڵاتەکە لە بڕێك شوێن‌دا لەژێر ئاستی دیجلەوەیە. نیوەی ڕێگەی نێوان کووت و قورنە، بە ئاوڕێژگەی ڕووبارێك‌دا تێپەڕبووین، عەرەبەکان پێی‌دەڵێن ئەلحەد Al-Had و بارستەکەی گەورەیە وەك بارستی ڕووباری دیجلە، پانییەکەی سێ‌سەد یاردە دەبێت. چەند جار لەسەر بنچینەی ئەم ڕووبارە سەرسام‌بووم،

بەڵام نەمتوانی زانیاریی مایەی ڕەزامەندی وەگیربخەم. بەڕای من، وای دادەنێم ئەوە ڕووباری مەندەلیسوو Mandali-Sou بێ، یان ئەوەی لای کۆنەکان پێیدەڵێن (کیندس) Qyndes و سیروس Cyrus ئاماژەی پێکردووە. بەگوێرەی عەرەبەکان، لەگەڵ ڕووباری کەرخ یا حەوێزە یەکدەگرێتەوە و دەیشڵێن: مرۆ دەتوانێ لە ڕێگەی ئەو کەناڵەوە کە لە ئەلحەدەوە ڕادەکێشرێ و تا کەلاوەکانی شووش Sus و شاری حەوێزە بە بەلەم بڕوا. هاوڕێکەم بەڕێز کۆلکهۆن، زۆر دوورتر لەم ڕووبارە ڕۆیشتووە و بەگوێرەی ئەو بەدواداچوونانەی کە ئەو لەسەر شوێنەکان کردوونی، باوەڕی وایە لە لایەکەوە دەگاتەوە بە کەرخ و لە لایەکی دیکەوە بە هۆڕەکان و ئەو گۆلە زەریاییانەی کە لە لافاوەکانی دیجلە دروستدەبن و لە ئەلحەد بەتاڵدەبنەوە. سەرچاوەکەی، هەموو شتێك بۆ ئەوەی دەبا کە بڕوابکا ڕووبارەکەی لەناو چیاکانی لوڕستانەوە هەڵدەقوڵێ، بەڵام کاتی ڕۆیشتنی بەناو وڵاتێکی ڕاستەڕاستدا بەبن لاپاڵی چیاکان، تا دیجلە درێژدەبێتەوە، لەوانەیە لە ڕێگەی کەناڵەکانی کەرخەوە[1] درێژببێتەوە و ئاوی هۆڕەکانی تێدەڕژێ. هۆزی گەورەی بەنیلام ڕانەکانیان بەدرێژیی کەنارەکانی ئەلحەد دەلەوەڕێنن. ئێمە ڕۆژی ١٩ی مانگ کاتی خۆرئاوابوون پێیدا پەڕینەوە و سبەینێی ٢١ی مانگ، لەگەڵ تاوهەڵاتن گەیاندینیە بەسرە. نێوان کووت و قوڕنە زیاد لە چەند جارێك عەرەبەکان پەلاماریانداین، بەڵام چەند گوللەیەك کە تاقمێکی بچووکی سەربازانی سیپۆی هیندی تەقاندیان، بەس بوو بۆ ئەوەی وایان لێبکا ڕابکەن. هەموو بەشەکانی بیابانەکە لە دەوروبەری بەسرە نوقمی ناو ئاوی فوڕات

---

[1] من زۆر ئەو ڕایە دووپاتدەکەمەوە: ئەو ئاوە لە کەرخەوە بۆ حەوێزە دەڕوا و ئەو ئاوە دەڕژێتە ناو شەتی عەرەب، چونکە لە هیچ یەکێك لەم ناوچانە بارستێکی ئاویی وەها گەورە نییە، تەنیا لە شووش (سووس) نەبێ.

بووبوون، کە بەربەستەکانی سەر قوڕنەی شکاندبوو. ئەم ڕووداوە چەند جار لە ماوەی چەند ساڵێکدا دووبارە و چەندبارە بووەتەوە، لە ئەنجامی کەمتەرخەمی عەرەبەکانەوە کە سەددەکە چاکناکەنەوە و پێشتریش هەر وایان کردووە. ئەگەر بەردەوامبن و هیچ چاککردنەوەیەك نەکەن، ئەوا بەسرە بەم زووانە نوقمی ناو ئاوی زەریا دەبێ، یا لە ڕێگەی شەتی عەرەبەوە نوقمدەبێت. ئەم ڕووداوانە نەهامەتیی زۆر لەدوای خۆیان بەجێدەهێڵن، چونکە لەبریی ئەوەی پەیینی زەوەییەکان بکەن، وەك هەندێك کەس خەیاڵدەکەن، ئەوان تەنیا کار بۆ بێ پیت و فەرکردنی دەکەن و بەشەکانی شۆرەکاتەکە بەزۆری لە گەلێ بەشی بیابان هەن و لەگەڵ ئەو خاکەی تێکەڵدەکەن. کاتێك بە شێوەیەکی کەمیش بێ ئاودەدرێ، ئاسایی بەرهەمهێنانی زیاتردەبێت. کێڵگە گەورەکانی دارخورما کە وای لە بەسرە کردووە هێندە بەناوبانگ بێ، زۆر گیرۆدەی لافاوەکانە و چەندانێکی لێ لەناوبردوون. دکتۆر کۆلکوهۆن چەند ساڵ لە عەرەبستان ماوەتەوە و زانیاریی کۆکردووەتەوە، ویستی بڕێك لە خەسڵەتە سەیرەکانی ئەم درەختەم پێبدا، کە لە چلوچوار جۆری هەمەچەشنە کەمتری نییە و هەمووشیان بە زمانی عەرەبی ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە.

بەشێکی زۆری دارخورما تا تەمەنی شێست یا سەد ساڵی دەژین و خورما دەگرن، لە کاتێکدا هی دیکە هەیە لە تەمەنی بیست یا سی ساڵیدا دەمرن یا لە بەرهەمهێنان دەکەون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانەی دوایی ڕاستە زۆر زووتر لەوانی دیکە دەگەنە تەمەنی بەرهەمهێنان، زۆر بەدەگمەن پێش نۆ یا دە ساڵی بەردەگرن. بەداخەوە تووشی جۆرە کرمێك دەبن (پێی دەڵێن لێدنا ledna)، درەختەکە دەسمێ و دایدەڕزێنێ، دەچێتە ناو ڕەگی لقەکانی سەرەوە و کرۆکەکەی دەخوا. دەتوانن بە گیراوەیەك لە خوێی ئاسایی بیکەنە ناو زارکەکە و چارەسەریبکەن. لە بەسرە ئەم ئاژەڵە پەلاماری درەختەکە دەدا، بەڵام لە

یەمەن و زۆر بەتایبەتیش لە دەوروبەری مەککە و مەدینە، بەشێکی زۆری بەرهەمەکە تێكدەدا و لە ڕێگەی کارێکی ناوازە و ئەوپەڕی داهێنەرانەوە ڕاویان‌دەنێن، کاتێك خاوەنەکە هەست‌دەکا درەختەکە تووش بووە، شانەیەکی میرۆلەی ڕەشی گەورە دەهێنێ، کە ئاژەڵەکان هەرگیز لە دەستی ڕزگارنابن و کرمەکان دەماشنەوە. جا ئەگەر خاوەنەکە لە باخەکەیان نەیانبوو، لای یەکێك لەوانە دەیکڕێ کە بە ئامانجی بازرگانی هێشتوویانەتەوە.

بەرهەمی خورما لە سەفەر Siffiri یا دوادوای مانگی ئاگستۆس دەست‌پێ‌دەکا یا سەرەتای سێپتامبەر. عەرەبەکان لەم کاتەدا چەند جۆرێکی خورما دەخۆن، پێی‌دەڵێن خەتەل *Khatal* سەرەتا نەرم و ڕەقە و کاتێك خورماکە نیوە پێ‌دەگا[1]، زیاتر خواستی لەسەرە و پێی‌دەڵێن ڕوتەب Rutub. دوای پێگەیشتنی، تەواو بڕێکیان هەر لەسەر درەختەکە خۆی دەمێننەوە و لە ڕەوشێکی تازەدا وەك خواردنێکی بەلەزەت تەماشادەکرێ، بەڵام ئەوەیان یا بۆ خواردنی ڕۆژانەی ماڵ بەکاردەهێنرێ یا بۆ بازرگانی کە دەم‌ودەست لێ‌دەکرێتەوە و بە چەندین شێوە هەڵدەگیرێ. بڕێکی لەبەر خۆرەتاو وشك‌دەکەنەوە و پاشان دەیخەنە ناو کیسەی بچکۆلە بە شیلەکەیەوە. بەڵام باوترینیان ئەوەیە کە لەناو ئەستێرکێکی گەورە دادەنرێ و بە شونام[2] chunam

---

[1] لە دەوروبەری مەککە و لەوانەشە بە هەموو درێژیی زەریای سوور، دانیشتووان دەستووری کارێکیان هەیە بۆ هەڵگرتنی ڕوتەب بۆ هەموو ساڵەکە، لاسکی دارخورماکان لەسەر شێوەی قووچەك کۆدەکەنەوە و بەرەکە لە ناوەڕاستی دەمێنێتەوە.

[2] چێنام tchénâm، کە بە شێوەیەکی نادروست (سەنا tchéna)یشی پێ‌دەڵێن، شێواوی وشەی سانکریستیی یەtchhounaیە، بریتییە لە قسڵ یا چیمەنتۆ بە توێژاڵی کلسین دروست‌دەکرێ. هەموو تەختەکانی هیندستان بە شونام دادەپۆشرێ و وەك ڕووپۆشێکی زۆر فێنك سەیردەکرێ. شونام زۆر لە بونیاتناندا بەکاردەهێنرێ، کاتێك دەیانەوەی ئەستووریی باڵەخانەیەك لە شونام بگرن. شلەیە و ڕێی تێ‌دەچێ لەکاتی

یا بە دار دادەپۆشرێ، لەگەڵ کونێکی ڕووت لە بنەکەیدا شیلەی خورماکەی لێ دێتەخوارەوە. ئەو ماددە شەکرەمەنییە یا دۆشاوە، بە ناوی دۆشاو یا (دبس) دەفرۆشرێ و بەرەکە و ناوکەکەی دەردەهێنرێ و دەکرێتە ناو کیسە.

بەڵام بەری ئەم درەختە بەسوودە تاقە بەش نییە کە خەڵك بەکاریدەهێنن. ئەوان گوڵاویکی یەکجار خۆش لە دەمە پانەکەیشی دەدڵۆپێنن و عەرەبەکان[1] لایان وایە حەزی خواردن دەکاتەوە. ئەوان پیفۆکی گوڵە مێیینەکان بە کاڵی و بە سوورکراوەیی دەخۆن[2] و درەختی مێیینە لای ئەوان ڕێزێکی زۆری هەیە و ئەم بەشەی کۆتایی درەختەکە بە کاڵی دەخورێ یا دەیکەنە ناو سرکە. بەسروشتی خۆی، تامەکەی لە ناوکی گوێز دەچێ و ناوی جەممارە djammar. هێشتا ئەویش نێرەکەی دەخورێ، بەڵام برێکجار تاڵە و کەمتر خواستی لەسەرە، لە چڵە دارخورما بچووکەکان باوەشێن یا مێشەفڕفڕی دروستدەکەن. پاشان قەدەکەی دەبڕن بۆ کاریتە و تەختەداری بینا و سووتەمەنییەکی نایابە. بیروڕای باو ئەوەیە کە عەرەبەکان لە ڕێگەی بەرداشەوە ڕۆن لێ دەردەهێنن. هەڵەکە وادیارە سەرچاوەکەی لە پراکتیکی ئەم خواردنەوە پەیدابووە کە ئێستە باسیدەکەین. ڕۆن گوشین لەم وڵاتە تا ئەوپەڕی ناشیرنە و بە هەڵە نەبێ، ئامانجەکانی خۆی ناپێکێ، چونکە زەیتوون وادەبێت لەژێر بەردە داتاشراوەکە (بەرداشەکە) دەردەچێ. جا بۆ ڕێگری لەم جاڕسکارییە، بە ناشیرینی ناوکی خورماکە دەشکێنن و لەگەڵ تووی ڕۆنیی وەك دەنکی کەتان و بەنگی ڕووەکی

---

بەکارهێنانیدا بکشێ و برێکی زۆری لە بینادا بەکاربهێنرێ و بریسکەدانەوەیەکی وەك مەرمەڕی هەیە. شونامی مەدراس هۆی هەموو ئەو جوانییەیە کە لە هەموو پاشماوەکانی هیندستاندا هەیە.

[1] عەرەبەکان پێیدەڵێن (ئاوی لیجە=ماء لیجە) *mahé legah*.

[2] هەروەها ئاوی گوڵ لە گوڵی نێریش دروستدەکەن، پێیدەڵێن "ماء الفحل"، کە بەهێزترە، بەڵام بۆنەکەی وەك ئەوەیتر ناسك نییە.

گوش chenevis تێکەڵی‌دەکەن، بەوپێیە کە ماددەیەکی پێوەنووسە و خەسڵەتی ئەوەیە بە بەردەکەوە دەنووسێ، ئەمەش بۆ ڕوودانی ئەو کاریگەرییەی کە پێشبینیی‌دەکەن. لەگەڵ ئەوەش‌دا، خورما خواردنێکی زۆر خۆراك پێدەرە بۆ چارەوێ، کاتێك لێ‌دەگەڕێن ماوەی چوار یا پێنج ڕۆژ لەناو ئاودا بخووسێ. کاتی گەڕان بەدوای مێژووی خورمادا، دەتوانین وێنەیەکی کۆنی میوانداریی عەرەب بکێشین، هەتا ئێستاش گەڕۆکەکان دەتوانن برسێتییان بە بەروبوومی خورمای سەر ڕێگەیان نەهێڵن، چونکە هەرگیز وەك دز دوایان‌ناکەون، تەنیا ئەگەر بچێتە سەر درەختەکە یا بەرەکەی هێندە ببا، کە لە پێویستیی ئاسایی خۆی زیاتربێ.

چەند ساڵێکە بەسرە بووەتە ناوەندێکی بازرگانیی ئەسپ لە ئاستێکی زۆر بەرفراوان‌دا و لە ناوچە دوورەدەستەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە ئەسپی بۆ دەهێنن. بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە هاوڕێی نزیکم بەڕێز کۆلکهۆن پێشکەشی‌کردم، چەندین جار دەرفەتی هەبووە لەوبارەیەوە لەگەڵ دانیشتووان و شارەزایانی گەورەی ئەم ژانرە قسەبکا، وەچەی هەچەشنەی ئەسپەیلی عەرەبی بە شێوەیەکی پەرجووئاسا زۆردەبن، بە مشوورخواردنی عەرەبەکان بۆ پارێزگاریی، ژینۆلۆژی (وەچەناسی)ی جوانترین ئەسپ و باشترین جوانوویان گەڕاندووەتەوە سەر باوانیان. ئەم ژمارە زۆرەی جۆرەکانی ئەسپ پێنج وەچەی هەمەچەشنەی هەیە، کە هەرەیەکەیان ناوەکەی بەسەر ڕەگەزێکدا بڕاوە و هەموو ئەم وەچانەش دەگەڕێنەوە بۆ نیمچە دوورگەی عەرەب. ئەم پێنج وەچەیە بریتین لە: کحیلة العجوز *Kuheiiut el ajvez*، شویمة الصباح *Showeiman el subah*، اوزتنی ئەلخورسة *Uzithin el Khursa*، صقلاویة بن غدران *Suglavie ben gedran*، دهمة النمر Dehma el *naamir*. ئەوە لەم یا لەو پێنج وەچەیە، کە بەناوبانگترین ئەسپەیلی عەرەبی دەنێنەوە، ئەوەی

زۆر جێگەی سەرنجدانە ئەوە ئەسپ نییە هێڵی ژینۆلۆژیی بێ، بەڵکوو ئەوە مایینە کە خوێنی ڕەسەنی ئەم ئاژەڵانەی تێدایە، بەناوبانگترین وەچە یا خێزانەکان بریتین لە: کحیلة السمنة Kuheillu el Sameneh، المنجیة Ul Munigieh، ئەبویل ئەلنجدیە Aboyel el nejedis، یا ئەبەوین خندش- Aboyan Kineideish، ئەبەوین ئەلشراق Aboyen el Shirack، ترفیع - Tereiieh، موتابع Mutabuh، هەدبە Hedeba، غەرادە Gerade، زەبی - Zubie، ئەلجلفیە Julfa، بەریسا Bereisa، ریشا Risha، جوحیرە Jouheira، ئەلنمح el Naumeh، کورووش Curoosh، ئەلخوری el Kurry یا ئەلخیری el Kerry، سەدەSaadeh، ئەلغەرە Ghureh، غەرە Ghureh، عوزالە - Ghuzaleh، حەمدانیە Humdanie، ئیجتمعیة Igithemie، پێویستە تێبینیبکرێ کە ئەم ناوانە بنچینەی هەمەچەشنەیان هەیە، بڕێکیان لە لقی بنچینەیی وەرگیراون و بڕێکیشیان لەو شوێنەی کە لێیەوە هاتوون و هی دیکە لە خەسڵەتی ئاژەڵەکە خۆی وەرگیراوە، کە دەبێتە ناوی خانەوادەیی بۆی.

مونتەفیکەکان باشترین وەچەی ئەسپن، هۆزێکی گەورەی عەرەب کە هەمان ناوی هەیە و لەسەر ڕووباری فورات و نێوانی قورنە و سامەڕا دەژین، پەروەردەکراون. ئەسپی شوب Chob بە بەهێزییان جیادەکرێتەوە، بەڵام خوێنیان وەك خوێنی ڕەگەزەیلی بیابان پاك نییە. ئەوانەی شوستەر Shustar بەرز و بەهێزن و شێوەیان بەشێوەیەکی جوان هەڵکەوتووە بۆ پێشبڕکێ، بەڵام ناتوانن لەسەر چیمەن بڕۆن. لە ئەرمینیا و لە کوردستان دەتوانرێ ئەسپ لە بازاڕی زۆر گەورەی ئەسپان بۆ دووبارە بەرزبوونەوەی هێزی ئەسپسواری بکڕدرێ. ئەوانەی بەغدا گەورەن و بڕێکیان خوێنیان پاکژە، بەڵام جوانترین ئەسپی هەموو نیمچە دوورگەی عەرەب -بەڕای من- ئەو ئەسپانەیە کە لە بیابانەکانی نزیك دیمەشق پەروەردەکراون. گوێم لە عەرەبێکی هەژار بوو لە

ئەنتاكیای سوریە، كە سی‌وشەش پیاستەر (٣٦٠٠٠ فرەنك)ی ڕەتكردبووەوە بۆ جوانوویەكی لەم ڕەگەزە. تاقە ئەسپەیلی ڕەسەن كە من بینیم لە ئاسیای بچووك لە دەورووبەری یۆزگات پەروەردەكرابوو، لە پێدەشتی كاپپادۆكیا. ئەوانە بێ‌گومان لەو ئەسپانەن كە ڕۆمانەكان پێیان سەرسامبوون. باشترین ئەسپەكانی لای عەرەب، دەبێت بەرزییەكەی چوارده دەست hands بێ، لە كاتێكدا ئەوان زیاتر دەڕواننە ڕەگەز نەك بەرزی و زۆر بە دەگمەن ئەو ئاژەڵانەی كە بەناوبانگترین ڕەسەن وەردەگرن، ئەو بەرزییەیان دەبێت. چەند ساڵ ئەزموون قەناعەتی پێ‌هێنام، كە ئەسپسواری خۆجێی هیندیی ئێمە لەسەر ئەسپی لەم جۆرە زۆر باشتردەبێت لەوەی كە ئێمە ئێستە بۆیان دابین‌دەكەین. بەڵگەهێنانەوەی (ئارگیۆمێنت) بەهانەهێنراوە بە قازانجی ئەسپی بەرزی ئاوایییەكان بۆ ئەو وڵاتەی كە ئێستە ئێمە هەڵمانبژاردووە بۆ دووبارە پێكهێنانەوەی سوپای مەدراس، ئەوەیە كە پێویستە هێزی بارهەڵگر گونجاوبێ لەگەڵ بەرزیی ئاژەڵەكە. بەڵام ئەم بیانووە -بە ڕای من- تەنیا وەهمییە، چونكە خێرایی ئەسپی عەرەبی هاوسەنگی ئەو مەودایە دەبێت كە ئەسپی بەرز دەیبەخشێ بەوانی دیكە. سەرباری ئەوە، ئەسپی عەرەبی ماندوویی‌نەناسە و هێشتا دەتوانرێ باری لێ‌بنرێ و دوای بڕینی مەسافەیەكی درێژ كە دەشێ ئەوەی هیندستان داهێزراویكا. من لێرە ئەوە وەبیردەهێنمەوە كە نادرشا یەكەمینایەتیی دابووە ئەسپی عەرەبی بەسەر هەموو ئەوانی دیكە. بە گۆڕینی ئەسپی هەوسار گەورە بە هەوساری بەن،[1] كە لە ئێران بەكاردەهێنرێ، دەتوانرێ ڕێگە لەو ترسە بگیرێ، كە دەشێ بەهۆی خێراییەوە بارەكەی ئەسپسوار سەغڵەتبكا. من قەناعەتم وایە ئەسپەیلی عەرەبی تێچووی كەمترە بۆ كۆمپانیا وەك لە ئەسپەیلی كوتشی یا كوتوار، كە باشتر بەرگەی ماندوویی

---

[1] جۆرێكە لە هەوسار (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسی).

دەگریێ و دەگاتە تەمەنێکی زۆر هەڵشکاوتر[1] و تێچووی ئازووقەی ساڵانەی لە ئەنجامدا کەمترە. ئەسپسواری ئێمە لە مەدراس بریتییە لە حەوتهەزار و پێنجسەد و چلوشەش ئەسپ و بۆ پارێزگاری لەو ژمارەیە، بەتەواوی پێویستە هەموو ساڵێک نۆسەد ئەسپیان نویێبکرێنەوە، کە دەکاتە دوازە لە سەد. بەوپێیەی کە ڤیستالەکانی Vestale کەشتیی گەشتی زەریایی بۆ کۆمپانیای هۆنۆرابل، کە من شوێنێکم حیجزکرد بۆ چوونە بۆمبای، زۆر بچووك بوو تا شوێنێکی تەواوت پێبەخشێ، بۆیە بە هاوبەشی لەگەڵ بەڕێز کۆلکهۆن و کاپیتان سواتسۆن و من، کەشتیەکمان بەکرێگرت بۆ گواستنەوەی ئەسپ و خزمەتگوزار و جانتاکانمان بۆ هیندستان. هەمووما پێکەوە لە کۆتاییی سێپتەمبەردا سواری کەشتی بووین، پێکەوە تا دوورگەی کشمیش ڕۆیشتین. بەڵام بەداخەوە بەهۆی باوبۆرانەوە لە کەشتییەکە کە بەکرێمان گرتبوو، جیابووینەوە. دوو ڕۆژ دواتر ئەو کەشتییە، کە هەرچەندە ئاڵای ئینگلیزیی بەسەرەوە بووە، بەڵام ڕاما بەن جابا Rama Ben Jaba، یەکێك لە چەتەکانی جواسمی Djoasmi دەستی بەسەردا گرت، سێ بەشی تاقمی ناو کەشتییەکەی قەتڵوعامکرد، بەشێکی ئەسپەکانیشی کوشت و هەموو جانتاکانی منیش کە نرخەکەی نزیکەی هەزار و پێنجسەد جونەیهی ئیستەرلینی دەبوو (سیوشەش هەزار فرەنك) و کتێبەکانم، ئامێرەکانم، ڕۆژنامەکانی ڕێگەم، نەخشە و کۆلیکسیۆنێکی نایابی مەدالیا و شتی دیکە کە من لە گەشتەکانمدا بە زەحمەت و تێچووی زۆر کۆمکردبوونەوە، زەوتیکردن. بەردەوامبووین گەشتەکەمان تەواوکرد، بەبێ ئەوەی لەبیرمان بێ چی ڕوویداوە و کاتێك پێمان نایە ناو مەسقەت، ١٣ی تشرینی یەکەم گەیشتینە بەندەری بۆمبای. مەسقەت پایتەختی

---

[1] ئەسپی عەرەبیی ڕەسەن تا تەمەنی بیست ساڵی دەژی و تا ئێستەش گەلێکی بەناوبانگی هەیە لە بەسرە لە سەروو چل ساڵییەوەیە.

شازادەی عوممانە (کە پێی‌دەوترێ ئیمام یا سوڵتانی مەسقەت)، کەوتووەتە ناو بەندەرێکی قووڵ، لە سێ لاوە بە گاشەبەردی قاقڕی دوورگەی جەزیرەی عەرەبی دەورەدراوە. ئاووهەوای هەموو وەرزەکانی ساڵی، ئەوەندە پیس‌وپۆخڵ و هێندە سووتێنەرە، ئێرانییەکان پێی‌دەڵێن جەهەنەم یا دۆزەخ. ئیمامی مەسقەت هاوپەیمانی ئینگلیزە، زیاد لە چەند جارێك لەدژی وەهابییەکان پارێزراوە. لەسەر حیسابی بازرگانیی ئێمە، ژمارەیەکی زۆر کەشتیی لە بەندەرەکەی کۆکردووەتەوە، باشترین کەشتیی چارۆکەداری هەیە، لە زەریاکانی هیندستان کەشتییەوانی دەکەن و لە هەموو شوێنێك دەبینرێن؛ لە بینگال، لە چین، لە دوورگەکانی زەریای ڕۆژهەڵاتی و کەنارەکانی ئەفریقیا بازرگانیدەکات. وەختێك مۆریتیوس Mauritius پێش داگیرکرانی دوورگەکانی لەلایەن ئینگلتەراوە، لەژێر دەستی فەرەنسییەکاندا بوو، ئیمامی مسەقەت ئازووقەی بۆ ئەم کۆلۆنییە دابین‌دەکرد و هەموو ئەو کەشتییانەی کڕی کە لە چەتەی هاوپەیمانی لەدەست کەشتیگەلی ئینگلیز دەربازبووبوون. نامەوێ ئەوە بسەلمێنم کە تا چ ڕادەیەك سیاسییە، ڕێگە بە هێزێکی زەریاییی هەڵکشاوی وەك ئەم میرە بدرێ. ئەوە پرسیارێکە بۆ بڕیاردان نایکەم، بەڵام پێم وایە ئەوە ئەرکی منە ئاماژەی بۆ بکەم کە جگە لەو زیانەی کە بە بازرگانیی ئێمەی دەگەیەنێ، ئاکامەکەشی زۆر ترسناك دەبێت، لە حاڵێكدا هەر دەوڵەتێکی ئەوروپایی هێرش بکاتە سەر هیندستان، ئەگەر ئەو کەشتییانە بەو ڕێژەیەی ئێستە کەڵەکەبن.

# یادداشت لەبارەی هێرشی سەر هیندوستانەوە

ئەگەری هەوڵدانی هێرشێك بۆ سەر هیندوستان لە ڕێگەی وشكانییەوە،[1] چەند ساڵێكە زۆر بە گەرمی سەرنجی ڕای گشتیی بۆ لای خۆی ڕاكێشاوە. بەڕێكەوت ئەركەكانی كارەكەم منی بردە چەندین وڵات، كە دەكرێ ئەو وڵاتانە ببنە ڕێڕەوێك بۆ تێپەڕبوونی ئەو هێزانەی وا ئەم لەشكركێشییەیان پێ دەسپێردرێ. ئەو هەلومەرجەی كە منی تێدام، خستمیە سەر كەڵكەڵەی كۆكردنەوەی زانیاری سەبارە بەو وڵاتانەی كە خۆم سەرم لێ داون، بیركردنەوەكانم بە شێوەیەكی ئاسایی ئاڕاستەی ئەو ئامانجە كرابوون و چەندین سەعاتی كاتی بەتاڵیی خۆمم تەرخان كرد بۆ پابەندبوون بە ئەنجامەكانی تێڕامانەكانم.

زۆر پلان هەیە دەوترێ پێشنیازكراون بۆ سەركەوتنی ئەو پرۆژە بوێرانەیە، بەڵام -لەگەڵ ئەوەش دا- ئەوا تەنیا دووان لەوانە بڕێك سەركەوتنی دووری تێدا شك دەبرێ (ئەوەش هێشتا لە ئاسۆیەكی زۆر دوورەوە): یەكەمیان لەم پلانەدا بریتییە لە گرتنەبەری ئەو ڕێگەیەی كە ئەسكەندەر و نادرشا (تەهماسپ قولیخان) پێوایان و ئەوەی دیكەش پێشڕەوییە لە ڕێگەی ڕووسیا و بوخاراوە.

---

[1] لەوانەیە پێویست بەوە نەكا ئاماژە بكرێ بۆ ئەوە كە ئەم یادداشتنامەی ئێرە پێش كەوتنی بۆناپارت و ئەو ڕووداوانە نووسراوە. كەوا ئەم دواییە لە ئەورووپا ڕوویان دا و بوون بە هۆی پێدانی درێژبوونەوەیەكی نوێ بۆ خاكی ڕووسیا و بوون بە هەڕەشەی سەر خاوەنایەتیی زەویوزارەكانی ژێر دەسەڵاتی ئێمە لە ڕۆژهەڵات.

بیرۆکەی پەلاماردانی هیندوستان لە ڕێگەی زەریای سوور یا کەنداوی فارسییەوە، تەنیا دەبێت وەك بیرۆکەیەکی خەیاڵیی حیسابی بۆ بکرێ لە لایەن هەموو ئەوانەوە کە -بە هەر جۆرێك بێ- ناشارەزان لە سروشتی ئەم زەریایانە و ناوچەکانی هاوسێیان. پێش ئەوەی کردەوەیەکی لەم جۆرە بە تێڕامان بکرێ، ئەوا پێویستە دوژمن سەرداری بێ ئەملاوئەولا و دەستڕۆیشتووی نەك هەر تەنیا میسر و سوریە، بەڵکوو -جگە لەوە- عیراقی عەرەبی و هەرێمە باشوورییەکانی وڵاتی ئێرانیش بێ. نە سنووری کەناراوەکانی زەریای سوور و نە ئەوەی کەنداوی فارسی، تەختەدار و کۆگەی پێویستی زەریاییان نییە بۆ دروستکردنی پارچەی کەشتی. بۆیە ئەستەمە ئەم کەرەسانە لە ڕێگەیەکی دوورەوە لە زەریاوە بهێندرێن، یەك کەشتی ناتوانێ بەبێ ڕێگەپێدانی ئێمە کۆببێتەوە. بەدڵنیاییەوە زارکی ئەم دوو کەنداوە ئەوەندە بەرتەسکە، هەر یەك کەشتیی جەنگیی ئاسایی بەسە بۆ پەرپەچدانەوەیان بەتوندی لە هەموو وەرزێکی ساڵدا. ئەوە ڕاستە کە چیاکانی فارس Fars دارستانی داربەڕووی زۆری لێیە، بەڵام ئەم درەختانە هێندە بچووکن تا ئەو ڕادەیەی کە ناتوانرێ بەکاربهێندرێن بۆ دروستکردنی حەوزی کەشتی. ئەو درەختانەش کە لە دوورابییەکی دووری ئەو ناوە دەڕوێن، دەبێت بە تێچوویەکی زۆر بەسەر گاشەبەردی زل و لێژاییی ترسناكدا بگوازرێنەوە. کەناری حەبەشە côte d'Abyssinie یش تەختەداری بچووك بەرهەمدەهێنێ، بەڵام چۆنایەتییەکەی لەوەی کە لە چیاکانی فارس Fars بەرهەمدەهێنرێ، لەخوارترە، لە ئەنجامدا دەبینین هەموو کەشتییە گەورە فارسی و عەرەبییەکان یا لە هیندوستان دروستکراون، یان بە کەرەستەگەلێك دروستکراون، کە لە مالابارەوە Malabar هێنراون: لەپاڵ ئەمەدا، ئایا دەشێ دوژمن بتوانێ کەشتیگەلێك بە کەرەستەی هاوردە دروستبکا، لەسەر حیسابی کێشەی گەورەی ناو سوریە، یا سەر کەناراوەکانی زەریای سپیی ناوەڕاست یان

لە ڕێگەی بەردەستخستنیانەوە لە یەکێك لە بازرگانەکانی مەسقەت Muscat (ئەوانەی کە ئێستە لەسەر حیسابی بازرگانی لەگەڵ ئینگلیز ژمارەیەکی زۆر و نایابتری کەشتییان هەیە، کەشییەوانیی لە زەریاکانی هیندیدا دەکەن). هیچ بەندەرێك نییە کەشتیگەلێکی ئاوها لە هێرشی کەشتییە جەنگییە خێراکانی ئێمە بپارێزێ، یا ئەگەر هەشبێ، پێویستە لە ساتەوەختی گەیشتنە croiseurs ناو زەریادا چاوەڕێی تێکشانێکی دیاریکراو بکا. بەوپێیەی کە ئێمە ئەممان لەپێشە، بەڵام شتێکی ئاوا زۆرمان نییە لەم ڕووەوە لێی بترسین. با ئێستە بێینە سەر چاوگێڕانێك بەو بەربەستانەدا کە بەرەوڕووی سوپایەك دەبنەوە دەیەوێ لە ڕێگەی ئاسیای بچووك و وڵاتی ئێران یا ڕووسیا و بوخاراوە بگاتە هیندوستان.

پێش ئەوەی جەنەڕاڵێکی ئەوروپایی شوێنپێی داگیرکاریی مەقدۆنی یا نادرشا هەڵگرێ، پێویستدەکا یا هەردوو ئیمپراتۆریای فارسی و تورکی بڕووخێنێ، یا حوکوومەتانی ئەو دوو وڵاتە بەتەواوی بە قازانجی خۆی بێنێتە ناوەوە. یەکەمجار ئەوە ئەرکێکە کاتێکی زۆری پێویستە بۆ ئەنجامدان، باری حوکوومەتە بەدبەختەکان و جەنگی بێپسانەوەی نێوان تورکان و فارسەکانیش وادەکەن ئەم کارەی دوایی بە هەمان ڕادە قورس بێ، بە مەرجێك ئێمە بەخێرایی و دەستوبرد بجووڵێینەوە. بەڵام با وای دابنێین ئەوان لەمبارەیەوە سەرکەوتووبوون بۆ ئەوەی سەرکردەکانی ئەم وڵاتانە ڕازیبن بە پلانە چاوتێبڕاوەکانی ناپلیۆن، ئەوسا دەبێت سوپا بە سێ ڕێگەی جیاواز لە ئەورووپاوە بگوازرێتەوە بۆ وڵاتی ئێران: یەکەمیان دابەزین لەسەر کەناری سوریە یا کیلیکا Cilicie، دووەم لە ڕێگەی دەربەندی بۆسفۆر یا دەردەنیلەوە و بەرەوپێشەوەچوون بە ئەنادۆڵ و ئەرمینیا و دوایینیشیان بە زەریادا بە کەشتییەوانی لە زەریای ڕەشەوە لە کۆنستانتینۆپل یا نیمچە دوورگەی قرم یا

دەروازەکانی ڕووباری دانووب بۆ تەرابزۆن یا بەندەرێکی دیکەی سەر کەناری مینگریلیا Mingrelie.

ئەگەر ئەو کەشتیگەلەی کە سوپا دەگوازێتەوە بە زەریای سپیی ناوەڕاستدا بڕوا بۆ سوریە یا کیلیکا، بەختەوەردەبێت بەوەندەی دەستبەرداربێ تا بتوانێ لەدەست وریایی ئەدمیراڵەکانی ئێمە ڕابکا و سوپا بە دڵنیایی و سەلامەتی لە ئەسکەندەرییە Scanderoun یا لازقییە Latekièh دادەبەزێ و سێ بژاردەی لەبەردەستدا دەبێت بۆ ئەوەی کاروانەکەی بەردەوامبێ. یەکەم بژاردە ئەوەیە کە ئیمپراتۆر جۆلیان گرتیەبەر. پەڕینەوە بە فوراتدا لە بیر Byr یا مێمبگیز Membghiz و گرتنەبەری ڕێرەوی ئەم ڕووبارە بۆ نزیکی بەغدا. لە لازقییەوە بۆ حەڵەب چل سەعاتە یا نزیکی سەدوچل میلە، لە حەڵەبەوە بۆ بیر سەد و چلوشەش میلە، بەگوێرەی خەملاندنەکانی کۆلۆنێل سکۆت Scottی هاوڕێم. پێدەشتێکی وشك و قاتوقڕ پێنجسەد میل لە بیرەوە بۆ بەغدا درێژدەبێتەوە، بەدەر لە ژمارەیەك ئاوایی پەڕپووت و چەند کونجێکی چێندراو لەسەر کەنارەکانی ڕووباری فوڕات، کە تەواو بەدەرە لە گەنمەشامی و مەڕومالات و هەموو جۆرە ئازووقەیەك. ئەگەر پەڵپ لەوە دەگرن کە ڕۆمانەکان بە زیاتر لە دوو ساڵ لە ئەنتاکییەوە بۆ تەیفیسۆن بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتوون، ئەوا دەبێت ئەوەشمان لەبیربێ کە ئەوان کەشتیگەلی زۆریان لەگەڵ بووە و لە هەموو پێویستییەك لە هەرێمی ڕووها (ئەدیسە Edesse) و پێدەشتە بەپیت و فەڕەکانی سوریە، کە ئێستە لەژێر دەستی ئاسنینی تورکاندایە و نەک هەر دوورە لەوەی بتوانێ خۆراك بۆ ژمارەیەکی زۆری سوپا، بەڵکە زۆر بەدەگمەنیش دەتوانێ پارووی ژیانی تەواو بۆ دانیشتووانە چەوساوە و کەمبووەکانی خۆیشی دابینبکا. کەنارەکانی ڕووباری فوڕات ئەو سەردەمە لە ڕەوشی کشتوکاڵدا زۆر لەوەی ئێستە هەیە، باشتر بووە و پاشماوەی کەلاوەکانی عیراقی عەرەبی کە

ئێستە کەلاوەن، ئەو کاتە پڕبووە لە شار و دێهات و دانیشتووان. لە کاتی گەیشتن بە بەغدا، دەشێ بڕێکی زۆر ئازووقە لە ڕێگەی ڕووباری دیجلەوە لە کوردستانی خواروو دابین‌بکرێ، بەڵام ئالیك لە هەموو ئەو ناوچەیەدا زۆر دەگمەنە و کەمیی ئەو مادده زۆرتر گرینگە تا ڕادەیەکی زۆر گەورە پێشڕەویی سوپا دوادەخا. لە بەغداوە ڕێگە کراوەیە بۆ هەمەدان بە دەربەندی کرندا، من هیچ شتێکی‌تر نابینم پێشڕەویی سوپا بۆ وڵاتی ئێران ڕابگرێ، بە مەرجێك تورك و کورد و فارسەکان بە هەموو هێزێکیانەوە کۆمەگی‌بکەن: بەبێ یارمەتیی ئەوان و کۆمەگی یەکگرتووانەیان، دەبێت چاوەڕێی هەموو مەترسیەکی برسێتی بن.

ڕێگەی دووەم لە کیلیکیاوە بۆ وڵاتی ئێران، بریتییە لە ڕێگەی ئورفە، ڕەهای کۆن، ماردین، مووسڵ و تێپەڕبوون بە دەربەندی ناو کوردستاندا. ڕێگەی ڕاستەوخۆ لە ئەسکەندەروونەوە بۆ ئورفە، درێژیی نزیکەی سەدوچل میل دەبێت. ڕێگەیەکە لەڕادەبەدەر خراپە، بەڵام دەکرێ خۆی لێ وەدووربگیرێ بە سووڕانەوە بەدەوری پێدەشتەکەدا. بە گەیشتنە ئورفە ناتوانرێ پێداویستییەکانی سوپایەك کەم‌بکرێتەوە، بەهۆی میرنشینی ئوشرۆشین Ochrohèneەوە، کە پێشتر میرنشینێکی بەختیار و گەشەسەندوو بووە و چارەنووسی وەك هەموو ئەو هەرێمانە بووە کە بۆ نەگبەتی کەوتنە بن‌دەستی بابی‌عالی. لە ئورفەوە بۆ مێردین نەوەد و لە مێردینەوە بۆ مووسڵ سەدوپەنجا میل و بە دەرهاوێشتنی گەڕەکە بچووکەکانی نوسێبین و چیای تۆر Mont-Thor،[1] وڵاتەکە تێکەڵەیێکە لە بیابان و خاکی بەیار. دەبێت پێشوەچوونی سوپا لە مووسڵ بۆ بەغدا پشت بە کورد و فارسەکان ببەستێ، دیسان هەمان

---

[1] کوینت-کورس Quinte-Curce بەڕوونی ئەوە بەدیار دەخات کە ئەسکەندەر لەنێوان جەزیرە و مووسڵ لە دیجلە پەڕیوەتەوە، کە لەم شوێنەدا لەماوەی هاوین و پاییز دەکرێ لێی بپەڕینەوە.

چارەنووس و هەمان ئاستەنگ دێنە پێشەوە، ئەگەر ئەم گەلانە مەیلی ئەوەیان بێ دوژمنایەتیان بکەن.

دواینی ئەم ڕێگەوبانانە، بە کەپپادۆکیا Cappadocia و دیاربەکر و ئەرمینیادا ڕەتدەبێت. لە ئەسکەندەروونەوە تا دیاربەکر بە ڕێگەی سامۆسات Samosat و مەلاتیەدا، یا ڕاستتر ڕێڕەوی پیادەڕۆی هاوشانی لێژاییەکانی چیای سەختی تۆرۆس، گەیشتن پێی دژوارە و لە هەموو ساتەکاندا ئەستەمە تۆپخانە یا هەر گالیسکەیەکی تایەداری پێدا بڕوا. وەرزی زستان، بەفر بەتەواوی ڕێگەکە دادەخا و دایدەپۆشێ. ئازووقەپێدان، بە گرتنەبەری ئەم ڕێگەیە لە هەموو ڕێگەکانی پێشوو باشترە. لە مەلاتیە و دیاربەکر کۆگای گەورە دەکرێ بە کۆمەگی پاشاواتەکان دروست بکرێ. بەڵام لەشکرکێشیەکە پێویستە لە پاییزدا دەست پێ بکات، کاتێك گەنم تەواو پێ‌دەگا، چونکە کۆگای بەردەست بەشێوەیەکی گشتی بچووکە و هەروەها ڕێوبانەکان هەروەك پێشتر تێبینیمان کرد بوو، بەڕاستی لە زستاندا ناکرێ بگیرێنەبەر، لە بەهاریشدا هێشتا بەهۆی ئەو سێڵاوەی کە بەهۆی توانەوەی بەفرەوە دروست دەبێت، خراپترە. نێوانی دیاربەکر و عەربگیر سەدوبیست میلە و لە عەرەبگیرەوە بۆ ئەرزەڕۆم سەد میل و وڵاتەکە زیاتر چیاییە و ڕێوبانەکان بە هەمان شێوەی وەك پێشوو و بەتایبەتیش لە نێوان دیاربەکر و عەرەبگیردا خراپن.

لەڕێگەی ڕاستەوخۆوە بەناو ئاسیای بچووکدا، سی‌وشەش میل لە کۆنستانتینۆپلەوە بۆ نیکۆمیدیا Nicomedia دوورە و لە نیکۆمیدیاوەشەوە بۆ بۆلی دووسەد و نۆزدە میل دەبێت، لە بۆلییەوە بۆ ئەماسیە سێ‌سەد و حەفتاویەك میل، لە ئەماسیەشەوە بۆ تۆکات حەفتا میل دەکا؛ کۆی هەمووی دەکاتە حەوت‌سەد و بیست‌وسێ میل لە پایتەختی تورکیاوە بۆ تۆکات Tocât، یەکێك لە گەورەترین شارەکانی ئەنادۆڵ. لەوانەیە ئاسیای بچووك یەکێك لە

نایابترین وڵاتەیلی جیهان بێ، کەش‌وهەوایەکی تەندروست و خۆش، خاکەکەی پڕ بەرهەم و هەمیشە بە گژوگیا سەوزە؛ لەگەڵ ئەوەش‌دا، لە هەرەس‌هێنانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییەوە، لە پاشەکشەدایە. بەم‌جۆرە لە کاتی ئێستەدا ژمارەی دانیشتووانی زۆر نییە و کشت‌وکاڵی خراپە، ڕووبەرێکی بەرفراوان لە خاکەکەی یا بە خۆڵ‌وخاشاك داپۆشراوە یان بە زۆنگاو و دارستانی بێ‌سەروبەر، بەڵام -وێڕای ئەوە- بە چاوپۆشین لەم ڕەوشە، بەرهەمی زۆرە و پاشاکان pashas کۆی‌دەکەنەوە و ئازووقەی تەواو بۆ پێویستییەکانی سوپایەکی گەورە دابین‌دەکەن، بەتایبەتی هەموو هۆیەک هەیە مەزەندەی بکەین کە دوژمن خۆی بە شیاوتر دەبینێتەوە بە دابەشبوونی بچووك بجووڵێ وەك ئەوەی یەك هێزی گەورە بێ، بە شێوەیەك کە ڕاییکردنی ئەم کاروانە لە وەرزی هاوین‌دا نەبێ، بە سەلامەتی ناکرێ. کات لەو وەرزەدا بەدرەنگ‌دەکەوێ پێش ئەوەی سوپا لە کۆنستانتینۆپلەوە بگاتە تۆکات، لەسەریەتی بەدرێژیی وەرزی زستان لەوێ یا لە ئەماسیە بمێنێتەوە و بەشێکی گەورەی وەرزی بەهاریش لەوناوەبێ. دەشێ وەستان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ببێتە هۆی شەکەتکردنی ناوچە هاوسێکان، بۆ ئەو مەڕومالاتە زۆرەی کە دەبێت ئامادەبکرێن و کاروانی سوپا بەناو وڵاتێك‌دا بڕوا هەموو شتێکی دەبێت بەسەر پشتی ئەسپ و وشتر و ئێستر و.. هتد. بگوزارێتەوە و بڕێکی لەڕادەبەدەری جۆ و پووش و پەڵاش .. هتد بەکاربهێنرێ، بەتایبەت لەو وەرزەدا کە بەفر زەوی دادەپۆشێ. لە تۆکاتەوە بۆ ئەرزەڕۆم دوورایییەکەی نزیکەی سەد میلە؛ تەواو هاوشێوەی ئەوەیە کە دەکەوێتە نێوان دیاربەکر و ئەرزەڕۆم و ئەمە واتە ناوچەیەکی چیایییە و ئەستەمە ژمارەیەکی لەژمارەنەهاتووی خەڵکی پێدا بڕوا، بەتایبەت ئەگەر کاتێك کاروانەکە باری لەگەڵدا بێ. ڕاستە دەتوانین هەموو جۆرە خواردەمەنییەك لە هەموو جۆرەکان لەناو دانیشتووانە دەوڵەمەندەکانی

شیوی ئەرزەڕۆم دەستبخەین. پاشان لێرەوە بۆ یەریڤان دوازدە ڕۆژ کاروانەڕێیە و سروشتی وڵاتەکە و ڕەوشی ڕێگەوبانەکان هەروەك خۆیانن، لە یەریڤانەوە بۆ تۆرۆس پەنجاوسێ فەرسەغە (سەد و هەشتاوپێنج میل و نیو). لە تۆرۆس ئازووقە زۆرە و بەردەستە، ئێستە ئازەربایجان باشترین ناوچەی چێنراوە و باشترین هەرێمی پڕ بەرهەمە لە ئیمپراتۆریای ئێران.

خێراترین ڕێگە و گونجاوترین و کەمخەرجیترینیان بۆ گواستنەوەی سوپا لە ئەورووپاوە بۆ وڵاتی ئێران، بریتییە لە بارکردن لە کۆنستانتینۆپل و دابەزین لە تەرابزۆن. لەم ڕێگەیەوە، دەڵێن ئیمپراتۆری یۆنانی، هێرقەل لە لەشکرکێشیی دووەمی‌دا بۆ سەر خوسرەو پەرویز[1] Khosrou-Parviz، سوپاکەی لە ماوەی حەوت هەفتەدا لە کۆنستانتینۆپلەوە گواستۆتەوە بۆ تۆرۆس. زەریای ڕەش لە ساڵدا تەنیا شەش مانگ بۆ کەشتی‌سواری بەکەڵکە و ماوەی پێنج یا شەش ڕۆژ بەسە بۆ کەشتییەك بە (با)یەکی گونجاو لە ڕێژگەی بۆسفۆرەوە بگاتە کەناراوەکانی مینگریلیا Mingrelie، لەوێشەوە بە کاروانی هەشت[2] بۆ دە ڕۆژە تا ئەرزەڕۆم: ماوەی نێوان ئەوەی دوایی و تۆرۆس لەپێش‌دا باس‌کراوە.

جا با وای دابنێین نیازی دوژمنە ئەورووپاییەکانمان بەڕاستی کۆشش بێ بۆ داگیرکردنی هیندوستان بە هەر یەکێك لەو ڕێگایانەی سەرەوە، ئەوا بیر بۆ تۆپخانە و ئازووقە و کۆگەی دیکەی جەنگیی ئێرانییەکان دەچی کە دەیانخەنە بەردەستیان، چونکە گواستنەوەی ئەم کەرەستانە بەسەر پێدەشتەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبیی سووتاو و دارستان و زۆنگاوەکانی ئاسیای بچووك و لێژاییی

---

[1] خوسرەو پەرویز: بیست و سێیەمین زنجیرەی شاکانی ساسانی بووە (وەرگێڕ).

[2] من لە ماوەی حەوت ڕۆژدا ئەم شوێنەم تەی‌کرد، بەڵام ناکرێ مرۆ پێی وابێ سوپایەك بتوانێ وەك تاقە کەسێك بجووڵێتەوە. ڕێگەکە هەروەها ترسناکە و بەناو چیای بەرز و زۆر لێژەواردا دەڕوا و بەفر تا کۆتاییی حوزەیران دایدەپۆشێ.

زۆر سەخت و هەڵەتی چیاکانی تۆرۆس، چیاکانی قەوقاز یا چیای زاگرۆس‌دا، کارێکی کردەنی نییە، بەزوویی دەبێتە پڕۆژەیەکی ئەوتۆ کە تەنانەت داگیرکەرانی مارێنگۆش Marengo[1] بتۆقێنێ. ئەو دارشتە کارخانەسازییەی وا لە ئەسفەهان بۆ جەنەڕاڵ گاردان General Gardanne دامەزراوە، دەتوانێ بەئاسانی کەرەستە و پارچەی پێویست دابین‌بکا. دارستانەکانی گێلان بەزۆری درەخت‌گەلێکی زۆر بەنرخ بەرهەم‌دەهێنن بۆ دروستکردنی گالیسکە، بەڵام ئامادەسازییەکی وەها پێویستی بە ماوەیێکی زۆر هەیە و بەدڵنیایشەوە ئێمە هەر وا دەستەوەستان ناوەستین تا گێژاوەکە دەگاتە سەرمان. بەڵام با وای دابنێین سەرباری ئەوەی کە ڕقی دوژمنەکانمان، پیلانەکانیان و کۆششەکانیان، هەموو کۆسپێکیان تێپەڕاند و سوپایەکی سی تا چل هەزار جەنگاوەر (چونکە سەختە باوەڕبکرێ، کە ژمارەیەکی کەمتر لەوە بتوانێ هیچ وێنایەکی جیددی لە ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکان بەجێ‌بهێڵێ) پێکەوە سازوئامادەن هێرش ببەنە سەر سنوورە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێران، واتە سەر مەشهەد، تورشیش Turshish یا یەزد. چۆن دەتوانرێ خواردنی پێویست بۆ ئەو هێزە ئاوا گەورە بێ‌ئەژمارە و دارودەستەکانی دابین‌بکرێ، کە لە باشترین مەزەندەکردن‌دا ژمارەکانیان ئەوەندەی یەکەم دەبێت، ئەگەر زیاتریش نەبێ. دەبێت بۆ ئەم ژمارە بێ‌حیسابە لە ئەسپ، قاتر و وشتر و حەیوان‌گەلی دیکەی باری قورس هەڵگرتوو، کە

[1] تێپەڕبوون بە چیاکانی ئالپ Alpesدا لە لایەن بۆناپارتەوە، پێش جەنگی مارینگۆ Marengo، یەکێك لەو کردەوە هەرە جەسوورانەیە کە لە تۆمارەکانی سەربازی‌دا نووسراوە، بەڵام -وێڕای ئەوە- سوپای فەرەنسی لەگەڵ دەستەکەی‌دا تەنیا ژمارەکی زۆر کەم پارچەتۆپیان بێ‌بوو و هەموو ئەو تۆپخانەیەیش کە لە جەنگەکەدا بەکاریان‌هێنا، لە نەمساییەکانیان گرتبوو، دوای ئەوەی فەرەنسییەکان لە پیێمۆنت Piémont دابەزین.

تەواو پێویستن بۆ گواستنەوەی تۆپخانە و ئازووقە و هەتا بۆ کۆمەگی ئاویش. ئازووقە و ئالیکی پێویست بۆ ژمارەیەکی گەورە، (دووبارەیدەکەمەوە) لە تارانەوە بۆ تەرشیش یا مەشهەد یا یەزد، ئامادەبکرێ، کە ڕێی تێدەچێ ببێتە هۆی پەرێشان و داماو کردنی پتری ناوچە پەڕپووت و وێرانەکانی وڵاتی فارس، ئەوە ئەگەر هەر بەتەواوی لەناویاننەبا. چی لە سەفەرێکی یازدە بۆ دوازدە سەدهەزار میل چاوەڕواندەکرێ، پێش ئەوەی بگاتە کەناراوەکانی ڕووباری هیندۆس، بەناو بیابانێکی فراوانی بێ هیچ دانیشتووانێکدا، لە هەرێمگەلێکی تەواو بێئاودا، بەبێ گەنم و لەوەڕگە و ئالیك. سەفەرەکانی کاپیتان گرانت، کریست و پۆلتینگەر بە شێوەیەکی تەواو ئەوە دەسەلمێنن کە مەحاڵە هەتا گالیسکەی بچووکیش بچێتە ناو هیندوستان، لە ڕێگەی مەکران یا بەشە جنووبییەکانی کرماوە، بۆیە کاروانی سوپایەك پێویستە بەناو خوراسان یا سیستاندا بڕوا.

لە خوراسانەوە دوو ڕێگە هەیە: یەکەمیان و لە هەموویان ڕاستەوخۆتر، ڕێگەی تورشیش و هیراتە بۆ قەندەهار و ئەوی دیکەش، ڕێگەی مەشهەد و مۆرۆ-شاهـ-جیهانە Mouro-Châh-Djihân بۆ بەلخ. ئەو ڕێگەیەی کە لە هێراتەوە دەردەچێ، فۆستەر گرتوویەتە بەر و نەخشەڕێگەی سەفەرکردنەکەی بەدەستەوەداوە و ئەوەی پەیوەندیدارە بەو ناکۆکییە ناوخۆییانە کە لەناو ئەفغانەکان تەشەنەیانسەندووە، ڕەوشگەلێك کە ئەم ناوچانەی ئەمڕۆ تێدایە، لەوانەیە لە دەورانی پێشتر کارەساتبارتربێ. لە تورشیش Turshishەوە بۆ هێرات، حەفتا فەرسەخ[1] یان دووسەد و چلوپێنج میل دەبێت، بە حیسابی

---

[1] بە شێوەیەکی ئاسایی من فەرسەخ بە سێ میل و سێ چارەگە میل (یەك فەرسەخ و نیو) دادەنێم، بەڵام بۆ دیاریکردنی دوورییەك لەسەر کەمترین پێ، کە بشێ حیساب‌بکرێ بۆ فەرسەخ تەنیا سێ میل و نیو دادەنێم.

ئەوەی هەر فەرسەخێك سێ میل و نیوە بۆ هەر یەکێکیان لە کەمترین خەملاندندا کە بشێ بیکەین. ماوەی سی‌وپێنج فەرسەخی یەکەم، ولاتەکە بووەتە هاوسێیی ئاوایی‌گەلێك کە خاکەکەی زۆرباش چێندراوە، بەلام ئەوەی دیکە لە ڕێگەکە کە ماوەتەوە تەنیا بیابانێکی بەرفراوانە. هیرات پایتەختی خوراسان، شارێکی گەورەیە و پڕ لە دانیشتووانە و لەناو پێدەشتێکی جوان هەڵکەوتووە، میوە و گەنمی زۆر بەرهەمدەهێنێ. لە هیراتەوە بۆ قەندەهار، سەدوپێنج فەرسەخ یا سێ‌سەد و حەفتا میل دەبێت. ئەو ولاتەی کە ئێمە پێیدا تێپەڕبووین، پێدەشتێکی گەورە و قاقڕە، بەبێ درەخت، بەبێ لەوەڕگە، نە گەنم و نە دانیشتووان، هەتا لە برێك ناوچەدا ئاوی سازگاریشی لێ‌نییە. قەندەهار شارێکی دەوڵەمەند و گەشەسەندووە و میوە و ئازووقەی تێدا زۆرن و بازاڕێکی گەورەی هەیە.[1] لەم شوێنەوە بۆ کابوول سەد و حەفتاوشەش میلە، هەرێمەکە لە چەند بەشێکی‌دا زۆر باش داچێندراوە و بەپیت‌وفەڕە. کابول، پایتەختی ئیمپراتۆریای ئەفغان، لە قەندەهار گەورەترە و ئازووقەی تێدا زۆرە و سوپایەك دەتوانێ لەوێ بەردەستی‌بخا. لە کابولەوە بۆ پیشاوەر، سەدوهەشتا میلە و لە پیشاوەر بۆ ئاتتۆك Attock پەنجا میلە. ئەم شارەی دوایی تاقە شوێنە کە دەتوانرێ بە شێوەیەکی باش لە ڕووباری هیندۆسەوە بپەڕینەوە.[2] ڕووباری

---

[1] واتە بۆ دانیشتووان، بۆ خەڵك.

[2] ڕووباری هیندووس یا (سیند) L'Indus، کە دوورتر بەناو پێدەشتێك‌دا درێژدەبێتەوە و لای ئاتتوك Àttok تەسك‌دەبێتەوە، پانییەکەی لە سێ‌سەد هەنگاو زیاترنییە و کە دەگاتە ناو چیاکان تەسکتردەبێتەوە. لە نیلاب Nilâb شارێك کە پازدە میل لە خوارووی ئاتووکەوەیە، پانییەکەی -وەك دەڵێن- بارتەقای هەڵدانی بەردێك زیاترنابێ، بەلام تا ئەوپەڕی قووڵ و تیژڕۆیە؛ لە نیلابەوە بە ناوەڕاستی کۆمەڵەچیاییێکی ڕووتەن‌دا دەڕوا تا قەرەباغ و لەوێوەوە بەناو کەندولەندێکی بەرچاودا دەڕوا و ئیتر ئاوەکەی قووڵ و ڕوون و سازگارە. لێرەوە بەبێ ئاستەنگ بەرەو زەریا دەچێ. پاشان بەرەو

هیندۆس لێرە فراوانە و ئاوەکەی ڕەش و تیژڕۆیە. بنکی ڕووبارەکە چەند دوورگەیەك دەیبڕێ، هەموویان دەتوانن بەئاسانی بەرگرییان لێبکرێ.[1]

لە مەشهەد بۆ مۆرۆ-شاهـ-جیهان، شێست فەرسەخ یا نزیکەی دووسەد و دە میل دەبێت، بەشێکی درێژی ڕێگەکە بەناو چۆڵاییەکی قاقڕ و تاردا دەڕوا، نە خواردن و نە سووتەمەنی هەیە و لە زۆر شوێنیش‌دا بێ‌ئاوە، بەڵام -لەگەڵ ئەوەش‌دا- چەند ناوچەیەك هەیە دەوڵەمەند و بە پیت و فەڕە، دەکرێ لەوێ بە کۆمەگی خەڵکی ڕەسەنی شوێنەکە ئالیك و ئازووقە بەردەست‌بخرێ. مۆرۆ-شاهـ-جیهان پێشتر یەکێك لە شارە هەرە گەورە و نایابەکانی ڕۆژهەڵات بووە، ئێستە بووەتە وێرانە. لێرە چەند ئاستەنگێك دێنە پێش بۆ بەردەست‌خستنی ئازووقە. لێرەوە بۆ بەلخ زیاتر لە دووسەد میلە و وڵاتەکە زۆر لەو هەرێمە دەچێ کە دەکەوێتە نێوان مەشهەد و مۆرۆ و هۆزەکانی تارتاری لێیە و لەیەك کات‌دا دوژمنی ڕووسەکان و ئێرانییەکانن. دووری لە بەلخەوە بۆ پیشاوەر، پێنج‌سەد میلە بەناو چیاکانی بامیاندا. ئەو ناوچەیەی کە کەوتووەتە نێوان ئەم دوو شارە، بەشێکی هیی ئۆزبەکەکانە و بەشێکیشی هیی ئەفغانەکان، کە ئەوانیش ڕقیان لە فارسەکانە.

بەڵام -سەرەڕای ئەوە- دوورنییە هێزەکان لەبریتی ئەوەی بەرەو بەڵخ بچنە پێش، لە مۆرۆ-شاهـ-جیهان بچنە سەر کابول. یەکەم بەشی ئەم ڕێگەیە بەناو بیابانێك‌دا دەڕوا و باقیی ڕێگەکە زەوی‌وزارێکی بە پیت و فەڕە و هەرچەندە

---

باشوور هەڵدەقوڵێ و لە پێدەشتەکە دابەش‌دەبێ بە چەند کەناڵێك و بەیەك‌دەگەن و جیادەبنەوە، بەبێ ئەوەی بەدەگمەن لەناو یەك ڕەوت‌دا یەك‌بگرنەوە. (*Elphinitone's Cabul*)

[1] ڕووباری هیندووس -پێم وایە- لە چەند شوێنێکی نێوان ئاتتوك و حەیدەرئابادەوە دەتوانرێ لێی بپەڕینەوە و لەم شوێنەش مەحموودی غەزنەوی پەڕییەوە.

ناوچەیەکی چیاییە و هۆزی کێوی و بەهێزی ئەیماکەکان[1] و هەزارهاکانی[2] تێدا دەژین، کە ژمارەیەك شار و ئاواییان هەیە، بەڵام خەڵکەکە لە شوێنی نیشتەجێی کاتیدا دەژین. گەنمچاندن زۆر کەمە، شیر و گۆشت بریتین لە خواردنی سەرەکییان. لەم ڕێگەیەوە تا مۆرۆ ئەلڕوود Muro al Rood سەد میل، لەوێوە تا کابول چوارسەد و چل میل دەبێت.

ڕێگەی سیستان Seistan لە یەزدەوە دەچێتە دیزوك Dizuc، بە بۆست Bostتا قەندەهاردا بەدرێژیی کەناراوەکانی ڕووباری هیلموند Hilmund دا دەڕوا. لە یەزدەوە بۆ دیزوك سێسەد و شەست میلە، کە ناوچەکە چەندین سەدە

---

[1] ئەو وڵاتەی کە ئیماکەکانی تێدا دەژین، کەمتر چیاییە وەك لەوەی هەزارەکان، بەڵام بەرزاییەکانی لای هێرات بەرزن و قەدپاڵەکانی زۆر ڕژدن. ڕێگەکان بەناو پێدەشت و سەرچیاکاندا پێچدەکەنەوە و هێندە سەختن هەموو کەس ناتوانێ بەسەریانبکەوێ، تەنیا ئەوانە نەبێ کە حەزدەکەن سەری لێبدەن، ئەوانیش ناچارن بە گوریسێك لە لایەن ئۆردووەکانەوە خۆیان ببەستنەوە. دۆڵەکان بە شێوەیەکی باش داچێندراون و گەنم و جۆ و هەرزن و بادەم و هەنار و زریسك، کە بە خۆرسك تێیدا سەوزدەبن، بەرهەمدەهێنن. بەشی ناوچەی باکوور-ڕۆژئاوای وڵات جەمشیدەکانی تێدا دەژین و زۆر تەختترە و بە پیت و فەڕترە، لێژیی بەرزاییەکانی نەرمە و بێشەڵانێکی چاکە. شیوەکە دەوڵەمەندە و ڕووباری مارگوس یا مەرگوب ئاویدەدا. لە باشووری خاکەیلی تیمونی -هەروەها- پێدەشتێکی بەرفراوان هەیە و بە گژوگیای چڕ داپۆشراوە. هەموو ئەو چیایانە سەرچاوە و کانیاویان زۆرە ( *Elphinitone's Cabul*).

[2] وڵاتی هەزارەکان (هەزارها) زیاتر لەوەی وڵاتی ئیماکەکان دابەشکراوە، بێبەرهەمیی خاك و سەختیی زستانی تێدا دژایەتیی کشتوکاڵ دەکا لەوێ: دەنکە گەنمێکی چکۆلە کە دەچێندرێ،، لە دۆڵێکی تەسك شیندەبێ و پێش کۆتاییهاتنی وەرزی هاوینێکی زۆر کورت دەپسێ و پارێزگاری لە مانەوەی دانیشتووانێکی لاواز دەکا. گۆشتی مەڕ، مانگا و ئەسپ و پەنیر و حەیوانی دیکە، خواردنی سەرەکییانە (*Elphinitone's Cabul*).

دەبێت هیچ ئەوروپاییەك سەری لێنەداوە. جا ئەگەر متمانە بە گێڕانەوەی دانیشتووان بکەین، کە بەو دواییە چوونەتە ئەم شوێنە، ئەوا وڵاتەکە تەنیا چۆڵەوانییەکی بەرفراوانە و بەس. دیزوك کە من پێم وایە هەر زارانگ Zarangی کۆن بێ، ساڵی ١٨١٠ هاوڕێم کاپیتان کریست Captain Christie سەری لێداوە. ئەم ئەفسەرە وەك شارێکی پڕ لە خەڵک وێنای‌کردووە، لە ئاوایییە هاوسێکانی گەنمەشامیی پێویست بەرهەمدەهێنن، هەتا دەتوانن بیشینێرن بۆ هیرات. لە دیزوکەوە بۆ بۆست بەرەو بەرزایی و ڕوو بە هیلملاند، دووسەد میلی سەر کەناراوەکانی ئەم ڕووبارە، کە برێك پاتانەی Pattans کۆچەر یا شوانکارەی بلووجی تێدا دەژین، ژمارەیەکی کەمی لەوەڕگە و دارودرەختی لێیە، بەڵام ئازووقە بەئەستەم بەش‌دەکا و لەوێ دەگمەنە. بۆست، کە جاران شارێکی بەرفراوان و پڕ لە دانیشتووان بووە، ئێستە تەنیا شوێنێکی پەڕپووتە و بەس. لێرەوە تا قەندەهار سەدوچل میلە و وڵاتەکە لەو ماوەیەدا تاڕادەیەك ئارام و باش داچێندراوە.

هیچ ئەستەم نییە سوپا بگاتە ئەم شوێنە، لەجیاتیی ئەوەی بەرەو ئاتتوك بچێتە پێش و لە ڕێگەی پەنجابەوە[1] هەوڵبدا بە سەرووی مۆڵتان Moultanدا لە ڕووباری هیندووس بپەڕێتەوە و بەم جۆرە بەشەکانی باکووری گوزیراتە Guzerat داگیربکا. ئەوە لێرەوەیە کە لەوانەیە بەشی هەرە بێهێزی سنوورەکانمان بێ و بەتایبەت لە ڕووباری هیندووس پەڕینەوە، سروشتی وڵاتەکە پانییە و ئازووقەی زۆری تێدایە و هیچ بەربەستێك نییە بتوانێ ڕێگە لە هێرشی لەشکرێکی گەورە بگرێ. لە قەندەهارەوە بۆ میرپوور Meerpoor کە لە

---

[1] پەنجاب یا پێنج ڕووبار. ئەم ناوە بە وڵاتی سیخەکان دەبردرێ، چونکە ڕووباری هیندووس لەم ناوچەیە دەبێتە پێنج لقی سەرەکی و هەموو ناوچەکە ئاودەدا، پێش ئەوەی لەناو زەریا ونببێ. (تێبینیی وەرگێڕی فەرەنسی).

نزیکیەوە شوێنێك هەیە دەبێت وای بۆ بچین کە سوپا لێیەوە  لە ڕووبارەکە دەپەڕێتەوە، ئێمە ئەم ڕێگەیەمان بە سێ‌سەد و پەنجا میل ژماردووە، کە کاروانەکان بە شێوەیەکی ئاسایی دەیگرنەبەر، بەناو وڵاتێك‌دا دەپەڕنەوە کە گردۆڵکەی نزم و دارستانی دووروودرێژ دەیبڕێ. ئەم ڕووبەرە شوێنی نیشتەجێی هۆزگەلی هەمەچەشنەی ئەفغان و بلووجە.[1] لێرە بەروبوومی گەنم و جۆ بە هیچ شێوەیەك زۆر بەردەست نییە و بەتەواوی پشت بە بارانی وەرزیی دەبەستێ. فەیلەقی سوپایەك بەزۆری ئەم ڕێگەیە دەگرنەبەر بۆ گەیشتن بە ڕووباری سیند (هیندووس) و هەر بە بەلەمی سەوڵدار (بایەوان) و کەڵەك نەبێ، ناتوانین لە ڕووباری هیندووس بپەڕینەوە. خۆ ئەگەر کێشە و شەڕیش لەسەر ئەو ڕاڕەوە دروست‌ببێ، ئەوا مرۆڤ بە زەحمەتییەکی یەکجار زۆر دەیگاتێ.

ساڵی ١٧٩١ کاتێك ئەگەری ئەوە هەبوو دابڕانێك لە نێوان ئەنگلستان و ڕووسیادا ڕوویدا، پلانێك لە لایەن شازادەی ناسووەوە Prince de Nassau پێشکەش بە ئیمپراتۆر کاترینی دووەم Catherine II کرا بۆ هێرش‌بردنە سەر هیندوستان. پێم وابێ ئەم پرۆژەیە لە کاری پزیشکی ناودار سانت ژینێ St. Genie بوو. وەك بۆی دەچم (چونکە من خۆم هەرگیز پلانەکەم نەبینیوە) پێشنیازی‌کردبوو -وەك دەڵێن- هێزەیلی تایبەت بەناو پێدەشتی قۆڵگادا بۆ ئەم لەشکرکێشییە دابەزن و لە ڕووباری خەزەر (قەزوین) بپەڕنەوە، یا لە ڕێگەی بەلخ و بوخاراوە بەرەو ڕووباری هیندووس بڕۆن. هەرچی سەبارەت بە پلانە هەمەچەشنەکانی دیکە بوو، کە دانرابوون بۆ داگیرکردنی هیندوستان، ئەوەی پەڕینەوە بوو (لە زەریای خەزەر - قەزوین)، تێپەڕبوون لە ئۆکسوس، پێم وایە لە ڕووی جێبەجێ‌کردنەوە ئاسانترە. بەڵام -لەگەڵ ئەوەش‌دا- چەندین ئاستەنگ

[1] بڕوانە باشترین وەسپی ئەفغانستان لە لایەن بەڕێز ئیلفنستۆن Elphinstoneەوە.

لە سەررێگە هەن، بە جۆرێك کە پێش هەوڵدان پێوستی بە ئامادەکارییەکی دوورودرێژ هەیە.

پێدەشتی ڤۆلگا هەواکەی تا ئەوپەڕی ناتەندورستە و گەنمی پێویست بەرهەمناهێنێ بۆ بەکاربردنی دانیشتووان و تاعوون (ڕەشاو) برێكجار وێرانی‌کردووە. پەڕینەوە بە زەریای خەزەر (قەزوین)دا، لە هەر وەرزێكدا بێ، یەکجار ترسناکە. ڕەوشی خراپی بەندەرەکانی، گژوگیای زۆروزەبەند کە بەر بە کەشتیرانی دەگرن لە هەر شوێنێکی ئەم زەریا پڕ لە گێژاوەدا، ڕێگە لەوە دەبڕن کەشتی‌گەلی بارست گەورە بەکاربهێنرێ. حاڵی حازر هەموو کەشتی‌گەلی ڕووسیایی سەرلەبەر لە چواردە یا پازدە کەشتیی سلووپی (چارۆکەدار sloops) بە بیست تفەنگەوە تێپەڕناکات؛ کە -من گومانی زۆرم هەیە- هەموو کەشتییەکانیش بەسەریەکەوە لە هەموو بەندەرە هەمەچەشنەکانی کۆبنەوە، بەشی هەڵگرتنی سوپایەکی دەهەزار پیاوی بکا. ئەوە ڕاستە کە دەتوانرێ بەندەر بە ئاسانی بۆ ئەم مەبەستە دروست‌بکرێ، بەڵام کاتێك سوپا دەگاتە کەناری ئەوبەر، ئاستەنگە سەرەکییەکان بەدیاردەکەون. بە شێوەیەکی ئاسایی، من ئەوە لەم وڵاتانە کە ئەم دواییە سەرم لەو ناوچانە داوە، زانیم ڕووسەکان کەلوپەلەکانیان بۆ بەندەرێکی تەنگیز ناوی سەر کەناری ڕۆژهەڵاتی زەریای قەزوین دەنێرن و لەوێوە لە ڕووباری ئاراڵ دەپەڕنەوە. لەوێ ڕێگەکە هەشت ڕۆژەڕێیە (بە مەزەندەی ڕۆژێك بە سی‌وشەش میل) تا خیرە Khira. لەگەڵ ئەوەش‌دا نەمتوانی زانیاریی سەبارەت بە سەرچاوەکانی دەوڵەت لە نێوان تەنگیز و ئاراڵدا بەدەست‌بهێنم، بەڵام ئەوە کە دانیشتووانەکەی تەنیا بریتین لە هۆزەیلی کۆچەریی تورکمان و ئۆزبەك، دەکرێ بیرمان بۆ ئەوە بچێ کە ناوچەکە دەوڵەمەند نییە بە گەنمەشامی و سروشتییە کە تەنیا بە چاوی ئێرەیی سەیری دەستدرێژیی بێگانەکان بکەن و هیچ کۆمەگێکی هێزەکانی بەرپرسیاری

لەشکرکێشییەکە نەکەن. بە کەشتی، لە ئۆکوسەوە بۆ بەلخ تا سێ یا چوار ڕۆژەڕێ دەبێت، بەڵام پێش دەستپێکردنی سوپایەك، پێویستە کەڵەك دروستبکەن و کۆگای ئازووقە دابنێن. سەرباری ئەوە، پێویستە ئەو هۆزانەی کە لە کەناراوەکانی ئۆکسۆن دەژین و هاوسێکانی گۆلی ئارالًیش بۆ سەرکەوتنی پڕۆژەکە ملکەچبکرێن، یا دنەبدرێن لەگەڵ بیروڕای دوژمنەکانیان هەڵبکەن.

ئەم هۆزانە بە شانازییەوە پەیوەستن بە شێوازی ژیانی خۆیان و داوێنگیری ئازادیی خۆیان دەبن و هیچ شوێنێکی جێنشینیان نیە و هیچ مەیلێکیشیان نیە بۆ ئەم یا ئەو شوێن و زۆر ڕێی تێدەچێ کاتێك ببینن ناتوانن بەری ئەم هێزە فرەژمارە ترسناکە بگرن، ئاواییەکانیان بەجێبهێڵن. جا ئەگەر ئاواییان هەبێ، لەگەڵ مێگەل و شتومەکەکانیان دەکشێنەوە بۆ دوور لە ڕێگەی دوژمنانیان. زەوی چاندن لە دەوروبەری ئۆکسۆس (وەك لە وەسپی خوراساندا وتم) تەنیا سنووردارە بە هاوسێی ڕووبار و لەو دیوەوە بیابان و چۆڵەوانییە. دەشێ ئازووقە لەم ناوچانە پەیدابکرێ، بەوپێیەی کە بەکارهێنانی بەشی دانیشتوانەکەی دەکات، بەڵام ئەمە بە داوای هێزێکی ئەوروپایی نابێ. هۆزە گەورەکان کە جاران لە پێدەشتەکانی تارتار دەردەچوون بۆ داگیرکردنی مەمالیکەکانی جنووبی، کە بە شێوەیەکی گشتی زیاتر شارستانی بوون، بژێوی خۆیان لەو مێگەلەی وا دوایاندەکەوتن، دەستدەکەوت. هەر کەسێکیش بەگوێرەی خۆی بەشداریی‌دەکرد لە دابینکردنی بژێوییاندا. ئەوان ئەو ئامێرە کەتانەیان دوای خۆیان ڕانەدەکێشا، ئامرازگەلی چەکی مۆدێرن و دەچوونە ناوەڕاستی بیابان و هەروەهایش ناوچەیلی داچێندراو، ڕۆیشتنێك کە بۆ سەربازانی ئەوروپایی ئەستەم بوو. لە توورمووز Toormooz، ئەو شوێنەی کە گەشتیارەکان بە شێوەیەکی ئاسایی لە ڕووباری ئۆکسوس دەپەڕنەوە و بە پێنج

ڕۆژ دەگەنە بەلخ. کووندووز Koondooz لە دوو ڕۆژەڕێی ڕووبارەکەیە. یەکەم شار لەسەر ڕێگەکە، پایتەختی هەرێمێکی ڕەعیەتگەلی هۆزێکی کیستگار ناوە. لە کووندووزەوە بۆ بەلخ، بەشی زۆری ڕێگەکە بەناو ناوچەیەکی بیابانیدا دەڕوا.

وێستگەی پاسەوانیی پێشەوەی ئۆرێنبورغ Orenburgh ساڵی ١٧٤٠ بەهێزکرا و ئۆردوویەکی بەهێزی دەرباری ڕووسیا، لەوساوە هەمیشە ئەرکی پاراستنی ئەم بەشەی سنووری پێسپێردراوە. لەم شارەوە بۆ بوخارا -وەك دەڵێن- چل ڕۆژە (هەر ڕۆژێك بەو دوورییە دەپیورێ، کە وشتر لە هەتاوکەوتنەوە تا سەعات دووی پاشنیوەڕۆ دەیبڕێ. لەوێوە بیست ڕۆژ ناو خاکێکی داچێندراو دەبڕی تا کەناری ڕووباری جاکسارات و ئەوەی دەشمینێتەوە تا بوخارا، بەناو هەرێمێکی وێرانە و دانەچێندراودا دەڕوا.[1] ئەم ڕووبەرە هۆزی تارتارەکانی نیگوس و تاجیکی لێدەژین، کە ڕقیان لە ڕووسیایە و ڕێبازیان لە پەلاماری جەنگدا کە باشتر بۆیان دەگونجێ، بەرگرییە لە خاکەکەیان. سەرەڕای ئەوە، پێش ئەوەی ڕووسەکان خاکەکانی ئێمە لەو لایەنەوە داگیربکەن، پێویستە دەسەڵاتی هۆزەکانی تارتار تێكبشکێنن و بە بەرەوپێشوەچوونی شێنەیی و ڕێکخستنی بەرەبەرەی داگیرکارییەکانیان نەبێ، ناتوانن ئەم ئامانجەیان وەدیبهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە -بە ڕای من- تاقە ڕێگەیە کە ڕێی تێبچێ داگیرکردنی هیندوستان سەرکەوتنی بەنسیببێ. بەڵام -وێڕای ئەوە- من پێم وایە ڕووسەکان نایانەوێ ئیمپراتۆریاکەیان لەم بەشە ئاسایییە فراوانتربکەن.[2] ئەمە بەڕاستی تا ئەوپەڕی کردەنی نییە و لەوانەیە دوای

---

[1] بە شێوەیەکی ئاسایی بازرگانانی بوخارا کە هاتوچۆ بەناو ڕووسیادا دەکەن، زستانان ناو بیابان دەبڕن، بۆ ئەوەی ئاوی بەفراویان دەستبکەوێ.

[2] پێم وایە چاوی کابینەی سانت پیتەرسبورگ زیاتر بەلای ئاسیای بچووك و گرێکەوەیە، وەك لەوەی لەسەر هیندوستان بێ.

ماوەیەکی درێژ ئیمپراتۆرە کەڵەکەبووەکە هەرەس بهێنێ و سەرەوژێری بکاتەوە و ببێتە چەند بەشێك. پێویستە شاحەیدەری بوخارا وەك یەکێك لە بەهێزترین مەلیکەکانی ڕۆژهەلات لەقەڵەمبدرێ. دەڵێن دەتوانێ سوپایەك کۆبکاتەوە بۆ مەیدانی جەنگ، خاوەنی سەدهەزار ئەسپ بێ. لە ئەنجامدا ئەمە ئەوە دەچەسپێنێ کە بە هەمان ئاست بۆ ڕووسەکان بەسوودبێ، چ وەك دوژمن یا وەک هاوپەیمانیان بەهێزبێ. خواست و پەرۆشی بۆ تالانی، ڕەنگە وای لێبکا ئارەزووی هەبێ پێوەندی بە سوپای داگیرکەرەوە بکا. بەڵام هێشتاش قەناعەتم وایە کە ئیرەییبردن و ترسی میرانی دەوروبەر لەهەمبەر دەستدرێژییەکانی ڕووسیادا، بەس بن بۆ زاڵبوون بەسەر چاوچنۆکی و خواستی ئەو میرانەدا. بوخارا شارێکە دوو ڕۆژەڕێ لە ئۆکوسەوە دوورە و -وەك دەڵێن- ژمارەی دانیشتووانی هەشتا هەزار کەسە.

بێگومان پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاوی خوێنەر کە سازوتەیارکردنی سوپایەکی ژمارە زۆر، بە ئازووقە و جلوبەرگ و پێداویستی دیکەوە، تەنانەت لە وڵاتە هەرە ڕۆشنبیرەکانی ئەورووپاش، کە ئەم بەشە گرنگ و بایەخدارەی زانستی جەنگیان تێدا گەیشتووەتە ئاستێکی بەرزی کەماڵ و بێخەوشی، ئاستەنگێکی زۆری لە بەردەمدایە. دواجار با بیربکەینەوە لە هەموو ئەو ڕووداوانەی کە بەڕووبەڕووی سوپایەك دەبنەوە، تەنانەت لەسەر خاکی خۆی و هەتا لەناو کەشوهەوای نیشتمانەکەی خۆشیدا، کە نەخۆشخانەکانی تێدا چاك ڕاگیراون و فریای نەخۆشە بریندارەکان دەکەون. جا ئەگەر ژمارەی ئەو جارانە لەبەرچاوبگرین کە ئۆپیراسیۆنە هەرە کارامە گشتییەکان بەهۆی لەدەستدانی دەرفەت و چەند پلانێکی تۆکمەی داڕێژراوەوە دوادەکەون، لەبەر نەبوونی ئەم شتانە بێسوود ماونەتەوە، لە کاتێکدا سوپایەك بەبێ ئەوانە ناتوانێ لەشکرکێشی بەڕێوەبا. ئایا مەحاڵە پێشبینیی چارەنووسی ئەو هێزە نەکرێ کە لە

کۆنستانتینۆپلەوە دەردەچێ بۆ دەلهی، لە ماوەیەکی سێ هەزار میلی سەفەردا بەناو ناوچەیەکی کەمدانیشتووانی خراپ داچێندراوی دەرەوەی هەموو شتێك کە ئەوروپاییەك پێی ڕاهاتووە، بە هەمان شێوە جیاواز لە کەش‌وهەوا و زمان و ئەخلاقی دانیشتووانە کێوییەکانی سەر زۆنگاو و زەلکاوێك کە بەردەوام هالاوی ئافاتی لێ‌هەڵدەستێ، بە ڕێگەی ناو چیادا کە ڕۆیشتنی تێدا ئەستەمە و هەمیشە بەفر دایپۆشیوە، بەناو بیابانی وشك‌وبرینگ و قاقڕی بێ ئاوی پاکی خواردنەوە و بەرەوڕوو لەگەڵ هەموو گەرمایەکی تیشکی سووتێنەری خۆرەتاوی ئاسیایی![1]

ڕای گشتیی هەموو ئەوانەی وا شارەزای سروشتی ئەم وڵاتانەن، ئەوەیە کە سوپایەك ٥٠.٠٠٠ پیاو بێ، کە بۆ ئەم لەشکرکێشییە ئامادەکرابێ، بە ئاستەم دەهەزار سەربازی دەگاتە سەر کەناراوەکانی هیندووس، هەتا ئەگەر بیرمان بۆ ئەوە دەچێ کە هەموو کۆمەکێکیان لە لایەن فارس و تورکەوە بۆ دەکرێ. کاتێك سوپای فەڕەنسا لە میسر دابەزی، ژمارەی چل هەزار پیاو بوو: دوو ساڵ بە زەحمەت تێ‌پەڕیبوو، وێڕای خواردەمەنیی زۆر و شوێنی گونجاو، جگە لە لەشکرکێشیی سوریە و سەرووی میسر، هەرچەندە شەکەتییەکەش بە ڕادەیەکی ڕێژەیی سووك بوو، کەچی لە شازدە هەزار سەرباز زیاتر نەگەڕانەوە بۆ فەڕەنسا و پێویستە گەورەترین زیان بگێڕینەوە بۆ ئەم دوو لەشکرکێشییە کورتە. ئەگەر ئاستەنگەکان و مەترسییەکان گەورەن، وەك ئەوەی من ویستوومە لە حاڵەتی کۆمەگی فارس و تورکەکاندا بۆ هێزەکە دیارییانبکەم، کەوایە لە حاڵەتی کۆمەگدا چ دەبێت ئەگەر هەڵس‌وکەوتی ئەم گەلانە دوژمنکارانە بێ؟ بەڵام

---

[1] لە چاپە فەڕەنسییەکەدا نووسرابوو "گەرمای سووتێنەری خۆرەتاوی عەرەبی". بەڵام لە چاپە ئینگلیزییەکەدا بەوشێوەیە نووسراوە، کە ئێمە لەڕووی چاپە ئینگلیزییەکە ڕاستمانکردووەتەوە. (وەرگێڕ)

هەموو شتێك بۆ ئەوەمان دەبا باوەڕبکەین تەنیا دوژمنکاری لەناویاندا ببینین. بەشی زۆرترینی ئاسیای بچووك و ئەرمینیا گوێڕایەڵی چەند پاشای بەهێزن، تەنیا بە ڕووکەش سەر بە بابیعالین، چەندین جار وابووە بڕیارەکان بە بێزاری و چاوێکی سووکەوە وەربگرن. لەمەدا لە سەرۆکانی فارس دەچن کە بەرژوەندی جیاوازیان هەیە و بەغیلن و یەکیان دوژمنی ئەوی دیکەیانە، نابینین بەشێوەیەکی کۆمەڵی ڕەفتاربکەن، تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە پەیوەندیی بە جەنگی دژ بە کافرانەوە هەبێ، ڕێی تێبچێ پێی دەوڵەمەندبن. کەوایە ئایا گونجاوە هەر هێزێکی مەسیحی تەنیا لە ڕێگەی فیت و دەهۆی فریودانی ئەم پیاوانەوە، کە -بە دەگمەن نەبێ- گوێنادەن بە ترسی خۆیان و ناکۆکییە تایبەتەکانیان و ڕقی گشتییان دەرهەق بە ئەوروپاییەکان بۆ شەکەتکردنی دەوڵەتەکانیان لەبیردەبەنەوە، خۆیان هەژاربکەن لەپێناوی گەیشتن بە پرسێکی هاوبەشدا لەگەڵ نەتەوەیەك، کە دۆگمەکانیان فێریاندەکا ڕقیان لێیبێتەوە و ئەزموونیان لە ترسی ناو پرۆژەیەك کە ئەگەر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لەوانەیە بەکۆیلەکردنیان کۆتایی پێبێنێ؟

من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە دەڵێ: دەشێ هێز و پێداگریی سیاسیمان لە ئێستە بەدواوە ئامرازی بۆ کاریگەرییەکی دیاریکراو بۆ سەر ئیمپراتۆریای فارسی ببێ، لە حاڵێکدا ئەگەر دەرکەوت دەرباری تاران ئامادەیە بداتەپاڵ دوژمنەکانمان، بۆ ئێمە ئاساندەبێت لەناو ئەم ئیمپراتۆریایەدا دنەی پشێویی ناو گەلێك بکەین، تا وای لێبکەین نەتوانێ کۆمەگییەکی بەهێزیان پێبگا. لە لایەکیترەوە، دوژمنایەتیی ئەفغان و فارسەکان و بایەخدانیان بە ئاسایش و سەربەخۆیی خۆیان، ڕێوشوێنێک دەگرنەبەر کە ڕێگە لەوە بگرن کە هێزی بێگانە بچێتە ناو خاکەکەیان. لە ئاتتوك پانیی ڕووباری هیندووس دووسەد و شەست هەنگاوە: خێراییەکەی هێندە تیژڕۆیە، بە بەلەم و کەڵەک نەبێ ناتوانین

لێی بپەڕینەوە و هەموو کەسێکی بەئەزموون لە هونەری جەنگدا، بەو ئەنجامە دەگا کە زیانێکی بێ‌ئەژمار بەرەورووی سوپایەك دەبێتەوە بیەوێ بەرانبەر بە دوژمنێکی کارامە و ئازا بچێتەپێشێ. لە ئاتتووکەوە بۆ دیلهی پێنج‌سەد و حەفتا میلە: لەم پانتاییە دوورییەدا چوار ڕووبار هەیە، بەقەد قوولّیان تیژڕۆن[1] و بێ‌گومان ئێمەش لە لای خۆمانەوە، هیچ شتێك پشت‌گوێ ناخەین بۆ وەستاندنی پێشڕەویی دوژمن.

ئەوانەی پێیان وایە بۆناپارت کاتێك پڕۆژەیەکی ئاوهای داناوە، بانگەشەدەکەن ئەگەر لە کاتێك‌دا ئەسکەندەر و تەیمووری لەنگ و مەحموود و نادرشا یەك بەدوای یەك توانیبێتیان هیندوستان داگیربکەن، ئەوا ئەوانە هیچ هۆیەك نادۆزنەوە دژی سەرکەوتنی ئەوەی فەڕەنسییەکان یا ئیمپڕاتۆریای ڕووس بێ. بەڵام لە کلاوڕۆژنەی لێکۆڵینەوەیەکی سەرتاسەرییەوە بۆ مێژووی جەنگەکانی ڕۆم دژ بە فارس و مێژووی جەنگەکانی ڕووس، هەر لە هێرشی یەکەمی بوترۆسی گەورەوە تا ئەمڕۆ، دەتوانین حوکمێکی زۆر ڕاستتر لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە بدەین. ئەو سیستەمەی کە ڕۆمانەکان بەردەوام بەجێیان‌دەهێنا، لەوانەیە زۆر باشتر بە قازانجی بەرفراوانکردنی داگیرکارییەکانیان و هەروەك بەرگرییەکانیشیان بووبێ. ئەوان هەر وڵاتێکیان داگیربکردایە، کۆڵۆنییەکیان لە سەربازانی خۆیان لێ‌دادەنا. ئەوانە بە شێوەیەکی هەست‌پێ‌نەکراو ئەخلاق (ئاکار) و داب‌ونەریتی داگیرکەرانیان لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکە جێ‌بەجێ‌دەکرد و تێکەڵ‌دەبوون و دەبوونە هاوپەیمان. بەم شێوەیە بڵاوکردنەوەی شکۆی ناوی ڕۆمانی، لە سنوورێکی بەرفراوان‌دا، دەبووە جێگەی بایەخیان. وێڕای ئەم خاسیەتانە و هاوڕێیەتی و هەبوونی سنووری

---

[1] بەردەبازی سوتتیتلجە Suttetlje لە بەردەبازی هەر ڕووبارێکی دیکەی پەنجاب سەختترە.

هاوسێ، که هێزە ڕاسپێردراوەکان بۆ داگیرکردنی خاکی دوژمن دەیانتوانی به ئاسانی دەستیان لێیەوە بە ئازووقه و سەربازگیریی پێویست ڕابگا، بەڵام ئێمه وای دەبینین -لەگەڵ ئەوەش‌دا- ڕۆمانەکان هەرگیز نەیانتوانی کارێکی درێژخایەن بکەنە سەر ئیمپراتۆریی فارس. سوپاکانی ئەنتوان و ژولیان له هێرشێکی سەخت‌دا بوون بۆ سەر سوپای ئەرتابان و ساپوور Sapor، ڕێك وەك ئەوەی فەڕەنسی یا ڕووسەکان بۆ سەر فارسەکانی ئەمڕۆ. بەرژەوەندیان لەوەدا بوو خۆیان لە جەنگ بەدووربگرن، کاتێك بەرەوڕووی دوژمنانیان دەبوونەوە، برسێتی و شەکەتی هەمیشە و هەمیشەش هەر کۆسپی کۆنترۆڵنەکراون بۆ زاڵبوون بەسەریان‌دا.[1] ڕووسەکان له ماوەی جەنگێك‌دا که نزیکەی یەك‌سەدە درێژەی کیشا، نەیانتوانی سنووریان تا کەنارەکانی ئاراکس (ئاراس) فراوان‌بکەن. جا ئەگەر ئەم سیستەمە بەرگرییە بەشوێن سەرکەوتنی ئاوا گەورەدا چووبێ دژ بە جەنەڕاڵە زۆرتر کارامەکانی ڕۆمان و ڕووس لە مەودایەکی ئاوا کەمی سنوورەکانیان‌دا، ئایا ناتوانن له دووریی هەزاران هەزار میل لە نیشتمانی خۆیانەوە، بەر له پێشڕەویی فەڕەنسییەکان بگرن؟

ئەو سەردەمە کە ئەسکەندەری مەکدۆنی وڵاتەکەی داگیردەکرد، فارسەکان نەژادێکی سووك و چرووك و لاواز بوون، بەپێچەوانەی پێشینه سەربازییەکانی پارسەکان یا مەملەکەتدارانی ئێستەی مەملەکەتی ئێران، که بێ‌گومان گەلێکی ئازا و جەنگاوەرن. سوپاکەی داریووش تەنیا ئاپۆرایەکی

---

[1] ئەم سیستەمە بەرگرییە، بێ‌گومان باشترین بوو و لەگەڵ ڕەوشی ئیمپراتۆریای فارسی دەگونجا. فەیلەقی پیادەڕۆی گەورە و دیسپلین‌خراپ، دوور له پشتگیریی هێزی وڵات، دەشێ بەتوندی هاریکاربێ تا وایان لێ‌بکا سەربەخۆیی خۆیان لەدەست‌بدەن. بەڵگەی ڕوون لەسەر ئەمە، لە مێژووی جەنگی دوایی مارتا و شکستی بەلخ و چالووس‌دا دەبینین.

بێ‌سەروبەر و بێ‌دیسپلین بوو، هێشتا یۆنانییەکان دەرنەکەوتبوون کە یەکسەر ڕایانکرد و هەر بە شکستی سوپا، دانیشتووانی هەرێمەکان نیریان لە ملیان داماڵی. دوای هەموو شتێک، ئەسکەندەر هیندوستانی داگیرنەکرد، کەنارەکانی ڕووباری هیفازیز Hyphasis سنووری پێشڕویی بوو. داگیرکاریی لەشکرکێشییەکە نزیکەی ساڵێکی خایاند و ئاستەنگەیلی زۆری لە مل پێ‌کەچکردنی پارس و هیندییەکاندا بینی و داگیرکاریی زۆر لەوە زیاتری لەسەر کەوت، وەك لە هەموو جەنگەکانی بەرانبەر بە داریووش‌دا کردی. سوپای یۆنان بە هیچ شێوەیەك سەرقاڵی ڕاکێشانی تۆپخانەی قورس نەبوو، سوپا زۆر لە سوپا مودێرنەکان زیاتر بەئاسانی دەسووڕایەوە. بەڵام پێویستە ئێمە ئەوە لەبەرچاوبگرین کە ئەو ناوچانەی وا لە سەردەمی ئەسکەندەر، تەیمووریيەکانەوە و هەتا سەردەمی درەنگی نادرشاش، دەوڵەمەند و پڕدانیشتووان و گەشەسەندوو بوون، وەك ئەمڕۆ چۆڵەوانێکی بەرین و خاشاك نەبوون. لەو هەرێمانەی لەشکرکێشییەکانی تەیمووری لەنگ و نادرشا کە وەبیریان‌بێنینەوە (ئێمە ناتوانین جگە لە پشێوی، هیچ ناوێکی‌تر لە لەشکرکێشییەکانیان بنێین، چونکە نە ئەمان و نە ئەوی‌تر لە باکووری دەروازەکانی دیلهی تێپەڕنەبوون)، نابێ لەبیری‌بکەین کە ئەو سەربازانەی وا لە ڕۆژهەڵات لەدایك‌بووبوون، لەگەڵ کەش‌وهەواکەی سازابوون و لێ‌ڕاهاتبوون لە دەرەوە بخەون. ڕۆیشتنیان هیچ جێگەی بەراورد نابێ لەگەڵ ئەوەی کە سوپایەکی ئەورووپایی بیکا. زۆر کەم تووشی ئۆپۆزسیۆن دەبوونەوە یا هەر هیچ، توانیویانە بەبێ ئەوەی نیگەران‌بن، ئیندووس و کەنارەکانی پەنجاب ببڕن و -هەرچۆنێك بێ- هەموو هێزەکانیان لە سوارەی سووك پێك‌هاتبوو، تەیموور دە مانگی پێویست‌بوو تا لە دیلهیەییەوە بگاتە سەمەرقەند و نادر هێشتا زۆرتر، چونکە دەبوو بە ئەسفەهان‌دا بڕوا.

بەڕاستی تاقە ڕێگەیەك هەیە، دەشێ نفووزیکی بەهێز بە ڕووسەکان ببەخشێ لە شانشینیی ئێران، ئەگەر هەر بەتەواویش نەیخاتە بندەستی خۆی. دەمەوێ باسی گفتوگۆ ناوخۆییەکان بکەم (ئەگەر بە ئەزموون و ڕێتێچوون حوکمبدەین)، کە دەبێت لەگەڵ مەرگی پاشانشینیی[1] ئێستە بێتە ئاراوە.

بە پشتگیریی یەکێك لە داواکارە نەیارەکانی عەرش و لێوەشاوەییی زۆر و دیسپلینی لەشکرەیلی ڕووسی دەتوانن، لە ساتەوەختێکی پشێویی لەوشێوەیەدا، تاجی عەرش بخەنە سەر یەکێك لە لایەنگرەکانیان. بەڵام ئەمە هێشتا کۆششی زۆر و ساڵانێکی پێویستن (تەنانەت ئەگەر ئێمە هیچ ڕێوشوێنێکی خۆپارێزیش نەگرینەبەر)، پێش ئەوەی وڵاتەکە بە شێوەیەکی باش ڕێكبخرێتەوە، بەر لەوەی ئاشتی باڵ بەسەر ئەوێدا بکێشێ، بۆ ئەوەی ئیمپراتۆری ڕووسیا لە ڕەوشێكدا بێ دەست بە پرۆژەیەکی ترسناکی وەك پرۆژەی داگیرکردنی هیندوستان بکا. هەڵبەت ئێمە ناتوانین ڕەتیبکەینەوە باوەڕبکەین کە ئێرانییەکان بە پەرۆشەوە بەرەو پیشنیازێکی لەم شێوەیە دەچن، تینووبوون بۆ تاڵانی، نموونەی نادر دەچێتە پاڵ ئەو بیرۆکەیەی کە سەبارەت بە دەوڵەمەندی و لاوازیی سەرزەمینەکانی ئێمە لە ڕۆژهەڵات هەیانە، بەیەکەوە

---

[1] لەنێوان چل لە کوڕانی پادشادا، یەکێکیان نەبوو چاوی لە عەرش بێ و نزیکەی نیوەیان حاکم بوون لە شارەکان یا ئاوابییەکان. سیستەمێك کە بە ڕووکەش ئاسایشی باوك زیاد دەکا، تەنیا دواڕۆژێکی ترسناك و خوێناوی بۆ ڕەعیەتەکانی دەستبەردەکا، بەو شێوەیە کە هەر یەکە لەو شازادانە دەستبەچەکەوە هۆی خۆی دەبێ بۆ پشتگیریی بانگەشەبۆکەرانی خۆی و وەك چۆن جێگەی گومان نییە ئەوەی کە دەچێتە سەر تەخت، لەپێناوی سەلامەتیی خۆیدا قوربانی بە سیونۆ برای خۆی بدا. ئەگەر ئەمە خواست نەبێ، زۆر کەس لەوانە ناچاردەبێ شوێنی براکانی خۆی بگرێتەوە.

هانیاندەدا پەیمانبدەن. بۆیە لەم لایەنەوە زۆرمان هەیە لێی بترسین: بە ڕای من، ئەوە لە بەرژەوەندی ئێمەدایە، کە ئەوەندەی لەتوانامان‌دا هەیە، نەهێڵین تاکتیکی سەربازیی ئەوروپایی بخزێتە ناو ئەم ئیمپراتۆریایە. سوپایەکی ئێرانی، دیسپلینکراو و ڕاهێنراو لە لایەن ئەفسەرانی ئەوروپاییەوە، دەشێ ئەوە بۆ ئێمە دوژمنی هەرە دڕندە بێ، چونکە دەبێ ئێمە لە سپێدەشتەکانی هیندوستان بەرەوڕوویان‌ببینەوە و وێڕای ئەوەی کە دەشێ دەستبەسەرداگرتنی ئەو وڵاتە (هیندوستان) تەنیا بەرژەوەندییەکی تەواو خاکییانەی بێ بۆ هێزێکی گەورە، کە پێوەندی و گەیاندنی زەرییایی نەبێ، لەوانەیە ئامانجی ڕووسیا بێ‌بەریکردنمان بێ لەوەی کە پێی وایە هیندوستان یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی هێزی ئێمە.

# ڕێگەکان

## ڕێگەی ماردین بۆ ئیستەنبووڵ بە سیواس و تۆقات
## لە لایەن نووسەر لە زستانی ساڵی ١٨١٠

دیاربەکر Diarbekr، سەعات هەژدە. شاری کۆنە ئامەدە، ژمارەی دانیشتووانی ئەم شارە نزیکەی سیهەزار کەسە و کەوتووەتە سەر لقێکی دیجلە، لە لایەن پادشایەکی سێ تەوغەوە* حوکمدەکرێ، کە دەسەڵاتی ئەمڕۆ لە شوورای شارەکە زیاتر تێپەڕناکا، گەرچی سنووری جوگرافیایی پاشالیکەکە زۆر بەرفراوانە. ئەو ناوچەیەی کە کەوتووەتە نێوان ئەم شارە و مێردین، لەبن دەستی زۆرێك لە سەرۆکە کوردەکانە، ئەوە وای کردووە سەفەرکردن تێیدا ترسناك بێ.

ئەرغەنە Arguna، سەعات دوازدە. شارێکە کەوتووەتە دەروازی چیای تۆرۆس، لە ڕێگەی دیمەنەکەیەوە زۆر لە شاری مێرسین دەچێ. لە دیاربەکرەوە بۆ ئەم شوێنە وڵاتێکی بەردینە و کوردانی ئامۆرگەی تێدا دەژین.

مادنMaden، سەعات چوار. شارێکی گەشەسەندووە لە چیای تۆرۆس، بە کانی مس بەناوبانگە.

خارپووتKarpout، سەعات چواردە. شارپۆتی کۆن، شارێکە کەوتووەتە شیوی سۆفین، سەر بە پاشای مادنە یا موفەتیشی جێنشینی کانەکان لە گێبێن-مادەن Gebbyn-Maaden نیشتەجێیە، کانەکانی زیو لەسەر ڕووباری فوڕاتن.

---

* À trois queues

تیز ئۆغلوو Teiz-Oghlou، سەعات دە. شارێکی بچووکە، لەوێ لە فوڕات دەپەڕینەوە. دانیشتووانەکەی کوردن و خاوەن خەسڵەتێکی دڕندانە و ملکەچ نین و سەربەخۆن.

مەلاتیە Malatie، سەعات هەشت. کۆنە مەلاتیە، بۆ ماوەیەك پایتەختی ئەرمینیای بچووك بووە، بەڵام ئێستە بووەتە کەلاوە، کەوتووەتە ناو پێدەشتێکی جوانی نێوان فوڕات و مێلاز Mêlas و بەناوبانگە بەو جەنگەی کە لە نێوان جوستیان و خوسرەو نەوشیرواندا ساڵی ٥٢٧ ڕووی دا.

حەسەن-سەدریك Hassan-Sedrik. سەعات شەش. گوندێکی پەڕپووتە لە دەروازەی چیاکانی ئاغا، خەڵکێکی تێدا دەژی، خەسڵەتیان زۆر بەدناوە و نە موسوڵمانن و نە مەسیحی. ئێمە لێرە لە ڕووباری میلاز لە چوار یا پێنج میلی مەلاتیە پەڕینەوە.

حەسەن چەڵەبی Hassan-Tcheleby، سەعات دوازدە. گوندێکە لەوەی پێشوو دەچێ، لەناو چیاکان.

دوورغیل-تاش Dorguil - Tach، سەعات دوازدە. گوندێکی پەڕپووتە و ڕێگەکە بەفر بوو تا ئەژنۆ و لەوەتی لە ئەرغەنەوە دەرچووین، سەرماکە زۆر سارد بووە.

سیواس Sivas، سەعات نۆ. ئەم شارە جاران پێیانوتووە سابیرا[1] Çabia و ناوەکەی لە سێباست لەسەر شەرەفی ئۆگست وەرگرتووە. ئەم شارە بەناوبانگە

---

[1] *Ad ipsum autem montis Paryadris latus Cabira sita sunt, ab ista versus meridiem stadiis circiter centum et quinquaginta distantia. In Cabiris regia Mithridatit fait eitracta, et mola aquaria, et vivaria, et in vicinia venatiooeS) ac metalla. Ibi etiam locul qui nomen Novusj edita et praerupta petra minus quiun ducentis stadiis a Cabins: habet in vertice fontem qui multum aquae sursum ejicit; in radice luvium, et convallem*

بەو سەرکەوتنەی کە لەو دەوروبەرە لۆکیلووس بەسەر میتراندا سەرکەوت و ئەو گەمارۆ سەختەی کە دژی ڕۆمانەکان وەستایەوە. شارەکە دەکەوێتە بەشی باکووری پێدەشتێك، بە ئاوی ڕووباری قیزل-ئیمەق[1] ئاودەدرێ، شارێکی پیس‌وپۆخلە و خراپ دروست‌کراوە. سەعاتێکی گشتی دەبینرێ (کە ئەوە پەڕجوویەکە لەو ناوچەیەی جیهان)، بارەگای پادشایە، دانیشتووانەکەی ڕەق‌وتەقن و بەڕەوشت نین، مالآت بەخێودەکەن. قەلاکە وێرانەیە و نزیکی شارەکە دێری بەناوبانگی ئەرمەنەکانی لێیە.

---

*profundam; altitude colli ejus peta immensa est; itaque expugnari nequit: mirabiliter muris dncta est, nisi qaà eos Romani dejecemnt: quicquid in orbetn circa petram ean jceet, id silvosum omae, tnonosum, et aqua expers est: ut intra centum et vigjnti stadia nan liceat castm ponere. Ibi Mitbidates predosissima quaeque babebat deposita, quae nunc in Capitolio jacent, a Pompeio dedicata. Hanc ergo regionem omnem possidet Pythodoris, contiguam barbaricae quam obtinuit, et Zelitin prseterea, ac Magnopolitidem. Cum autem Cabira Pompeius in urbis formam adomasset, ac Diopolim notninasset: addidit ipsa open aliquid, et Augastam nunoo avit, aaque boo regies ttitac. Habet etiam templuc Mensk, qaod Fhari acis dicitur: nempe pagum oppido simiiem Ameriam,quae multos continet hierodulos, etque agrum sacrum, cujus fructus pontifex percipit. Usque adeo autem id fanum reges sunt venerati,iit jusjurandum, quod regiua dicitur, pronunciarent, regis fortunam et mensem Pharnacii,* -Strabo, vol II. page 804.

(1) قزل ئیرمەق Kizil Irmak (بە تورکی واتە ڕووباری سوور و لە یۆنانی کۆن بە ڕووباری هالیز Halys ناسراوە)، لە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆلەوە هەلدەقوولێ و دەرژێتە ناو زەریای سوور و درێژییەکەی ١١٥٠ کیلۆمەترە و درێژترین ڕووبارە لە تورکیا، کەشتیرانی تێدا ناکرێ بەلام سەرچاوەیەکی گرینگی وزەی هیدرۆ ئیلکترۆنییە (وەرگێڕ).

تۆقات Tocât، سەعات شەش. ناوچەیەکی چیایی داپۆشراوە بە سنۆبەر و بەی. ئەم شارە شاری کۆنی بێرسیایە، کەوتووەتە ناو دۆڵێکی جوان، ڕووباری جیزیل-ئیرمەق Djisil - Ermak، ئیرسی Iris کۆن لە ناوەڕاستەکەی هەڵدەقووڵێ. گەورەترین شار و گەورەترین شاری بازرگانیی ئاسیای بچووکە، وەك دەڵێن دانیشتووانەکەی شەست هەزار کەسن، تاپۆی شازادەی بنەماڵەی عوسمانییەکانە و لە لایەن سەرۆکێکی جەنگاوەرەوە بەڕێوەدەبردرێ.

تورجال Turcal، سەعات هەشت. کۆنە سیباستۆپۆل Sébastopolis، شارێکە کەوتووەتە نزیکی گاشەبەردێکی زل و زەلام، بە قەڵایەکی قایم و مکوم دەورەدراوە.

ئەماسییە Amasie، سەعات دە. وڵاتێکی چیایی و درەختدارە، وڵاتی ستراپۆن و یەکێك لە شارە سەرەکییەکانی پۆنتە، دەکەوێتە سەر هەردوو کەناری ڕووباری ئیریز Iris (کە ئاوەکەی بەهۆی چەرخەیلی گەورە بەرزدەکاتەوە) و لەناو شیوێکی تەسکی نێوان چیایەلی بەرز و بەردین، کە قەڵایەکی کۆن لەسەر یەکێکیان هەیە. ئەم گاشەبەردە بە پەیکەری نائاسایی بەناوبانگن، کە گومانی ئەوە دەکرێ ئەوانە گلکۆی دوو پادشای پۆنت بن. ئەم شارە کەوتووەتە شوێنێکی دڵگیر. دانیشتووانەکەی -وەك دەڵێن- دەگاتە سی‌وپێنج هەزار کەس. ئەویش تاپۆی سوڵتانەیەکە کە لە لایەن سەرۆکێکی جەنگاوەرەوە حوکمڕانی دەکرێ. بڕێکی گەورەی ئاوریشمی نایاب لە دەوروبەری شارەکە لە دەوروبەری شارەکە بەرهەمدێنن.

مارساوان Marsawân، سەعات نۆ. فاسەمۆنی کۆن، شاری پۆنت بووە. ئەمڕۆ هێشتا شارێکە بە پێدەشتێکی چێندراو دەورەدراوە. گوندێکی دەوروبەری بەناوی حاجی-کودژین لێیە، کانێکی هەیە، کەمێك زیوی لێ بەرهەمدەهێنرێ.

ئۆسمانجیك Osmandjyk، سەعات چواردە. ناوچەیەکی بەردین، دڵگیر و پڕە لە دارودرەخت. ڕێگەکەی بەناو چەندین لێژایی و ناو دۆڵێکی دڵگیردا دەڕوا. وای دادەنێین ئۆسمانجیك شاری پیمۆلی کۆن بێ، شارێك کە کەوتووەتە کەناری قیزل-ئیرمەقەوە، لەگەڵ قەڵایەکی کۆنی سەر گاشەبەردێگی گۆشەگیر و لەسەر ڕووبارەکە پردیکی جوان هەیە، بایەزید دروستیکردووە.

حاجی-هەمگا Hadjy-Hemgâ، سەعات نۆ لەم ماوەیەدا بەناو ڕێگەیەکی خۆتێهەڵقورتێنانەی بەرانبەری چیایەکی بەردین‌دا ڕەت‌دەبین، سەدری ئەعزەمی کۆچکردوو کردوویەتیەوە. حاجی-هەمگا، جاران پێیان‌وتووە ئاندراپا و شارێکی بچووکە، قەڵایەکی چوارگۆشە یا پالانکە (palanka خێوەتی سەربازیی عوسمانیی لەسەر سنوور) بەسەر چیای هالیزەوە لێیە.

تۆسیا Tos.ia، سەعات نۆ. کۆنە داسیا Dacia، شارێکە کەوتووەتە شیوێك، بڕێکی زۆر برنج بەرهەم‌دەهێنێ، خەڵکەی وای لێ‌هاتووە دەوڵەمەند بوون و هەموویان لە کشتوکاڵ‌دا کاردەکەن.

جۆدی-حیسار Codj-Hissar، سەعات هەشت. ئاواییەکی بچووکە.

کارادژودران Kardjourân، سەعات هەشت. شارێکی بچووکە لەناو وڵاتێکی کراوەدا کە بڕێکی زۆر گەنم و جۆ بەرهەم‌دەهێنێ.

حەماملی Hamamly، سەعات سێزدە. شارێکی کەلاوەیە لەسەر کەناری پارستینۆس Parthenius. بەناو شیوێکی بەردینی قەدپاڵەکانی ئۆلمپی‌دا ڕەت‌بووم.

گەرەدە Geredeh، سەعات دە. شارێکە خانووەکانی لە دار دروست‌کراون.

بۆلی Boly، سەعات سێزدە. کۆنە هادرینۆپۆل، شارێکە پێشتر وەسپیم‌کردووە. سەعاتێکی گشتی وەك ئەوەی سیواسی لێیە.

دوستیس Dustche، ، سەعات یازدە. ناو داراستانێکی بەرفراوان. کۆمەڵێك خان و کێڵگەی چێندراون.

هەندیجیك Hendick، سەعات دوازدە، شارێکە لەناو دارستان. دانیشتووانەکەی بەتەواوی سەربەخۆن و هیچ گوێرایەڵی بابیعالی نین.

سوبنجە Subaudjah، سەعات دوازدە، شارێکی بچووکە لەناو دارستان و سەر کەنارەکانی گۆلێکی قەشەنگ. لەنێوان هەندێك سەبانجەدا بەسەر پردێکی دارین‌دا تێپەڕبووین، کە زۆربەی جار ئاوی بەرزبووە و تەکانی ڕەوتی ئاوەکە هەڵیدەگرن.

ڕێگەی سەبانجی Sabandjy بۆ ئیستەنبووڵ Constantinople لەپێش‌دا وەسپ‌کراوە.

دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لە ئیستەنبووڵ ماینەوە، بەناو ئاسیای بچووك‌دا چوومە سەردانی شارەکانی ماگنیزی Magnesie و پیرگام Pergame و سمیرنا Smyrne، هتد. بەڵام ئەم شارانە چەندین جار وەسپیان‌کراوە، بە جۆرێك پێویست‌ناکا جارێکی دیکە قسەیان لەسەر بکەینەوە.

## لیستی ئەو گەشتانەی کە جۆن مەکدۆناڵد کینییر بەناو وڵاتی ئێران و ئاسیای بچووك کردوونی.

١. لە بووشەهر بۆ تەبریز و ئاراس لەڕێگەی ئەسفەهانەوە.
٢. لە ئاراس بۆ مەراغە.
٣. لە مەراغە بۆ سنە.
٤. سنە بۆ هەمەدان، کرماشان و بەغدا.
٥. بووشەهر بۆ ئەندیان، دوراك (وڵاتی شۆب).
٦. دۆرك بۆ بەسرە.
٧. بەسرە لەڕێگەی سامیۆڤات، بەناو فوڕات، مەشهەد، عەلی کونە، حیللە بۆ بەغدا.
٨. بەغدا، شۆربوونەوە بەناو دیجلە بۆ بەسرە.
٩. بەسەر ڕووباری کاروون‌دا، بۆ شوستەر و لە شووستەرەوە بۆ دیزفووڵ.
١٠. شووستەر، لە ڕامەرەز، بیبەهان و کولاهـ سفید، بۆ شیراز.
١١. شیراز، لە ڕێگەی ئیمامزادە، بۆ ئیسفەهان.
١٢. بەغدا بۆ عانە بە فوڕات.
١٣. بەغدا، لە ڕێگەی مووسڵ، دیاربەکر، ئەماسییە بۆ کۆنستانتینۆبڵ.
١٤. ئیستەنبووڵ لەڕێگەی ماگنیزیا بۆ سیمێرنا، لە سیمێرناوە بە ساپان و پورتوگال بۆ ئینگلستان.

١٥. ئینگلستان لەڕێگەی سویدەوە، بۆ پۆڵۆنیا، ئەڵمانیا و هەنگاریا بۆ کۆنستانتینۆبڵ.
١٦. ئیستەنبووڵ، لە ڕێگەی ئەسکی شەهر، ئەنگۆرە، قەیسەرییە، تۆرۆس و ئەنتاکیاوە بۆ لازقییە.
١٧. لازقیە بەناو قوبرس، کرامان، ئیکۆنیوم، ئیکۆنیوم قەرە حەسیر و بوورسادا بۆ کۆنستانتینۆبڵ.
١٨. ئیستەنبووڵ لە ڕێگەی نیکۆمیدیا، تریپۆلی، بۆلی، کۆنستانتینۆپڵ، سامسوون، تەرابزۆن، ئەزەڕۆم، بتلیس و سێرت بۆ مووسڵ.
١٩. مووسڵ بەناو دیجلەدا بۆ بەغدا و لە بەغداوە بۆ بەسرە-لە بەسرەوە بۆ بۆمبای.

## ئەم سەفەرنامەیە لە کوێوە بۆ کوێ؟

ولیەم هیوود لەم گەشتەیدا، کە دیارە زیاتر بە مەبەستی زانیاریی کۆکردنەوە و شارەزابوون لە ڕێگەوبانی ناوچەکە، دابو نەریت و شێوازی ژیانی گەلانی ڕۆژهەڵات کردوویە، بە هیچ شێوەیەك باسی سەرەتای شوێنی گەشتەکە دەستنیشان ناکات و تەنیا چەند زانیارییەکی گشتیی لەبارەی ڕەوشی مالابار[1] و دانیشتوانەکەی، ئەو کاتەی بوون بە تەبەعەی حوکوومەتی ئینگلیز، بەدەستەوە دەدات. هیوود، کە لە کۆتایی ئەیلوولی ساڵی ١٨١٦ لە کانانۆر[2]-ەوە بەرەو بەسرە بەڕێ دەکەوێ، لەم ماوەیەدا تا دەگاتە ئەو شارە هیچ وردەکارییەکی ئەوتۆ باس ناکات، تەنیا ئەوەندە نەبێ زۆر بە کورتی، تاوەکوو بەسرە، باسی هەندێ لە سەرەڕۆییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، وەك ئەوەی ئامانجی گەشتەکەی تەنیا عیراقی عەرەبی و کوردستانی عوسمانی بوو بێت. نشینگەی (موقیمیە) ئینگلیزیش لە بەسرە، وەکوو ڕێبەر، عەلی ئاغای پەیامنێری ئاسایی خۆی بەگەڵ هیوود دەدات، عەلی ئاغا، تورکێکی تەمەن چل و پێنج ساڵ بووە، شێوە و سیماکەی بەلای کەمییەوە، دە ساڵ زیاتر لە تەمەنی خۆی نیشان دەدا. هیوود لە ڕێگەدا، کە چەند ڕۆژێك لە لای شێخی مەنتەفیکەکان دەمێنێتەوە و تێبینی

---

(١) مالابار: ناوچەیەکە کەوتۆتە کەناری باشووری ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی هیندستان، کەناری مالاباریشی پێ دەڵێن (وەرگێڕ).

(٢) کانانۆر یا کاننوور: شارێکە لە ویلایەتی کیرلای هیندستان و کەوتۆتە کەناری باشووری نیمچە دورگەی هیندستان (وەرگێڕ).

ورد لەسەر دابو نەریت و کولتووری ئەم هۆزەش دەنووسێ، دواتر لە سەرەتای شوباتی ساڵی ١٨١٧ دەگاتە بەغدا، نزیکەی بیست ڕۆژێك لەم شارەکەدا دەمینێتەوە، لە سەفەرنامەکەیدا، باسی ئاسایشی شاری بەغدای کردووە و ژمارەی دانیشتوانەکەیشی بە دووسەد هەزار کەس دەخەملێنێ. ئەو کاتەی هیوود دەگاتە بەغدا، سەروبەندی بەدەستەڵات گەیشتنی داود پاشا بووە و بۆتە شایەتحاڵی ڕۆژی ٢٤ ی شوباتی ١٨١٧، کە داود پاشا بەسەرکەوتوویی دەگاتە ناو شار و دواتر سەری سەعید پاشا و چەند لایەنگرێکی دەبڕێ و لەگەڵ ئەو کاروانەی هیوود هاوسەفەریان بووە، بە دیاری بۆ بابیعالی دەنێرێ. هیوود لە ٢٨ ی شوبات لەگەڵ نێردراوێك، لەلایەن والیی نوێی بەغدا، ڕادەسپێردرێ تا سەری براوی سەعید پاشا و چەند دارودەستەیەکی نزیکی ئەو ببات بۆ ئیستەنبوول. لە بەغداوە و بەناو جەرگەی کوردستاندا لەگەڵ ئەم کاروانە سەفەر دەکات. وەرگێڕانە کوردییەکەی ئێمەش لێرەوە دەست پێ دەکات و تا کۆتایی سەفەرنامەکەی گرتۆتەوە. هیوود لە بەغداوە تاوەکوو کفری ڕێگەی ئاسایی گرتۆتەبەر، لەوێوەش بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات و دەچێتە دەڤەرێک، کە ئەو بە دەڤەرێکی نەناسراوی دادەنێ. لەوە زیاتر دەڵێ: ئەم دەڤەرە تاوەکوو ئێستە (واتە ساڵی ١٨١٧) لەسەر نەخشەکان بە سپێتیی ماوەتەوە. پاشان لە ڕێگەی ئیبراهیم-خانچی و سەگرمەوە دەچێتە شاری سلێمانی پایتەختی میرنشینی بابان، لەوێشەوە بە ڕێگەی کۆیەدا، دەچێتە هەولێر، کە ئەو ناوی یەکەمیان بە کۆیسنجاق و دووەمیشیان بە ئەربیل دێنێ. پاشان لە ڕێگەی هەولێرەوە دەچێتە مووسڵ و پاشان یەك لە دوای یەك دەچێتە ماردین، دیاربەکر، ئەماسییە و سکۆتاری، دوامەنزلیش لە ئیستەنبووڵ گەشتەکەی بە کۆتا دێت. وێرای ئەوەی کە نووسەر سەفەرەکەی کورت بووە، بەڵام زۆر بە وردی باسی ئەو دەڤەر و ناوچانە دەکات کە کەوتوونەتە نێوان کفری و هەولێر، درووست باشووری کوردستانی ئێستەمان، کە ئەو لای وایە هیچ گەڕۆکێکی ئەورووپایی

پێش ئەو پێی نەناوەتە ئەم شوێنە هەڵەت و بەرزانە. ئەو شوێنەی کوردستان، کە ئێمە هیچ سەروساختێکمان لەگەڵیدا نییە، هەرچەندە گەڕۆکی فەرەنسایی ئەدریان دوپرێ[1] لە سەفەرنامەکەی خۆیدا (چاپی ساڵی ١٨١٩) باسی سلێمانی دەکات، بەڵام بێ ئەوەی خۆی سەردانی شارەکەی کردبێت، بەڵام هیوود بۆ خۆی بەناو شاری سلێمانیدا تێپەڕیوە و پاشای ئەمارەتی بابان پێشوازی لێ کردووە و دواتریش چووەتە کۆیە. هیوود لەم سەفەرنامەیەیدا، لە کوردان وردبووەتەوە و تێبینی و سەرنجی وردی لەسەر ژیانی کوردەواری نووسیوە. هەروەها باسی ئێزیدییەکانی نێوان بیابانی مووسڵ و نەسیبین و دواتر باسی شارەکانی: ماردین و نەسیبین و دیاربەکر دەکات، دواجاریش باسی دوایین قۆناغی سەفەرەکەی خۆی لە چیای تۆرۆسەوە تا ئیستەنبووڵ دەکات.

گرینگی ئەم سەفەرنامەیەی هیوود لەوەدایە، کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم سەفەری ئەو ناوچانەی کوردستانی عوسمانی کردووە، ئێمە وا دەزانین هیچ گەڕۆکێکی دیکەی ئەورووپایی لە پێش ئەو پێی نەنابێتە ئەم بەشەی کوردستان، بۆیە پێمان وایە نووسەر ڕاستی وتووە، کە ئەم ناوچەیە لەسەر نەخشەکان وەکوو خاڵێکی سپی وابووە. خاڵێکی دیکە کە لەم سەفەرنامەیە تێبینی دەکرێ ئەوەیە: نووسەرەکەی تابلۆیەکی گرینگی سیاسی-ئابووری و مێژوویی و کۆمەڵایەتیی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمی کوردستانی عوسمانیمان بۆ دەخاتە بەرچاو، کە دەتوانین لەوێوە و لە ڕێگەی ئەو زانیارییانەوە، کۆمەڵێك پرسیاری لۆژیکی بورژێنین و هاوکات سەرەداوی وەڵامەکانیشمان وەگیر بکەوێ. ئێمە لەم چاپە کوردییەی بەردەستتاندا تەنیا ئەو بەشانەمان کردۆتە کوردی کە تایبەتن بە کورد و کوردستان. دوا تێبینییەك کە

[1] Adrien Dupré, *Voyage en Perse fait dans les années 1807, 1808 et 1809, en traversant la Natolie et la Mésopotamie, depuis Constantinople jusqu'à l'extrémité du golfe Persique, et de là à Iréwan*, Paris : J.G. Dentu, 1819, 2 vol.

حەزدەکەم خوێنەرانی خۆشەویستی لێ ئاگادار بکەمەوە، ئەوەیە کە ئەم سەفەرنامەیە بۆ یەکەمجار ساڵی١٨١٩ لە لەندەن بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە، دواتریش هەر ساڵێك دواتر لە ساڵی ١٨٢٠دا کراوەتە فەرەنسی و لە پاریس بڵاوکراوەتەوە. وەرگێڕاوە کوردییەکەی ئێمە لەسەر چاپە فەرەنساییەکە کراوە، دواتر لەگەڵ چاپە ئینگلیزییەکەش بەراورد کراوەتەوە، بۆیە ئەگەر لە چەند جێگەیەکدا جیاوازییەك لەنێوان چاپە کوردی و فەرەنساییەکەدا هەبێت ئەوا هۆیەکەی ئەوەیە وەرگێڕانە کوردییەکە لەو جێگایانەدا بە وردی لەسەر بنەمای چاپە ئینگلیزییەکە ڕاستکراونەتەوە.

# ولیەم هیوود کێیە؟

ولیەم هیوود، لە بنەماڵەیەکی ئارستۆکراتی ئینگلیزە، ڕۆژی ٢٠ کانوونی دووەمی ساڵی ١٧٨٩ لە شاری روان* لە فەرەنسا لە دایك بووە، هێندە نابات بنەماڵەکەیان بە هۆی هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشی فەرەنسی دەگەڕێنەوە بۆ ئەنگلستان. ساڵی ١٨٠٤یش لەلایەن کۆمپانیای هیندیی ڕۆژهەڵات وەردەگیرێ و ساڵی ١٨٠٧ لە دامەزراوەی (مەدراسیی سەربازیی)** پلەی لیوتینان وەردەگرێ. لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨١٦ بۆ سەفەرێك بۆمبای بەجێدەهێڵێ و بەسەرهاتی سەفەرنامەکەی لە نیسانی ١٨١٧ لە ئیستەنبوڵ تەواو دەکات، ئەم کتێبەیان کە بریتییە لە بەسەرهاتەکانی ولیەم هیوود و لێرەدا بەشێکی کراوە بە کوردی، هیوود یەکەم کەس بووە وەسپێکی میللیی بۆ بابل کردووە، ئەوە لەکاتێکدا بووە، کە مستەر ڕیچ لە ماوەی ١٨٠٨-١٨٢١ موقیم بووە لە بەغدا و لەو سەفەرەیدا پێشوازی لە هیوود کردووە. هیوود دوای تەواوبوونی گەشتەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ هیندستان. شوباتی ١٨٢٢ هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات و کوڕە بچووکەکەی دەنێرێتەوە بۆ ئەنگلستان. خۆیشی لە ئاياری ١٨٢٥ لە تەمەنی (٣٦) ساڵیدا لە مازولیپاتان*** کۆچی دوایی دەکات.

---

* Rouen

** Madras Military Establishement

*** Masulipatan

# VOYAGE

DE

# LA CÔTE DE MALABAR

## A CONSTANTINOPLE,

PAR LE GOLFE PERSIQUE, L'ARABIE, LA MÉSOPOTAMIE, LE KOURDISTAN ET LA TURQUIE D'ASIE;

FAIT EN 1817,

PAR WILLIAM HEUDE,

LIEUTENANT AU SERVICE DE L'ANGLETERRE;

AVEC UNE GRANDE CARTE ET DES GRAVURES.

TRADUIT DE L'ANGLAIS,

PAR LE TRADUCTEUR DU VOYAGE DE MAXWELL.

PARIS:

LIBRAIRIE DE GIDE FILS,

RUE SAINT-MARC-FEYDEAU, N.° 20.

1820.

چاپی فەرەنسی کتیبەکە (سەفەرێك لە کەناری مالاباراوە بۆ کۆنستانتینۆپل لە ڕێگەی کەنداوی فارس و عەرەبستان و میزۆپۆتامیا و کوردستان و تورکیا و ئێران)، پاریس، ١٨٢٠.

A

# VOYAGE

UP

# THE PERSIAN GULF,

AND A

# JOURNEY OVERLAND

# FROM INDIA TO ENGLAND,

IN 1817.

CONTAINING NOTICES OF

ARABIA FELIX, ARABIA DESERTA, PERSIA, MESOPOTAMIA, THE GARDEN OF EDEN, BABYLON, BAGDAD, KOORDISTAN, ARMENIA, ASIA MINOR, &c. &c.

BY LIEUTENANT WILLIAM HEUDE,

OF THE MADRAS MILITARY ESTABLISHMENT.

LONDON:

Printed by Strahan and Spottiswoode, Printers-Street;

FOR LONGMAN, HURST, REES, ORME, AND BROWN,

PATERNOSTER-ROW.

1819.

چاپی ئینگلیزی کتیبەکە (سەفەرێك تا کەنداوی فارس و سەفەرێك بە ڕێگەی وشکانی لەناو خاکی هیندستانەوە بۆ ئەنگلستان لە ساڵی ١٨١٧ دا )، لەندەن، ١٨١٩.

## فەسڵی یەکەم[1]

دەرچوون لە بەغدا، گەشت بەناو چیاکانی کوردستاندا، کاریگەرییەکانی قامچی، مەترسییەکانی سەر ڕێگە، ئەو ترسەی کە ڕووس ناویەتەوە، کێشە لەگەڵ هۆزێکی کورد، کۆمەڵە گۆڕێکی سەرنجڕاکێش، کۆیسنجاق، وردەکاریی لەبارەی کوردانەوە ، گەیشتن بە ئەربیل و مووسڵ.

[1] ئەم فەسڵە لە سەفەرنامەکەدا دەکاتە فەسڵی یانزەهەمی چاپە فەرەنسـاییەکە ( لا: ٢٣٦-٣٠٢)، بەڵام لە چاپە ئینگلیزییەکە دەکاتە فەسڵی نۆیەم (لا: ١٨٩- ٢١٦ ) (وەرگێڕ).

**٢٨ ی شوبات:** لەگەڵ عەلی ئاغا چولنگی*[(١)] وا ڕێکەوتبووین بە ٦٠٠ پیاستەر بمگەیەنێتە ئیستەنبووڵ، ئەوە سەرباری ئەو دیارییە بچووکەی دەبوایە بیدەمە خزمەتکارەکەی ژێر دەستی، کە دەبا لە ڕێگەدا خزمەتی منیش بکات. عەلی ئاغا (تابلۆی ژمارە ١) پێشتر لەلایەن پاشای نوێوە ڕاسپێردرابوو سەرە براوە داواکراوەکان بگەیەنێتە ئیستەنبووڵ. کەوابێ ئەم سەفەرە بۆ ئەو زۆر بە سوود دەبێت، چونکە لەلایەن پاشا و لەلایەن کۆمپانیا و لەلایەن منیشەوە پارەی

* Aly-Aga-Chulingi

(١) عەلی ئاغا ناوی بوو، "چولنگی" (یان ئەو کەسەی کە مێزەر لەسەر دەکات)، نازناوێکە یەکێك لە پاشاکانی میسر خستبوویە پاڵ ناوەکەی، چونکە لە کاتی لەشکرکێشی فەرەنسا بۆ سەر میسر سەری دوو فەرەنسی بۆ هێنا بوو. بە بەدواداچوونی نرخی پارەگۆڕینەوە، ٦٠٠ پیاستەر ئەوکاتە بەرامبەر نزیکەی ٢٠ پاوەندی ئیستەرلینی بوو. نزیکەی دە پاوەندی ئیستەرلینی دیکەشم لە ڕێگەدا خەرج کرد و دەمتوانی گلییدەمەوە چونکە دابوومە ئەو خزمەتکار و ڕابەرانە تەنیا بۆ ئەوەی هانیان بدەم چاك خزمەتم بکەن. ماوەی نێوان بەغدا و کۆنستانتینۆپل ١٨٠٠ میلە، بەڵام بەهۆی ئەو ڕێگەیەی کە گرتمانە بەر زیاتر لە ٢٠٠٠ میل بوو. بە ٦٠٠ پیاستەر ئەسپ، خان و هەموو پێویستییەکانی منیان لە کاتی گەشتەکە بۆ دابین کردم. بێگومان ڕاستییەکەی بەو شێوە نایابەش نەبوو بە تەواوی، بەڵام باشترین لەوەی کە لەبەردەست دابوو پێشکەشیان کرد. خۆ ئەگەر ٦٠٠٠ پیاستەریشم بدابوایە ئەوا هەر بە شێوەیەکی لەوە جیاوازتر خزمەتیان نەدەکردم. بە گشتی ئەم تەتەرە نزیکەی ٤٠٠٠ پیاستەری بۆ ئەم گەشتە وەرگرت. بەڵام ئەگەر ئەم دەرفەتەم بۆ هەڵنەکەوتبایە سەفەرەکە تەنیا لەسەر من ٢٠٠٠ پیاستەر دەکەوت.، تەتەرەکانی کۆمپانیاکە ١٢٠٠ پیاستەر وەردەگرن بۆ ئەم سەفەرە لە بیست و پێنج ڕۆژ لە هاوینان و سی ڕۆژ لە زستاناندا و ٢٠٠ پیاستەریش وەکوو بەخشیش بۆ هەر ڕۆژێکی لەو ڕێگەیەدا، کە بەسەری دەبەن وەردەگرن. بۆیە دەبینین لە بەرژەوەندی ئەوان دایە کە پەلە نەکەن یان خۆیان ماندوو نەکەن لەوەی نامەکان بگەیەنن. بەم شێوەیە نموونە لەسەر خێرایی ئاسایی دەهێنمەوە، کە ئەم گەشتە بیست ڕۆژ دەخایەنێ و هەندێکجاریش تەنیا بە حەڤدە ڕۆژ دەیبڕن و بیستوومە کە پیاوێك ماوەی ١٨٠٠ میلی تەنیا بە ١٣ ڕۆژ بڕیوە.

سەفەرەکەی درابوویێ. لەگەڵ ئەوەشدا کەس نەیدەتوانی وا لەم تەتەرانە بکات تا واز لەو دابە بێنن بەوەی کەلوپەلەکان بەسەریەکەوە دانەدەن. هەموو گەڕۆکەکان پێشتریش گلەییان لەمەبوو، بەڵام لایان وابوو ئەگەر بێ دەنگ بن قازانجیان زۆرتر دەبێت لەوەی بەردەوام گلەییان بکەن، چونکە بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکانیان مشووری ئەوەیان بۆ دەخواردن باشترین ئەسپیان بۆ هەڵبژێرن ، وێرای ئەو مەترسیانەش کە لە سۆنگەی هاوەڵیکردنی ئەو کەسانەی کە دەیانبردن تووشی دەبوون، مەترسییەکانی سەر ڕێگەش وەک پەلاماری جەردە و ڕێگرەکان ، زیاتر دەبوو.




**تابلۆی ژمارە: (١) عەلی ئاغا چولنگی**

**١ ی ئادار**: خزمەتکارێکی تەتەر، لە کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ، بە دوامدا هاتە نشینگەکەم و بۆ سواریی ئەسپێکی عەرەبی نایابی بۆ هێنابووم، ئەسپەکە، کەباشترینی ئەو توخمەی خۆی بوو، چاك زین کرابوو، من بۆ ئەم هەڵبژاردنە پیرۆزباییم لە خۆم کرد. خوداحافیزیم لە خانەخوێیەکەم و خێزانەکەی کرد و بەڕێکەوتین، بەڵام لە ماوەیەکی کورتی نزیکەی دوو کاتژمێریی، لەناو ڕێگەیەکی زۆر تەسك و تروسك وەستاین بۆ ئەوەی نامە و پاکەتگەلێکی پۆستە هەڵبگرین، بێگومان ئەمانەش زۆر لە کەسیی خاکیی وەکوو من گرینگتر بوون، ڕەفتاری شایستەی سولێمان ئاغای چاوەشەکەشم ، منی بۆ مەترسیگەلی ئاوەها ئامادەکردبوو ، بەڵام چاوەڕێم نەدەکرد، ئەوها زوو، ڕێك لەبەرچاوی ئەو هاوڕێیانەی کە بەجێمهێشتن، بەرەو ڕووی ببمەوە.

دوای دەرچوونمان لە شار ، بۆ ئەوەی سەرۆکەکەمان پێمان بگات، بۆ دووەمجار وەستاینەوە، ئەوسا بینیمان کاروانەکەمان هەمووی بەسەر یەکەوە، نۆ پیاوی کەتەی تەواو چەکدارن، شەش ئەسپی بارهەڵگر و سێی یەدەك و پێنج ڕابەری پیادەی کاروانەکە بوون. بە بێ ئەوەی لە کەناری ڕووبارەکە دووربکەوینەوە بەناو ئەو بیابانەدا تێپەڕین کە دەوری شاری دابوو. دوای شەش کاتژمێر ڕێ، کە لەبەر پێویستی ڕێکخستن و شەتەکدانی بارەکان، تەنیا بیست میلێکمان بڕی بوو، ، لە نزیك ئاوایی دوخەلا*لەناو کاروانسەرایەکی پەڕپووتدا وەستاین.

**٢ی مانگ**: لە کاتژمێر چواری بەیانی بەڕێکەوتین، کاتێ بەناو پێدەشتێکدا ڕێمان دەکرد کەلاوەی سێ گوندمان بینی، لە کاتژمێر دە لە شارۆچکەیەکدا وەستاین کە نزیکەی هەموو دانیشتوانەکەی چۆڵیان کردبوو.

---

* Dokhala



تابلۆی ژماره: (٢) چوون بۆ ناو دۆڵی سلێمانی

وادیاربوو ئاستەم بوو ئازووقەمان لێوەگیر بکەوێ، بەڵام هاوڕێکانم لەو کەسانە نەبوون هەر وا بە ئاسانی و پۆزشت هێنانەوەی چەند کلۆلێکی نیمچە-برسی کە تووشیان دەبوون، دەستبەردار بن. ئێسترەکانمان کردنە حەوشەی یەك لە ماڵە چۆڵەکانی بەردەممان، بۆ وەگیرخستنی ئازووقەش، کاتێك پاڕانەوە بێهوودە بوو، قامچی بە ئازادی بەکار هێنرا. یەکێك لە تورکەکان لەو مۆڵەتەی کە درابوو بۆ ڕاییکردنی داواکارییەکانی، ئەوەندە تووڕەبوو، پەتی قامچییەکەی لە ملی بەدبەختێکی بندەستی ئاڵاندبوو و شمشێرەکەشی دەرهێنا بوو تا سەری پەلبدات، خۆشبەختانە لەم کاتەدا خزمەتکارە تەتەرەکەم گەیشت و لەسەر داوای من نفووزی خۆی بە قازانجی ئەم بێگوناهە بەکارهێنا، کە ژیانی گرنگییەکی ئەتۆی نەبوو تا داوای کەسێکی وەك ئەو ڕەتبکاتەوە. چووینە ماڵێکی دیکە، قامچی لە لایەك و نیشاندانی چەند پیاسەرێك لە لایەکی دیکە، وایانکرد بەشێکی ئەو ئازووقەیە وەگیربخەین کە دانیشتوانەکەی توانیبوویان لەدەست دڕندەیی ئەو لەشکرگەلە بیشارنەوە کە ماوەیەك پێشتر وڵاتی ڕاماڵی بوو.. ئەو ڕۆژە هەر تەنیا هەژدە میل و سێ چارەکمان بڕی، ئەمەندەش بەس بوو بۆ کەسانێك کە نە حەسابوونەوە و نە خۆراکێکیشیان خواردبوو.

**٣ ی مانگ**: بیست و یەك میلمان لەناو وڵاتێکی پان و پۆڕی پڕ لە دۆڵی تەنگ و باریک بڕی بوو ، لەم ماوەیەشدا تەنیا بەناو تاقە گوندێکدا تێپەڕ بووین.، ئەو شوێنەی کە لێی وەستاین هەروەك دەللی عەبباس* وابوو لە ڕووی ژمارەی ئەو هەنگاوانەی کە ئێمە بڕیبوومان.

**٤ ی مانگ**: دە ئەسپسوار پەیوەندییان پێوەکردین کە ئەسپی ڕەسەن و چەک و تفاقی چاکیان پێ بوو. ئەمانە هەموویان کورد بوون جگە لە یەکێکیان نەبێ کە گورجی بوو و پێشتر لە دەرباری پاشادا بینیبووم. لەدڵی خۆمدا دڵخۆش بووم بەوەی هێزمان زیادی کردووە بێ ئاگا لەو هەموو ناڕەحەتیی و

* Delly Abbas

شەرمەزارییەی لەهەندێ ساتەوەختدا چاوەڕێیان دەکردم؛ ساتەوەختێک کە خۆم تێدا وەکو کەسێکی خۆشبەخت دەبینی. هەر زوو پێیان گوتم کەوا ئەو کەسایەتیە بەهێزە (گورجییە) کۆیلەیەکی گوێڕایەڵی پاشای نوێ بووە. ئەوسا وەبیرم هاتەوە کاتێك ئێمە لە حزووری پاشادا بووین بینیبووم ئەو نەك هەر لە ڕیزێکی خوارەوە بەڵکو لەگەڵ دوایین کۆیلەکانا وەستابوو، ئێستەش ئێمە وا شوێنەکانمان گۆڕییەوە، لە ئێستەوە کە ئەو کەسایەتییە گرنگە پەیوەندیمان پێوە دەکات هەموو سەرنج و هەموو چاودێرییێکی تەتەرەکەم خرایە سەر ئەو، چاکترین و باشترین شوێنی لە هەمووان شکۆدارتر بەو دەدا، لە کاتێکدا گەڕۆکە ئینگلیزەکە، بە چاوی سووك سەیر دەکرێ و فەرامۆشیش دەکرێ و لە ڕیزبەندی ژمارەشدا تەنیا سفرێك بوو. گورجییەکە، کاتێ نەیدەزانی چی بکات، دەهات منی دەدۆزییەوە و بە هەوایەکی بەرزەوە پرسیارگەلێکی لێ دەکردم، لەو کاتەدا کە وەڵامیم دەدایەوە، حەزم دەکرد دەرفەت لەبار بوایە بە شمشێرەکەم ڕووبەڕووی ببمەوە.

**چوارشەممەی ٥ ی مانگ:** نزیکەی سێ کاتژمێرێك لە کفریماینەوە، لە کاتی نزیکبوونەوەشمان لەم شارە بە زەبری هێز، دەستمان بەسەر مەڕێکدا گرت کە ئێمە بە شمشێرەکەمان کوشتمانەوە و دابەشمان کرد. مەڕەکە دوای سەربڕینی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، کە باوەڕ ناکرێ، برژا و خورا. تەنانەت کوردەکان لایان وابوو هەتا پێویست ناکات ئەو بەشەی خۆشیان کەوڵ بکەن کە پێمان دابوون، هەربەوەندە دەستبەردار بوون، کە بە ئەستەم پاکیان کردەوە و پاشان خستیانە سەرخەلووزەکە . کاتژمێر سێی ئێوارە، بۆ ئەوەی بگەینە ناو چیاکانی کوردستان، کەمێك بەرەو باکوور-ڕۆژهەڵات ڕۆیشتین. لەوەتای لە بەغداوە دەرچووین تا ڕادەیەك شوێن پێی ڕێگەی ئاساییمان گرتبووەبەر، بەڵام لە باکوور بۆ ڕۆژهەڵاتی کفری بەتەواوی لەم ڕێگە ئاساییە لاماندا و چووینە ناو ئەو وڵاتەی کە نەناسراوە، ئەوە لە سۆنگەی نەبوونی زانیاریی بوو دەربارەی ئەوە

دەڤەرەی لەسەر هەموو نەخشەکان بە سپێتی ماوەتەوە. زۆر داخم بۆ ئەوە خوارد کە هیچ کەرەسەیەکی پێویستم لەبەردەستدا نییە تاوەکوو بتوانم زانیارییەکی ورد و تەواو لەبارەی ئەم وڵاتە بەردەست بخەم، بەڵام بە گوێرەی ئەو دابەی کە لە ماوەی چەندین ساڵدا لەبارەی خەملاندنی دوورییەکان کۆم کردبۆوە، دەکرێ ئەم زانیارییانەی کە من لە خوارەوە باسیان دەکەم تا ڕادەیەك ورد و تەواو بن.

ئەو وڵاتەی کە دەچینە ناویەوە، وڵاتێکی بەرزاییە و زەوییەکانی بەرین نییە و هیچ ئاوایییەکی تێدا نییە، بۆ کشتوکاڵیش دەست نادات. بەرەبەری ئێوارە، یانزە میل دوور لە کفری، لەو کاتەی کە خەریك دەبوو تاریکایی باڵی بەسەردا دەکێشا، تووشی ڕەشماڵێکی کوردان بووین. لەبەر ئەوەی ئەو زەوییەی کە لەسەری بووین بەرزایی بوو بۆیە هەواکەی زۆر سارد بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەر وەك ئەوەی خانەخوێیەکەمان ڕەتیکردەوە کە نوایەکمان لەژێر ڕەشماڵەکەی خۆیدا بداتێ وا دیار بوو زیاتر ئامادەیی ئەوەیان بوو تاڵانیمان بکەن لەوەی بە هانامانەوە بێن، بۆیە ناچار بووین لە هەوای ئازاد لەناو ئەواندا ڕەشماڵ هەڵبدەین لەگەڵ وریایی ئەوەی کە هەمیشە چەند پیاوێك پاسەوانیی بکەن لە ترسی ئەوەی نەوەکا لە ناکاو بەسەرمان دابدەن.

ئەو هۆزەی کە ئێمە لەناویاندا بووین، لە ڕووی بنەچە و دابو نەریت و عادەتیانەوە، تەواو جیاواز بوون لەو هۆزگەلە کێوی و کۆچەرانە، بەڵام بەخشندە و میوانندۆستانە بوون، کە من زۆر سەردانیانم کرد بوون. ئەو هۆزەی کە ئێمە لەناویاندا بووین بە دڵنیاییەوە هۆزێکی زۆر گەورە نەبوو، چونکە ژمارەی ئەو پیاوانەی کە دەیانتوانی چەك هەڵبگرن بە هیچ شێوەیەك لە ژمارەی پیاوەکانی ئێمە زیاتر نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك لەو دزانە زیاتر لە چەند جارێك بە بێ دەنگی لە ڕەشماڵەکەمان نزیك دەکەوتەوە و پشێوی دەنایەوە، ئێمەش ناچاربووین بڵێین هەرکەسێك یەکەمجار ئەو کەوشەنە ببڕێ کە ئێمە دامانناوە

دەیبڕینەوە. ئەو هۆزگەلانە جل و بەرگیان زۆر سادەبوو، لەگەڵ ئەو ژیانەی بەسەریان دەبرد و ئەو لایەنە کێویانەی ئەو ناوچەیەی کە تێیدا دەژیان دەگونجا، پیاو و ژنەکانیشیان جۆرە پالتۆیەکی خوری کەمێك درێژیان لەبەردەکرد، شەروالێکی درێژ، کە لە ناوقەدییەوە بە پشتێنێکی چەرمیی دەبەسترایەوە لە سەرەوەشی پارچە قوماشێکی چوارگۆشە شانەکانی دادەپۆشی، هەردوو گۆشەکەی بە سەر سنگیانەوە دەبەستەوە. جیاوازی سەرەکیی نێوان جلوبەرگی پیاوان و ئەوەی ژنانیان، کە دەتوانین تێبینی بکەین، ئەوەیە پیاوەکان کڵاوێکی خوری لەسەر دەکەن کەچی ژنەکان پارچە پەڕۆیەك، لەسەر شێوەی مێزەر، بە دەوری سەریانەوە دەپێچنەوە.



تابلۆی ژماره: (٣) گۆڕستانێکی سەرنجڕاکێش لە کوردستان

**پێنجشەممە ٦ ی مانگ**: لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە تاوەکوو یانزە بەناو چیا چۆڵەکانی کوردستاندا ڕۆیشتین. دوای ئەوەی بیست میلمان بڕی لە جۆگەلەیەك پەڕینەوە کە لەوانەیە لقێکی ڕووباری ئەربا* بێت، دواتر لە ئاواییی ئیبراهیم-خانچی**، لە ماڵێکی چکۆڵەی کورد وەستاین کە بۆ پێشوازی لە گەڕۆکەکان لەوێ بوو.

**هەینی ٧ ی مانگ**: ماوەی حەوت کاتژمێر و نیو، بە بێ ئەوەی تووشی تاقە یەك ئاوایی ببین، ڕۆیشتین. لەسەر بەرزاییەکان بەهەر لایەکدا بڕۆیشتباین ، چەپ و ڕاست، ژمارەیەکی زۆری ئەم بەرزاییانە گۆڕستان بوون و بێمانایی ژیانی وەبیر دەهێنایینەوە. لەو کاتەدا، کە ڕێبەرەکانمان بە بارەکانمانەوە لە پێشەوە دەرۆیشتن، لە لایەن دەستە کوردێکەوە ڕاگیران، بە بێ ڕووخسەت کەوتنە پشکنینی باری ئێسترەکان. ئەم دیمەنە لەسەر دۆندی چیایەك لەو شیوانەی کە هەمیشە شوێنگەلی شاڵاوی تاڵانچییەکانن ڕوویدا. مەیتەرەکانمان یەکسەر هەرایان کرد و بەرەو لای ئێمە هاتن و بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد. من هەر سەد پێیەك لە پێشەوە دوور بووم کە هاواریان بۆ کردم بوەستم. هەمووومان کۆبووینەوە و چاوەڕوانی تاقە وشەیەکمان دەکرد کە دووپاتەی ئەو تۆقینە بکاتەوە کە تووشی ڕێبەرەکانمان بوو و تەسەوری کارەکە بکەین. دەمودەست بە پێچێکی گەورەدا ڕۆیشتین و دوای ئەوەی چارەگە میلێکمان بڕی، لەو تاڵانچیانە نزیك بووینەوە کە پشکنینی جانتاکانمان تەواو بوو بوون و دەیانخستنە سەر پشتی ئێستر بۆ ئەوەی بیانبەن. تەتەرەکانمان دەمودەست هێرشیان بردە سەریان و شمشێر بەدەست و بە هاوارگەلێکی تۆقێنەرەوە، بەڵام کوردەکان کە ژمارەی ئێمەیان بینی، بڕیاریان نەدا چاوەڕوانمان بکەن بەڵکو

---

* Arba

** Ibrahim-khanchi

هەڵاتن و دەستکەوتەکانیان لە دوای خۆیانەوە بەجێهێشت و ئێمە بووین بە پاڵەوانی گۆڕەپانی جەنگەکە.

دوای ئەوەی بیست و حەوت میلمان بڕی، لە کچان* وەستاین، ئەمیش ئاواییەکی چکۆڵەی پەڕپووت بوو و دەکەوتە سەر لێژایی گردێکەوە، خانووەکانی لەبەردی داتاشراو دروستکرا بوو و سەربانەکانیشیان بە قوڕ و پوش گیرا بوو. نەمانتوانی هەتا تاقە کۆخێکیشی لێبدۆزینەوە کە لەو سەرما و سۆڵە و بارانە سەختەی ئاسمان بمانپارێزی کە هەڕەشەی لێدەکردین. تەنیا بە گەیشتنی تەتەرەکان، کە بە قامچی پیاو و ژن و منداڵەکانیان داپاچی، ئەوکاتە ڕەشماڵێك و برێك خواردنیان پێداین. وا دیار بوو قامچی بۆ تەتەر هەموو شتێك بوو. من هەمیشە بە کارێگەریی قەمچییەکەیان سەرسام بووم. ئەگەر ئەسپەکەی چاك بوو ئەوا دەنگی قەمچییەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی دوو هێندە پێهەڵبێنێ.، ئەگەر خاووخلیسکیش بووایە ئەوا بەهۆی قامچییەوە ورەیان دەخستەوە بەر، ئەگەر لەبەر ماندوویێتی یان وەڕسی بکەوتبایە ئەوا قامچی هێزی دەهێنایەوە بەر. ئەگەر تەتەر ئازووقەی نەمابوایە، یەکەمجار داوای دەکرد، ئەگەر نەیاندابوایە هەندێ گلەیی دەکرد، دواجار پەنای بۆ قامچی دەبرد، پەسنیی خۆی بەسەر هەمووان دابەش دەکرد بە بێ هەڵاوێردن لێرە و لەوێ هەتا ئەوەی پێویست بوایە پێشکەشیان دەکرد. لە دێهاتەیلی پەرپووتدا، باوەڕمان نەدەکرد هەتا مریشکێش بدۆزینەوە، کەچی دەمبینی قامچی لەناکاو دە دوانزە مریشکێکی تەواوی دەدۆزییەوە و لە شوێنگەلێك کە گژوگیای پێویستمان نەدەبینی بۆ لەوەڕی مەڕان، ڕێگەیان دەدا لەناو سەرلەبەری مێگەلەکانیان ئەوەی بمانبویستبایە هەڵبژێرین. کورت و کرمانجی قامچی لە هەموو دەرفەتێکدا، چەکی سروشتیی تەتەر و سەرچاوەی تاقانە بوو. جا ئەگەر شتێك هەبوایە سەراسیمەی بکردبوومایە، ئەوەبوو ببینم ئەم کلۆلانە، کە بە تاقیکردنەوە دەزانن

---

* Kitchan

چ مامەڵەیەك چاوەڕوانیان دەكات، بۆیە هەرگیز نایانەوێ بە هیچ شێوەیەك داوایەكانیان بەجێنەگەیەنن پێش ئەوەی ببینن بەوەی بە زەبری قامچی ناچار بكرێن.

هەربۆیە دەبینین ئەم هۆزانە ڕقێكی ئەستووریان لە ستەمكاران هەڵگرتووە.، كەچی شمشێرەكانیان لەناو كێلانەكان هەڵناكێشن و كالانەكانیان فڕێ نادەن؟ ئەمە پاشماوەی خەمساردیێكی گشتییە كە وای كردووە هەموو كەسێك هەرچەندە هەستیاری بەرانبەر بە ئێش و ئازاری كەسی خۆی هەبێ كەچی هیچ تروسكەیەكی ڕۆحی گشتیی دانەگیرسێنێ، بەڵام ئەگەر چاوێك بۆ دواڕۆژ بگێڕین دەبینین هەزاران لەو هۆزگەلە شەڕكەرانە وەڵامی بانگەوازی یەكەمین ئازادیخواز دەدەنەوە كە بانگەوازیان لێدەكات و ئەوكاتە چەك بەڕووی ستەمكاران بەرز دەكەنەوە. دەشێ پێشبینیی ڕووخانی ئەم هێزە لەبننەشكاوە خۆسەپێنەرە بكەین كە هەردوو دیوی جیهانی بە فرمێسك و خوێن ژیاندووە و بە خێرایی بەرەو وێرانەبوونی خۆی هەنگاو دەنێ. ئەم هێزە دەبێت بەم زووانە ڕێگە بۆ سەردارگەلی نوێ چۆڵ بكات یان نوقمی ناو پاشاگەردانیی ببێ. ئیمپراتۆریای عوسمانی ئێستەكە لە یۆنانستانی كۆن لەبەردەم هەرەسهێناندایە، بە هەمان ئەندازە لە لایەكەی دیكەیەوە لەوپەڕی لاوازی دایە. مەگەر تەنیا لە حالێكدا كە بە گردبوونەوەیەكی هێزی خۆی، یەك هێزی نوێ درووست بكات كە ئەوكات ئێمە لامان وایە دەشێ لەنێوان سنورگەلێكی وا بەرتەسك گیر بخوات، كە چیاكانی تۆرۆس و پردەكەی بۆسفۆر و بیابان بۆی دیاری دەكەن. دەتوانین بپرسین داخۆ چ هێزێك شوێنی دەگرێتەوە بەڵام لێرە ئەم گفتوگۆیە لەم گەشتەی مندا نامۆیە.

**٨ ی مانگ:** كاتژمێر شەشی بەیانی بەڕێكەوتین، ئێمە كە لەسەر ڕووی ئاستی پێدەشتەكانەوە بووین، وڵات دیمەنێكی زۆر جوانتری نیشان دەدا، بۆیە

خێراتر بە هەورازەکاندا هەڵدەکشاین. کاتێك بە لای کۆمەڵە کوردێکدا ڕەتدەبووین، کە لە بناری چیایەکدا ڕەشماڵیان هەڵدابوو، تەتەرەکانمان بە هەنگاوی خێرا بەرەو لایان هەڕایان کرد و دەستیان بەسەر هەموو ئەو ئەسپانەیاندا گرت کە توانیان بەرزەفتیان بکەن. سەرۆکەکانیان بەدواماندا کەوتن.، بەڵام کاتێ بینییان ئێمە ژمارەمان لەوان زۆرترە بۆیە نەیانویست پەلامارمان بدەن. هاوسەفەرەکانم زۆرجار نەفرەتیان لەو وڵاتە دەکرد، کە پیایدا تێپەڕ دەبووین، وەك ئەوەی ئەم وڵاتە تەنیا تاڵانچی و ڕێگری تێدا بژی.، بەڵام من دەمەوێ ئەوە بسەلمێنم کە ئێمە خۆمان، لە هەر کوێیەك خۆمان بەهێزتر بینیبووایە، گەورەترین تاڵانچی بووین.

شوێنی ئەسپە خراپەکانمان بەو ئەسپانە گرتەوە کە تازە دزیبوومان، ئەوەبوو بەم چیا بەرزە هەڵگەڕاین کە لە پێشمانەوە بوو، بێگومان پێویستی بە ئەسپی بەهێز بوو. ئەوکاتە بە تەواوی ئەو بەفرە سەرمەدییەمان جیاکردەوە کە لە دوورەوە وەکوو هەور لەسەر دۆندی چیایەکە دەمانبینی. لەوکاتەی من لەگەڵ یەکێك لە تەتەرەکان لە دواوە بووم، لە پەنا گاشە بەردەکانەوە تەقەیان لێکردین. من لە سەر ئەو دواکەوتنەم لە کاروانەکە بە توندی گلەییم لێکرا، بەتایبەتی لەو کاتەی لە نزیکمانەوە گروپگەلێکمان بینی بوو کە جێگەی گومان بوو: ڕاستیەکەشی ئێمە تووشی هەر پیاوێك بووینایە بە دوژمنمان دادەنا. بەڵام لە بەر ئەوەی من حەزم دەکرد لەو دیمەنە جوانانە ڕابمێنم کە لە هەموو لایەکەوە خۆی نیشان دەدا، هەستیشم دەکرد ئەسپەکەم ماندووە بۆیە بە کاوەخۆ دەڕۆیشتم، ئەوەبوو ئەوان هەمان ڕێگە تایبەتییەکەی خۆیان بەکارهێنا کە هێندە بە تاو بازیان دەدا ئەوەی پێی ڕانەهاتبا دەترسا.

لەوەتای ٤ ی مانگەوە ئێمە هەمیشە هەر سەرەو هەوراز سەردەکەوتین، دیاربوو هێشتاش زۆر هەورازی زیاترمان لەبەر مابوو. بە چۆڵەوانی وادا تێپەڕ

دەبووین بە ئاستەم تاقە گوندێك، جۆگەلەئاوێك، درەختێکمان تێدا دەبینی، ئێستە وڵات ئاوەدانتر دیارە و لەولاترەوە سیمای دانیشتوانێکی زۆر نیشان دەدات. دارودرەختی چیاکان تا دەهات زیاتر شوێنکاری زستانی نیشان دەدا و بەفرەکە قوولتر دەبۆوە. دواجار گەیشتینە لووتکەکە کە دەیڕوانیە سەر چیای لەخۆی بەرزتر و دەستمان کرد بەوەی لە لێژاییەکە هێندە خێرا دابەزین، کە هاتنە خوارەکەمان زۆر سەخت بوو. بەدەگمەن وا ڕێك دەکەوێ کە تەتەرەکان لە زەوی وردبینەوە بۆ زانینی ئەوەی داخۆ پێویست بەوە دەکات خێرایی ڕۆیشتنەکەیان زیاد بکەن یان کەمی بکەنەوە. هەڕامان دەکرد وەك ئەوەی لە پێدەشتێکی پان و پۆڕدا بین. لە هەر چرکەیەکدا پێشبینی ئەوەم دەکرد کە من و ئەسپەکەم لە لاپالێکی چیاکەدا هەڵدێرێین، بەڵام من، کە بۆ پاراستنی کەرامەتم، خۆم نیگەران نیشان نەدەدا، هاوڕێکانم بە قۆشمەبازییەوە لێیان دەپرسیم داخۆ حەزدەکەم لەسەر شێوازی تەتەران سەفەر بکەم. وەختایەك گەیشتینە دامێنی چیاکە، ڕێگەکە هێشتا بەرەو خوارەوە دەهات، بەڵام بە لێژاییەکی زۆر هێواشتر. دەبوو لە ڕێڕەوی جۆگەلەئاوێك کە لە چیاکان دەردەچوو بپەڕینەوە. ئەسپەکانمان شوێنی پێی خۆیان نەدەبینی یەکێکیان نغرۆ بوو و ئاوەکە ڕایماڵی.

ئێوارە لە دۆڵان* کە گوندێکی جوان بوو وەستاین، گوندەکە کەوتبووە ناو دۆڵێك و چیای کەمێك بەرز دەوریان دابوو. دوو یان سێ جۆگەلە ئاوی ڕوونی پێدا تێدەپەڕێ، خۆم خستە ناو یەکێکیان بۆ ئەوەی ماندوێتی خۆم لابەم. چەند ژنێك کە ئەوانیش لە دوورییەکی کەمدا مەلەیان دەکرد، دوودڵ نەبوون لەوەی هێمای ئەوەم بۆ بکەن بچمە لایان. من دەمزانی دەشێ ترسناك بێ وەڵامی داواکەیان بدەمەوە، بۆ ئەوەی ڕاستی بڵێم ئافرەتگەلی بەتەمەن بوون

* Dollan

و له ناویاندا یەکێکیان ئەوەندە شۆخ و شەنگ نەبوون، کە گەڕۆکێکی ماندوو فریو بدەن. دوای ئەوەی مەلەم تەواو کرد، چوومە ناو ئەوماڵەی کە تێیدابووین، بینیم هاوڕێیەکانم گوێیان بۆ شایەرێکی چیایی هەڵخستبوو. کەوڵی ورچی لەبەرکردبوو، قژی بە نارێکی بەسەر شانیدا هاتبووە خوارەوە و گۆرانی بەسەر پاڵەوانێتی کۆنە سەرۆکەکانی دەچڕی و هێماگەلێکی شێتانەی دەکرد و دەهۆڵی دەکوتی. دوای ئەوەی بڕێك پارەی کۆکردەوە ئێمە کشاینەوە و بۆ ئەوەی خۆم لە ئەسپێ و دووکەڵ دووربکەومەوە کە کوخەکەی تەنیبوو بڕیارمدا لە دەرەوە لەژێر ئاسمانی پڕ لە ئەستێراندا بخەوم. لەم ڕۆژەدا بیست و یەك میلمان بڕی. ئەو دۆڵەش کە بەناو چیاکانا پێیدا تێپەردەبووین ناوی سەگرمە بوو.

**یەکشەممە ٩ ی مانگ**: دوای ئەوەی بیست و یەك میلمان بەناو چیا و شیوەکاندا بڕی، بەڵام چونکە بەشێوەیەکی گشتی سەرەو نشێو دابووین، چووینە ناو پێدەشتێکی بە پیت نزیکەی دە بۆ دوانزە میل پانایی و سی بۆ سی و پێنج میلێك درێژایی بوو و ڕووبارۆچکەیەك ئاوی دەدا کە بەناو سلێمانی پایەختی کوردستاندا تێپەر دەبوو و نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ. ئەوەی کە دەبێت لە ڕاستیدا لەم شارە ببینین ئەوەیە کە شارەکە چێوەکەی دوو میلە، بەڵام زۆر زیاتر درێژدەبێتەوە، ئەگەر بمانەوێ ئەپارتومانە سەربەخۆیەکان و ئەو گوندانەش بگرێتەوە کە لێیەوە نزیکن. ماڵەکان لە قوڕ و خشت درووست کراون. زۆربەی خانووەکانی تەنیا یەك نهۆمن و بانەکەی قوڕیین و پانە. بە گشتی ماڵەکان نارێکن و ئاسوودە نین، دانیشتوانەکەشی کە ژمارەیان لە دوانزە یان پانزە هەزار کەس تێپەرناکات، زۆربەیان کوردن جگە لە بڕێك خێزانی جوولەکە و ئەرمەنی نەبێت، کە بە مەبەستی بازرگانی لەوێدا دەژین و وادیارە بە تەواوی هەموو کاروبارێکی بازرگانیان قۆرخ کردووە.

بەو پێیەی کە نامەمان پێبوو و دەبوو تەسلیم بە دەسەڵاتکارانی ناوخۆیی بکەین لەلایەن سەرۆکەکانیانەوە، پاشای کوردستان کە ئەوکات لە خیوەتگەی داود ئەفەندی بوو، بەشێوەیەکی شکۆمەندانە پێشوازی لێوەکردین. لە سەرای شار دابەزین و ئێوارەخوانێکی نایابی پێشکەش کردین کە لەو خواردنانە دەچوو، کە لە ئێران و ترکیا پێشکەشی دەکەن کە من باسی ناکەم چونکە زۆر لە گەڕیدەکان وەسپی ئەو خواردنانەیان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت قسەیەک لەبارەی ئەو خواردنە باس بکەم، کە بە شێوەیەکی تایبەتیی پێشکەشیان کردم، وەك ئەوەی دەڵێن ئەوە خواردنی پەسنکراو بووە لە کوردستان. خواردنەکە بریتیبوو لە چەلاو و گۆشتی کەروێشکی کێوی کە بە بۆنەکەیدا دیار بوو ماوەیەکی زۆر هەڵگیرابوو تا بەخوێنەکەیەوە بۆگەنی کردبوو و بە چەوری و سیر و هەموو جۆرە بەهاراتێك لێنرابوو. هەرچەندە من ڕاهاتووم لەسەر پڵاوی پڕ لە بەهارات بەڵام نەمتوانی نە بەرگەی تامەکەی بگرم نە بۆنەکەی و ناچاربووم قاپەکە بنێرمەوە بە دڵخۆشییەکی زۆرەوە لەگەڵ خاوەنەکەی کە لەوە باشتر تەسەوریان نەدەکرد، بەڵکو سەرسام بوون لەوەی کە من ناتوانم تامی خواردنەکە بکەم. بەڵام وەختایەك ڕازەکەم ئاشکرابوو، میوانەکان زانیان من ئەوروپایی و پیاوێکی ئینگلیزم و بەم خواردنە نوێیە ڕانەهاتووم، وای بۆچووم کە پارچە پارچەم دەکەن، ئەوان هێندە کونجکۆڵ بوون بەپەلە بوون ئەوەی کە خۆیان پێی دەڵێن کەسێکی فەرەنگی ببینن و دەستی لێبدەن. هەموویان لەیەك کاتدا پرسیاریان لێ دەکردم و هەمووشیان دەیانویست کارسازیی دەمانچەکەم کە بە وردی سەرنجی ڕاکێشا بوون ببینن و دەترسام، کە لە هەر ساتێکدا شتەکانم لەدەست بچێ، بەڵام خۆشبەختانە لەکاتی حەسانەوە دابوون. داوایان لێکردم تەقە لە یەکێك لە ئەستوونەکانی گۆڕەپانەکە بکەم و منیش زۆر کەیفسازبووم بەوەی بە گوللەیەك ئەستوونەکەم

پێکا. بەو خێراییە سەرسام بوون، کە دەمانچەکەم پێ پڕکردەوە و باوەڕیان هێنا کەوا ئەوروپاییەکان بێگومان سەرسامترین گەلانی جیهانن.

پێیان وتم کە چۆن جاران وڵاتەکەیان لە لایەن ئەسکەندەری گەورە، جەنگاوەری ئەوروپی داگیرکراوە و دەستیان کرد بە گێڕانەوەی سەربووردەی پاڵەوانێتی و حەکایەتگەلی بێ مانا، کە من هەر بە تەواوی تێشیان نەگەیشتم. دواجار پێیان گوتم کە تەنیا ڕووسەکان دەتوانن وڵاتەکەیان داگیربکەن و ئەم داگیرکردنەشیان پێڕاگەیەندراوە و داوایان لێکردم داخۆ ئینگلیز دەتوانن لەگەڵ ئەم هۆزە لە ئاشتیدا بژین. ئەوان لەنێو گەلانی جیهانا تەنیا ڕووس و ئینگلیز و فەرەنسی یان دەناسی. ئینگلیزەکانیان دەناسی چونکە هێندێکیان لە بەغدا بوون، هەرچی لەبارەی فەرەنسییەکانەوەیە ئەوە لە سۆنگەی داگیرکردنی میسرەوە بوو کە دەیانناسین.

ترس لە داگیرکردنی ڕووس، لە هەموو گۆشەیەکی ئەو وڵاتە بڵاوبووبۆوە کە من سەردانیم کردبوو، ئەم ڕاستییەش شایانی سەرنجدان و بابەتی گفتوگۆی هەمووان بوو. لە زۆر شوێن لێیان دەپرسیم: ئەوکاتە ئینگلیز و ناپلیۆن بۆناپارت چ هەڵوێستێك وەردەگرن. وا وەڵامم دەدانەوە کە بۆناپارت لە لای ئێمە زیندانییە و چاودێرییەکی توندیش دەکرێت، بەڵام ئەوان نەیاندەویست و باوەڕیان نەدەکرد، واش دیاربوو حەزیان دەکرد پێچەوانە بووایە، چونکە ئەوان کە بەشێوەیەکی گشتی ڕقیان لە ڕووسیا دەبۆوە و وەکوو دوژمنی ڕووسیا و هێزێکی تێکنەشکاو تێیان دەڕوانی.

لە ١٠ ی مانگ، بە درێژایی دۆڵێك، کە درێژاییەکی نزیکەی بیست و پێنج میل دەبوو، بە چوار گونددا تێپەڕ بووین و گەیشتینە کەناری حەوزێکی گەورەی شێوە بازنەیی لە بناری گردێکدا کە دە دوانزە جۆگەلە ئاوی سازگاری تێدا دەڕژایە ناوی، لە کۆتاییەکەشیدا ڕووبارێکی تا ڕادەیەك گەورەی لێوە

دەڕژێ. ئەم ڕووبارەش، وەك هەموو ڕووبارەکانی دیکە، بۆ خۆی بەردەوام دەبێت بەسەر زەوییێکی تا ڕادەیەك پان و پۆڕ دەڕژێ و ئاودێریی دەکات، ئەمەش خاڵێکی لێکچووی ئاشکرایە لەگەڵ سەرچاوەکانی نیل، وەك ئەوەی بووس وەسپی کردووە. دواتر لە ئاوایییەکی چکۆڵە بە ناوی سوسێ* وەستاین، حەوزێکی وەك ئەو حەوزەمان بینی کە پێشتر باسم کرد، حەوزەکە ئەوەندە ماسی بێشوماری وای تێدابوو کە لەگەڵ بچووکترین دەنگەدەنگ دەهاتنە سەر ڕووی ئاوەکە و ئەو برنج و لەتە نانانەیان دەگرتەوە کە بۆیان فڕێ دەدرا [1].

---

* Suza

[1] ئەم کردەیە زۆر زیاتر سەراسیمەی دەکردم ئەگەر پێشتر هەمان شتم لە ڕەوشێکی هێشتا سەرسامانەتر نەبینیبوایە. لە دەوروبەری مانانتودەی لە مالابار، نزیك لە یەکێك لە پەرستگەکان لە کەناری ڕووبارێکدا، ژمارەیەکی بێشومار ماسی تەواو ماڵیی دەبینین، کە هەرگیز لەو ناوچەیە دوورناکەونەوە. وادیارە تێگەیشتوون کە لە ئەمان دان. بۆ خۆشی لەگەڵ بڕێك لە هاورێکانم بەرەو ئەو پەرستگایە چووین و دەستمان بە تاقیکردنەوەکەمان کرد بەوەی بڕێك لەتە نان و برنج و هێندێك گژوگیامان بۆ فڕێدان. وێرای ئەو هەراوزەنایەی کە ئێمە نامانەوە بەوەی بەردمان فڕێدەدایە ئەوبەری ڕووبارەکە کەچی ماسییەکان هەتا کەنارەکە دەهاتن و بە ژمارەیەکی ئەوەندە بێشومار کە ڕووی ڕووبارەکیان دادەپۆشی. ماوەیەکی کەمێك پێشتر، جۆرێکیان لە داری قامیشی باریك (بامبۆ) یان دۆزیبۆوە کە دەیانتوانی بەسەریەوە هاتووچۆ بکەن و لەوێوە ئەم ماسیانە دەهاتن ئەوەی لە دەستمان بوایە وەریاندەگرت و هەردەموودەست پارچەکەیان بەردەست دەخست و دەچوونەوە ژێر ئاوەکە و ماوەیەکی کەمتر دواتر دەهاتنەوە بۆ ئەوەی پارچەیەکی دیکە ببەن. زۆر لە ماسییەکان چوار تا پێنج پێ درێژبوون، وێرای ئەوەی کە ئەم ڕووبارە زۆر گەورە نەبوو کەچی پێیان وتین مەلەکردن لەناویدا مەترسیدارە. خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە باوەڕیان وایە کە ئەم ماسییە بێشومارانە لەژێر پاراستنی تایبەتیی ئەو خوداوەندە دەژین، کە سەرۆکایەتیی پەرستگەکە دەکات و ئەوەی بیانگرێ یان بیانکوژێ ئەوا هەستی ئایینی خوداوەندەکەی بریندار دەکات. باوەڕ ناکەم هیچ ئەورووپییەك توانیبێتی

دوای دابەزینمان دەستمان بە داگرتنی باری سەر ئەسپەکانمان کرد و بە بێ ویستی خەڵکەکەی دەستمان بەسەر جۆرە تەویلەیەکدا گرتبوو، هەر چەند داواشیان دەکرد چۆڵی بکەین بەڵام ئێمە دەرنەدەچووین، ئەوانیش ڕەتیان دەکردەوە، کە کەمترین شتمان پێشکەش بکەن. وەك چۆن تەنیا پیرەمێرد و ژن و منداڵمان دەبینی. ئێمە سی کەسێك دەبووین، تەتەرەکانمان پەنایان بۆ ڕێگەچارەی ئاسایی برد و قامچیەکانیان ڕاکێشا و ئەزموونی پەسندکراوی خۆیان بە ئازادی پیادەکرد. دەموودەست، بینیمان گروپێك سوارەی تەواو ساز لە پێدەشتەکەوە گوێبیستی شەقەی قامچی بووبوون بە هەڵەداوان بەرەو لای ئێمە هاتن. من کە ئەوەندەجارە کاریگەریی گورزی قامچیم بینیبوو، دەستم نەکرد بە داگرتنی باری ئەسپەکەم و هەستیشم بە مەترسی نەدەکرد تەنیا ئەوکاتە نەبێ، کە بیستم تەتەرەکان هاواری جەنگ دەکەن و ئاوڕم بەلایان دایەوە بینیم هەموویان شمشێرەکانیان هەڵکێشاوە.

لەکاتێکدا دوژمنەکان پەلاماریان دەداین، خەڵکی گوندەکەش دەموودەست لە دواوە بەرد بارانیان دەکردین. دوژمنەکان ژمارەیان لە ئێمە زیاتر بوو بەڵام چەکەکانیان لە ئاست چەکەکانی ئێمەدا نەبوو و وەکوو پیاوەکانی ئێمەش لە شەڕ ڕانەهاتبوون، کە ئازایەتییەکی بێوێنەیان نواند. عەلی ئاغا چولنگی لەناویان دا دیاربوو و توانیمان ناچاریان بکەین ڕابکەن. یەکێك لە پیاوەکانی ئێمە بە شمشێر ناولەپی بریندار بوو و یەکێکی دیکەش بە قورسی

---

جۆری ئەم ماسیانە دیاری بکات. خەڵکەکە ئەوە دووپات دەکەنەوە ئەوەی گۆشتیان بخوات دەمرێ چونکە گۆشتەکەیان پیرۆزە و دەشێ خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بە شێوەیەك ڕەفتار بکەن لە بەرامبەر ئەوەی کە ئەگەر بەڕاستی کەسێکی ژیاندۆستی شانازیکار بەخۆی هەبێ جورئەتی ئەوە بکات تەحەدای ئەو ترسە بکات کە هێمای بۆ دەکەن.

شانی بریندار بوو. هەرچەندە ئەسپەکانمان لە ڕەوشێکی باشدا نەبوون بەڵام هەر بەدوایاندا کەوتین و دوژمنەکانمان کشانەوە ناو ڕێگەیەکی تەسك و تریسك کە پەلاماردانیان مەترسیدار بوو.

بەرپرسە تەتارەکەمان کە کەسێکی ژیر بوو، داوای کرد پێکەوە بمێنینەوە و لەیەک دوورنەکەوینەوە نەبادا تووشی نەهامەتیەک ببین. لەبەرئەوەی هەرچی ماڵە لەوناوە یان داخرا بوو یانیش چۆڵ کرا بوو، بۆیە خواخوامان بوو هەر بەسەلامەتیی قورتار بین؛ کە ئاوا بەبێ خواردن و پەناگەیەک مابووینەوە، هەر ئەوەمان بەدەستەوە مابوو چاوەڕێ بکەین تاریک دابێت هەتا پاشەکشە بکەین. لەو ماوەیەدا ڕێبەرە کوردەکانمان گرێبەستێکی شێوە ئاگربڕیان لەگەڵ دانیشتوانەکە بەستبوو، کە قەناعەتیان بەوە هێنابوو کە ئێمە ئامادەین داکۆکی لە خۆمان بکەین و هیچ شتێکی ئاوەها لە دەست نادەین.، بۆیە ئەوان ڕازی بوون لەسەر ئەوەی هەموو چەشنە تەقوتۆقێکی دوژمنکارانە ڕابگرن، بەڵام سەرسەختانە بە هەموو شێوەیەك ڕەتیانکردەوە کە هیچ چەشنە ئازووقەیەکمان پێ بدەن.

سبەینەکەی ١١ ی ئادار، بەیانی لە کاتێکی زوودا ڕۆیشتین، بەڵام نەمانتوانی متمانە بە ڕاستگۆیی و نیازپاکی دوژمنەکانمان بکەین، حەزیشمان دەکرد خۆمان لە هێرشێکی نوێ وەدوور بگرین، شارۆچکەکە کەوتبووە ناو چیایەکەوە و نیوەڕۆیەکەی گەیشتینە ئاواییەك لەسەر کەناری ڕووبارێك کە برێك لە ڕێبەرەکانمان ناویان نابوو زەر*، بە کەڵەک، کە لە تەیمانی بە سەر مەشکەی فوو دراو دروستکراوە، پەڕینەوە. ڕێڕەوی ئاوەکە زۆر تیژڕۆ بوو و پانییەکەی نزیکەی دووسەد و چل پێ دەبوو و هەرگیز بە وردی لەسەر هیچ نەخشەیەك نەمبینیبوو. ڕەوتی ئاوەکە بەرەو ناو چیاکان دەڕۆیشت و پاشان

* Zer

دوورتر بەلای ڕۆژهەڵات دەڕۆیشت و ئەو ڕێگەیەی دەبڕی، کە ئێمە لامان وابوو هەرقەل لەکاتی گەڕانەوەی لە گوزاوجە* بڕیویەتی، ئەم ڕووبارە سنووری ئەو زەوی و زارەیە، کە سەر بە سلێمانییەیە. کاتژمێر و نیوێك لە کەناری ڕووبارەکە وەستاین، پاشان بە ڕێکەوتینەوە و دوای ئەوەی بەلای کەمییەوە سی و حەوت میلێکمان بڕی گەیشتینە ئاواییەکی چکۆڵە بە ناوی گوڵیخان.

لەکاتی باسکردنی کشانەوەی هەرقەڵ دوای هێرشی سێیەمی، دەبێت ئەوە قەبووڵ بکرێ کە وێڕای ئەوەی کۆلۆنێل کینیێر باسی دەکات، ئەوا زۆر لە خۆمان دەکەین ئەگەر بڵێین دەتوانین بڕێك شوێنەوار بدۆزینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ، کە ئەم ژمارە زۆرەی گۆڕستان کە ئەمڕۆ بینیمان وامان لێدەکات باوەڕ بەوە بکەین کەوا جەنگێکی زۆر گەورەی سەخت لەسەر ئەم خاکە کۆنە ڕوویداوە، چونکە شوێنەواری هیچ شارێك یا گوندێك یان کەلاوەیەك نابینین کە ئەوە بگێڕێتەوە کەوا شارێکی گەورە لێرەدا هەبووە. سەرەڕای ئەوە ئەم گۆرستانانە بەو شێوەیە ڕیز نەبوون کە لەو سیستەمە ناسراوەدا هەیە کە لە گۆرستانگەلی ناوچە ئاوەدانەکاندا بینیمان. ئەو گۆڕستانانە لە شوێنێکی تایبەت کۆنەکراونەتەوە، کە ئامادەبن بۆ ئەوەی مردووی تازە بەخۆوە بگرن، بەڵکو بە هەموو لایەکەوە پەرت و بڵاوبوونەتەوە و بازنەیەك پێکدەهێنن کە لە ناوەڕاستەکەی گۆڕێکی کەمێك بەرزتری تێدایە و بە بەرد داپۆشراوە و ئەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دەشێ ئەمە گۆڕی سەرۆکێك بێ و لە دەوروبەریشیەوە گۆڕی سەربازەکانی بن. دواجار ڕەوشی نیسبیی ئەو گۆڕستانانە ئەوەیە کە لەنێوان خۆیاندا هێشتا ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم گۆڕانە دەبێت دوای شەڕێکی خوێناوی هەڵنرابن و هێلێك پێکدەهێنن کە ناوەڕاستەکەی زیاتر لە ئەوپەڕەکانی زیاتر درێژتر دەبێتەوە.

---

* Guazuca

له گوڵیخان* قاڵی زۆر نایاب به جوانترین ڕەنگ دروست دەکەن. کوردەکان ڕێگەیان داین له یەکێك له کوخه پەرپووتەکان بمێنینەوە، بەڵام خواردنێکی نایابی برنج و قەیسیان پێشکێش کردین. چەند کوردێکی ئەم گوندە، لای یەکێك له تەتەرەکانی ئێمە، دوو دەمانچەیان بینیبوو کە درێژیی لوولەی هەر یەکێکیان، بەلای کەمییەوە، هەژدە پەنجە دەبوو ، پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە پێیان بفرۆشێ. وەختایەك تەتەرەکە نەیویست بیفرۆشێ، داوای بیست دۆلاری[1] کرد، دەموودەست پارەکەیان دا، له حالێکدا نرخی ئەم دەمانچەیە ناگاتە چل سەنت. تەتەرەکەم کە گاڵتەی بە نەزانیی کوردەکان دەهات بە پێکەنینەوە پێی وتم کە سەروەتێکی چکۆڵەی کۆکردۆتەوە لەماوەی ئەو دوو هەفتەیەی لە خیوەتگاکەی داود ئەفەندی بەڕێکەوتووین. خەڵکی ئەم ناوە هەموو شتێك کە لە ئیستەنبووڵەوە بهێنی دەیکڕن. ئەو شێوازەی کە ئەم بازرگانییە بەزۆرییەی پێدەکرێ ئاماژە بە زانینی دابونەریتی ئەم هۆزانە دەکات کە بڕێکجار هێندە دەستبڵاو خۆیان نیشان دەدەن کەچی بەشێوەیەکی ئاسایی تاڵانچین. لەو خیوەتگایەی کە هی داود ئەفەندی بوو گرتبوویان و لە کاتێکدا کە کاروانەکە تەنیا سێ ڕۆژ لە بەغداوە دوور بووە گلیانداوەتەوە و چەندین جار هەوڵیان دابوو بە بێهوودەییەوە ناچاری بکەن تا جانتاکانی بکاتەوە. شەو بەزۆر کردبوویانەوە و لە بەیانییەکەی داوایان لێکردبوو نرخی هەر کەلوپەلێك دیاری بکات و دەموودەست نرخەکەیان دابوویێ، ئەوە چونکە وەك هاوڕێ مامەڵەیان لەگەڵدا کردبوو، بەڵام ئەگەر مامەڵەیان دوژمنکارانە بوایە دەشیا ژیانی لەدەست بدات دوای ئەوەی کەلوپەلەکانی ون دەبوو، ئەمە ئەگەر هەوڵی بدابوایە بەرەنگارییان بکات.

---

* Kouli-Khan

[1] لە چاپە ئینگلیزی و فەرەنسییەکەش‌دا هەر نووسراوە (دۆلار) (وەرگێڕ).

دوانزەی مانگ: دوای ئەوەی شانزە میل و نیومان بڕی و لە ڕێگەیەکی چیایی سەخت و دژوار چووینە ناو شیوێك کە شاری کۆیسنجاقی تێدابوو. پێش ئەوەی بگەینە ناو شار کەلاوەی بینایەکی گەورەمان بینی، ڕێڕەوی ئاوێکمان بڕی کە لقێکی ڕووباری کارپووس* یان زێی بچووك بوو و پردێکی بەردینی جوانی لەسەر بوو کە لە کۆندا هەبووە بەڵام داڕووخابوو. ئەم شارە کەوتۆتە ناو بەرزاییێك کە لەم ڕووبارەوە دوورە. ئەم ڕووبارە بەشێوەیەکی بەشیی پاراستوویەتی و شارەکە لە سلێمانی گەورەترە و بینایەکانی باشتر دروستکراون. لەوانەیە ژمارەی دانیشتوانی بەلایٔ کەمییەوە بگاتە دوانزە هەزار کەسێك. مزگەوتگەلی جوانی تێدایە کە گومبەزیان بەسەرەوەیە. هەروەها بڕێك باخچەی دڵگیری تێدایە، کە کەوتوونەتە سەر کەناری ڕووبارەکە. بەگشتی دەتوانرێ بەشێکی زۆری بەسەر زۆر شارگەلی ئاسیەوی دا پەسند بکرێن. شارێکی زۆر پاك و خاوێنە و ئاو و ئاوەڕۆ و بڕێك دامەزراوەی گشتیی دیکەی تێدایە کە ناتوانین لێرەدا ناویان ببەین. بازاری کۆیسنجاق بازارێکی گەورەیە و پڕە لە کەلوپەل. نابێ ئەوە لەیاد بکەم بڵێم لە کاتی هاتنەخوارەمان لەو ڕێڕەوەی کە بە شارەکە دەگەیشتەوە، ئاماژەیان بۆ چیایەك بۆ کردم بە ناوی قەندیل-داغ وەکوو دەگێڕنەوە ئەسکەندەر شەڕێکی گەورەی تێدا کردووە.

ئەم ناوچە چیاییە بەرزە بە کۆیسنجاق کۆتایی دێ کە سلێمانی ناوەندەکەیەتی ، هەرچەندە لەویش بەرزتریش نییە. ئەم بەشە شاخاویترین بەشی چیایی کوردستانە، ڕۆژێکیش دێ کەوا دەزانرێ ئەم تێبینیانەی خوارەوە هەموویان ڕاست و دروستن:

---

* Carpus

١- ئاراستەی گشتیی ڕێگەی کفری-کچان، بە بەردەوامی بەرە و باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات روو لە هەورازە و ماوەی نزیکەی ٥٨ میل چیا و دۆڵان دەبڕێ.

٢- لەنێوان کچان و دۆڵان، بەناو زنجیرە چیایەکی گەورەدا دەڕۆین، کە تا کۆیسنجاق شۆڕدەبێتەوە، لە باکوورەوە بۆ باشوور و زیاتریش بەرەو لای ڕۆژئاوا دەکشێ، وەك ئەوەی نەخشەکان ڕوونی دەکەنەوە.

٣- ڕێگەکە، بە شێوەیەکی گشتیی، لە دۆڵانەوە تا دۆڵی سلێمانی کەمێك دادەبەزێ، دواتر بەرەو باکوور دەبێتەوە ، تا دەچێتەوە ئەو دەربەندەی بۆ کۆیسنجاق دەڕوات و پاشان بەرەو ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوە تا دەگاتە ئەربیل، ڕێگەی ڕاستەوخۆی نێوان بەغدا و مووسڵ.

٤- ڕێگەکە لە سلێمانییەوە تا لوتکەی دەربەندی کۆیسنجاق، بە هەمان ئەو ماوەیەی کە تا دۆڵان شۆڕ دەبۆوە، کەمێك بەرە و هەوراز دەبۆوە.

ئەوەیە سلێمانی کەوتۆتە ناوەندی بەرزترین دۆڵی کوردستان، ئەم دۆڵەش بە چیای سەرکەشی وا دەورەدراوە کە بە درێژایی کاتەکانی ساڵ بەفر دایپۆشیون، زۆرترین تایبەتمەندییەکانی ئاو و هەوای مامناوەندی ئێمەی هەیە، بەم پیت و فەڕییە نایابەیشییەوە کە شان لە شانی پیت و فەڕی ناوچە گەرمەکان دەدات. ڕاستییەکەی دۆڵی سلێمانی بە یەکێك لە بە پیت و فەڕترین دۆڵەکانی جیهان دەژمێردرێ. کوردەکان بۆ خۆیان، کە لە نەوەی کاردۆخییەکان the Carduchians و پارسییەکانی مێژوون Parthians of history (ئەشکانییەکان وەرگێڕ)، لە دەورانی هەرە کۆنەوە نەژادێکی شوانکارەن و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچن ، ئەوان لەم چیایانە، ئەوەندە شانازی بە سەربەخۆیی خۆیان دەکەن، تا ئێستەکەش دابو نەریتی کۆنی خۆیان پاراستووە، کە لە شارەکان لە دەستیان داوە. ئەوەشی سەیرە ئەم ڕۆحیەتی سەربەخۆییە برێکجار

تێبینی مەترسیی لێ بکرێ، تەنانەت بە رووبەڕووبوونەوەش. چیاییەکانیان لە هاونیشتمانییە دەشتەکییەکان جیاوازن. ئەو چیاییانە پیشەیان ڕێگرییە، ئەوان بەردەوام قولاغن و تاقە کاریان ئەوەیە کە بە دوای دەرفەتێکی شیاودا دەگەڕێن بۆ تالان و بڕۆ. بەشێوەیەکی گشتیی پێکهاتەیان بەهێزە ،چالاك و جەسوورن. ڕیشیان پڕ چەناگەیە و خوارووی گۆنایان دادەپۆشێ و بە دەگمەن لێدەگەڕێن ئەوەندە درێژ ببێ. ڕیشیان جۆرێك لە ناکۆکی لەگەڵ سمێڵێکی ڕەش و چاوی شین دروست دەکات، کە وەکوو چاوی هەڵۆ وایە و واپێدەچێ هەمیشە بەدوای نێچیر و لەززەتی تۆڵەسەندنەوەدا بگەڕێ. ئەوان هەمیشە چەکدارن، تەنانەت لە ماڵەوەش دەمانچە، خەنجەر یان شیر و مەتارە هەڵدەگرن و کاتێکیش دەچنە دەرەوە هەمیشە تەورێك یان دەمانچەیەك لەگەڵ خۆیانا دەبەن، یانیش رمێك لەگەڵ قەڵغانێك هەڵدەگرن. نیشانەگەلی بەهێزی و لەشساغیی بە ڕەنگی زەیتوونییانەوە دیاری دەدا، ئەمەش پۆرترێتی ئەو چیاییانە تەواو دەکات و جاڕی ڕێگرێکی بەهێز و سەرسەخت دەدات.

دوای ئەوەش ژنانی کورد دێن و ئەم تابلۆیە تەواو دەکەن، ئەمان کە لە دەورانی گەنجایەتیاندا پێستی ڕووخساری ئەسمەریان زیندوێتی لێدەتکێ و ڕووخۆشن و دەشێ بە فریشتەی چیا دایانبنێین، بەڵام هەر زوو دەبنە سوارچاك و لە هەموو گەشتەکانیاندا بەگەڵ هاوسەرەکانیان دەکەون و لە سۆنگەی شەکەتی ژیانێکی کۆچەرییەوە هەر زوو شۆخ و شەنگیان نامینێ. ئەفسوونی جوانییان بە هەموو ناسکیانەوە لە پانزە تا بیست ساڵی دایە و لە بیست و پێنج ساڵیدا ئیدی لە دابەزین دان. هەمیشە ژن و پیاویان بەسەر پشتی ئەسپەوەن، بە بوێری و لێزانییەوە.

کەم ئەسپ هەیە، لە جەسارەت و خێرایی، شان لە شانی ئەسپی کوردستان بدات، بە تایبەت لە خێرایی بەسەرکەوتن و هاتنەخوارەوەی گردۆلکەی زۆر

لێژاولێژ و سەختدا. کورد عاشقی ڕاوە ئاسکن، بە هەمان جۆش و خرۆشەوەش ڕەدووی ئەم ئاژەڵە دەکەون بەبێ ئەوەی بچووکترین حیساب بۆ سەختیی زەوییەکانیان بکەن، ئەسپەکانیان بارستیان لە ئەسپی دیکە گەورەترە، سواربوونیان دڵنیاترە و زوو ماندوو نابن، جوانی و چالاکی و زیندوویتییان لێوە دەبارێ.

من بە دڵنیاییەوە ناتوانم باسی دابەشبوونە جوگرافییەکانی کوردستان بکەم. ئەم وڵاتە ناوەوەی زۆر نەناسراوە، لەوانەش نییە هیچ گەڕۆکێکی ئەوروپایی هەبێ توانیبێتی ئەم چیاوچۆڵانە بەو ئاڕاستەیە ببڕێ کە ئێمە بڕیمان. لەگەڵ ئەمەشدا وا دیارە ئەم ناوچەیە لە کۆندا زۆر ناسراو بووە، ئەگەر بمانەوێ پشت بەو پارە زێڕ و زیوە یۆنانی و ڕۆمانییانە ببەستین کە لەو وڵاتە دەبینرێن و دانیشتوانەکەی زۆربەی جار بۆ خۆ جوانکردنی ژنان و منداڵان بەکاری دەهێنن. ئەمڕۆ بەشێکی کوردستان سەر بە تورکیایە، بەشەکەی دیکەشی سەر بە ئێرانە، دابەشی سەر چەندین حوکوومەتی چکۆڵە کراوە کە لە لایەن پاشاگەلێکەوە بەڕێوەدەبردرێن کە خاوەنی یەك تۆغ[1]ن و تەنیا بەشێوەیەکی ڕواڵەتی دان بە دەسەڵاتی سەرۆکەکانیان دا دەنێن لێرە و لەوێ بەردەوام لەناو خۆیاندا لە شەڕدان و جیاوازیەکانیان بە دەستی بە شمشێرەوە چارەسەر دەکەن و کێشە و ناکۆکی بە میرات بۆ هۆزەکانیان بەجێدەهێڵن و ڕۆحی تۆڵەسەندنەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان دەگوازنەوە. تاڵان و بڕۆ بەو پێیەی بەرنامەی ڕۆژیانە و ئەم حاڵەتی پاشاگەردانییە دەبێتە بیانووی زۆر تاوانکاری و وەك چۆن کوردەکان تاڵانچی پیشەکارن و کاراکتەری تۆڵەسەندنەوەیان هەیە، خوێناوی و شەڕانین، بۆیە ژیانی حوکوومەتەکانیان هیچ تاسیرێکی وا لەسەر ژیانی ئاسایی ئەوان دانانێ.

---

[1] تۆغ: بریتی بووە لە کلاڤەیەك مووی کلکی ئەسپ و بەسەر ئاڵاوە دەکرا وەکوو ڕەمز بۆ ڕێزلێنان و سێ پلەی هەبووە و سێیەمیان بەرزترین پلە بووە (وەرگێڕ).

هەرچەندە ئەو چیایانە، بە مانای تەواوی وشە، دەبووە کۆتایی ئەو دەربەندەی دەگەیشتەوە کۆیسنجاق، بەڵام تەواوی ڕۆژی ١٣ ی مانگ و ١٤ ی مانگیش تاوەکوو نیوەڕۆ، هەر بەسەر ئەو گردۆلکە بەردینانەدا دەڕۆیشتین، کە پڕ بوون لە دۆڵی پان و بەرین و ڕێگەی سەخت و دژوار. چەندینجار دز دەهاتنە سەر ڕێگامان و پێشی کاروانەکەمان تا بمان وەستێنن، بەڵام ئێمە بایی ئەوەندە هێزمان هەبوو وەڵامیان بدەینەوە و ئەوەندەش بارمان پێنەبوو تا چاوچنۆکی ئەوان بوروژێنین. ئەوەبوو بە بێ ئەوەی هیچ ڕوویدا گەیشتینە ئەربیل، ئەربیلای کۆن. دوای ئەوەی بەناو بازاڕ و شەقامی زۆر پیس و پۆخڵدا ڕەتبووین، ئێمەیان بردە ناو جوانترین ماڵی شارەکە. ئاسان بوو کە ببینرێ وێرای ئەو پێشوازییە گەرمییەی کە لێیان کردین، هاوڕێگە گورجییەکەمان، کۆیلەی گوێڕایەڵی پاشای بەغدا، پێی وابوو وەکوو پێویست پێشوازیان لێ نەکردووە. ڕۆڵی کەسایەتییەکی گەورەی گێڕا و بۆ پاراستنی کەرامەتی خۆی بێدەنگییەکی زۆری هەڵبژارد و تەحەفوزێکی لووتبەرزانەی نیشان دا و ڕەفزی ئەو لەباوەشگرتنە دۆستانەیەی کردەوە، کە حاکمی شار ویستی بۆ ڕازیکردنی دۆستایەتی ئەو نیشانی بدات. ئەم زیارەتە بە گوێرەی ڕێوڕەسمی ئەتەکێتخوازیی درەنگ کەوتبوو. گورجییەکە لە هەڵسوکەوتی حاکم هەستی بە سووکایەتی کرد، کە حاکم نەهاتبووە دەرەوەی شار بۆ پێشوازی لێ کردنی و مەراسیمی ڕێزلێنان و سڵاو لێنەکردنیشی لەکاتی گەیشتنیدا، کە ئەمە ڕێزلێنانێکە پێم وایە زۆر لە پایەی گورجییەکە گەورەتر بوو. حاکم بە ساردییەوە خزمەتی نێردراوی داود ئەفەندی کرد و زۆر لەسەر هەق بوو و ترسی لە ئەنجامی ئەو هەڵە سیاسییە بوو، بۆیە هەوڵیدا ئەو کەسایەتییە گرنگە هێور بکاتەوە بەوەی مەرایی بۆ ستایشیکردنی بکات.

دوای ئاشتەوایی و لە ئەنجامدا وتوێژ لەنێوان ئەو سەرۆکە بەجەرگانە، حاکم هەموو لەشکرەکانی ئۆردوو و پیاوانی وڵاتی لەناو ئەو گۆڕەپانە کۆکردنەوە کە لەوماڵەدا بوو، کە ئێمەی تێدابووین و دوای ئەوەی چەند تەقەیەك بە ئاسماندا کران، ئەو فرمانەی سوڵتانی گەورە خوێندرایەوە کە تێیدا داود ئەفەندی کراوە بە پاشای بەغدا. هەموو پیرۆزباییان لەیەك کرد و دەستی یەکیان گرتبوو و شاییێکی خۆشی هێمنیان دەست پێ کرد و لەگەڵ گۆرانییەکی بە منگەمنگ و بێزارکەر کە سەرۆکی ئاهەنگەکە پێشکەشی دەکرد. ئاسان بوو ببینرێ کە ئەم دیاردەگەلی خۆنیشاندانانە لە دڵەوە نییە، هەندێکیان تەنیا ئاهەنگ دەگێڕن بۆ گۆڕینی ستەمکارێك بە ستەمکارێکی دیکە، کە ئەمە گۆڕانێکە لێرە لە ڕۆژهەڵاتدا لەسەر حیسابی حاکمەکان دەبێت، چونکە خەڵك لە دەسەڵاتدا شوێنەکە بە دەستکەوت دەزانن و جێیناهێڵن تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە سەریان بپەڕێ. ناوە ناوە خەڵکی ڕەشۆك دەهاتنە ناو ئاهەنگەکە و هیتافیان دەکێشا. هەرکاتێکیش دەنگیان زۆر بەرز نەبوایە خەڵکانێك بە بیانووی پاراستنی ڕیزەکانەوە شانی خەڵکەکانیان لە ڕاست و چەپ دەجولاند تا ئەوەی زۆر بەرزتر هاوار بکەن. لە کۆتایی شاییەکە بەشێوەیەکی نارێك و پێك بە هەموو چەك و چۆڵ و دەمانچەکانی ئۆردووەکە تەقە بە ئاسماندا دەکرا و جا وەك چۆن زۆربەی ئەم چەکانە فیشەکیان تێدابوو، خۆشبەختانە هیچ ڕووداوێك ڕوویان نەدا.

وەختایەك ئاهەنگەکە کۆتایی هات، بەدبەختی ئەوەم بوو وەکوو ئەورووپاییەك ناسێنرام و هەر دەموودەست هەرچی نەخۆش و پەککەوتەکانی شارەکە بوو هوروژمیان بۆ هێنام کە لایان وابوو من چاکیان دەکەمەوە و شاش بوون و باوەڕیان پێم نەکرد، کە من ئاماژەم بۆ شمشێر و دەمانچەکەم کرد، کە پیشەی من کوشتنە نەك چاککردنەوە. یەکێك لەنێویاندا پێی داگرت و وایکرد،

کە من ڕۆڵی "بەزۆر کراوە بە دوکتۆر"[1] ببینم و هەموو نەخۆشەکانی لێم دوورخستەوە و پێی وتم کە ئەو هەقی بووە بیانووەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لێیان ڕزگاری بێ و خۆی وەك پیاوێکی گرینگ و لەسەر ئاستی حاکمی شار ناساند و داوای لێکردم ڕای خۆم لەسەر ئەو نەخۆشییەی بدەم، کە وەسپی کرد و ئەو چاك دەزانێ کەوا ئەوروپاییەکان، بە تایبەتی ئینگلیزەکان، دەستی پزیشکییان هەیە و زانستکارن، تەنانەت ناوی چەند ژمارەیەك لە کاربەدەستانی ئێمەی هێنا کە ئەوانە پزیشکەگەلی کارامە و زیرەکن و هەتا ئاماژەی بە ڕیشی درێژی یەکێکیان و جدیەتی ئەو کرد لە مامەڵەکردندا. ئیدی هیچ دەرفەتێکم لەبەردەمدا بۆ نەمابەوە بۆ ئەوەی خۆمی لێ ڕزگار بکەم و لە ترسی ئەوەی نەوەکا هەیبەت و قیمەتی خۆم وەکوو ئینگلیزێك لە دەست بدەم و لەبەر ئەوەش، کە حەزم نەدەکرد ڕۆڵی پزیشك یاری بکەم، ئامۆژگاریم کرد تا سەفەری بەغدا بکات بۆ عەمەلیاتێك کە دەمزانی نەخۆشیەکەی پێویستیەتی و بۆ ئەوەی خۆم لە دەست پێداگرییەکەی ڕزگار بکەم، ژەمێك لەو دەرمانانەی کە پێم بوو دامێ، پاشان داوای لێ کردم چارەسەرێکی بۆ لاوازی یەکێك لە ئۆرگانە دیاریکراوەکانی بۆ بدۆزمەوە، دەزانم هیچ شتێك نییە لە جیهان چارەسەری ئەمە بکات، پێم گوت کە من نازانم و بە هیچ شێوەیەك نازانم دەرمانێك بۆ چارەسەری ئەم لاوازی و بێتواناییە هەبێت. کاتێك ئەوەم پێگوت، پێی گوتم کەوا دەرمانەکەم تاقیدەکاتەوە بەڵام چیتر باوەڕی بە زانایی من نەکرد.

ئێوارە داوەتی سەر خوانێکی وا شاهانە کراین، کە بەلای کەمییەوە چل جۆر خواردنی هەمەچەشنەی لەسەربوو. کوڕگەلی حاکم بە میوانەکان ناسێنران، پاشان حەکایەتخوان  و دواتر مۆسیقازانەکان کە بۆ خۆشی ئێمە هاتبوون پێشکەشکران. بەو پێیەی کە بە قورسی لە مانای گشتی ئەوە دەگەیشتم کە بە

---

[1] ئاماژەیە بۆ شانۆنامە بەناوبانگەکەی مۆلیێر (بەزۆر کراوە بە دوکتۆر) (وەرگێڕ).

تایبەتی پێیان دەوتم، بە ئاسانی گریمانەی ئەوەیان کرد، کە من هیچ خۆشییەك لە گوێگرتنی چیرۆك گەلێك نابینم کە بابەتەکانی بۆ من نادیارن و ناتوانم تێیان بگەم. هەرچی تایبەت بە مۆسیقاکە بوو ئەوەندە سەرەتایی و نەشاز بوو، کە تەنیا گوێچکەی تورکی دەیتوانی بە دڵی بێت و بە سروودی شاعیرە گەڕۆکەکانی ناوچەکانی باشووری فەرەنسا دەچوو کە لە ئاواییەکی لۆنگدۆکی* (باشووریی) ئەو وڵاتە گوێبیستی بووبووم، بەڵام جیاوازیان زۆر بوو و مۆسیقاکە زۆر لە خوارووتر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕێیەکانم خۆشنوود بوون و بە بێ پەشیمانبوونەوە وەکوو باجی سوپاسگوزاری و پێزانینی ئەو پێشوازییەی کە لێوەیان کردم چەپڵەم بۆ لێدان. تورکەکان وەك ئاسیاییەکان هەستیار نین لە بەرانبەر سازانیی ئاواز و وەبیرم دێ، کە لە یەکێك لە ئاهەنگە گشتییەکان و لە دەرباری نیزامدا، وەختایەك گرووپی مۆسیقای سەربازیی ئێمە یەکێك لە جوانترین سەمفۆنییەکانی دەژەنی، داوایان لێکرد ئەو مۆسیقایە دووبارە بکاتەوە، کە پێشتر ژەنیبووی و تەنیا سازانێکی ئامێرەکان بوو و بەس.

دوای ڕۆیشتنی میوانەکان ، خۆم ئامادەکرد لەسەر ئەو قاڵی و بالیفەی ناو هۆڵەکە بخەوم کە ئێوارە نانمان تێدا خوارد، وەختایەك تەتەرە چەپەڵەکە هات و داوای لێ کردم تا بچمە ژوورێکی دیکە لە نهۆمی خوارەوە. سەرەتا وای بۆ چووم کە ئەو هۆڵەی ئێمەی لێبوو بۆ کاری دیکە تەرخانکراوە و لەسەر ئەوە بووم دەربچم، زانیم کەوا ویستوویانە من بگوازنەوە تەنیا بۆ ئەوەی جوانترین بینایەکە بۆ هاوەڵە گورجییەکەمان بەجێبهێڵن، هەستم بە تووڕەیی کرد بەو ئیهانەکردنەم، بۆیە وێرای ئەو هاوارانەی کە دژی من بەرزبوونەوە کەچی من ئەو شوێنەم هەڵبژارد کە بۆ من ئاسوودەتر بوو و بە ئارامی تێیدا خەوتم. لەوانەیە بڕێکیان ڕەخنەیان لە هەڵسوکەوتی من بووبێ و منیان بەبێ ئەدەب و

---

* Languedoc

کەم نەزاکەت دانابێ، بەڵام تاقیکردنەوەم لەگەڵ سروشتی ئاسیاییەکان، فێریان کردبووم ئەگەر دەرفەتی وا لە دەست بدەم ئەوا هەیبەت و ئەو مەرتەبەیە لە دەست دەدەم کە لە نەفسیەتی ئەواندا هەمە. لەو دەروناوچانەی کە باڵادەستیی قانوون ناناسن، ئەگەر نەوازش و خاکەڕایی خۆت نیشان بدەی، ئەوان ئەوە یان بۆ ترس یان بۆ هەست کردن بە خۆ بە کەمزانینت دەگێڕنەوە. بەو پێیەی کە شەرەفی ئەوەم هەبوو لە حزووری پاشادا دابنیشم، وەختایەك ئەم کۆیلە پیسە هێشتا بە کۆیلەش قەبووڵ نەکرابوو، بۆیە لەوە بێگومانم کە لە خەیاڵدانی هاوڕێکانم وا هێمام بۆ دەکەن کە لە مەرتەبەیەکدا بم، کە بۆ من گرنگە لەو مەرتەبەیە نەیەمە خوارەوە.

ئەربیل، ئەربیلای کۆن بەو جەنگەی کە ئەو ناوەی هەڵگرتووە، وێرای ئەوەی کە جەنگەکە لە دوورییەکی لەو دوورتر ڕوویداوە و بەو پەنا بردنەی کە داریۆش دوای شکستەهێنانەکەی پەنای بۆ بردووە، بەناوبانگ بووە. ئەربیل، شارێکی ناشیرین و پیس و پۆخڵە و ناوەڕاستەکەی پاشماوەی قەڵایەکی لێیە کە ڕووخاوە. هەروەها دەکەوێتە سەر ئەو بەرزاییە دەستکردەی کە دەڕوانێتە سەر پێدەشتەکە. بەچاو وەکوو بارستێکی بێشوماری کەلاوە و کەرەسەی بەسەریەکداکراو دیارە. دانیشتوانەکەی بریتین لە مەسیحی، عەرەب، تورك، کورد، جوولەکە و ئێزیدی یان شەیتانپەرستەکان. لە ئەربیل جۆرە پەتوویێکی گەورە دروست دەکەن کە ناسراوە بەوەی بەرگریی لە شێ دەکات.

لە بەیانییەکەی پانزەی مانگ ئەربیل-مان بەجێهێشت و حاکم بۆ خۆی لەگەڵ یەکێك لە پاسەوانەکانی شەرەف بۆ ماوەی سێ میل هاوەڵی کردین و بە ڕێزلێنانێکی گەلێك زۆرەوە ئیزنی لە گورجییەکەمان خواست بە بێ ئەوەی بە باقی هاوڕێکانم بڵێ ماڵئاوا. دوای ئەوەی ماوەی پێنج کاتژمێر بەناو پێدەشتێکدا ڕۆیشتین کە برێك گردۆلکەی هەبوو، گەیشتینە زێی گەورە و

هۆزێکی چکۆلەی ئیزێدی (شەیتان پەرستەکان)مان بینی کە یاریدەیان داین بەسەر قەمیشی بەستراو بە پێستی مەڕی بە هەوا فووکراو ئێمەیان پەڕاندەوە. ئەوانە هەر تەواوێك ڕووت و قووت بوون، هەژار و کلۆڵ دیاربوون و لە کەناری ئەم ڕووبارەدا بە پەراندنەوەی گەڕۆکەکان دەژیان، لە پەڕاندنەوەی ئەسپەکانیشمان زۆر کارامە بوون. تەنانەت منداڵە بچکۆلەکانیان دوو یان سێ ئەسپیان زۆر بە ئاسانی دەپەڕاندەوە، تەنیا تاقە ئەسپێکمان لە دەستدا کە دوای ئەوەی خەریك بوو بگاتە ئەوبەر کەچی ویستی بگەڕێتەوە دواوە. کاتێك هەموومان گەیشتینە ئەوبەری زێیەکە، لە کاتی ئەوەی خەریکبوو لە ئەسپەکەم سواربم، کەسێکی نامۆ پێشی پێ گرتم و داوای بەخشیشی لێ کردم، بڕێك پارە بەس بوو بەڵام لام نەبوو. قرۆشێکم دایێ، بە چاوێکی سووکەوە قرۆشەکەی دامەوە و داوای زیاتری لێ کردم، منیش قرۆشەکەم وەرگرتەوە و بە هێمنی خستمەوە گیرفانمەوە. ئەو چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستەی لە من نەدەکرد و ویستی لغاوی ئەسپەکەم بگرێ و هەوڵیدا بمهێنێتە خوارەوە و بە کافر و مەسیحی سەگ بانگی کردم، منیش بە دەسکی قامچیەکەم لێم دا و بەرم دایەوە هاوڕێکانم بەم نمایشە زۆر پێکەنین و پێیان گوت کە ئەو من ناناسێ و من مەسیحی نیم بەڵکو من ئینگلیزم. ئەمە دەستنیشانکردنێکی زۆر سەیر و سەمەرە بوو بۆ من.

پانایی زێی گەورە سێسەد پێ دەبێت، لەم وەرزی ساڵەشدا قووڵ و زۆر تیژڕۆ بوو. پاشان پێدەشتێکمان بڕی لەوەی پێشوو دەچوو. لەم ڕۆژەدا دوای ئەوەی نزیکەی چل و دوو میلمان بڕی گەیشتینە قەرەقووش، ئەمیش ئاواییەکی گەورەی زۆر پیس بوو، هەندێ لە دانیشتوانەکەی ئێزیدین. زۆربەی ماڵەکانی قوبەیەکی بچووکیان لە ناوەڕاستدایە کە ئەمە ڕووکارێکی جیاکەرەوەی بەم ناوچەیە بەخشیوە. دانیشتوانەکەی شەرافەتمەند دیارن و باری گوزەرانیان چاکە،

پیاوەکانیان گورج و گۆڵ و توووند و تۆڵن، ژنەکانیشیان تا بڵێی جوانن. لەگەڵ ئەوەشدا من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە زانیارییەکانی کاپیتان مەکدۆنالد کینێیر[1] بەگشتی زۆر وردن، بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێم کە من تێنەگەیشتم بۆچی کینێیر ئەم گوندەی بە مەمیومی کۆن* دادەنێ، قەرەقووش بە لای زۆرییەوە چل و دوو میل لە ئەربیل دوورە، لە کاتێکدا ئاوایی مەمیوم بەلای ئەوەوە خۆی بە ماوەی چوار ڕۆژ دادەنێ، کە بەلای کەمییەوە بە کەمتر لە هەشتا میل ناخەملێندرێ.

تەتەرەکەم لە قەرەقووش بە تەواوی پەردەی لەسەر خۆی هەڵماڵی، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی برێك لە هاوڕێکانم وەکوو نموونەی ئاغریی خۆی نیشان بدات. پیاوە گەپجارەکە لە مەنزڵ خانە (کاروانسەرا) خۆی خزاندە ناو ژوورێکی تایبەت لەگەڵ چوار لە هاورێیە سەرەکیەکانمان بە مەبەستی شەراب خواردنەوە تا سەرخۆش بوون بە هەمان ئەو ئاستە جدییەی کە نوێژەکانی تێدا دەکات. بۆ بەدبەختی، یان بۆ ئەوەی باشتر بڵێم بۆ خۆشبەختیی، شەرابیان کەمبووە و بۆ ئەوەی بتوانن پرۆژەکەیان جێبەجێ بکەن، وەك ئەوەی چیتر شەراب لەناو شاردا نابینن، ناچار دەبن بچن بخەون پێش ئەوەی بە ڕەوشی خۆشنوودی سەرخۆشیان بگەن کە بە نیاز بوون بەسەری ببەن.

**١٦ ی مانگ**: بەوەی بە سەرپشتی ئەسپگەلی چاك و نایاب کەوتین و بۆنی شەراب، کە شەوی پێشتر پێنج لە هاوڕێیەکانمان خواردبوویانەوە، هێشتا

---

[1] مەبەست لەوە ئەو سەفەرنامەی کینێیرە، کە ساڵی ١٨١٨ لە لەندەن بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە و لە سەفەرنامەی دووەمی ئەم کتێبەشدا کراوە بە کوردی، بڕوانە:
John Macdonald Kinneir, Journey through Asia Minor, Armenia, and Koordistan, in the years 1813 and 1814; with remarks on the marches of Alexander and retreat of the Ten Thousand. London : John Murray, 1818, 1 vol. (XII-603 p.)

* Memmium

تەواو نەبووبوو، وایان لێکردین کە بە خێراییەکی وا سەفەر بکەین کە لە سەفەرەکانی پێشووماندا نەمانبینیبوو، بە تووڕەیی هاواریان دەکرد، بۆ ئەوەش خێراتر بڕۆن، بە بەردەوام بە قامچیان لە ئەسپەکانی خۆیان و ئەوانی دیکەیان دەدا تا بە هەنگاوی گەورە بڕۆن، ، هەرچەندە ماوەکە بەگوێرەی نەخشەکان پانزە میل دەبێت، بە نزیکەی کاتژمێر و نیوێك گەیشتینە مووسڵ.



تابلۆی ژمارە: (٤) سلێمانی پایتەختی کوردستان

# فەسڵی دووەم[1]

پاشماوەکانی نەینەوای کۆن-گۆڕی یۆحەننا- وەسپی مووسڵ- سەفەر بۆ نەسیبین بەناو بیابانە بچووکەکەیدا - گەیشتن بە ماردین- وەسپی شارەکە- وردەکاریی لەبارەی ئێزیدییەکان یان شەیتانپەرستەکان.

---

(1) ئەم فەسڵە، لە چاپە فەرەنسییەکەدا، دەکاتە فەسڵی دوازدەهەم (لا:٣٠٣-٣٢١)، هەرچی لە چاپە ئینگلیزییەکەیە دەکاتە فەسڵی دەیەم (لا: ٢١٧-٢٢٩) (وەرگێڕ).

مووسڵ بە شێوەیەکی گشتیی وا دێتە بەرچاو، کە کەوتبێتە بەرانبەر ئەو شوێنەی کە جاران نەینەوای بەناوبانگی لێ بووە. ئەم شارە کەوتۆتە سەر کەناری ڕۆژئاوای دیجلە، نزیکەی چوارسەد میلێك لە بەغداوە دوورە، بە پردێکی پانزە کەوانەیی دەیگەینێ، بەڵام لەبەر ئەوەی پێنج کەوانەی ناوەڕاستەکەی دارما بوون، ڕووبارەکەمان بە کەلەکێکی دارین بڕی. من نازانم ئەوە دووپات بکەمەوە داخۆ بەرزاییەکانی زەوی و ئەو کەرەستەگەلە نەناسراوانەی کە لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتیدا دەبینرێن بەشێك بوونە لەو شارە گەورەیەی کەوا گریمانە دەکرێ لەم شوێنەدا دامەزرابێ. بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم ڕایە دەبێت زانیاری زۆر فراوانتر، پشتئەستوور بە بەڵگەوە، لەبەردەستدابێ. بەڵام ئەوەی جێگەی گومان نییە کەوا لە مەودایەکی زۆر کەمی شارەکەدا، چەند بەرزاییەکی بێشومار دەبینرێ کە پێدەچێ دەستکرد بن و بەزۆری لە کەلاوەکانی بابل دەچن. یەکەمیان نزیکەی یەك میل لە مووسڵەوە دوورە و لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلەیە و چێوەکەی نزیکەی یەك میل دەبێت. دووەمیان زۆر بەرزترە، بەڵام پانتاییەکەی کەمترە و بینایەکی بەسەرەوەیە کە قوبەیەکی هەیە دەڵێن گڵکۆی پێغەمبەر یۆحەننا[1]یە و جوولەکەکان زیارەتی دەکەن و ئاواییەکی بە دەورەوەیە بە ناوی کۆنی شارەکە، کە وا باوەڕ دەکرێ ئەمە پاشماوەی شارەکە بووبێت. ڕێبەرەکەم دڵنیای کردمەوە کەوا بەرزاییی لەو شێوەیە بۆ ماوەی چەندین میل لە پێدەشتەکە دەبینرێ و بڕێك کوخی پێ نیشاندام کە لەسەر بەرزاییەك بوون، لە بەسەرکەوتنی بە ئاڕاستەی ڕووبارەکە، وەك ئەوەی بە ئاڕاستەی ئەو بەرزاییانە بن، کە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی نادر شا.

---

[1] دیارە ئەمەیان مەزاری یونس پێغەمبەرە (وەرگێڕ).

پێم وایە زاناکان سەرقاڵی ئەوەن بە وردی ئەو شوێنە دیاری بکەن، کە جاران ئەم شارەی لەسەر بنیات نراوە. بیروڕاکان دابەش بوونە لەنێوان ئەوەی کە ئەم بەرزاییانەی کە کەوتۆتە بەرانبەر مووسڵ و ئەو شوێنەی کە گۆڕی پێغەمبەر یۆحەنای لێیە و دەوروبەری ئاواییەکی چکۆڵە، کە بڕێك لە کووخەکانیان پێ نیشان دام. بەڵام ئەگەر بە وردی تێبینی ئەوە بکەین کە ئەو شارانەی لەسەر کەناری ڕووبارێك درووست دەکرێن بە شێوەیەکی ئاسایی شەقامەکانی بە ئاڕاستەی ڕێڕەوی ڕووبارەکە دەبن. نەینەوا هەمیشە وەکوو شارێکی گەورەی بێ شومار نیشاندراوە، بۆیە هیچ شیمانەی ئەوە ناکرێ کەوا ئەم دوو ڕایە لەسەر بنەمایەك هەڵنرابن و ئەم شارە گەورەیە ڕووبەرێکی ١٨ میل زەوی بە درێژایی ڕووبارەکە دەگرێتەوە. جا ئەگەر لە لای مووسڵەوە بۆی بچین بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو بەرزاییە کەڵەکەبووە خۆڵییە دەدۆزینەوە کە دەکرێ گریمانەی ئەوە بکرێ کەلاوەی کۆشك، یا پاشماوەی دیوار و بینای سەرەکی نەینەوا بن. بە پشت بەستن بەم مەنتیقە، دەکرێ بوترێ مووسڵ لە بنەواندا سنووری لای باشووری شارەکە پێکدەهێنێ.

ئەم شارە لەم ڕەوشەی ئێستەیدا هێشتا شارێکی زۆر گەورەیە، وێرای ئەوەی کە لە کاتی لەناوچوونیدا دیواری بەردینی زۆر بەرز دەوریان داوە. پێش گەمارۆدان، کە دواتر قسەی لەسەر دەکەم، شارێك بووە وەك دەڵێن بیست هەزار ماڵ بووە: سێ چارەگی ڕووخاوە و ئێستە تەنیا نیوەی ئەو ماڵانەی لێ ماوەتەوە. بە گریمانەکردنی شەش یان حەوت کەس بۆ هەر ماڵێك، دانیشتووانی شارەکە دەگاتە چل تا چل و پێنج هەزار کەس: لەوانە دوانزە هەزار مەسیحی، کە سێزدە کەنیسەیان هەیە و هەزار و شەشسەد ماڵن، ماڵەکانیشیان خراپ نین. لە ناوەوەی شارەکەش کەلاوەگەلی زۆری لێیە، بەڵام بینایەی جوانی نایابی تێدایە، حەمام و مزگەوتی جوانی لێیە، حەمامەکانیشی لە جوانترین ئەو

حەمامانەن کە لە ژیانمدا بینیبێتم، ڕووکاری دەرەوەیان لە مەڕمەڕە و زۆر پاك و خاوێن و ناسکن. لەناو ئەو شانزە مەنزلخانە* (کاروانسەرا)یەی کە هەن، (دە) یان (دوانزە)ەیان زۆر گەورەن و هەموو شتێك بە گەڕۆکەکان دەدەن، کە ئەمە دابونەریتی خەڵکی وڵاتی ڕۆژهەڵاتە.

دانیشتووانی شار زۆر لە شارەکانی دیکە کراوەترن. ژنەکان ئەوەندە بە خۆپارێزییەوە وەك لە بەغدا وایە، خۆیان داناپۆشن. بازرگانی قاڵی و ئامرازگەلی ئاسن و مس و کەرەستەی ئەسپسواریی، شێوەیەك لە شێوەکانی دەوڵەمەندی و متمانەیەك نیشان دەدات، کە لەناو هەمان شارە گەورەکانی دیکەدا نابینرێ. مووسڵ لەگەڵ ناوچەیەکی بچکۆڵەی دەوروبەری لەژێر حوکمڕانی سەربەخۆی پاشایەکن لە پلەی یەکەم[1]. ئەم شارە بە بێهوودەییەوە لەلایەن نادر شا لە دەورانی حوکمڕانی حوسێن پاشا، گەمارۆ درا و مەسیحییەکان بە حەماسەتبازی و بوێرییەکی وا بەشدارییان لە بەرگری شارەکە کرد، کە بوو بە مایەی ڕێز و سەرسامی هەمووان و تا ئێستەش هەر جێگەی ڕێزن. ئێرانییەکان لە کاتی گەمارۆکەیاندا بێهوودە سێ ڕۆژ بە بەردەوامی پەلاماری شاریان دا کەچی هەموو جارێك دوور دەخرانەوە و هەمیشە هەر بە دۆڕاوی دەگەڕانەوە. هەرکاتێك درزێك لە شوورەی شارەکە درووست بووایە هەر دەمودەست چاك دەکرایەوە. تورکەکان بە خەمساردییێکی زۆرەوە ڕایانگەیاند کە ئەوان پێیان باشترە سەری ژن و کچەکانیان ببڕن لەوەی بەجێیان بهێڵن ببنە دیلی دەستی ئەو گومڕا قێزەونانە.

چیاکانی دەوروبەری مووسڵ چەندین کان ی زیو و بڕێك پارچە بەردی مەڕمەڕی لێیە، جگە لەمانە، نازانم ئەگەر شتێکی دیکەی لێ بێت، کە سەرنج

---

* Menzil-Khaneh

(1) A Pasha of the first order

ڕابکێشێ. ئەو ئێوارەیەی گەیشتینە ئەوێ کاتێکی خراپم بەسەر برد، ئەوەبوو بەیانییەکەی خۆم شوشت ئەوجا بە ئیشتیایەکی چاکەوە گەڕامەوە بۆ کاروانسەرا، بەڵام تەتەرەکەم بە بێ ئەوەی بایەخ بە من و پێداویستییەکانم بدات چوو بووە لای پاشا، هەرچی خزمەتکارەکان بوون، هەمان هەڵسوکەوتیان کرد و هەموو ئەو ئازووقەیەی کە نێردرابوو ماشیبوویانەوە و شتێکیان بۆ من نەهێشتبۆوە. ئەم پشتگوێخستنە هەستی بریندار کردم و وێڕای ئەوەی کە ئەم کلۆڵانە بە من پێدەکەنین. من بە تاك و تەنیام، هێشتا سەفەرێکی ناخۆشم لە پێشدایە لە گەڵیان، کەوایە دەمەقاڵێ لەگەڵیاندا هیچ سوودی نییە، بۆیە بەشوێن پلانە ئاساییەکەی خۆمدا چووم. ئەویش ئەوەبوو بۆیان بسەلمێنم کە من دەتوانم دەستبەرداری ئەوان ببم ، پشت بە خۆم ببەستم. داوام لە یەکێك لە خزمەتکارەکانی کاروانسەراکە کرد، کە لە ویستی چاکی دڵنیابووم، تا هاوەڵیم بکات بۆ گەرماو و، لەبەرانبەر خزمەتەکانی چەند دیارییەکی بچووکم پێشکەش کرد و، پاشان داوام لێی کرد لەگەڵم بێت بۆ بازاڕ بۆ کڕینی بڕێك ئازووقە. ئەوەی بۆ ئامادەکردنی ژەمێکی نایاب پێویستم بوو کڕیم. کاتێک بەو ئازوقەوە گەڕامەوە کاروانسەراکە، بینیم ئاپۆرای هاوڕێیەکان، بە مەیتەرەکەشەوە، لە دەورم کۆبوونەتەوە، بەو هیوایەی کە بەشی خۆیان بەردەست بخەن پاڵیان بە یەکەوە دەنا. بەڵام پێم گوتن ئێوە نانی ئێوارەی خۆتان خواردووە، وێڕای ئەوەی کە ئەوان دەبوو چاوەڕێی منیان کردبایە، چونکە ئینگلیز مل نادەن و لەگەڵ خەڵکی ڕەشۆك لەسەر مێز دانانیشن. خۆ ئەمە ئەگەر لە ڕواڵەتدا بڕێك گەبجاڕیشی تێدا بووبێت، کە بۆ شان و شکۆی من بوو، بەڵام بڕێك سوودیشم لێوە بینی لەگەڵ خەڵکانێك کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم. فەرمانم دا هەموو ئەو خواردنانەی کە بۆ خۆم کڕیبووم بیبەنە ژوورەکەم و جگە لە خزمەتکارە خاکییەکانی کاروانسەرا کە بە حەماس و دڵسۆزییەوە خزمەتیان کردم بەو

هیوایەی کە بەشیان بیێ لەوەی کە دەمینێتەوە، کەسم بەدەورەوە نەما. کاتێك تەتەرەکەم هاتەوە هەستی بە تاسیری ئەم هەڵسوکەوتەی من کرد و لە پیاوەکانمان تووڕە بوو و پۆزشی بۆ هێنامەوە لەوەی کە پشتگوێیان خستبوو.

١٧ی مانگ: ئێستە ئەسپەکان ئامادە بوون، کاتژمێر پێنجی پاشنیوەڕۆ بەڕێکەوتین، و دوای ڕێڕۆیشتنی دوو کاتژمێر و سێ چارەگ گەیشتینە ئاواییەکی چکۆلە. گورزی قامچییەکان وەکوو ئاسایی بەسەر هەموو خەڵکی گوند داباریـن، بەڵام نەمانتوانی هیچ شتێك وەچنگ بخەین. بەڕێکەوتینەوە و دوای دوو کاتژمێر ڕەشماڵێکی عەرەبیمان لە بیابانێکی چکۆڵەی درێژبوەی نێوان مووسڵ و نەسیبیندا بینی و لەوێدا کاریلەیەکیان بۆ سەربڕین و دەستبەجێ کردیان بە شیشەوە. لەگەڵ تەواوبوونی خواردنەکەمان، ڕاستەوخۆ کەوتینەوەڕێ، ئەم جارەیان لە یازدە و نیوی شەو گەیشتینە ناو هۆزێکی دیکە، لەوێش هەر ئەوەندە لە ئەسپەکانمان دابەزین هەتاوەکوو چاوساغمان بۆ پەیدا دەکەن.

١٨ی مانگ: تەواوی شەو تا بەیانییەکەی ڕۆیشتین، ڕۆژەکەی دواتریش، بۆ ئەوەی ئەسپەکانمان ئاو بدەین لە کەنار ڕووبارێکی بچووك وەستاین. لەگەڵ نیوەڕۆ گەیشتینە نزیك گردێکی بەرزی شێوە قووچەك، ڕێبەرەکانمان سەرکەوتن بۆ ئەوەی ئەو بڕە سوارە بناسنەوە کە لە دوورەوە دیار بوون. هەرچی من بووم جگە لە خاڵێکی ڕەش کەوا دیار بوو (با) بەناو تەمتومانێکدا کە ئاسۆکەی تەنیبوو دەیبرد هیچی ترم نەبینی. بەڵام چاوی ڕێبەرەکانمان بەهێز و ڕاهاتوو بوون و بە تاقیکردنەوە دەیانزانی کەوا ئەم خاڵە هێندە نابات گەورە دەبێت و بڵاو دەبێتەوە. لەگەڵ ئەو گەشتیارانەی کە لە مووسڵەوە بەگەڵمان کەوتبوون ئێمە نزیکەی هەشتا چەکدار دەبووین. بەڵام سنجاقەکان[1] بە شێوەیەکی ئاسایی کە زۆربەی جار لە سەدان پیاو پێکدێن بۆ پەلاماردان و

[1] Sinjacks

لەسەر شێوەی دەستەی گەورە کۆدەبنەوە و پەلامار دەدەن و تەتەرەکەمان بڕێك کەشافەی نارد و بەسەر بەرزاییەکە کەوتین.

پێشقەرەوڵە یەکەمەکان گەڕانەوە، پێیان وتین خۆتان بۆ جەنگ ئامادە بکەن. پێش ئەوەی قەرەوڵە دووەکان بگەڕێنەوە دەمودەست هەندێك لە هاوڕێیەکانم دەستیان کرد بە هاواری جەنگ، بە شمشێرەکانیان لە دەمانچەکانیان دەدا بۆ ئەوەی بەهێزی هەرا و زەنا ئازایەتی وەبەرخۆیان بنێن. پێم وابوو کە ڕەوشەکە ڕێگەم پێ دەدات بڕێك لە ڕای خۆم دەرببڕم و داوام لێ کردن بە تەواوی بێدەنگی بپارێزن و بارەکانمان ڕیز بکەن، لەو ناوچانەی کە مکوم نییە و دەکرێ دەرفەتی تێدا بقۆزرێتەوە بیکەن بە مەتەرێز. بەڵام بەم ئامۆژگارییەم ئەو ناوبانگە کەمەی ئازایەتییەی کە لە سوزا* بەردەستم خستبوو خەریك بوو لە دەستی بدەم. هاوڕێکانم وا دیار بوو لایان وابوو کەوا هاتوهاوار چاکترین وەسیلەیە و نیشانەی ئازایەتییە. بەردەوام بوون لە هاتوهاوار، لە کاتێکدا هەندێکی دیکە لەسەر زەوی دانیشتبوون و بە هێمنی سەبیلیان دەکێشا. نیو کاتژمێرێك بەم شێوەیەماینەوە. ئەوکاتە بینیمان پاشماوەی کەشافەکانمان، کە لەلایەن چەند سوارەیەکی دابڕاو لە فیرقەی سەرەکی سنجاقەکان دابڕابوون ڕەدوونرابوون بە هەڵەداوان گەڕانەوە، ئەو چەند سوارەیە تەنیا ئەو کاتە وەستان کە ژمارەی ئێمە و یەکگرتوویی و هێزی شوێنی ئێمەیان بینی، ئەوکاتە بە سەلامون عەلەیکوم سڵاویان لێ کردین و بە هەڕاکردن کشانەوە و پەیوەندییان بە فیرقەی سوپاکەی خۆیان کرد و زۆری نەبرد لەبەرچاو ون بوون.

دڵخۆش بووین بەوەی لە دوژمنێك رزگارمان بوو کە وای بۆ دەچووین بە ئازایەتی خۆمان ترساندمان. دوای بەڕێ کەوتنەوە و دوو کاتژمێر و نیو ڕۆیشتن، بینینی گرووپێکی دیکەی ڕێگر ناچاری کردین شوێنەکانمان لە نێوان

---

* Souza

ئەو کەلاوە زۆرانەی کە لە دەستەچەپمان بوو ڕێك بخەین. پێم وابوو ئەم کەلاوەیە تەنیا کەلاوەی کاروانسەرایەکی گەورە بووە، هەندێك لە هاوڕێیەکانم ئەوەیان بۆ دووپاتە کردمەوە، کە جاران شارێکی گەورە لەم شوێنەدا بووە و لەم بارەیەوە چیرۆکی بێ سوودیان بۆ گێڕامەوە کە هەمیشە ئامادەن لە دەرفەتی هاوشێوەدا بیگێڕنەوە. لە کاتژمێر چوار ڕۆیشتین و تا نیوەی شەو هەر بەڕێوە بووین.

دوای کاتژمێرێك لە حەسانەوە، سواری سەر پشتی ئەسپەکانمان بووینەوە و بە وریاییەکی گەلێك زۆرەوە دەچووینە پێشەوە، تەتەرەکەمان قەدەغەی کردبوو ورتە لە زارمان بێتە دەرەوە و هەتا جگەرەکێشانیش قەدەغە بوو لە ترسی ئەوەی نەوەکا دووکەڵی پاپەکانمان ڕۆیشتنی بێدەنگمان بەدیار بخات. لەوەتای ١٧ ی مانگەوە لە کاتژمێر پێنجی ئێوارەوە ئێمە بەسەر پشتی ئەسپەکانمانەوە بووین بە نزیکەیی بە بێ وەستان و بەبێ وەرگرتنی هیچ پشوویەك و جگە لە چەند سەلکە پیازێك و پارچەیەك نانی ڕەش بەولاوە هیچی ترمان پێنەبوو. بەیانییەکەی ١٩ ی مانگ، ئەسپەکەم لە ماندوێتیان پڕوکا و فڕێمیدایە ناو جۆگەلەیەک. کاتێکیش کاتژمێر دە و نیو لەناو ئاواییەکی پەڕپووت بەناوی ئاغا گحێلی* وەستاین، هیوام خواست کە ئەوەندە کاتەی کە لە ڕۆژەکە ماوە کەمێك تێیدا بحەسێینەوە، بەڵام نیشانەی دەرچوون هەر دەمودەست دەرچوو و دەبوو بچینەوە سواری پشتی ئەسپەکانمان ببینەوە.

تا ئەو ساتە لە هەموو ڕۆیشتنەکانی گەشتەکەمدا زۆر کەم دەرفەتی وام بووە گلەیی لە دانیشتووانی ئەو وڵاتە بکەم کە پیایدا تێپەڕ دەبین. خۆ ئەگەر بڕێك جاریش ڕووبەرووی هەڵسوکەوتی وەك پشتگوێخستن و بێڕێزی بووبمەوە ئەوا لە لایەن تورکی لووتبەرز یان ئەو تەتەرە نیمچە شارستانانە بووە

* Aga Geheli

که لەگەڵ کاروانەکەماندا بوون. بەڵام ئەو ڕۆژە یارییەکیان لەگەڵدا کردم کە زیانێکی زۆریان پێ گەیاندم. پۆتینە تورکییەکانم لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەی کە بەسەر مندا هات شێدار بوو بوو و ئەوەندە تەسك بووبۆوە کە زانیم ئیدی ئەستەمە بتوانم لە پێی بکەم. جوتیارێك، کە یەکێك لە ڕێبەرەکانمان بوو، دەمودەست جووتێك پێڵاوی کۆنی تەواو بەکارهێنراوی پێشکەش کردم و ئەوەی خستە بەردەمم کە تاوەکوو ماردین پووتەکەم بۆ هەڵدەگرێ. من هەمیشە وریایی ئەوەم هەبوو، کە ئاگام لە هەموو چەشنە فێڵ لێکردنێك بێ، بەڵام جوتیارە چەپەڵەکە بە سیمای دەستپاکیی خۆیەوە بەشێوەیەك ڕازی کردم و قرۆشێکیشم پێ دا چونکە بایەخی پێ دام. دوای ماوەیەك زانیم کەوا برایەکەی ئۆردووەکەی جێهێشتووە و پۆتینەکانی منیشی بردووە. یەخەیم گرت و لەسەر ئەوەبوو کە لەبەرامبەر ئەم فێڵبازییە سزای بدەم کاتێك تەتەرەکەم منی گرت و وادەی پێ دام کە تۆڵەم بۆ بکاتەوە، بەڵام ئەو وادەیە هەرگیز جێبەجێ نەکرا.

دواجار لە کاتژمێر دە و نیوی ئێوارە، چووینە ناو کاروانسەرای دووگرووت*. شەومان لەوێدا بردە سەر و ٢٠ ی مانگ کاتژمێر شەش و نیوی بەیانی بەڕێ کەوتین. لە ڕێگە چاومان بە گرووپێکی تەتەر کەوت و پێشنیازمان کرد ئەسپەکانمان بگۆڕینەوە، بەڵام ئەوان ئەوەندە زیرەك بوون کە تێنەکەون و دوای چوار کاتژمێر و نیو لە ڕۆیشتن گەیشتینە نەسیبین[1].

---

* Dougrout

[1] نیسبیس Nisibis، ئێستە نیسیبین Nisibine، شارێکی سەدەکانی ناوەڕاستە، کە سی و پێنج میل لە دیجلەوە بەرەو چارای Charrae (یان حەران Harran) دوورە، شارێکی زۆر بەرچاو بوو و، پێیان وتووە ئەنتۆنیا میگدۆنیاAntonia Mygdonia ، لەناوی ڕووباری میگدۆنیۆسەوە کە بەناویدا تێدەپەڕێت. لە سەردەمی ڕۆمەکاندا

نەسیبین جگە لە پاشماوەی پەڕپووتی شارێك، کە جاران بەرفراوانییەکی زۆری هەبووە، چیتر نییە و کەوتۆتە سەر کەناری ڕووباری مەقدۆنیس* ، ڕووبارێکی زۆر پان نییە بەڵام زۆر تیژە لە لای باکوور شارەکە دەیپارێزێ لە کاتێکدا لە لای باشوورەوە زۆنگاوێك دەیپارێزێ. ئێمە جگە لە کەلاوە هیچی ترمان تێدا نەبینی. پۆستەخانەکەی پیس و پۆخڵ بوو و باقی قەنتەرەکانی ئاو و برێك بینایەی دیکە هێشتا گرینگی کۆنی شارەکە نیشان دەدەن. بینایەکمان بینی، کە پێدەچوو کۆشك یان قەڵایەك بووبێ، دیوارەکانی زۆر کونی گەورەیان تێدابوو، مزگەوتێك لە بەرد کە منارەیەکی بەسەرەوە بوو و پاشماوەی کەنیسەیەکی مەسیحی کە کاتی خۆی پێشکەش بە سانت-ژاك** کرابوو. لە دوورایییەکی هێندە زۆر دوورنا لەم کەنیسەیە کە هێشتا پێنج ئەستوونی لە یەك بەرد هەڵکەنراوی هەبوو کە یەکێکیان پانزە تا هەژدە پێ بەرز بوو، لە سمتی چەپدا.

دوای ئەوەی بۆ نانی نیوەڕۆ و بۆ حەسانەوەمان نزیکەی کاتژمێرێك و چارەگێکی تێدا ماینەوە بەڕێ کەوتینەوە. دوای ئەوەی نزیکەی حەوت میلمان بڕی، کەلاوەگەلێکی بێ شومارمان بینی کە ڕێبەرەکانمان ناویان نابوو سەریکەخان*** و دواتر زانیمان کەوا ناوی ڕاستەقینە قەسری جیهانە****. ئەم کەلاوەگەلە بیری ئەوە دەدات کە ئەمە کەلاوەی قەڵایەکی بەهێزی پانوپۆڕ بووە

---

بەمانای وردی وشەکە پایەختی میزۆپۆتامیا بووە، و لەلایەن قەشەکەیەوە بە بەرگرییەکی باشی لێکراوە لە سەردەمی کۆنستنتن Constanttne لەدژی فارسەکان، بەڵام دواتر لەلایەن ئەوانەوە لە سەردەمی جۆڤیان ک. ڕاولۆف داگیرکراوە.

* Maygdonius

** Saint-Jacques

*** Serika-Khan

**** Caissir-Jehan

که تا ئێستەکەش دیوارە پان و بەرینە بەرزەکانی هەر ماون. ئەوەیان بۆ دووپات کردمەوە کەوا بیرێك لە ناوەڕاستەکەیدا هەیە کە ئاوەکەی زۆر سازگارە و بە پەیژەیەکی بەردین دەتوانین بچینە ناویەوە کە ئێستەش بەشێکی زۆری هەر ماوە. شەو لە حاموودە*، کە ئاواییەکی زۆر بچووکە و دەکەوێتە دووری چوار کاتژمێر لە نەسیبین، ماینەوە.

٢١ ی مانگ، بەیانییەکەی کەلاوەی مەزنی دارا-مان بینی کە جاران شاری سەر سنوور بووە و گرنگییەکی زۆری هەبووە. کاپیتان مەکدۆنالد کینێر وەسپێکی وردی کردووە. دوای ڕۆیشتنێکی پێنج کاتژمێر و نیو گەیشتینە ماردین کە لە کۆندا پێیان وتووە "ماردا". ئەم شارە کەوتۆتە سەر چیایەك، کە بە ڕێگەیەکی سەخت و تەسك و ناخۆشدا دەکرێ بۆی بچین کە لە کۆتاییەکەیدا هەڵکۆڵینی بەرچاو دەبینین کە لە بەرد هەڵکەندرابوون.

حاکمی شار پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین و منیش پێشوازیم لە دانیشتووانە سەرەکییە مەسیحییەکانی شارەکە کرد کە ئازادانە شەراب و نانی زۆر چاکیان بۆ هێنام و پرسیارگەلێکی زۆریان لێ کردم لەبارەی لەشساغی قەشەکەیان و کاروباری گشتییەوە. دوای ئەوەی ئەوان دەرچوون، هاوڕێکانم پەلەیان بوو بەشی خۆیان لەوەی پێشکەشیان کردم وەربگرن و بەشێوەیەك دەستیان بە بوتلەکە دادەهێنا قەناعەتم بەوە هات کە ئامانجیان ئەوەبوو بگەنە ئەوەی تام لەو خۆشییە بکەن لە ورێنەی سەرخۆشیدا دەیبینن. تورکەکان لەم بارەیەوە بێ حەوسەڵەن و ئەوانە کە لە ڕووکاری دەرەوەدا گەورەترین قێزلێبوونەوەیان بۆ هەموو چەشنە شەرابێك دەردەبڕن و بە گشتی بەوەندە دەستبەردار دەبن کە ئاوی سازگار بخۆنەوە.، بەڵام کاتێکیش دەرفەتی شیاویان بۆ بڕەخسێ ئەوا بە چلێسییەوە دەیقۆزنەوە.

---

* Hamouda

شاری ماردین چێوەکەی نزیکەی سێ میلە و دەکەوێتە باشوور و بەسەر لێژاییی گردێکەوەیە کەوتۆتە پاینی قەڵایەکی کۆن بە دامێنی لووتکەی شاخێکەوەیە. شوورەیەکی بەردین دەوری شارەکەی داوە کە دەگاتەوە شوورەی قەڵاکە و نزیکەی هەموو خانووەکان لە بەرد دروست کراون، ئەمە لە ئەنجامدا وای کردووە لە هەموو ئەو شارانە جوانتر بێت کە تا ئێستەکە من بینیومن. ئەگەر چی شەقامەکانی سەخت و دژوارن بەڵام زۆر خاوێنن، چۆنایەتی پاك و خاوێنییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شارێکی زۆر لێژە و کەمترین باران بارین هەموو قوڕ و لیتەیەك لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێ. ماردین بارەگای سەرەکی مەترانی مەسیحییە کاتۆلیکەکانە کە لە بەغدا بینیم و حاکمێك بە ناوی موتەسەلیم، کە لە لایەن پاشاوە دیاری دەکرێ، حوکمی شارەکە دەکات. هەرچی پێکهاتەکانی دیکەی دانیشتووانە بریتین لە مەسیحیی کاتۆلیك، نەستووری و ئەرمەنی.، تورك، عەرەب، جوولەکە و چەند بنەماڵەیەکی ئێرانی و ژمارەی دانیشتووانی بە ٢٠٠٠٠ کەس دەخەمڵێنرێ. دەوترێ کە موسڵمانەکان لەناو دوو هەزار ماڵ و مەسیحییەکان بە هەموو تایەفە جیاوازییەکانیانەوە لەناو هەزار ماڵدا دەژین (تابلۆی ژمارە ٥).

بەرلەوەی ماردین بەجێ بهێڵین دەبێت چەند شتێك دەربارەی ئێزیدییەکانی چیای شەنگال بڵێین کە زۆر بە دەگمەن لە دەرەوەی ئەم شارەدا دەبینرێن. ئەوانە گرۆیەکی توندڕۆن کە بیابانە چکۆڵەکانی نێوان مووسڵ و نەسیبینیان گرتووە و بە شەیتانپەرست ناویان دەبەن. بەڵام من پێم وایە ڕاستتر وایە بگوترێ کە ئەوانە تەنیا هەوڵ دەدەن خۆیان لە تووڕەیی شەیتان بەدوور بگرن. من وای دەبینم کە ئەوان لە هەمان ڕەوشی ئەو ئافرەتە بەساڵاچووەدان کاتێك لەسەر شەرەفی جەلالەتی شەیتان مۆمێك دادەگیرسێنێ. " شەیتان ئەوەندە خراپ نییە وەك ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن"، ئەوان وا دەڵێن و "چاکتر وایە لە هەموو شوێنێك هاوڕێیەکت هەبێت".




تابلۆي ژماره: (٥)
توركێكي ماردين

ئێمه شتێكی زۆر كەم لەبارەی عەقیدەی تایبەتییان دەزانین، چونكە توركەكان تەنیا ڕێگە بەو تایەفانە دەدەن كە كتێبی نووسراویان هەبێت، وەكوو مەسیحی و جوولەكەكان، بۆیە ئێزیدییەكان دەبینین ناچارن لەگەڵ ئەم ڕەوشه باوەڕیان بە پێویستی پێكەوەژیان هەبێ و دەڵێن ئەوان بەگوێرەی ڕەوشەكە موسڵمان، مەسیحی یان جوولەكەن. برێك بانگەشەی ئەوە دەكەن كەوا ئێزیدییەكان ڕێز لە كتێبە پیرۆزەكانی وەكوو قورئان دەنێن و بە هەمان شێوە ڕێز لە دەسەڵاتی ئایینی مەسیحییەكان و موسڵمانەكانیش دەگرن. هەندێكی دیكە دەڵێن ئەوان نەوەی "یەزید"-ن و لەو عەرەبانەن كە حوسێن-ی كوڕەزای

پێغەمبەریان قەتڵوعام کرد و بنەماڵەی عەلی یان بە زۆر و زەبروزەنگ و سەرسەختانە ڕەدوونا. سونەتکردن شتێکی هاوبەشە لەنێوان تورك و موسڵمانەکان، بەشێوەیەك کە هەموو منداڵێکی نێرینە سوننەت دەکرێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەوان پێڕەوی لە هەمان ئاقیدە دەکەن. بەڵام وەك چۆن ئەم سونەتکردنە لەلایەن نەتەوەگەلی دیکەی ئاسیایی و هەتاوەکوو وەك ئەوەی بۆیان دووپاتە کردمەوە کەوا لەلایەن بڕێك لە مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتیش پیادە دەکرێ بۆیە ئەمە ئەوەی لێوە دەرئەنجام ناکرێ کەوا ئەمە لە ئاینەکەیانەوە سەرچاوەی گرتبێت. دوور لەو ڕقەی کە موسڵمانەکان بەرانبەر بە شەراب هەیانە، دەبینین ئێزیدییەکان شەراب پیرۆز دەکەن بەو پێیەی کە ئەمە بەخششێکە لە بەخششەکانی خودایی و حەز ناکەن یەك دڵۆپیشی لێ بڕێژن. کاتێکیش شەراب دەخۆنەوە پیاڵەکە بە هەردوو دەستیانەوە دەگرن و جا ئەگەر وێڕای وریاییان چەند دڵۆپێك ڕژا، ئەوا بە خاك دایدەپۆشن و وەك ئەوەی کە بەشێك بێت دەسەڵاتێکی سەرووتر پاراستبێتی. لەگەڵ ئەوەشدا سەرخۆشبوون زۆر بەدەگمەن لەناویاندا ڕوودەدات، چونکە یەك ساتە وەختی لەبیرچوون دەشێ ببێتە هۆی ئەوەی هەموو هیوایەکیان لە پێکەوەژیانی ئاشتیانە لە دەست بدات.

پرەنسیپێك کە هەموو ئێزیدییەکان پێڕەوی دەکەن ئەوەیە کەوا بەخشندەیی ئافەریدەکار سنووری بۆ نییە وەك چۆن حیکمەتەکەشی بێ کۆتاییە. جا ئەگەر بەڕێزەوە باسی ئەو ئافەریدەیە دەکەن کە بەوە تاوانباریان دەکەن دەیپەرستن، جا ئەگەر ناویان ناوە خوداوەند یا پەروەردگار ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەوان بە توندی لەو باوەڕەدان ڕۆژێك دێ دەگەڕێتەوە بەر ڕەحمەت و کرنۆشی خوداوەند، ڕۆژێك دێت ئەو کەرامەت و شکۆیەی کە لە سۆنگەی یاخیبوونییەوە لە دەستی داوە بۆی دەگەڕێتەوە. کەوایە وەك ئەوەی

ئەوان دەیڵێن بۆچی تووڕەیی بورووژێنن؟ بۆچی دەخالەت لەنێوان فریشتەیەکی لێکەوتوو و خوداوەندەکەی بکرێ؟ ئایا خوداوەند پێویستی بەوە هەیە کە ئێمە نەفرەت لەوە بکەین کە خۆی سزای داوە، ئایا ناشێ لێی خۆش بێ؟ هەروا بێتەوە ئایا پێویست دەکات شمشێرەکەت بەڕووی یەکێك لە نزیکەکانی خوداوەند هەڵبگری کە ئەمڕۆ غەزەبی لێ گیراوە، ئایا ناشێ بەیانی هەموو کەرامەتی بۆ بگێڕدرێتەوە؟

ئەو ئێزیدییانە بە زۆری لە دەوروبەری چیای شنگاڵ دا دەژین، کە یەکێك لەو زنجیرە چیایانەیە کە پێدەشتی میزۆپۆتامیا لە باشوور-ڕۆژهەڵاتی ماردین دەبڕێ و دار مێو، هەنجیر، قەیسی بەشێوەیەکی خۆڕسك تێیدا دەڕوێ. هەرچی لە زستانە لە ئەشکەوتەگەلی هەڵکەندراو لە خوارووی ئەم چیایانەدا دەژین. لە مانگەکانی هاوینیشدا، لە پێدەشتەکە بڵاودەبنەوە و پەلاماری کاروانەکان دەدەن و هەموو گەڕۆکێك کە تووشی ببن بەبێ جیاوازی ڕووتی دەکەنەوە. ئەوکاتە لەسەر شێوەی بیاباننشینەکان ڕەشماڵ هەڵدەدەن و بە شمشێرەوە لەسەر پشتی ئەسپن ، هەروەها بە ڕم و دەمانچە و تفەنگ دەجەنگن و هەروەك پارسەکان* کە لە بەشێکی وڵاتدا دەژین، چاك دەزانن چۆن ئەم چەکانە لە کاتی پەلاماردانداا بەکاربهێنن و لە کشانەوەدا تەقە دەکەن و بە تاوی زۆر خێرا ڕادەکەن و زۆر بەدەگمەن وادەبێت کە ئامانجەکانیان نەپێکن.

ئێزیدییەکان جلوبەرگیان وەکوو جلوبەرگی تورکەکان وایە و بەگشتی پیاویان قۆز، توندوتۆڵ، لەش و لاریان بەهێزە و هەر لە گەنجییانەوە لەگەڵ چەك ڕادەهێنرێن، لەسەر بەرگەگرتنی هەموو شێوەکانی ماندوویێتی و بێبەشبوون ڕاهاتوون. بەڵام خیانەتکار، دڵڕەق و ترسنۆکن، دیلەکانیان دەکوژن یان دوای ئەوەی ڕووتیان دەکەنەوە لەناو بیابان بەجێیان دەهێڵن بۆ ئەوەی لە

---

* Parthes

برسان و له کلۆڵیدا لەناو بچن، چەندین نموونەیان لەبارەی ئەو مامەڵە وەحشیگەرانەیە بۆ گێڕاینەوە کە لەگەڵ ئەو گەڕۆکانەیان کردووە کە کەوتوونەتە ژێر دەستیان. بەڵام لە دوو یان سێ دەرفەتدا بووە، کە بوێری و پێچەقاندنی تاقە کەسێك بەس بووە بۆ تۆقاندنیان و ڕزگارکردنی کاروانێك.

ژمارەی دانیشتووانیان لە ملیۆنێك زیاترە و بەگوێرەی بڕێك لە ڕاپۆرتەکان هەتا دوو ملیۆنیش دەڕوات[1]. دانیشتووان دابەشی سەر چەندین هۆزگەلی بچووکی سەربەخۆ دەبن کە هەر یەکێکیان سەرۆکی خۆی هەیە. دەڵێن هەموویان لە بنەواندا لە پێنج بنەماڵە کەوتوونەتەوە، بەڵام ئەمڕۆ بریتین لە هۆزگەلی کۆچەر و نیشتەجێ. هەندێکیان لەوانە لە ناویاندا لە ئێزیدی سپی و ڕەش پێك دێن: ئەوە ڕەنگی جلوبەرگیانە کە ئەم وەسپەی پێداون. ئێزیدییە ڕەشەکان ئەو پیرانەن کە تەنیا هەر گرینگی بە ئیلتیزاماتی خۆیان نادەن بەڵکو زۆربەی جار هەروا پاسەوانی مێگەلی هاوبەشی هۆزیش دەکەن.

یەکێك لەو خورافیاتە سەیروسەمەرانەی کە بایەخی پێ دەدەن و لەسەر ئەوە تاوانباریان دەکەن، کە لەوانەیە هەق بێت، ئەوەیە کە ساڵی جارێك لە کەناری ئەشکەوتێکی گەورە لە بناری چیای عەبدولعەزیز* کۆدەبنەوە و بەشێك لە شتەکان و زێڕ و زەبەرە هەرە گرانبەهایەکانی خۆیان پێشکەش بە شەیتان دەکەن و دەیهاوێژنە ناو ئەم چاڵە. ئەم قوربانییە تەواو دەکەن کە لەوانەیە ڕەمزی بە چاوی سووك سەیرکردنی ئەوان بێت بۆ ماڵی دونیا، هاوڕێ لەگەڵ ئەم بەخشینەدا، ئاهەنگێکی کافرانە و ترسناك دەست پێدەکەن و بە دەنگی بۆقیە و سیمبال، سەمایەکی کێوییانە لەگەڵ هێماگەلێکی شێتانە وەك

[1] بەدڵنیاییەوە ئەم ژمارەیە ژمارەیەکە زۆری زیادەڕۆیی تێداکراوە، کە لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە لەو سەردەمە ئێزیدییەکان ئەو ژمارە زۆرە نەبوون (وەرگێڕ).

* Abdoul-Asiz

ئەوەی ئیلهامی ئایینیان بۆهاتبێ.

ئێزیدییەکان، ژنەکانیان لە باوکەکانیان دەکڕن و هەرگیز ڕێگەیان پێ نادەن دوای هاوسەری لێیان جیا ببنەوە، تەنیا مەگەر خۆی تەرخانی پەرستگەکەیان بکات و ئەوکاتە ڕێگەیان پێدراوە و دەتوانن جارێکی دیکە ژن بهێننەوە، ئازادییێك کە دەشێ لای ئێزیدییەکان یان شەیتانپەرستەکان هەبێت و ئەمە ئیمتیازێکە دەتوانێ ئەوە لێکبداتەوە بۆچی ژمارەیەکی ئەوەندە زۆری ئێزیدییەکان ڕەشن. نەمتوانی هیچ وردەکارییەك لەبارەی ئەو ئاهەنگانە پەیدا بکەم کە لە دوای مندالبوونیان دەکرێ. بەڵام زانیم کە ئەوان ڕێوڕەسمی مردوویی لەکاتی ناشتنی مردووەکانیان بە خۆشنوودییەوە دەگێڕن بەو مەرجەی مردووەکە بە مردنێکی قارەمانانە مردبێ و بە تۆڵەسەندنەوە نەمردبێ. لەم حاڵەتەدا، ڕێوڕەسمەکە بە بێدەنگی دەکرێ، نزیکترین کەسەکانی مردووەکە وەکوو نیشانەی پرسە و لەدەستدانی شەرەف ڕدێنیان دەتاشن و نایەڵن ڕیشیان درێژبێتەوە تا ئەو کاتەی تۆڵەی مردووەکە دەکەنەوە و کۆستکەوتوویی مردووەکە هێور دەکەنەوە، تەنیا ئەوکاتە مەراسیمی ماتەمیی بۆ دادەنێن.

لەوانەیە ئەو خورافاتەی کە پێشتر باسم لێوەکرد ئەو بیروڕایە گشتییەی لێوە لەدایك بووبێت، کە ئەوانە گەنجینەیەکی گەورەیان لە قووڵایی زەریادا هەیە. جا چ لەبەر چاوتێبڕینی ئەم گەنجینە شاراوەیە بێت یان لەبەر سزادانی دزی و دڵڕەقیان بووبێت، سوڵتان سلێمانی گەورە، بە سوپایەکی بێ شومارەوە پەلاماری دان و تا چیاکانیان ڕەدووی نان، ڕەزەکانی لێ تێکدان و شوێنەواری هیچ سەوزاییەکی بۆ نەهێشتنەوە و سەری سەرۆکەکەیانی بڕی. ڕاپەڕینێکی چەکداری، سلێمانی گەورەی ناچاری کرد ڕووی سوپایەکەی بە لایەکی دیکە وەربگێڕێتەوە و دوای خۆی تەنیا یادەوەریی بەربەرییەت و ڕقێکی قووڵی دژ بە تورکەکانی بەجێ هێشت.

# فەسڵی سێیەم[1]

دەرچوون لە ماردین- تێزیان-وەسپی دیاربەکر-چیای تۆرۆس- مەڵاتیە-دۆڵی سیواس-ڕەوشی جوتیاران لە تورکیا-ئەماسیە-بۆلی- هەندەك-گەیشتن بۆ سکوتاری.

[1] ئەم فەسڵە، لە چاپە فەرەنسییەکەدا، دەکاتە فەسڵی سیانزەهەم (لا:٣٢٢-٣٥٦)، هەرچی لە چاپە ئینگلیزییەکەیە دەکاتە فەسڵی یانزەهەم (لا: ٢٣٠-٢٥٢) (وەرگێڕ).

سپێدەکەی ٢٢ ی مانگ لە چێشتەنگاوێکی زۆر زوودا (ماردین) مان بەجێهێشت. ڕۆژی پێشتر موتەسەلیمی شار حەزی خۆی نیشان دا بەوەی دەمانچەکانی بەر پیشتێنم بکڕێ. بەڵام من زیاد لە نرخەکەی وەك پارە زیاتر بە دەمانچەکانمەوە دڵبەستە بووم، چونکو لەو سەفەرەی کە لە بەردەمما مابوو دەمانچەکان دەتوانن بەرگری لە پارەکەم بکەن ، بەڵام پارەکەم ناتوانێ بەرگری لە کەسیی خۆم بکات. بۆیە من هیچ مەیلی ئەوەم نەبوو لەدەست خۆمی بکەمەوە و بۆ ئەوەش تا زۆر بە ڕەقی داوایەکەی ڕەت نەکەمەوە پێم وت، کە من ناتوانم بە کەمتر لە دووسەد پیاستەر بیانفرۆشم، پێم وابوو کە داواکردنی نرخێکی وا بەرز وای لێ دەکات واز لەو هەوەسەی بهێنێ. کەچی لەو ساتەی کە سواری ئەسپەکەم دەبووم، پارەیان بۆ هێنام و ناچار بووم پابەندی قسەکەی خۆم بم. ئەوە بەم شێوەیە کە پیاوە گەورەکان بازرگانی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتدا دەکەن. بەڵام ئەو گەڕۆکەی کە دەکەوێتە ژێر دەستیان ئازادی هەڵبژاردنی نییە، بەڵکو هەندێك جار بە بێ هیچ ڕەچاوکردنێك دەست بەسەر ئەو شتانەدا دەگرن کە پێیانە بێ ئەوەی کەمترین قەرەبووی بکەنەوە، واش دەبێت برێك جار لایەنی هەرە لاواز لەم گۆڕینەوەیە بەزۆرەدا قازانج دەکات، هەروەك ئەوەی لەم بۆنەیەدا بەسەر مندا هات.

یەکەمین بەشی ڕێگەکە لە دەرچوون لە ماردینەوە بەناو وڵاتێکی بیابان و چیایی دا دەڕوات، کە هەر وەك هاوڕێکانم دەڵێن پڕ دەبێت لە گرووپگەلی تاڵانچی. ئەوەندەی توانیمان بە گرووپی بەڕیز لەپاڵ یەکدا دەڕۆیشتین و چونکە ئەسپەکانمان لە ڕەوشێکی باشدا بوون، دوای شەش کاتژمێر ڕۆیشتن، بە بێ هیچ ڕووداوێك، بەڵام بە زیاتر لە جارێك ئاگاداریکردنەوە گەیشتنیە تێزیان-خان. ئاخاوتنی هاوڕێکانم بەس بوو بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین، بەڵام بێ گومان زیاتر لە چەند جارێك چاومان بە گرووپەیلی چەکداری خەڵك

دەکەوت کە بەلای کەمییەوە سیمایان جێگەی گومان بوو و خۆیان مۆڵ دابوو بۆ دۆزینەوەی دەرفەتێك چەند پیادەیەکیان بکەوێتە بندەست. ئەم دزانە بەشێوەیەکی ئاسایی لەسەر شێوەی گرووپی چوار تا پێنج کەسیی لەسەر لووتکەی ئەو بەرزاییانە دەوەستن کە ئێمە پێیاندا تێپەڕ دەبین. هەر یەك لەوانە دەمانچەیەکی لە دەستە و بڕێك جار دزە دەکەنە ناو دارودرەختەکان خۆیان دەشارنەوە و ئامادەن بۆ تەقەکردن ئەگەر ببینن ڕەوشەکە لەبار بێ. چەند تەقەیەکمان بە دەمانچە بە ئاسمانا کرد بۆ ئەوەی نیشانیان بدەین، کە ئێمە ئامادەین داکۆکی لە خۆمان بکەین. ئەوان خۆیان گەیاندەوە ناو چیایە هەرە سەختەکان و ئاوڕیان دەدایەوە داخۆ ئێمە بە شوێنیانەوەین، شیمانەی ئەوەش هەبوو کە ئەوانیش، وەك ئێمەمانان، زارەتەرەک بووبن ، چونکە کاروانەکەی ئێمە بەگشتی ناسراو بوو بەوەی گەورەترین تالانچی بەڕێوەی دەبەن کە بەناو وڵاتدا تێپەڕ دەبن.

تێزیان-خان ئاواییەکی گەورەیە ئەو چەند ڕووبارە بچکۆلانەیەی کە ئاوی دەدەن دەڕژێنە ناو دیجلەوە. بینای سەرەکی گوندەکە کەوتۆتە سەر بەرزاییەك کە کەوتۆتە ناوەڕاستەکەی. لە کاتی گەیشتنمان ئێمەیان برد بۆ ناو هۆڵێکی گەورەی زۆر تاریك. دوای ماوەیەك سەرۆکی هۆزەکە بە خۆیی و بیست تا سی کەس لە دەست وپێوەندە ڕووخسار ناشرین و چەکدار لە تۆقی سەریانەوە تا بنی پێیان، هات بۆ ئەوەی بمانبینێ کە بە چاوێکی شەڕانی و درۆدۆنگەوە تێیان دەڕوانین و بە بێ پێشەکی لەو شوێنەیان وەدەرنایین کە تێیدا بووین و دەستیان بەسەر شوێنەکەدا گرت، ئەمەش بووە هۆی دەمەقاڵێیەکی توند لەنێوان تەتەرەکەمان و ئەو سەرۆکە. سەرۆکەکە کوردێکی باڵابەرز و ڕوخسارێکی وەحشییانەی هەبوو. وادیار بوو گومانی لە ڕاستی ئەو فرمانە هەبوو کە پێمان بوو و دەیویست ئەو سەرانە ببینێ کە تەتەرەکەم ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرابوو

بیانگەینێتە ئیستەنبووڵ. تەتەرەکە لە بوخچەیەکدا قووتوویەکی بچووکی چوارگۆشەی دەرهێنا، سەری پاشا بەدبەختەکەی پیشان دا و بە خۆڕاگرییەوە پێی وت: "بەم شێوەیە دەکرێ سەری تۆش بپەڕێ، مستەفا ئاغا ئەگەر جورئەت بکەی سووکایەتی بە کارمەندانی دەوڵەت بکەیت". وا دیار بوو ئەم تاڵانچییە زۆر بایەخی بەم هەڕەشەیە نەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاری لە هەڵوێستی کرد، چونکە کشایەوە و دڵنیای کردینەوە، کە ئەو ڕێز لە فرمانەکە دەگرێ. شانازیکار بە سەربەخۆیی خۆیەوە، لەوانەیە هەرگیز تووشی هەڵوێستی هاوشێوە نەبووبێ، بەڵام ئەم نمایشە لێکدانەوەی سەنگینی بۆ هێناوە. ئێوارە، ئازووقەی زۆری بۆ ناردین، هەروەها لیبۆکۆکیشی بۆ ناردین بۆ کات بەسەربردنمان. کاتێك ویستمان بخەوین، سەرۆکەکەمان ڕایسپاردین کە شمشێرەکان و دەمانچەکانمان لەژێر دەستمان بێ، ئامادە بۆ بەکارهێنانیان لە هەر حاڵەتێکی خیانەتکاریی ئەگەر هاتە پێشەوە.

٢٣ ی مانگ هەندێک لە ئەسپەکانمان ئاڵوگۆڕ کران، بۆ ماوەی چوار کاتژمێر بەناو وڵاتێکدا ڕۆیشتین کە هێشتا تاریکتر و وێرانتر بوو لەوەی ڕۆژی پێشوو؛ تەنانەت پاشماوەی باخەکانی ترێ و کشتوکاڵیش هەر بە تەواوی نەمابوون، لەگەڵ ئەوەشدا دوای ئەوەی ئاوایی دووەممان بڕی کە بە هیچ شێوەیەك نەچووینە ناویەوە و بەلایدا تێپەڕین، ناوچەکە خەریك بوو دیمەنی جوانتری نیشان دەدا، گردی ڕووتەڵان نەما و پێدەشتێکی پان و بەرینمان بینی، چاك چێنراو و چەند ئاواییەکی بەخۆوە گرتبوو. کشتوکاڵ تێیدا گەیشتبووە ئاستێکی بەرزی تەواو. کێڵگەکان داپۆشرابوون بە پەین و بە گاجووتی بەهێز و بەرز دەکێڵران. لە ماوەی سەفەرە هەزار میلییەکەماندا، ئەوە تاقە ناوچەیەك بوو کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک چێنراوبێ . لە شوێنەکانی دیکە کاتێك زەوی ئامادەیە بۆ دروێنە، تەنیا ئەوەندەی لێ چاوەڕوان دەکرێ بەشی تێرکردنی

ژمارەیەکی کەمی دانیشتوان بکات. لەگەڵ نزیکبوونەوەمان لە دیاربەکر، ڕێگەکە زۆر سەختتر دەبوو و زۆربەی جار زۆنگاوەکان دەیانبڕی و ڕێگەکە بۆ ماوەی چوار میلی دوایی بەناو چیاکاندا تەسك دەبۆوە. لە نوێوە ڕووباری دیجلەمان بینییەوە، هەمیشە خێرا و ئەوەندەی خوارووی مووسڵ پێچی دەکردەوە و دوای ئەوەی کە سێ پردمان بڕی کە دووانیان زۆر چاك دروست کرابوون و لە دە کەوانەی جوان پێکهاتبوون. کاتژمێر پێنج و نیو گەیشتینە بەر دەروازەی شار.

دیاربەکر وەکوو ئامەدی کۆن ناسراوە و تورکەکان ئاماژە بە ڕەنگی ئەو بەردەی کە بینایە سەرەکییەکانی شارەکەی پێ دروست کراوە ناوی قەرە ئامەد یان (ئامەدە ڕەش) یان لێناوە. زۆر کەم ناوچە هەیە لە ڕۆژهەڵات کە دیمەنێکی زۆر نوێ و زۆر سەرنجڕاکێش بە گەشتیاری ئەوروپایی ببەخشێ. وا دیارە دیجلە سنووری ژیانی مرۆڤایەتی تێدا دیاری دەکات. هەر کە لە پردەکە پەڕینەوە لە هەموو لایەکەوە تارمایی مانەوەی مەرگ خۆی نیشان دەدات، گۆڕستانەکان ئاپۆرەی داین و دیوارێکی مەڕمەڕی ڕەش دەوران دەوری داوە کە ئەوە زیاتر ئیلهامبەخشی ماتەمیی دەبەخشێ. لەژێر دەرگە گەورە بەرزەکان ئاپۆرەی خەڵکی ترساومان بینی، کە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردابوو وەك ئەوەی ئافەریدەی جیهانێکی دیکە بن و هاتبنە ئەو ناوچەیەی کە پێشتر تێیدا ژیابوون. هەمان سەرنج کاتێك بە شەقامەکانی ناو شاردا تێپەڕ دەبووین. ئەمە پێویستی بە خەیاڵێکی زیندوو نەبوو چونکە گەڕۆکەکان دەشێ باوەڕ بەوە بکەن کە لە کۆشکی ئەفسوون و بێ هیواییدان کە شەهرەزادی جوان وەسپێکی هێندە زیندووی کردووە نەبێتەوە.

هەر کە گەیشتینە ناو ئەو کاروانسەرایەی کە بە تەنیشت کۆشکی پاشاوە بوو و بۆ پێشوازیکردنی نێردراوگەلی گشتیی تەرخان کرابوو، ئێوارە لەسەر

شێوەی تورکی نانیان بۆ هێناین، واتە خواردن دوای خواردنیان بۆ دەهێناین. یەکەمیان کە پێشکەشیان کردین بریتی بوو لە برنجێکی زۆر خراپ کوڵاو بەڵام یانزە کاتژمێر و نیو ڕۆیشتن کردی بە خواردنێکی خۆش تام. دووەمیان و سێیەمیان بە هیچ شێوەیەك لە هی یەکەم چاکتر نەبوون، بەڵام گوێم لێ بوو کە وتیان دەمودەست بەرێ دەکەوین. تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە کە چاك سوود لە کاتەکەم وەربگرم: لەگەڵ ئەوەشدا دواتر پلاوێکی نایاب، ئێغنیەکی* بەتام و هەموو جۆرە شیرنەمەنییەکیان بۆ هێناین. دان بەوەدا دەنێم کە ئەوکاتە هەڵەیەکی گەورەم لە سیاسەتدا کرد کە وادەم بە خۆم دا کە پارێزگاری لە هێزی خۆم بکەم بۆ دوارۆژ تا کۆتایی شەڕەکە. لەگەڵ ئەوەشدا بەیانییەکەی بەو پێیەی کە خواردنی یەکەم و دووەمم لە چاوەڕوانی خواردنی سێیەمدا پشتگوێ خست ، بەڵام هیچ شتێکی دیکەیان بۆ نەهێناین تا گەیشتمە نانی ئێوارە: بۆ ورياكردنەوەی گەڕۆکە هەستیارەکان و بۆ بەرژەوەندییان ئەم حەقایەتە دەگێڕمەوە.

کەمێك زانیاریم لەبارەی ئەم شارە وەگیرخست کە پێشتر نەزانراو بوون. تەواوی ئێوارە و تەواوی بەیانییەکەی ڕۆژی دواتر لەگەڵ ئەرمەنییەك، کە خۆی پێشکەش کردبوو بیێ بە ڕێبەرم، بەناو شاردا سووڕاینەوە. بینیم بینایەکانی شارەکە بە شێوەیەکی زۆر چاك دروست کراون کە لە بینای هەر شارێکی دیکەی ئیسلامی چاکتر دروست کراون بە بێ هەڵاوێردان هەتا بە شاری ئیستەنبوولیشەوە. شەقامەکانی بەگشتی تەختکراو و تا ڕادەیەك خاوێنن و لە شارەکانی دیکە فراوانتر بوون. بازاڕەکانی گەورە و پڕبوون لە کەلوپەل.، حەمامەکانی لە بەردی مەڕمەری ڕەش دروست کراون و خۆش و ڕێکوپێکن.

---

* ئێغنی: ragoût بە عەرەبی واتە (يخنة)، بریتیە لە پارچە گۆشتی ورد کە لەسەر شێوەی گۆشتاو دەکوڵێندرێ (وەرگێڕ).

مزگەوتەکان کە زۆربەیان بریتین لە کۆنە کلێسەی مەسیحییەکان، ژمارەیان زۆرن و چاك دروست کراون. شارەکە لە باکوور قەڵایەك دەیپارێزێ کە دیواری زۆر بەرزی بەدەورەوەیە کە وەك دیوارەکانی شار بەهێزن و قەڵایەکە ژمارەیەك بورجی چوارگۆشە تۆپخانەیان لەسەرە، وێڕای ئەوەی کە بە گشتی تۆپەکان لە ڕەوشێکی خراپدان و بەکار نایەن. لەسەر ژمارەیەك لەو بورجانەی کە وا پێدەچێ لە چەند دەورانێکی جیاوازدا دروست کرابن. هەروا دەبینین لەسەر دەرگاکانیش نەخش و نیگارگەلێك، کە بڕێکیان لەسەر بەرد و هەندێکی دیکەشیان لەسەر خشت هەڵکەندراون، بەڵام نە هێندە کاتم هەبوو و نە زانیاریی زمانەوانیم هەبوو تا لەو نەخش و نیگارانە تێبگەم. ڕێبەرەکەم کە واپێدەچوو پیاوێکی تا ڕادەیەك ڕووناکبیر بێ، پێی وتم ئەوان گریمانەی ئەوە دەکەن وەك ئەوەی گریمانەی ئەو نەخش و نیگارانەش کە بەسەر پردەکانەوەیە، ئاماژە بە مێژووی دروستکردنی ئەم بینایە دەکەن و ناوی سوڵتان یا ئەو پاتشایەی کە ئەوکات حوکمڕانی کردووە لەسەر هەڵکەندراوە.

پاش ئەوەی لە دەرگای ماردینەوە تاوەکوو دەرگای داغ بە دەوری شوورەی شارەکە خولامەوە ، کە بریتییە لە نیوەی شوورەی شارەکە، دەتوانم چیوەی شارەکە بخەمڵێنم کە دەگاتە نزیکەی پێنج و سێ چارەگە میل و ئەوە تەنیا لێرەدا بووم کە توانیم ژمارەی دانیشتووانەکەشی بە گریمانەی ئەوەی کە سێ چارەگی ئەو ڕووبەرەی کە کەوتۆتە نێوان شوورەکان بریتین لە شەقامەکان و ئەو ڕووبەرەشی کە ماوەتەوە دەشێ یانزە هەزار ماڵێك بگرێتەوە کە هەریەکێکیان حەڤدە پێی چوارگۆشە دەبێ بخەمڵێنم. هەر ماڵێك بەشێوەیەکی گشتی لە دوو نهۆم پێك دێت. بە گریمانەکردنی ئەوەی کە لە هەر ماڵێك پێنج کەس بژی، بەم شێوەیە ژمارەی دانیشتووانی شارەکە پەنجا و پێنج هەزار کەس دەبێت و ئەم ئەنجامە هاوجووتە لەگەڵ ژمارەی ئەو شارە ڕۆژهەڵاتییانەی کە ژمارەی دانیشتووانەکانی دەزانین.

٢٤ ی مانگ لە یەکی پاش نیوەڕۆ دەرچووین، تەواوی ڕۆژەکە باران بوو و بەشێکی زۆری شەوی پێشووش هەر باریبوو و وەك چۆن ئەو ڕێگەیەی کە پێیدا تێپەڕ دەبووین پڕی بوو لە جۆگاو بە شێوەیەك کە هەتا قامچیش نەیدەتوانی پاڵ بە ئەسپەکانمانەوە بنێ بۆ پێشەوە کە بڕێك جار هەموو قاچیان لەناو قوڕو لیتەدا دەچەقی. هەموو جۆگەلە ئاوێك بووبووە سێلاوێك کە تەنیا بە مەلەکردن دەتوانرا لێوەی دەربچین. لەگەڵ نزیکبوونەوەی ئێوارەدا ئەسپەکان ئەوەندە هیلاك بووبوون کە تەنیا تەتەرەکان دەیانتوانی خەیاڵ بکەن کە هێشتا توانای ڕۆیشتنیان ماوە. بەڵام من لەگەڵ تەتەرەکانا بووم و ئێمە بەردەوام بووین لە ڕۆیشتنی خۆمان هەرچەندە ئەو پاسەوانانەی کە لە دیاربەکرەوە بەگەڵمان کەوتن ڕەتیان کردەوە لەوە زیاتر لەگەڵمان بێن و ئێمەیان بۆ چارەنووسی خۆمان جێهێشت. لەماوەی چوار یان پێنج کاتژمێری دواتری گەشتەکەمان بەناو تاریکاییەکی ئەنگوستەچاو و بارانێکی بەردەوامدا دەڕۆیشتین. من لام وابوو کە ئێمە لە چوار تا پێنج میل زیاتر نارۆین. لە هەر هەنگاوێکدا ئەسپەکانمان دەکەوتن و تەنیا بە ژەمی تایبەتیی دوو هێندەبووی قامچی هەڵدەستانەوە. دواجار دوو لە هاوڕێ سەرەکییەکانمان کە هەوڵیان دەدا لە ڕووبارێکدا بپەڕنەوە، خەریك بوو بەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە لە ڕووبارەکە نوقم بن دوای ئەوەی شەپۆلەکان ڕایماڵین، ئەوەش وای لێ کردین بوەستین.

ماوەی یانزە کاتژمێر لەبەر بارانێکی بەردەوامدا بووین و بەجۆرێک ڕێگەمان لێ ون ببوو، کە نەماندەزانی بۆ پێشەوە دەچین یان دەگەڕێینەوە دواوە. بە خۆشییەکی زۆرەوە لە دوورەوە بینیمان ڕووناکییەك دەبریسکێتەوە و بەناو قوڕ و لیتە و دار و دەوەن و کەلاوەدا بەرەو لای ڕووناکییەکە ڕۆیشتین. کووخێك بوو کەوتبووە قەدپاڵی گاشەبەردێك. کەش و هەوایەکەی ئەوەندە خراپ بوو کە دۆست و دوژمن تێیدا پەریوە بووبوون. لەناو ئەو کووخەدا چاومان بە چەند

بازرگانێکی مەسیحی و گەڕۆك و ژمارەیەك دز کەوت کە تەنیا لەسەر تاڵان و بڕۆیی دەژیان. کوخەکە هێندە گەورە نەبوو تا لەگەڵ ئەوانەی لە پێش ئێمەدا لەوێ بوون شوێنمان ببێتەوە. بەڵام تەتەرەکانمان هیچ لەوە نە پرنگانەوە لەوەی کە ئەوانەی لەوێ بوون وەدەریان بنێن و دەبێت ئەو حەقەشیان بۆ بگێڕمەوە و بڵێم کە ئەوانە لەم ڕەوشەدا ئەوپەڕی بێلایەنی خۆیان نیشاندا بەوەی، هیچ جیاوازییەکیان لەنێوان باوەڕدارەکان و گاورەکاندا نەکرد.

باقی شەوەکەمان لەناو ئەم کوخەدا بەسەر برد کە تا سەر ئێسقان تەڕبووبووین و تا ئەژنۆشمان لەناو قوڕوقووڕاودا بووین، سەرباری ئەوەی لە برسان دەمردین و خەریك بوو دووکەڵی ئەو ئاگرەی کە دامانگیرساندبوو بمانخنکێنێ. هەرچی ئەو تورەگەیە بوو، کە ئەو سەرە بڕاوانەی تێدا بوو کە هەڵمان گرتبوو، بووبووە سەرینی من کە خۆم پێوە نووساندبوو. دەکرێ خەیاڵی ئەوە بکرێ کە ڕەوشی ئێمە چۆن بووە، بەختەوەر بووین کە نوایەکمان دۆزیبۆوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە دواین ناخۆشیمان نەبوو. باران لە بەیانی سبەینەکەی بەردەوام دەباری و تەمتومانێکی ئەوەندە چڕیشی لەگەڵدا بوو، کە هیچ ڕێبەرێکیشمان لەگەڵدا نەبوو و جارێکی دیکە ڕێگەمان لێ ون بۆوە. بیست و چوار کاتژمێرمان پێویست بوو تا بگەینە ئارگۆنا لە بناری چیای تۆرۆس لەکاتێکدا بەشێوەیەکی ئاسایی ماوەی ئەم ڕێگەیە سێزدە کاتژمێرە و لە تەواوی ئەم ماوەیەشدا هیچ جۆرە توێشووەکمان پێ نەبوو. من لە هیندستان هەندێك جار تێبینی تیژڕۆیی ڕووبارەکانم کردبوو لەناو چیاکانی ئێمەدا کە دەڕژێتە ناو جۆگەلەیەك و لە چیاکانەوە دێتە خوارەوە، بەڵام هەرگیز وەك ئەو سێلاوەم نەبینیوە کە ئێستە بینینم. ڕووبارێکمان بڕی کە بە ئاستەم توانیمان سەرچاوەکەی دیاری بکەین. وتمان ڕەنگە بڕێك لە بەربەستەکانی زەریای ناوەڕاست پڕبووبنەوە بۆ غەرقبوونی پێدەشتەکە و ئەوانەی کە لە دواوە بوون

برێکیان ئاو تا پشتێنیان دەهات لە کاتێکدا لە هەمان ئەو ناوچەیە ئەوانەی یەکەمەکان کە پێیدا تێپەڕبوون بە ئاستەم سمی ئەسپەکانیان تەڕ بوو بوو.

ئارگۆنا Arguna وەکوو ماردین کەوتۆتە سەر لووتکەی چیایەکی بەرز، بەڵام تەمتومانەکە هێند خەست بوو و بارانیش بەردەوام دەباری و وەك چۆن ئەوەی کەمێکیش نەحەسابوومەوە، وایان کرد ئەم شارە نەبینم. ئەم شارە بە شەراب بەناوبانگە کە لە دەوروبەری شارەکە، وەك ئەوەی لە چیای تۆرۆس و پێدەشتی خارپووت لە لای دیکە کەمێك دوورتر بەرهەمی دەهێنن. پێیان گوتم کە ڕەزەکانیان جۆرێکی نایابی شەرابی لێ بەرهەمدەهێنرێ بەڵام تەنیا بوتلێکی بچووکی شەرابی سوورم دەستکەوت، کە تام و بۆنێکی خۆشی ئەوتۆی هەبوو مەگەر هی کارگەکانی شەرابی بورگۆن La Bourgone ئەوەندە تایبەت بن.

لە ٢٦ ی مانگ، کاتژمێر یانزەی بەیانی بەسواری ئەسپی نوێ بەڕێ کەوتینەوە، تەتەرەکەمان، کاپید-باشی کە سەرە بڕاوەکانی هەڵگرتبوو و لەگەڵ پێنج یان شەش کەسی دیکە لە پێشەوەدا دەڕۆیشتن. ڕێگەکە سەخت بوو دەستی کرد بەوەی ببێتە بەرزایی. لە کاتژمێر یەك یەکێك لە لقەکانی ڕووباری دیجلە، کە لەو ناوچەیەدا تەنیا ڕووبارۆچکەیەکی بچووك بوو، بەسەر پردێکی سێ کەوانەییدا بڕی و پاشان دەستمان کرد بەوەی بەسەر زنجیرە سەرەکییەکانی چیای تۆرۆسدا سەربکەوین. کاتژمێرێك دواتر، پردێکی دیکەی زۆر بەرزمان بڕی، کە لە دوو کەوانە پێکهاتبوو و گەیشتینە مادن، کە ئاواییەکی گەورە، بوو بەقەدپاڵی یەکیک لە بەرزاییەکانی چیای تۆرۆس بوو، کە بە کانی مس بەناوبانگە و هەروەك بارەگای نازیری کانەکانیش بوو. لە کاتژمێر پێنجی ئێوارە بە پردی سێیەمدا تێپەڕین ، کە پردێکی یەک تاقیی کەوانەدار بوو، لە شەشی ئێوارەش لاماندایە لای ئامێرێکی گوشینی ترێ بۆ دروستکردنی شەراب لەسەر لووتکەی شاخی تۆرۆس؛ تا ئەو کاتە ئێمە حەوت سەعاتی ڕەبەق بوو بەوپەڕی خێراییەوە بەسەر ئەو شاخەدا هەڵدەگەڕاین.

لە مادینەوە Maden بە بەردەوامی هەر بەناو بەفردا دەڕۆیشتین و وەك چۆن ڕێگەکە نەکێشـراو بوو و هەمیشە لە لێواری نشێوێکی ترسناکدا بووین. ئەوان بە ئاسانی وای بۆدەچوون، کە من زۆر بیر لە هاوڕێکانم ناکەمەوە و نیگەران نیم بۆ ئەوانەی لە هێڵی پێشەوەدان و هەتا هەست بە ونبوونیشیان ناکەم. بەڵام کاتێك لەبەر ئاگر لە کونجێکی گەرم دانیشتم و شەرابی نایاب دەخۆمەوە کە خانەخوێیەکەم پێشکەشم دەکەن، شاش دەبم لەوەی کە نایانبینم و بەو شێوەیە ون دەبن. هەتا تەتەر و خزمەتکارەکەشی هەموویان ون بوون و لەگەڵ جانتاکان و دوو پیاوی کێوی سەروسیما خراپ مامەوە کە بە ئاستەم دەمناسین. ئەوە بۆ من ئاسان نەبوو تێی بگەم. پرسیاری تەتەرەکەم کرد پێیان گوتم کە بەرەو ئیستەنبوڵ ڕۆیشتووە، لە کاتێکدا هێشتا ٨٠٠ میل دوورین. هەستم کرد ئەوە شۆخییەکە بۆ ترساندنی من، بەڵام دواتر زانیم کە ئەوە ڕاستییە. بەو پێیەی کە برێك لە گەشتیارەکان دەیانتوانی بچن بۆ لای سوڵتان پێش ئەو هەواڵی سەرکەوتنی داود ئەفەندی بە سوڵتان ڕابگەینن، خێراییەکەیان دوو هێندە کردۆتەوە تا پێشیان بکەونەوە و بە بێ هیچ پێشەکییەك جانتاکانیان بۆ بەجێ هێشتم و وایان کردبوو کە دواتر لەگەڵ جانتاکان بە شوێنیانەوە بچم.

بە تاق و تەنیا لەناو بێگانان و لە وڵاتێکی کێوی و نەناسراو و بە بێ هیچ کۆمەگییەك لە هیچ کەسێك، لەسەر چیای تۆرۆس بەجێیان هێشتم، دەشێ باوەڕ بەوە بکرێ کە من خۆم لە ڕەوشێکی تووڕە و نیگەراندا بینیوەتەوە، بەڵام وانەبوو. ئەو جانتایانەی کە لە دوای خۆیانەوە جێیان هێشتبوو بۆ تەتەرەکانمان زۆر گرانبەها بوو هی ئەوە نەبوو هەروا بە ئاسانی لێگەڕێن لە کیسیان بچێ. کەوابوو ترسەکەم لە جێی خۆیدا نەبوو و دەمزانی هاوڕێکانم دەگەڕێنەوە. ئێوارە چاك حەسامەوە و شەرابەکە نایاب بوو. بینیم کە دوو پیاوە نامۆکە ئامادەبوون لەسەر حیسابی من پێبکەنن، لە جیاتی ئەوەی هیچ سوودێك بە من

بگەینن، دەیانەویست باڵادەستیی خۆیان بەسەر چارەوە بارهەڵگرەکان کە لە بندەستیاندا بوو بە قازانجی خۆیان بەکاربهێنن، پێیان وابوو دەتوانن وەک سەردارەکانیان هەڵسوکەوت بکەن، دەست بەسەر باشترین ئەسپ، باشترین شوێنی نزیك ئاگر، باشترین قاڵی بۆ خەوتن دابگرن. بەڵام وەك چۆن من هەستم بە نارەحەتی ئەم بانگەشانە کردبوو لەگەڵ سەرووی خۆیان کە زیاتر لەوان شارستانیتر بوون دەیانکرد، بۆیە وەك ئەوەی بۆم بلوێ لەسەر حیسابی خۆم بڕیارم دا بۆ جارێك و بۆ تا هەتاهەتایە پلەوپایەی ڕاستەقینەی خۆیانیان پێ نیشان بدەم، ئیدی ئەوەتا لەگەڵیان دەگەمە دابڕانێکی ئاشکرا و بە تەنیا سەفەر دەکەم. بە ئاسانی سەرکەوتم بەوەی هەموو ئەو شتانەی لەوانمان وەرگرتبوو بە خانەخوێیەکەم دان و سیمایەکی گرنگ و بەرزم نیشان دا کە دوو کێوییەکە ناچار بوون ڕێزی لێ بگرن.

لە ٢٧ ی مانگ لە کاتژمێر پێنجی بەیانی لە چیایەکە دابەزین و ناکرێ ئەو ئاستەنگییەی کە لە سەرکەوتندا بەرەو ڕوومان بۆوە لەگەڵ ئەوەی لە دابەزیندا تووشی بووین بەراورد بکرێ. دەزانین کە بەرزایی چیای تۆرۆس دەگاتە دە هەزار پێ. بەو پێیەی کە تورکەکان بە دەگمەن نەبێت بە پێویستی نازانن بەدوای ڕێگەیەك بڕۆن بەرەو ڕاست یان بەرەو چەپ بڕوات، بەڵکو توولەڕێگەی کوتراوە دەگرنە بەر کە ڕاستەوخۆ بەسەر گردەکاندا دەڕۆن، بە گشتی ئەو ڕێگایانەی کە بە ئاڕاستەی هێڵێکی ڕاست و ڕەوان دەڕۆن پێم وایە بە گشتی بە ناوچەی هەرە سەخت و هەرە مەترسیداردا دەڕۆن کە نەمانتوانی بیگرینە بەر. ئەستووری بەفربارین لە ساڵدا دەگاتە شەش تا هەشت پێ، بێجگە لەو توولە ڕێگەیە کوتراوەیە، جا وەك چۆن ئەم توولە ڕێگەیە پانییەکەی تەنیا هەژدە ئینج و هەندێ جار کەمتریش بۆیە هەر هەنگاوێك بە هەڵە کە بەسەر زەویدا بنرێ دەشێ نوقمی ناو بەفر ببین یان لە هەورازێکەوە پارچەپارچە ببین.

مەترسی گەلی لەوجۆرە کەمتر هەستی پێ دەکرێ لەکاتی بەسەر چیا کەوتندا، بەڵام زۆر هەستیار دەبێت لەو کاتەی کە دێینە خوارەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانم سەرسامی خۆم بەرانبەر بەو خۆڕاگرییە دەرببڕم کە ئەو دوو هاوڕێیەم بەسەر پشتی زینەکانیانەوە نواندیان و یارمەتی هەموو خەڵکەکانی ئێمەیان دەدا لە ئاڕاستەکردنی ئەسپەکانمان. هەرچی من بووم زیاد لە جارێك ویستم لە ئەسپەکەم دابەزم، بەڵام شەرم دەیگێڕامەوە و بەگوێرەی توانا هەوڵم دەدا بەشوێن تەتەرەکان و ڕێبەرەکانمانەوە بڕۆم. لەگەڵ ئەوەشدا بۆمن ئەستەم بوو تا لە کۆتاییدا نەمێنمەوە چونکە لەوانە بوو ڕێگەم لێ ون بوایە ئەگەر یەکێك لە تەتەرەکان کە تا دوا ڕادە شارستانی بوو و وانەیەکی لەکاتی ئەسپسواری پێ نەگوتبام کە قەت بیرم لە پیادەکردنی نەدەکردەوە. لە ئەنگلستان، کاتێك یەکێك لە چیایەك دادەبەزێ، ئەسپەکەی خۆی دەگرێ و بە هێواشی بەو پەڕی وریایی دەڕوات. تەتەرەکە ڕێك پێچەوانەکەی کرد. بە هەڵەداوان ملی ئەسپەکەی خۆی گرت، هەموو ساتێك وای لێ دەکرد هەست بە قامچی و نەقیزە بکات، ئەسپەکە بەم جۆرە شەرمنی سروشتیی خۆی دەشکێ و پێیەکانی پێشەوەی بە هەموو هێزێکییەوە لە زەوی دەچەقێنێ، بەشێوەیەك کە هەنگاوەکانی تەواو زامن دەبن. بڕێك ئەزموون و پێویستی هێندەی نەبرد متمانەیان پێ بەخشیم. کاتژمێر پێنج بە بێ هیچ ڕووداوێك، جگە لە ونبوونی ئەسپێك کە کەوتە ناو نشێوێکەوە کە قووڵاییەکەی سێلاوێك بوو و ئاوەکە بە کەفەکەیەوە دەمودەست ڕایماڵی، گەیشتینە بناری چیاکە. لە ماوەی چوار کاتژمێری دواتر دوو پێدەشتمان بڕی کە چیای نزم لە یەکی جیا دەکردنەوە و کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە خارپووت*، شاربۆتی** کۆن، شارێکی گەورەیە و

* Karpot

** Charpote

کەوتۆتە ناو دۆڵی سۆفێن*، قەڵایەکی قایم دەیپارێزێ کە خۆیی و هەرێمە هاوسێیەکانی لە لایەن حاکمیەتی پاشالقی مادن بەڕێوە دەبردرێن.

لە خارپووت تەنیا بۆ ماوەی دوو سەعات و نیو وەستاین، ئەوەیش بۆ ئەوەی پشوویەک بدەین و ئەسپ پەیدا بکەین. لەو ڕۆژەوە ئەوەندە بە خێرایی دەڕۆیشتین کە خێرایی ڕۆیشتنەکەمان ڕێگەی نەدەداین هیچ شتێك ببینین. کاتژمێر چوار و نیوی ئێوارە بەڕێ کەوتین و تا ئۆکسۆلی** نەوەستاین کە لە ٢٨ ی مانگ، کاتژمێر پێنجی بەیانی گەیشتین. ئۆکسۆلی شارێکی بچووکە و کەوتۆتە سەر کەناری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات. دانیشتووانەکەی جوتیاری کوردن و پێم وایە ناوی چیس ئۆغلی***-یشی پێ دەڵێن. خزمەتکاری تەتەرەکەمان کە لە دوای خۆیەوە بەجێ هێشتبوو بۆ ئەوەی ڕێبەرایەتی کاروانەکەمان بکات پێمان گەیشتەوە. پاشان کەسایەتێکی تورکی لە ئاستێکی باڵا، حەمموود بەگ ئەفەندی (تابلۆی ژمارە ٦)، مێردی خوشکی سلێمان پاشای بچووك کە لە بەغدا لە دەست ستەمی داود ئەفەندی ڕایکردبوو داوای لێ کردین لەگەڵ نۆ یان دە کەس لە دەستوپێوەندەکانی کە لە گەڵیدا بوون لەگەڵ ئێمە سەفەر بکات.

٢٨ ی مانگ، دوای پێنج کاتژمێر حەسانەوە و فراوین خواردن، لە کاتژمێر یانزە بەڕێ کەوتین و دوای شەش کاتژمێر ڕۆیشتن گەیشتینە مەڵاتیە یانماڵێتێنا****ی کۆن. بەو پێیەی ئەسپەکەم لە ڕەوشێکی چاکدا بوو، ویستم هەوڵ بدەم ئەگەر بۆم بکرێ بە تەنیا سەفەر بکەم، بەپێش هاوڕێکانم کەوتمەوە

---

* Sophène

** Euxouly

*** Djesis-Ogly

**** Malétina

و کاتژمێرێك پێش هاتنی ئەوان گەیشتمە مەنزل-خانە، بینیم کە بە پارەکەم دەتوانم بەچاکی پێشوازیم لێ بکەن و دە دوانزە تەتەرێکیش لەبەر پێمدا بوون. مەلاتیە جاران پایتەختی ئاسیای بچووك بووە. وێڕای ئەوەی کە.وا دەردەکەوێ لە دەورانی شکۆی خۆی کەوتبێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شارێکی گەورەیە. کاتژمێر پێنجی ئێوارە بەجێمان هێشت و دوای ئەوەی بە هەڵەداوان ماوەی پێنج کاتژمێر ڕۆیشتین، لە نیوەشەودا گەیشتینە ئاواییەك بەناوی حەسەن بادریك*. شوێنێک کە نە ژنەکانیان هێندە نموونەی داوێنپاکیی بوون و نە پیاوەکانیشیان ئەوەندە سومعەیان جوان بوو بەهۆی ئەو کردەوە نابەجێیانەی دەیانکرد؛ هەروەک هاوسەفەرەکانیشم دەیانگوت، ئەوانە نە مەسیحی و نە موسوڵمانن، بەڵکو لە قێزەونترین و بەدڕەوشترین زەندیقەکان بوون.




تابلۆی ژمارە: (٦) حەممووود بەگ ئەفەندی

* Hassan-Badrik

تەتەرەکان لە ئەسپسواریدا شێوازێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە زۆر ماندووکەرە. پێموایە ئەوە لە ئەنجامدانی ئەم گەشتە زۆر دوور و درێژانەیە، کە تیایدا دەبێت ئەسپەکان پشوو بدەن، بە هێواشی و لەسەرەخۆیی دەست پێ دەکەن، هەموو پیاوێکیان سەبیل (پایپ)ی Chubook خۆی دەکێشێت، هەرکە جگەرەکەشیان تەواو بوو، وردە وردە دەست دەکەن بە ڕاکردن و ئەسپەکانیان تاو دەدەن، خێرایی ڕۆیشتنەکەیان دوو هێندە دەکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەوتی خێرا ڕۆیشتنەکە هەمان دۆخ نییە لەگەڵ پێشتر، کە تیایدا بە هێواشی هەنگاویان دەنا، واتا جوڵەی ئەسپەکان زیادی کردووە، وردە وردە دارجگەرەکەیان دەخەنە لایەکەوە و دەست دەکەن بە هاتوهاوار و ژاوەژاو، ئەو ژاوەژاوەیش، کە لە دەمیان دێتە دەر زۆر هاوشێوەیە لەگەڵ ئەو حیلەیەی، کە ئەسپەکان لە هەنگاوەکانیاندا دەیکەن. پاش ماوەیەک تەتەرەکان دەنگێکی ترسناکیان لێوە بەرز دەبێتەوە و بەردەوام دەبن لە هاوار کردن، بەجۆرێک ئەسپەکانی خۆیان و هاوەڵەکانیان ئازار دەدەن وەک ئەوەی شێت بووبێتن، شێتگیرانە بەردەوام دەبن لەم جۆرە ئەسپسوارییەدا تاوەکو ئەسپەکانیان تەواو شەکەت و هیلاک دەبن. ئەوسا بە هێواشی هەنگاودەنێن و جگەرە دادەگیرسێنن، باز دەدەن و پاشان جارێکی تر بەخێرایی دەڕۆن، و بەم شێوەیە بەردەوام دەبن تا ئەو کاتەی پێویست دەبێ پشوویەک بدەن. دووری گەشتەکە هەرچەندێک بێت مەشق و شێوازی ڕۆیشتنەکە نەگۆڕە، واتە هەر کە سواری سەر پشتی ئەسپەکە بوون، ئیتر بەبێ ڕەچاو کردنی ماوەی گەشتەکە، هەر بەم شێوەیە ڕەوتار دەکەن کە لە پێشەوەدا باس کرا. ئەگەر لە سۆنگەی توانا و کۆششی ئەسپەکانی خۆمانەوە بڕیار بدەم، کە دوازدە بۆ چواردە کاتژمێرە، ئەوا ڕەنگە باشترین هەڵسەنگاندن بێت بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەستییان لە ڕێگەی ئەم جۆرە ڕیگەوبانانە لە کورتترین ماوەدا.

۲۹ ی مانگ، ماوەی حەوت کاتژمێر بە دەڤەرێکی شاخاویدا تێپەڕین لە گوندێکی بچووك بەناوی حەکیم-خان* وەستاین و ڕۆژمان لە ناو کوخێکی پەرپووتدا کردەوە. سەرەتا لە هۆیەکەی تێنەگەیشتم بەڵام وابزانم ئەوە بۆ لوتف نواندن بووبێ بەرامبەر هاوڕێ نوێیەکەمان، حەممود بەگ ئەفەندی، کە هەستی بە سووکایەتی و برینداربوونی کەسایەتی خۆی کردووە ئەگەر لە ماڵێکی ئاساییدا بخەوێ، لە جیاتی ئەوە لە ئاواییەکی بچکۆڵەدا بمێنێتەوە، کە کەس تێیدا نەیناسێ. دەمانتوانی ڕۆیشتنەکانمان بە شێوەیەکی زۆر ئاسوودەتر بەڕێوە ببەین و بەم شێوەیە چونکە بوونی ئەو، لە کاروانەکەمان هێشتا ئاستەنگگەلی دیکەی بۆ دروست دەکردم، دەستوپێوەندەکانی دەستیان بەسەر باشترین ئەسپ، بەسەر هەموو شتێکدا دەگرت، کە دەیانبینی و باشترینیان دەبرد. بۆیە بڕیارم دا لە نزیکترین دەرفەتدا لێیان جیاببمەوە. بەیانییەکەی یانزە کاتژمێر بەڕێکەوتین و ڕۆژمان.

لە ۳۰ ی مانگ، بۆ ماوەی چوار کاتژمێر بەناو وڵاتێکی چیاییدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە حەسەن چەڵەبی Hassan Chiliby ، لەوێ نانی فراوێنمان خوارد. پاشان جارێکی دیکە چوار کاتژمێر بەناو بەفردا رۆیشتین تا هەڵووجە خان Hallujah Khan، شەومان لەناو قەڵایەکی چکۆڵەی پیس و پۆخڵ بەناوی هەڵووجە-خان کردەوە.

۳۱ ی مانگ، بەوپێیەی شەو بەفرێکی زۆر باریبوو، هەموو شوێنەوارێکی ڕێگەوبانەکانی سڕیبۆوە و ڕۆیشتنەکەمانی سەخت و دژوار کرد بوو. چەندجارێك ئەسپەکانمان تا زینیان دەکەوتنە ناو بەفرەوە، یەکێکیان بە بارەوە سووڕا و ڕاماڵرا و ئەوەندە بە سەختی بریندار بوو، کە ناچار بووین دەستبەرداری ببین. دوای ڕۆیشتنێکی حەوت کاتژمێر و نیو گەیشتینە دەللیکی

---

* Hakim-Khan

تاش Delliki Tash، کە لەوێدا چووینە ناو کووخێکی پەڕپووت لە کاتێکدا حەممود بەگ یان بردە ناو جوانترین خانوو. پێم وابوو کە هەقی ئەوەم هەیە بەشداری لەم بەخششەیدا بکەم هەروەك ئەوەی زۆربەی جار ئەو بەشداری لە بەخششەکانی مندا کردووە، بە بێ هیچ پێشەکییەك دوای کەوتم، هەروەك ئەوەی ئەو لەگەڵ منی دەکرد. دەستوپێوەندەکەی نیازیان بوو بموەستێنن، بەڵام سەرم زۆر بەرز کردەوە و بە شێوازێکی ئاوەها هەڵسوکەوتم کرد کە دەمانچەکەی بەر پشتێنم ببینرێن و شمشێرە گەورەکەم لە زەوی خشاند و ڕۆیشتم بە بێ ئەوەی کەس جورئەت بکات ڕێگەم لێ بگرێ. بێگومان کارێکی زۆر چاکم کرد، چونکە ئێوارە خواردنێکی نایابم خوارد و شوێنێکی چاکیشم بۆ خەوتن بە دەست کەوت. ئەگەر جیاوازی زۆرتری خۆم لەگەڵ نیشاندابوایە ئەوا بە شێوەیەکی پێچەوانە ڕێزگرتنەکەی منی لێکدەدایەوە، ئەو ڕێزگرتنە کە لای تورکەکان نەناسراوە و تووشی ئاستەنگ و هەتا سووکایەتی پێکردنیش دەبووم.

لە ١ ی نیسان، کاتژمێر یەکی سپێدە بە ڕێ کەوتین و دوای ڕۆیشتنێکی نۆ کاتژمێری بەناو ڕێگەیەکی چاکدا، سوولەمان بڕی و گەیشتینە سیواس، شارێکی گەورە بەڵام پیس و پۆخڵ و خراپ بونیاتنراو، کەوتۆتە ئەوپەڕی باکووری دۆڵێکی بە پیت، کە لەوێدا ئەسپی زۆر جوان بەخێو دەکەن. من دەرفەتی ئەوەم بوو چەند ئەسپێکیان ببینم. ئەسپەکان بە گشتی قەبارەیان نزیکەی پانزە پانایی بەری لەپ[1] (بست)بەرزە، بەهێز و تەواو ڕێکوپێکن و لەشسافن وا دیارە بۆ سواری شیاون. هەر بۆ مەبادا، کە لە سیواس دەرچووین، بۆ باقیی ڕۆژەکە نانی پێویستمان کڕی. دوای ئەوەی بەسەر چیایەکی بورکانیدا ڕەت بووین دوای حەوت کاتژمێر و نیو گەیشتینە ئاواییەکی چکۆلە کاروانسەرایەکی گەورەی لێ بوو و شەومان تێدا بردە سەر.

---

[1] پانایی بەری لەپ پێوانەیەکە نزیکەی چوار گرێ دەبێت، (وەرگێڕ).

٢ ی مانگ، بەیانییەکەی لە کاتژمێر پێنج و نیو بەڕێ کەوتینەوە و نانی سپێدەمان لە کێڵگەیەکی چکۆلەدا خوارد بریتی بوو لە نانی نایابی بۆر، قەیماغی باش، هەنگوینی سروشتی و خواردنگەلێکی دیکەی دەشتەکی لە هەمان جۆریان پێداین. پیاوە پیرەکەی خاوەن کێڵگەکە خۆیی و ژنەکەیی و کچەکانی هەڵپەیان بوو خزمەتمان بکەن، زۆر خاتوونی چاوڕەش لەپشتی پەردەوە تەماشایان دەکردین. پێم وایە ئێمە باش لە هەلوێستی جوتیاران لە وڵاتانی موسڵماندا تێنەگەیشتووین، زۆرجار خراپ تێگەیشتن هەیە لەبارەی بارودۆخی جووتیاران لە وڵاتە موسوڵمانەکاندا. بەڵا و موسیبەتی دەسەڵاتی زاڵم (کە مەرج نییە تاغوت بێت) بەگشتی لەچوارچێوەی قەڵەمڕەوی تاریک و نوتەکی خۆیدا هەستی پێدەکرێ نەک لەشوێنی تر. لەپشت کاریگەریی ڕاستەوخۆی ئەو تیشکانەی خۆر کە دەبێ دنیا ڕۆشن بکەنەوە نەک مرۆڤ بکوژن، چارەسەر و حەسانەوە هەر لە سەرخەوێکی خۆشدایە، کە مەرج نییە هاوڕێکی سروشتی ئێمە بێ، بەڵام بەختەوەرییەکی تەواومان بۆ دەستەبەر دەکات. جوتیاری تورك لانی کەم، لە پێدەشتەکاندا ئەگەر لە هەموو ئیمپراتۆریاش وا نەبێ، کەسێکی پۆشتە و تێر و خاوەن کۆشکی گەورە و پان و پۆڕ و دەوردراو بە خاکی بەپیت و بەرەکەت و خودان مێگەلە وڵاخی چاک و گرانبەهایە؛ جا هەموو ئەمانە لەپاڵ ئەو ئاوهەوا خۆشەی، کە کەموێنەیە لە جیهاندا تێیدا دەژین بڵێی بەختەوەر نەبێ؟ تیۆرسینە تەجریدییەکان بە نەرێ وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە چونکە ئەو جوتیارە کۆیلەیە، بەڵام ئەزموون و لێوردبوونەوە پێچەوانەکەی دەڵێن، چونکە ئەو جوتیارە هەرگیز ڕەوشی دیکەی نەبینیوە. ئەی کەوایە ڕەوشی جوتیاران لە زۆربەی ئەو ناوچە زۆر ئازادانەی کە ئێمە دەیانناسین چۆنە؟ پێم وایە وەك دکتۆر جۆنسۆن دەیلێ جوتیار هەڵبژاردەی ئەوەی هەیە کە: " یان کار بکات یان لە برسێتییان بمرێ" جا

ئەمەیان ڕاستییەکەیە، هەموو ئەو پانتاییە ئازادییەی کە چێژی لێ وەردەگرن ڕۆژوو گرتن یان کارکردنە، خۆ ئەگەر بیانەوێ کار بکەن لە بڕێکجاردا ناچار دەبن خاوەن کارێك قەبووڵ بکەن کە ئەگەر دەرفەتیان ببێت قەت ڕازی نابن کاری بۆ بکەن. بەڵام وەك چۆن چارەنووسیان هەمان چارەنووسە لەژێر هەر ئاو و هەوایەك و هەموو وڵاتاندا بۆیە پێم وایە دەکرێ بڵێین کەوا کارکردن بە بەختەوەرییان دەگەیەنێ ئەگەر ژیانی ئاسوودەییان بە فرەیی بۆیان دابین کرا. جا ئەگەر جوتیار سەرقاڵی بژێوی خێزانەکەی بوو ئەوا کاتی ئەوەی نابێ بە شوێن تیۆرییە چەواشەکارییەکانی تەجریدییەکاندا بچێ و هەمیشە هەست بەوە دەکات پێویستی بە بیرکردنەوە نییە. دوور لە کاری ڕاستەوخۆی ئاژانەکانی ملهوڕیی، بە شێوەیەك هەست بەو زوڵمە ناکات کە کەوتۆتە سەرشانی وەك ئەوەی کەوتۆتە سەر دانیشتووانی شارەکان و لاتەریکییەکەی شێوەیەکە لە شێوەکانی ئازادی، چونکە بە شێوەیەکی ئاسایی ئەوە تەنیا لە شارەکانەوەیە کە ملهوڕ بە دوای قوربانییەکانیدا دەگەڕێ. ئەوە لە شارە چەوساوەکانەوەیە کە لەژێر حوکمڕانییەکی ملهوڕ و تەواو متمانەپێکراو بە هێزەکانی خۆیەوە دەژین، ڕۆحییەتی ئازادی بۆ داکۆکی و سەندنەوەی مافی سروشت و مرۆڤایەتی ڕادەپەڕێ. بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لەم حەماسەتبازییە پیرۆزەدا کە لەم داوا ڕەوایە سەرچاوە دەگرێ ئیلهام وەردەگرێ، بێگومان نابێ ئەوە لە بیر بکەین وەك مۆنتیسکۆ دەڵێ "ئازادی مافی پیادەکردنی هەموو ئەو شتانەیە کە یاساکان ڕێگەی پێدەدەن".

دوای ئەوەی ئەم شوێنە بێوەییانەمان جێهێشت کە بوو بەهۆی لەدایکبوونی ئەم تێبینییانە لەبارەی ڕەوشی جوتیاران لە جوانترین دەروناوچەی ئەم ئیمپراتۆریایە پان و پۆڕەدا، ڕێگەیەکی زۆرچاکمان گرت تا تۆکات Tokat کە دوای ڕۆیشتنێکی پێنج کاتژمێر و نیو تێیدا وەستاین. هیوام خواست کە تێیدا

بوەستین، بەڵام هەر ئەوەندە تێیدا وەستاین بۆ گۆڕینی ئەسپەکانمان و دیسان هەشت کاتژمێری دیکە ڕۆیشتین بۆ ئەوەی بگەینە توسخال Tuskhal ، کە سێباستۆپۆلیسی کۆنە.

حەممود بەگ ئەفەندی، بە هەوەسی خۆی هەموو جوولانەوەیەکی ئێمەی دیاری دەکرد، دەستی بەسەر خزمەتکارە تەتەرەکەم داگرت کە لەگەڵ مندا بوو ، سووریش بوو لەسەر ئەوەی کە خۆمان لەشارە گەورەکان دوور بخەینەوە و لە گوندە هەرە پەڕپووتەکان بمێنینەوە. ٣ی مانگ زۆر بە ئاشکرایی تکام لێی کرد لێك جیاببینەوە و هەریەکێکمان بە تەنیا سەفەری خۆی بکات، ئەو دەتوانێ هەر تەتەرێك بیەوێ هەڵی بژێرێ، بەڵام حەزدەکەم خزمەتکارەکەی من بۆ خۆم لێبگەڕێ: هەتا ئەوەشم خستە بەردەمی پاداشتی بدەمەوە ئەگەر بیەوێ ئەویان بۆ من لێبگەڕێ. بەڵام وا دیار بوو جیابوونەوە بە هیچ شێوەیەك لە پلانەکانی ئەودا نەبوو، وێڕای ئەو خۆبەزلزانیە کە حەممود بەگ نیشانی دەدا، کەچی ئەو جگە لە مرۆیەکی هەڵاتوو چیتر نەبوو. ئێمە تەنیا یەك فەرمانمان پێ بوو کە تایبەت بوو بە کاروانەکەمان و لە سەرێکی دیکەوە بیروڕای دیکەی هەبوو کە توانیم تێبگەم کەوا نیازی چی هەیە. ئەو حەممودە، لە گەنجێتیدا، کۆیلەیەکی مەملووك بووە دوای ئەوەی سولێمانی گەورە کڕیویەتی پەروەردەیەکی تایبەتی کراوە، پێ بە پێ توانیویە بگاتە بەرزترین پایە تاوەکوو کراوە بە حاکمی بەسرە و خوشکی سلێمانی بچکۆڵەی هێناوە. لەو دەستەیە بوو کە بەژێر نیردا دەڕۆن تا دەگەنە بەرزترین پلەی شایان. دوای کۆچی دوایی سلێمانی بچکۆڵە، بۆ ماوەیەك عەبدوڵڵا ئەفەندی خەلعەتی لێ وەرگرتەوە، دوای ئەوە داویەتە پاڵ ئەوانەی پیلان دەگێڕن بۆ کەوتنی ئەم سەرۆکە چاکە، بە قازانجی ئەوەی سەعید ببێتە پاشای بەغدا، بۆیێ عەبدوڵڵا ئەفەندی ڕقی لێ هەڵدەگرێ و لە لیستی ڕاوەدوونراوە داواکراوەکانی دادەنێ و

لە گێژەنی ئەم ملململانێیە لە کاتی گەمارۆدا، لەگەڵ نۆ یان دە کەس لە دەستوپێوەندەکانی کە سووربوون لەسەر ئەوەی بەگەڵی بکەون، هەڵدێ. زۆر خۆی بە بەختەوەر دەزانێ کە هێشتا سەری نەپەڕیوە. پێی وتم کە دەچێتە ئیستەنبووڵ بۆ ئەوەی لەبەردەم سوڵتان داکۆکی لەخۆی بکات و بۆ ئەوەی بیکەن بە فەرمانکارەیەکی وەك کاپیدچی باشی بۆ نموونە، وای بۆ دەچوو کەوا باڵوێزی ئێمە لای بابی عالی پشتگیری لە داوایەکەی بکات.

"ئەگەر ئێوە لەو شوێنە گرنگە دانران" من پێم گوت. "دەتەوێ چ سەرێك یەکەم جار پێشکەش بە سوڵتان بکەیت؟".

"سەری داود ئەفەندی پاشا بەبێ هیچ ئەولاوئەولایەك"، ئەو وەڵامی دامەوە: "ئەگەر ئەو بیتوانیبوایە سەری منی بۆ سوڵتان دەنارد و ئەو تاقە سۆنگەی ئەوەبوو کە من نەکرام بە پاشای بەغدا، چونکە ناوی من پێشتر لە فەرمانەکەدا نووسرابوو، بەڵام کاتێك دەگەمە ئیستەنبووڵ بمبە لای باڵوێزی ئینگلیز و بمناسێنە، چونکە من لە هەڵسوکەوتی ئێوە پیاوێکی ئاست بەرز دەبینم، وێڕای ئەوەی کە بە تەنیا سەفەر دەکەی هەروەك ئەوەی بە شێوەیەکی ئاسایی ئەوروپییەکان کاتێك دەیانەوێ بەدوای زانیاریدا بگەڕێن، دەیکەن: متمانەی باڵوێز لەگەڵ متمانەی من لە پرۆژەکانم سەرکەوتووم دەکەن و ئەوکاتە داود وریایی خۆی وەردەگرێ. ئیشەڵڵا". (تورکەکان بەبێ هێنانی ناوی خوا، هیچ خراپەکاری و بێئاوڕوویەک ناکەن!)، "سەری دەپەڕێنم و شوێنی دەگرمەوە".

ئەمانە خواستی خاکیی کەسێك بوون، کە چەند ڕۆژ پێشتر سەری لەسەر تاڵە موویێك وەستابوو. پێم گوت وێڕای ئەوەی کە قسەکانم تا ڕادەیەک ماقووڵ و گونجاون، بەڵام من سوور نابم لەسەر ئەوەی لە گەشتەکە جیاببمەوە و دوای ئەوە ئاستەنگ و ترسەکانی خۆم بۆ شی کردەوە. هەموو ئەوەی کە من

دەمویست بەردەستی بخەم ئەوە بوو وادەیەکم پێ بدات کە نەبێتە سۆنگەی جارسکردنم و من بتوانم ئەو ئەسپە هەڵبژێرم کە دەمەوێ و هەروەها ئەو خزمەتکارە تەتەرەم بۆ بگێڕێتەوە و لە دوارۆژ بەیەکەوە وەستانەکانمان لە هەر ڕۆژێکدا پێکەوە دیاری بکەین.

لە ئەنجامی ئەم ڕێککەوتنە من توانیم ئەسپێکی نایاب لە کاتی دەرچوونمان لە تورکات بەردەست بخەم و بۆ هێشتنەوەی ئەم ئیمتیازە بە پێش هەموو هاوڕێکانم کەوتمەوە. دوای ئەوەی ماوەی سێ کاتژمێرمان بڕی بەناو وڵاتێکی چیایی و ڕۆمانتیك، چوومە ناو کوخێکی دارتاشەکانی ناو یەکێك لە دارستانەکان و فنجانێك قاوەم خواردەوە. بەڵام لە کاتی گەیشتنیان من سواری ئەسپەکەم بووم. دوای ڕۆیشتنێکی شەش کاتژمێری هەروەها لە ئەماسیەش بە پێشیان کەوتمەوە.

لەو شوێنەی کە ئاراستەی پۆستەخانەی بۆکراوە، ئەسپەکەم بەجێهێشت و بەرەو گەرماوەکە ڕۆیشتم. ئەماسیە شارێکی گەورەی پەرشوبڵاوە، ئەم شارە کەوتۆتە ناو دۆڵێکی بەرتەسك لەنێوان چیای بەرز و لەگەڵ باخچە زۆر و زەوەندەکانی و هەردوو ڕووباری گیزەل ئیرمەق Jizil Ermek دەیبڕێ. شارەکە بەوە بەناوبانگە کەوا سترابۆن لەوێ لە دایك بووە و ئەو ڕووبارەکەی بە ناوی "ئیریس" ناوناوە و دواتر وەسپێکی نایابی شارەکە دەکات. هەروەها شارەکە ڕوفاتی پاشاکانی (پۆنت)ی تێدایە، کە بەشێك لە شانشینی کۆن بووە. ئێوارەکەی بۆ ماوەی نۆ کاتژمێری تر ڕۆیشتین کە بەکۆی گشتی هەژدە کاتژمێر بەناو ڕێگەیەکی باش و وڵاتێکی تەختاییدا ڕۆیشتین و گەیشتنیە ماراسوان Marsowan ، کە هەر چەند کاتژمێرێکی لەوێ ماینەوە و شارەکە هێشتا شارێکی گەورەیە، بەڵام شارێکی پاك و خاوێن نییە. بەڕێز کینێیر M. Kinneir گریمانەی ئەوە دەکات ئەوەیان لەگەڵ فاسۆمۆن Phasemon هەمان شاری (پۆنتۆس)ی بەناوبانگ بە کانزاکانی بێت.

له ٤ی مانگ، دوای ئەوەی چوار کاتژمێر ڕۆیشتین، گەیشتینە شاری عوسمان جیك Osmanjik، شارێك کە تەنیا ڕەگەزگەلی دواکەوتوو و کێوی تێدایە، دەکەوێتە سەر ڕووبارێك، کە دەڕژێتە ناو قزل-ئەرمەق. بە قەڵایەکی کۆن و جوان و پردێکی جوان بەناوبانگە و دەڵێن بە فەرمانی سوڵتان بایەزید بونیاد نراوە. دوای ئەوەی ماوەی نیو کاتژمێر لە ئێوارە و بەشێکی شەو بەناو ڕێڕەوێکی تەسکی هەڵکەندراو بەناو چیادا ڕۆیشتین، گەیشتینە قەڵای حاجی هەمزە، ئەو قەڵا بچووکەی پێی دەوترێ ئەندراپی کۆن.

له پێنجی مانگ، دوای ئەوەی سی میلمان لە ناوچەیەکی نایاب بڕی لە تۆسیا چاومان بە کەسایەتییەکی گەورەی ئێرانی کەوت کە دەگەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی. کەسێکی خەڵکی مەڵاتییەش، کە کەمێك فەرەنسی دەزانی، بەگەڵم کەوت بۆ ناو بازاڕ، لە هەمان ڕۆژدا، لووتم بە نموونەیەکی دیکەی بێویژدانی کەوت، کە ئەفسەرانی تورك یا تەتەرەکان دەیکەن بۆ ئەوەی هەرشتێکیان بوێ بە زۆر بەدەستی بهێنن. من بە چەند میلێك لە پێش هاوڕێکانمەوە بووم، کاتێك تەتەرەکە کە هەمیشە ڕایدەکرد بۆ ئەوەی لە پێشدا ئەسپەکان ئامادە بکات، بە هەنگاوی گەورە گەڕایەوە و داوای لێ کردم باقی کاروانەکە لە کوێیە. دوای ئەوەی کەمێك دواتر چەکەکانی پشکنی. چەکەکەی منی تاقی کردەوە و داوای لێ کردم دوای بکەوم. سەرەتا من لام وابوو کەسانێك هەن کە پەلامارمان دەدەن بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست بوو. لەگەڵ یەکەم پێچانەوەی ڕێگەکە چاومان بە سێ پیاوی تەواو چەکدار کەوت کە پانزە ئەسپیان پێ بوو. دەمانچە بەدەست پەلاماری دان و پێش ئەوەی ئەوان کاتی تەواویان ببێ داکۆکی لەخۆیان بکەن، حەوت یان هەشت لە باشترین ئەو ئەسپانەی توانیمان هەڵمانبژارد و سوێندمان خوارد، کە هەر کەسێك بیەوێ دەست بکاتەوە بیکوژین. ئەمە کاری ساتەوەختێك بوو و ئەم کردەوە لێهاتووانەیە

سەرنجڕاکێشە ئەوەندە خێرا تەواو بوو بەر لەوەی کاتی ئەوەم ببێ بیر لە ئەنجامەکانی بکەمەوە. من لەو باوەڕەدا بووم کە کەمترین شتێك کە لە بەرامبەر خزمەتەکانی خۆم وەگیری بخەم ئەوەیە کە ئەو ئەسپە هەڵبژێرم کە خۆم دەمەوێ، بەڵام تەتەرە چەپەڵەکە پێی وتم ئەوانە ئەسپی تایبەتیی حەموود بەگ و پیاوەکانیەتی. کە بینیم ئەمە کارێکی ناڕەوایە و بەڵکو دژی هەموو پرەنسیپێکی مامەڵەی شەریفانەیە لەنێوان خەڵکانی یەك چیندا، بە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەم کە حەممود بەگ و پیاوەکانی چی دەڵێن، ئەسپێکم بۆ خۆم هەڵبژارد و جڵەوی ئەسپەکەم کردە ملی و دەمودەست سواری بووم و لە جیاتی ئەوەی تەتەرەکە تووڕە ببێت، تەنیا بە شۆخییەکەوە وتی: "ئەورووپییەکە یاریدەی دام لە بەردەستخستنی ئەسپەکاندا"، تەتەرەکە وای گوت و "وێڕای ئەوەی کە عەدالەت وایە هەموو شتێك کە پێویستمان بێت لە بێگانەکانی وەربگرین، بەڵام ئێمە هەموومان سەرباز و گەڕۆکین، شێتییە کە هاوڕێیەکان لەنێوان خۆیاندا دەمەقاڵێیان ببێ". ئەوە پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی بوو.، ئەوەی کە ڕێگەی لێ نەگرت بەیانییەکەی بەرەورووی تەتەرێکی دیکە ببێتەوە و بە شمشێرەکەی بریندار بکات بەرلەوەی، کە ئەویان بتوانێ بەرگری لە خۆی بکات، ئێمە تەنیا ئەوکاتە توانیمان لە یەکیان بکەینەوە دوای ئەوەی دەست بە شمشێر، کەوتینە ناوبژییان.

٦ ی مانگ دوای ئەوەی بە شاری قەرەژوان* ڕەت بووین، کە شارێکی چکۆڵەیە و دەکەوێتە پێدەشتێکی بەپیت.، دوای ئەوەی کاروانێکی بیست کاتژمێریمان بە بێ وەستان بڕی، چەند کاتژمێرێك بۆ حەسانەوە لە قەرەژولار**ماینەوە. لە ٧ ی مانگ، لە کەشێکی زۆر سارد، کە لەوەتای دوو یان سێ ڕۆژ

---

* Karajouan

** karajolar

بوو هەڵی کردبوو و بەفرێکی زۆریش بەردەوام دەباری، ڕۆیشتین. ئەو گەڕۆکانەی کە چاویان پێمان کەوت ئامۆژگارییان کردین زیاتر نەڕۆین، چونکە ئەوان لە ڕێگەکە مەترسی زۆریان بینیبوو و بەفر ڕێگەی لەوە گرتبوو تەنانەت شوێنەواری ڕێگەکەش بناسرێتەوە، بەڵام تەتەرەکەمان لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری دا بەردەوام بین لە گەشتەکەمان جا ئەمە لە کەللەڕەقییەوە بووبێ یان لە بەسووك سەیرکردنی مەترسی و ماندووبوونەوە بووبێ. بەو پێیەی کەوا ئەسپەکەی من و ئەسپەکەی حەموود بەگ نایاب بوون، توانیمان بە پێش هاوڕێکانمان بکەوینەوە و بگەینەوە ڕێبەرەکە و تەتەرەکە کە پێش نیو سەعاتێك پێش ئێمە بەڕێ کەوتبوون. لە دوورابیەکی نزیکدا بینیمانن بەڵام بەفربارین بە تەواوی ڕێگەی لێ گرتبووین تا دەمودەست بیانبینین و بەفر هەتا شوێنپێی ئەسپەکانیشی داپۆشیبوو. بە تەنیا بەناو زنجیرە چیا بەرزەکانی ئۆلیمپدا دەڕۆیشتین و تا شەو هەر تێیدا دەسووڕاینەوە. دەترساین لە هەر ساتێکدا بەفر ونمان بکات یان بکەوینە ناو خەرەندێکەوە ئەگەر لەو تولە ڕێگەیە دووربکەینەوە کە دەبێت بیگرینە بەر کە، چیتر نەماندەتوانی ڕێگەکان بناسینەوە ئەگەر غەریزەی ئەسپەکانمان نەبوایە. دواجار دوای ئەوەی ماوەی شانزە کاتژمێرمان بڕی بۆ ماوەیەك کە دەکرێ تەنیا بە نۆ یان دە کاتژمێر ببڕدرێ گەیشتینە حەمامڵی، وەك چۆن شەو داهات، تا بەیانییەکەی ڕۆژی دواتر هاوڕێکانمان پەیوەندییان پێوە نەکردین و ئەوانیش هەمان ئەو ئاستەنگانەیان هاتبووە پێش کە ئێمە بینیمان، وێڕای ئەوەی کە ئەسپێکیشیان لێ ون بووبوو. بەفر بەردەوام دەباری بەڵام کەمێك سووکتر. دوای دە کاتژمێر لە ڕۆیشتن گەیشتینە شاری گەریدە، شارێکی بچووك، شارێك کە هیچێکی سەرنجڕاکێشی تێدا نەبوو و ماڵەکانی لە دار دروست کرابوون. نەمانتوانی هیچ ئەسپێکی لێوە بەردەست بخەین بەڵام شەومان لەوێدا بەسەر برد.

٩ ی مانگ بەرەو بۆلی بەڕێ کەوتین و ئێمە ئەوەندە خراپ سواری ئەسپەکان بووبووین کە تەنیا دوای سێزدە کاتژمێر و بە زەبری قامچی، گەیشتینە ئەوێ. ڕێگەکە تا ڕادەیەك باش بوو بەڵام لە ماوەی یەکەم حەوت کاتژمێردا، نە هیچ ئاواییێك و نەهیچ شتێکمان نەبینی کە ئاماژە بۆ ئاوەدانی بکەن. ئەم شارە ناوچەیەکی خاڵی وەستانی سەرڕێگەی زۆر نایاب بوو. لەم شارەدا پۆستەخانە و بازاڕێکی گەورە و گەرماوگەلی چکۆڵە، بەڵام پاکوخاوێن و چاك ڕاگیراوی لێ بوون. ئەو پێدەشتەی کە دەوری دابوو بەشێوەیەکی چاك چێنرابوو و پڕی بوو لەو ئاواییانەی کە بەشێوەیەکی گشتی کەوتبوونە سەر کەنارەکانی چەند ڕووبارێکی چکۆڵە کە دەتوانرێ پیایاندا بپەڕیتەوە و دەڕژێنە ناو زەریای ڕەش.

لە ١٠ ی مانگ هەرگیز ئاوا بە خراپی سواری ئەسپەکان نەبووبووین و هەروەك دوێنێ خراپترین ئەسپ بە نسیبی من بوو. بەڵام ئەسپی خراپ بە نیسبەت تەتەرەکان بیانووەك نەبوو بۆ ئەوەی لێیان خۆشبێ بۆ ئەوەی هەنگاوی خێرا نەنێ ئەگەر بڕیار لەسەر ئەمە بدات. ڕێگەکە خراپ بوو و ئەسپەکانمان تا پاژنیان لەناو قوڕو لیتەدا بوون و بڕێك جار پێیەکانیان لەناو ڕەگی دارەکان دەچەقی وەك ئەوەی (لەناو تەڵەیەکدا بووبن). ئەسپە بەدبەختەکە کە سواری پشتی بووم لە ماندوویێتییان کەوت و ئیدی مەحاڵ بوو هەڵی بسێننەوە و ناچار بووین وازی لێ بهێنین. ئەو ئەسپەی کە دوای ئەوە دایانمێ کەمێك باشتر بوو، ڕێگەکە باشتر دەبوو و بە هەنگاوی خێرا دەڕۆیشتین، بە قامچی لە ئەسپەکانمان دەدا و وەکوو شێت هاوار دەکەین تاوەکوو ئەسپەکانمان غار بدەن. ئەسپەکەی من دوو جاران لەگەڵ مندا کەوت بەڵام بە بێ ئەوەی لە زینەکە بکەومە خوارەوە. بەڵام میلێك دواتر جارێکی دیکە بەسەر مندا کەوتە ناو زۆنگاوێك و منی لەودیو زۆنگاوەکە جێهێشت. لە توندی کەوتنەکەم پەشۆکام. پێم داگرت تا ئەسپێکی دیکەم بدەنێ، بەڵام پێشتر لە ڕووداوگەلی هاوشێوەدا

هەموو ئەو ئەسپانەی کە لە نۆرەدا بوون بەکارهێنرابوون و بۆیە من ناچار بووم بەوەی خۆم دەستبەردار بم.

ئەمە شێوازی سەفەرکردنە لەگەڵ تەتەر. من بەختی ئەوەم بوو چونکە لەشێکی پتەو و زۆر باشم هەبوو. بەڵام ئەم ڕووداوە بچووکانە دەشێ ببنە وانەیەك و بەڵگەی ئەوەی کە پێویستە تەواو هێزەکانی خۆت لێك بدەیتەوە پێش ئەوەی دەست بە سەفەرێکی ئاوا بکەیت لەگەڵ پارەیەکی کەم، کە من هەمبوو. بەڵام ئەگەر بمتوانیبووایە تەتەرێك و خزمەتکارێك تەنیا بۆ من هەبوایە لەگەڵ کەرەستەگەلی شیاودا، ماوە ماوە گەڕۆکەکان پەیوەندییان پێوە دەکردین، و زۆر ئاسوودەتر سەفەرم دەکرد، بەڵام کە نەمتوانی ئەم کەرەستەگەلە بەرچاوانە دابین بکەم ئەوا زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم لەو دەرفەتەی کە بۆم هاتە پێشەوە. هەرچەندە بوونی من بێ گومان بۆ هاوڕێکانی سەفەرەکەم چارسکار نەبوو، بەڵکو هێزێکی زێدە بوو بۆ هێزی ئەوان و لە ئەنجامدا بۆ ئاسایشی ئەوان، بەڵام زۆر کەم بایەخیان بە پێویستییەکانی من دەدا، دەشیا بە تەنیا جێم بهێڵن و دەستبەردارم بن ئەگەر من وەکوو ئەوان بەرگەی ماندووبوون و بێبەشبوونم نەگرتبوایە.

دۆستشە، کە شەوی دەی مانگمان تێدا بەسەر برد، جگە لە چەند خانێکی تایبەت بۆ حەسانەوەی گەشتیارەکان هیچی دیکەی تێدا نەبوو. یانزەی مانگ بەجێمان هێشت و ماوەی دوانزە کاتژمێر بەناو دارستان و بەناو ڕێگەی سەختدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە هەندەك کە تەنیا چەند کێڵگەیەکمان بە دەوریەوە بینی کە ترێی نایابی پێوە بوو و هیواکانمان خەریك بوو دەبووژایەوە. تاقە شتی سەرنجڕاکێش کە لەو ڕۆژەدا بینیمان دوو یان سێ ئاشی ئاو بوو کە لەسەر جۆگەلەیەکی ئاو دروست کرابوون، هەرچەندە ئامێرسازییەکی سادە بوو، بەڵام مانای پێشکەوتنێکی هونەری و شارەستانی دەگەیاند کە لە وڵاتێکی گوندنشینی سەرەتاییدا پێشبینی نەدەکرا.

هەندەك دەكەوێتە سەد و بیست میلی ئیستەنبووڵ، هاوڕێکانم بە دەرچوونیان، سووربوون لەسەر ئەوەی لە گەشتەکە بەردەوام بن بە بێ وەستان. ئەوان نهێنی خۆیان بۆ نەدرکاندم بەڵام من بە بێ ئەوەی ئامادەی ئەم سەفەرە درێژە بم بە شوێنیان کەوتم و بە پردێکی دارین لە ڕووباری سەنگەر، رووباری ئەوەندە تیژڕۆدا پەڕینەوە کە کەم جێگەی ئەمان بوو و بەسەر پاشماوەی پردێکی نایابدا ڕووبارێکی دیکەمان بڕی کە لەوانەیە هەر تەنیا لقێکی ئەو ڕووبارە بێت کە تازە باسم کرد. بەڵام واپێدەچوو ئاوەکان ڕێڕەوی کۆنی خۆیان گۆڕیبێ: بە ئاستەم ئاوی ڕۆیشتوومان لە قووڵایی ڕووبارەکە دەبینی و هیچ شتێکیش ئاماژە بۆ ئەوە ناکات کە ڕەوشەکە لەوەتەی چەند ساڵێك لەوە باشتر بوو‌بێت.

دوانزە کاتژمێر لە دووریی هەندەك، سەبانجیێ*- مان بینی کە کەوتۆتە سەر زەریاچەیەکی جوان کە بەشێکی ڕێگەکە پێچاوپێچی بازنەییە. ئەمە شارێکی بچووکە، دوای ئەوەی ئەسپەکانمان تێدا گۆڕی، بەڕێ کەوتینەوە. بە ڕێگەیەکی کۆنی بەردڕێژکراو بەناو زۆنگاوێکدا پەڕینەوە، دوای ئەوەی دە کاتژمێر ڕۆیشتین گەیشتینە ئیزمید، نیکۆمیدی کۆن، کە کەوتۆتە ناو نیمچە دوورگەیەك کە بەرەو زەریای مەڕمەڕ دەڕوات. کاتێك چووینە ناو ئەم شارە شەو ڕاکشابوو. تەنیا ئەسپەکانمان تێدا گۆڕی و بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن. شێست میلی کۆتاییمان بە بێ وەستان بڕی، تەنیا جارێك وەستاین بۆ گۆڕینی ئەسپەکانمان و بە بێ هیچ ئازووقەیەك جگە لەوەی توانیمان بەردەستی بخەین بە بێ ئەوەی لەسەر زین بێینە خوارەوە و لە ١٣ ی نیسان لە کاتژمێر یەکی پاشنیوەڕۆ گەیشتینە سکوتاری کە لەوێدا سەفەرەکەمان بە کۆتا هات.

کۆتایی

---

* Sabangié

# پوژولا کێ یە؟

ژان-باتیستان-فرانسوا پوژولا* ساڵی ١٨٠٩ لەMontferrand-la-Fare لە فەرەنسا لە دایك بووە. مێژوونووس و ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسییە و برا بچووکی ژان جۆزیف فرانسوای پوژولا (١٨٠٨-١٨٨٠)ی ئالیکار و هاوکاری مێژوونووسی گەورەی فەرەنسی جۆزیف فرانسوا میشوو (1767-1839)** بوو. میشوو Michaud کە یەکێك لە مێژوونووسە گەورەکانی فەرەنسا بووە، لە ئایاری ١٨٣٠ لەگەڵ ژان جۆزیف فرانسوا پوژولا بۆ تۆمارکردنی وردەکارییەکانی جەنگی خاچپەرستەکان سەفەری ڕۆژهەلات دەکەن و سەری یۆنانستان، ئیستەنبووڵ و قودس دەدەن و میشوو بە تەنیا لە ڕێگەی سوریە دەگەڕێتەوە پاریس و لە ڕێگەیدا سەری میسر دەدات و لە ئایاری ١٨٣١ لە پاریس سەرجەمی نامەکانی لە (حەوت بەرگدا) بەناوی "نامەکانی ڕۆژهەلات"[1] بلاودەکاتەوە.

بۆ تەواوکردنی نووسینەوەی وردەکارییەکانی مێژووی جەنگی خاچپەرستەکان، گەلێك دەرو ناوچەی ئاسیای بچووك، میزۆپۆتامیا و هەرێمە

* Jean-Joseph-François Poujoulat

** Joseph-François Michaud

(1) *Correspondance d'Orient, 1830-1831* (7 volumes), en collaboration avec Poujoulat, 1833-35) Paris : Ducollet, 1833-1835.

ڕۆژهەڵاتییەکانی سوریە مابوون کە میشوو نەیتوانیبوو سەفەریان بۆ بکات و کەلێنێك لەناو کتێبەیدا مابوو، بۆ ئەم مەبەستە ساڵی ١٨٣٦ میشوو مێژوونووسی فەرەنسی ژان-باتیستان-فرانسوا پوژولا ڕەوانەی ڕۆژهەڵات دەکات و تێبینی و ڕێنوێنی پێویستی پێ دەدات بۆ گەڕان و سوڕان بە دوای وردەکارییەکانی جەنگی خاچپەرستەکان بە تایبەت لەو ناوچانەی کە ئەو سەردانی نەکردوون. وەك پوژولا لە پێشەکی بەرگی یەکەمی سەفەرنامەکەی خۆیدا نووسیوویە بە خۆیی و دەستنووسە کۆنەکان و کتێبە مێژوییەکانی میشوو، هەموو ئەو ناوچانەی ئاسیای بچووك، میزۆپۆتۆمیا و سوریەی ڕۆژهەڵات، کە گۆڕەپانی جەنگی خاچپەرستەکان بوونە، تەیکردووە.


Joseph-François Michaud

پۆژولا لە سەفەرنامەکەیدا کە لەسەر شێوەی نامە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ میشووی مێژوونووسی نووسیووە سێ ساڵ دوای سەفەرەکەی نامەکانی لە دوو بەرگدا لە ساڵەکانی ١٨٤٠-١٨٤١ بەناوی (سەفەر بۆ ئاسیای بچووك، لە میزۆپۆتامیا بۆ پالمیر، لە سوریە، فەلەستین و میسر)[1] بڵاوکردەوە کە کۆکراوەی هەموو نامەکانی بوو، کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە ڕەوانەی کردبوون.

ئەم سەفەرنامەیە بۆ کورد گرینگی لەوە دایە، کە لە سەروبەندی هێرشەکانی سوپای عوسمانی بۆ سەر میرنشینی ڕواندز بووە و گەڕیدەکە بۆخۆی لە

---

[1] *Voyage dans l'Asie Mineure, en Mésopotamie, à Palmyre, en Syrie, en Palestine et en Égypte* : faisant suite à la Correspondance d'Orient, Paris: Ducollet, 1840, 1841, 2 vol. (456, 612 p.)

ناوجەرگەی ڕووداوەکاندا بووە و وەك شایەدحاڵێکی زیندوو ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە. لە بەرگی یەکەمی سەفەرنامەکەیدا بە تایبەت لە نامەی بیست، بیست و یەك و بیست دوو تەرخانی کورد و (ئێزیدییەکان) کراوە زۆر زانیاری ورد و سەرنجڕاکێش دەگێڕێتەوە، کە تا ئێستە مێژوونووسیی کورد لێ بێئاگایە و هەموو ئەم بەشانەش لێرە لەم کتێبەدا کراون بە کوردی. دڵنیام ئێستە دوای بڵاوبوونەوەی سەفەرنامەکەی پوژولا ڕووداوەکانی جەنگی کورد و عوسمانی ساڵەکانیِ ١٨٣٦-١٨٣٧ پێویستی بە خوێندنەوەیەکی نوێ هەیە، زانیارییەکان زۆر ڕاست و دروستن و لە زاری مێژوونووسێکی فەرەنسییەوە نووسراوەتەوە، کە تەنیا خۆشەویستی و گەڕان بەدوای وردەکارییەکانی جەنگی خاچپەرستەکان گەیاندویەتیە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. گەرچی تارمایی لایەنگیرییەکی زۆر بۆ مەسیحایەتی لەناو بیرکردنەوە و سەفەرنامەکەیدا دەبینرێ بەڵام ئەم لایەنگیرییە ئەوەندە کاریگەریی نەبووە لە شێواندنی ئەو ڕاستییانەی، کە لەبارەی کوردستان دەیانگێڕێتەوە.

ماوەتە سەر ئەوەی بڵێم ئەم سەفەرنامەیە دووبەرگی گەورەیە و بەسەریەکەوە هەمووی هەزار قسور لاپەڕەیەکە، ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە مێژووی کوردستانەوە هەیە تەنیا بەرگی یەکەمە لە (لا: ٣٤٨ تاوەکوو ٤١٠) ،کە ئێمە لێرەدا لەم کتێبەدا کردوومانە بە کوردی.

ژان-باتیستان-فرانسوا پوژولا ساڵی ١٨٦٤ لە ئێکس ئۆن پرۆڤانس Aix-en-Provence کۆچی دوایی دەکات.

## بەرهەمەکانی

1-Voyage dans l'Asie Mineure, en Mésopotamie, à Palmyre, en Syrie, en Palestine et en Égypte : faisant suite à la Correspondance d'Orient, Paris : Ducollet, 1840, 1841, 2 vol. (456, 612 p.)

2-Histoire de saint Augustin: Sa vie, ses oeuvres, son siècle... son génie, Paris : Mellier frères, 1843, 3 vol.

3- Récits et souvenirs d'un voyage en Orient, Tours : A. Mame, 1848, (308 p.)

4-Histoire de Constantinople, comprenant le Bas-Empire et l'Empire ottoman, Paris : Amyot, 1853, 2 vol. (٤٨٧, 525 P)

5-Charles Ier et le Parlement, Ed. Douniol, 1854 (230 p).

6-Histoire de la conquête et de l'occupation de Constantinople par les latins, Tours : A. Mame et Cie, 1855, (284 p.)

7-Histoire de Richard Ier Coeur-de-Lion : duc d'Aquitaine & de Normandie, roi d'Angleterre, Tours : A. Mame, 1856, (307 p.)

8-Histoire des papes depuis saint Pierre jusqu'à la formation du pouvoir temporel, suivie d'un aperçu historique de la question romaine depuis 1848 jusqu'en 1862, Paris : A. Le Clère, 1862, 2 vol.

9-La Vérité sur la Syrie et l'expédition française. Avec une préface de M. [Jean-Joseph-François], Paris : Gaume frères et J. Duprey, 1861, (XXIV-540 p).

# VOYAGE

A

# CONSTANTINOPLE

DANS L'ASIE MINEURE,

EN MÉSOPOTAMIE, A PALMYRE,

EN SYRIE,

EN PALESTINE ET EN ÉGYPTE.

PAR

M. BAPTISTIN POUJOULAT.

FAISANT SUITE

A LA CORRESPONDANCE D'ORIENT

—

TOME I.



PARIS

DUCOLLET, LIBRAIRE-ÉDITEUR,

QUAI DES GRANDS-AUGUSTINS, 15.

—

1840

## LETTRE XX.

Les Kurdes, les Yezidis, les [illegible], et autres peuplades de la Mésopotamie.

A M. MICHAUD.

*Du camp de Hafiz-pacha, 28 août 1837.*

Dès le premier jour de notre arrivée à Malattia, le bruit avait couru que deux officiers moscovites, ayant mission d'organiser les bandes kurdes maintenant en guerre avec l'armée turque, étaient arrivés dans la cité. Ces deux prétendus officiers russes n'étaient autre chose que mon compagnon de voyage et moi. Un courrier avait été envoyé secrètement au camp des Osmanlis, situé à dix lieues à l'ouest de Mélitène, pour informer Hafiz-pacha de cette nouvelle; celui-ci fit partir en toute hâte un Tartare pour

# ئاسیای بچووك

## نامەی بیستەم

کورد، ئێزیدی، سەکیزبێیکلووەکان* و گەلانی دیکەی میزۆپۆتامیا

بۆ بەڕێز میشوو M. Michaud

### ئۆردوی حافز پاشا، ٢٦ ی ئاگستۆسی ١٨٣٧

هەر لەگەڵ یەکەمین ڕۆژی گەیشتنمان بۆ مەڵاتیە قاو وا بڵاوبۆوە کەوا دوو ڕووس، کە ئەرکی ڕێکخستنی ئەو چەتە کوردانەیان پێ سپێردراوە کە ئێستە لە لەگەڵ سوپای تورکدا لە جەنگدان، گەیشتوونەتە ناو شار. ئەم دوو کەسە، چ کەسێکی دیکە نەبوون جگە لە هاوسەفەرەکەم و من نەبێ. نامەیەك بە نهێنیی ڕەوانەی کامپی عوسمانلی کرابوو، کە لە دە فەرسەخی ڕۆژئاوای مەلاتینە* بوو بۆ ئاگەدارکردنەوەی حافز پاشا لەم هەواڵە، ئەویش بە تالووکە تەتەرێکی ڕەوانەی مەڵاتیە کرد و کەهیەکەی Kiaya (سکرتێرەکەی) فەرمانی بۆ هات کە بە هیچ شێوەیەك بویوردی (پاسپۆرت)مان نەدەنێ تا ئەو کاتەی ئەوەی بە خۆی دڵنیا دەبێت لەوەی کە ئێمە کێین. دوکتۆر مەگدانلاتۆ کە دەرفەتی ئەوەم هەبوو لە نامەی پێشوومدا باسی بکەم ئێمەی لە هەموو شتێك کە پەیوەندی بە ئێمەوە هەبوایە ئاگەدار دەکردەوە و بۆخۆشی ئامادە بوو، کە لەگەڵمان بێتە لای کەهیە بە خۆمان و فرمانی ئیمپراتۆریمانەوە، بۆ ئەوەی ترسی

---

* سەکیزبێیکلو: Sikisbéiklou : واتە هەشت سمێل، لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا زیاتر وەکوو سووکایەتی بە ئێزیدییەکان دەوترا (وەرگێڕ).

* Melitene: ناوی کۆنی شاری مەڵاتیەیە لەسەردەمی خاچپەرستەکاندا (وەرگێڕ).

ئەوە بڕەوێنێتەوە کە بوونی ئێمە دروستی دەکرد. چوینە لای سکرتێر، بە ساردی پێشوازی لێکردین و بە ئاستەم ئامادەیی خۆی دەربڕی و داوای لێکردین لە دیوەخانەکەی دابنیشین. وەختایەك چاوێکی بەسەر فەرمانە ئیمپراتۆرییەکەدا خشاند، دەمودەست شێوەی دەربڕینی دەم چاوی گۆڕا، ستایشی مەراییکەرانە، قسەی نەرم و نیان شوێنی ئەو دەم و چاوە مڕ ومۆن و گوماناوییەی گرتەوە. کەهیە پێیوتین کەوا حافز پاشا، سەرعەسکەری سوپای تۆرۆس، بە هاتنی ئێمەی زانیووە و زۆر حەز دەکات بتانناسێ: " بڕۆن بۆ بارەگەی گشتی، ئەو وتی.، سەرعەسکەر فەرەنسی زۆر خۆشدەوێن، خۆشنوود دەبێت بتانبینێ لەژێر خیوەتگەکەی ئەودا دانیشن". ملمان وەبەر ڕێگەنا بۆ ئۆردووی عوسمانی. هەرگیز پەشیمان نیم لە ماندووبونی ڕێگە، لێرە بە وردەکاریی سەیر و نوێم زانی دەربارەی دابونەریت، خەسڵەت، بیرو باوەڕی کورد و ئێزیدییەکان، ئەوانەی کە سوپای عوسمانی شەڕی لەگەڵدا دەکردن.

کوردستان، ئەم هەرێمە کە لە باشووری ئەرمەنستانەوە بە درێژاییەکی نەوەد و پێنج فەرسەخ لە باکووری -ڕۆژئاوا بۆ باشوور و بە پانییەکی پەنجا فەرسەخ درێژدەبێتەوە و ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بۆ لەوەڕگە، دانەوێڵە و بەرهەمی دیکە. کوردەکانی ئەم وڵاتە هەموویان لەژێر دەوار و ڕەشماڵ دا ناژین.، بە پێچەوانەوە ژمارەیەکی زۆرترینیان لە گوندە گەورەکان و شارۆچکەگەلێکی بێشوماردا دەژین، وەك شارەزوور، کە ژمارەی دانیشتوانەکەی هەشت هەزار کەسە، ئەربیل، ئەربیلای کۆن کە بە کەوتنی شانشینی فارس بەناوبانگە ئەمڕۆ ژمارەی دانیشتوانەکەی چوار هەزار کەسە. زنجیرە چیای زاگرۆس کە کوینت-کیورس Quinte-Curce بە چیای گۆردیان ناوی دەبات و لە دیوی ڕۆژهەڵات سنووری کوردەکانە.، بیابانی عەرەبی لە باشوور، وڵاتی خارپووت لە باکوور و ئەلەجەداغ (چیای ڕەنگ تێکەڵاو) یان

ئەنتی تۆرۆس بۆیان بووەتە سنووری ڕۆژئاوا. زنجیرە چیای ئەنتی تۆرۆس، جێگەیەك کە من ئێستە ئەم نامەتان بۆ دەنووسم دانیشتونەکەی سەرلەبەری کوردن. بە شیمانەی هەرە زۆر دانیشتوانی کورد بگاتە سێ ملیۆن کەس، کە دەوروبەری سەد هەزارێکیان مەسیحی نەستوورین کە سەر بە دوو پاتریارشی پشتاو پشتن: یەکێکیان هەمیشە پێی دەڵێن مارگ-ئەیمان، لە نشینگەکەی لە نزیك شاری جۆلە مێرگ دا دەژی و ئەوی دیکەیان: لە ڕوبان-ئۆرم دەژی. دەسەڵاتی ئەم دوو پاتریاشە بەسەر سێزدە قەشەوەیە. پایەی ئەسقەفیی و ئەوەی پاتریارشەکان پشتاوپشت لە مامەوە دەگوازرێتەوە بۆ برازا. وادەبێت برێکجار لە سۆنگەی ئەم مافە پشتاوپشتییە، منداڵێکی دوانزە یان پانزە ساڵان دەبێتە ئارشەڤێك. مەترانەکان (کەشیش) لەناو نەزانییەکی گەورە دان و دەستەی ئایینی (کلێرژێ) ی خوارەوە بە ئاستەم دەزانن بخوێننەوە: کوردە مەسیحییەکان لە جەنگی دژ بە تورکەکان ئامادەییان کەم بووە.

ئەو دانیشتوانەی دیکە کە ماونەتەوە سەر بە تایفەی عەلی[1] ین، بەڵام ئیسلامەتی لای ئەوان تێکەڵاوە لەگەڵ خوارفیات کە وا پێدەچێ پاشماوەی باوەڕدارانی مووغەکان بن. ئەوانە بەهیچ شێوەیەك مزگەوتیان نییە و لەو کاتەنەدا نوێژ ناکەن کە قورئان دیاری کردووە و مانگی ڕەمەزان ڕۆژوو (جەژنی پاکی تورکەکان) ناگرن و هەرگیز بۆ حەج ناچنە مەککە.

ئێوە دەزانن کە کوردەکان لە نەوەی کاردۆخییەکانن کە زینەفۆن، سەرکردەی سوپا دە هەزار کەسییەکە پێمان دەڵێ کاردۆخییەکان هەمیشە بەرەو ڕووی هێزی پاشای گەورە و سوپای مەرزەبانەکان بوونەتەوە. کوردەکان بە تەواوی ئەم خەسڵەتە یاخیبووە و سەربەخۆییەیان پاراستووە.

---

[1] مەبەستی لە تایەفەی عەلی، باوەڕدارانی عەلی ئیلاهیە(وەرگێڕ).

لێرە خۆم لەوە بەدوور دەگرم ئەو حەکایەتانە بگێڕمەوە کە تورکەکان بنچینەی کوردەکانی پێ لێکدەدەنەوە.، ئەم حەکایەتانە سیفەتێکی قێزەونانەی بەربەرییانەیان هەیە، کە شایانی باسکردن نین. دەشێ تێبینی ئەوە بکرێ کە هەمیشە چەند شتێك هەیە لە دابو نەریتی گەلێك دا کە لە بنچینەوە بۆی ماوەتەوە. ئەوەی لەبارەی پێکهاتەی سەرەتایی گەلی کوردستان بۆمان دەگێڕێتەوە قێزەونە وەکوو غەریزە و هەڵسوکەوتی ئەو چەتە پەرت و بڵاوانەی کە بەناو چیاکانی نیفت، قەرەجەداغ[1] و ماسیوسی کۆن دا بڵاوبوونەتەوە.

وێنەی کورد بە ڕێکوپێکی سیما و خەسڵەتی کە نازانم لە چ بەخۆنازنێکی کێویانەی پڕ لە نەجیبزادەیی سەرچاوە دەگرێ شایانی سەرنج لێدانە. کورد چاوڕەش، زیندوو، زیرەك، باڵا بەرز و شێوەی لەش و لاری جوانن. جل و بەرگیان لە کراسێکی خۆڵەمێشی، قات و شەروالێك لە خورییەکی خەت خەتی دروستکراو کە بە دۆخینێك لە ناوقەدیان توند کراوە و جامانەکەی لە کۆتاییدا گوڵینگی هەیە، پێڵاوەکەی سەندالێکی لە چەرم دروستکراوە کە بە قایشێك لەسەر پاژنەی دەبەسترێتەوە: ئەم پێڵاوە زۆر لەو پێڵاوانە دەچێ کە ڕۆمانە کۆنەکان لە پێیان دەکرد. کورد هەر لە گەنجێتییەوە لەگەڵ چەك ڕادێن، بە سواری ئەسپەوە بە شمشێر، تۆپڕەق، ڕم، دەمانچەی

---

[1] قەرەچەداغ (Karaca Da⊠) (بە کوردیی: قەرەژە-داغ): چیایەکی ڤۆلکانییە کەوتووەتە ناوەڕاستی باشوور-ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە باشوور-ڕۆژهەڵاتی تورکیا، کەوتووەتە نێوان حەوزی دیاربەکر و بانەکانی ئۆرفە بە ئاڕاستەی باکوور و باشوور. بەرزاییەکەی ١٩٥٧ مەترە و چیاکە بەناوبانگە بە "کەڤریڕەش"، بۆیە بەو ناوە دێتە ناسین. هەروەها چیای ماسیا (Mount Masia)شی پێ دەڵێن. ناوچەی قەرەچەداغ لەلایەن سوڵتان سەلجوقی سەڵتەنەی ڕۆم؛ کەیقوبادی یەکەم دوای جەنگی یاسیچەمن (Battle of Yassıçemen) پێشکەش بە ئەرتەغۆل غازی کرا. (وەرگێڕ)

ئاگردار شەڕدەکەن، ئەم چەکەی دوایی لە کاتی هەڵاتن و هەر وەك چۆن لە کاتی پەلاماردانیش دا هەر بەکاردەهێنن: بە سواری لەسەر ئەسپەکانیان تەقەدەکەن و بە خێراییێکی زۆر ڕادەکەن. ئەم پیاوانە دەتوانن بەرگەی هەموو ماندووبوون و هەموو چەشنە بێبەشبوونێك بگرن، بەڵام دڵڕق، بێ ئایینن و هیچ درۆ و دەلەسەیەك نایانترسێنێ، بەمەرجێك بەرژەوەندی خۆیانی تێدا ببیننەوە. کوشتن، تاڵان و بڕۆیی و بەچاوی سووك سەیرکردنی هەموو دەسەڵاتێك ئەوانە تاقە خەمیانە و ئەمە ئاکار و سروشتی سەرەکیانە. بەر لە جەنگی ١٨٣٦ و ١٨٣٧، کوردەکان پەلاماری کاروانسەرایەکانیان دەدا تاوەکوو دەروازەی دیاربەکر، مووسڵ، مەڵاتیە و ئۆرفە. میوانداریێتیان کە ئەوەندە لە لایەن چەند گەڕۆکێکەوە پێیدا هەڵگوتراوە لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەی ئێمە لێرەدا لەسەر ئەوان بیستمان دەسڕێتەوە: کوردەکان پێشوازی لە بێگانە دەکەن بە نیشاندانی دۆستایەتیەکی زۆر، بەڵام بە بیانووی پەسندکردنی چەك، جل و بەرگ و جانتاکانیان، لێیان دەدەزن و بە خراپی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، زۆربەی جار ئەسپیان لە ئەسپسوارێك ڕفاندووە و دواتر هیوای سەفەرێکی خۆش یان بە پێیان بۆ خواستووە! . لەوەتای کوشتنی زانای ئەڵمان شۆلتز کە لەسەر حیسابی حوکوومەتی فەرەنسی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی ڕەوانەی ئاسیا کرابوو دوای ئەوە ئیدی گەڕۆکە ئەوروپاییەکان چیتر مافی ئەوەیان نییە ستایشی ئەم میوانداریێتییە بانگاشە بۆکراوەی کوردەکان بکەن. شۆلتز دوای ئەوەی سەری ئێران دەدا، لە پاییزی ١٨٢٩ ڕێگەی کوردستان دەگرێتەبەر و بە هاوەڵی یەکێك لە بندەستەکان و شەش سەرباز کە ئارسلیارخان*، کە ئەو دەم حاکمی یەکێك لە هەرێمەکانی ئێران بووە بە گەڵی دابوون. گەڕۆکە ئەڵمانییەکە و دەست و پێوەندەکانی بەشێوەیەکی بێبەزەییانە لەلایەن کوردەکان قەتڵوعام دەکرێن هەتا

* Arsliar-Khan

ئەوانەش کە وایان نیشانداوە بیپارێزن. جوتیارە ئەرمەنەکان کە بە زۆر ڕاسپێردرابوون تەرمی ئەم بەسە زمانانە بنێژن، ئەو هەواڵە دڵتەزێنە بە ئارسلیارخان دەگەیەننەوە. کەل و پەل و تێبینییەکانی شۆلتز کە لە کۆشکی شازادەی ئێران بەجێهێڵدرابوون ڕەوانەی بالوێزخانەی فەرەنسا کران لە ئیستەنبوڵ، بەڵام ئەو جانتایانەی کە شۆلتز لە سەفەری کوردستان لەگەڵ خۆیدا بردبوونی هەموویان لەلای چەتەکان مانەوە.

کورد زۆر مەیلی ئەوەیان هەیە نرخی خوێنی کوژراو بژمێرن، وەکوو عەرەبە بەدوە بیابانشینەکان، خوێنی کوژاو، کە بە ئەسپ، مانگا، دوو مەڕ، سێ بزن، یان یەکێك لە کچەکانیان بە مارەیی دەدەن بە یەکێك لە کەسوکاری ئەو کەسەی کووشتویانە بە بێ ئەوەی داوای مارەیی بکەن، کە ئەم مارەییە بۆ زامنکردنی چێژوەرگرتنی ئافرەتی بەشوودراو داواکراوە. ژنانی کورد بەڕاستی پیاوانین، بە تەواوی سواری ئەسپ دەبن، وەکوو مێردەکانیان چەکدارن، باڵایان ناسکە، بەڵام دەم و چاویان لەبەر خۆرەتاو سوتاوەتەوە و هیچ ڕەونەقێکی تێدانەماوە. بەهیچ شێوەیەك پەچە ناپۆشن: جل و بەرگیان بەشێوەیەکی سادە بریتییە لە کراسێك لە قوماشی خۆڵەمێشی لەسەر سینەیان کراوەتەوە و بە قایشێکی چەرم ناوقەدیان بەستراوەتەوە، قژیان درێژ و ڕەش و کەزی کەزی کراوە و چەند پارچە پارەیەك بەسەر شانیان دا دێتە خوارەوە. ئەم ژنانە تەنیا پەچەیەکی تەنکی زەرد یان شین کە لە پشتەوە دێتە خوارەوە دەخەنە سەر سەریان و بە پێخواسی دەڕۆن.

لە دەرەوەی ماردین (ماردی کۆن) لەنێوان نەزیبین (یان نیزبین) و مووسڵ (نەینەوای کۆن) ئەو وڵاتەی کە پێی دەڵێن سنجار، لە ناوی شاری کۆنی سنجار کە بە مێژووی جەنگی خوێناوی شاپوور، پاشای ئێران دژی کۆنستانس، ئیمپراتۆریای بێزەنتینی بەناوبانگە. چیایێك بەناوی سنجار داغ، پێدەشتی

میزۆپۆتامیا (ئەمڕۆ هەرێمی جەزیرەیە)، بە لای باشووری ماردین دەبڕێ. سنجار داغ بە خەڵکەکەیەوە بەناوبانگە بەناوی جنستان یان نیشتمانی شەیتانستان. ئەم دەرو ناوچەیە لەوەڕگەی دەوڵەمەند و هەموو جۆرە میوەیەکی لێیە، ئێزیدییەکان، گەلێکی جەگاوەری لێیە کە حافز پاشا شەڕی لەگەڵ ئەوانیش دا کردبوو. دانیشوانی ئێزیدییەکان بە دوو سەد هەزار کەس دەخەملێندرێ.

ئێزیدییەکان عەقیدەی ئاینی خۆیان کردۆتە مەتەلێکی گەورە و ئێمە دوای ماندووبوونێکی زۆر توانیمان چەند چەمکێکی ڕوون و دڵنیا لەو بارەیەوە وەگیربخەین. هەڵبەتە بڕێك لە پراتیکی ئاینی ئێزیدییەکان لەدەست زانیاری گەلانی هاوسێیەکیانیان دەرباز نەبووە. من ئەوەندەی کرا بەدوای چاوپێکەوتنی کەسانی زۆر خوێنەواردا گەڕام و بایی ئەوەندە زانیاریم کۆکردنە، کە بتوانم لە بنچینە و ئاینی ئێزیدییەکان بگەم.

واباوەڕ دەکرێ کە ئەم نەتەوەیە پاشماوەی کۆنە ماردەکان بن، کە ئارشاك پاشای فارس گواستیێتنەوە بۆ میزۆپۆتامیا. ئەم گەلە ناوەکەی بەو شارە .ق بەخشیوە کە ئەمڕۆ ناوی ماردینە. ستراپۆن، ئاریەن و پلین ماردەکان وەکوو ڕەگەزێکی مرۆیی دەستەمۆنەکرا و سەر بە تایەفەیەکی ئێرانی دادەنێن کە ئەهریمەن یان بنچینەی خراپە دەپەرستن.

بڕێك لە زانایەکان زەردەشت وەکوو یەکەمین دامەزرێنەری ئەم عەقیدەیە دەبینن، بەڵام ماوەیەکی زۆر پێش ئەم پێغەمبەرە، میسر، هورموزد و ئەهریمەنی لەژێر ناوی ئۆسریس و نیۆفۆن ناسیووە. بنچینەی ئەم بیروباوەڕە لە دەورانی زۆر کۆنی مێژوودا ون بووە. ئاینی ئێزدی کە ئێستە ئێمە باسی دەکەین بێگومان سەرچاوەکەی لە پەرستنی کۆنی مارەکانەوە هەڵچنیووە. ناوی ئێزیدی کە ئەمڕۆ ئەمانە هەڵیانگرتووە لە ناوی سەرداری عەرەب یەزیدەوە هاتووە کە حوسێن کوڕەزای پێغەمبەر محەممەدی کوشتووە، کە زۆر بە سەرسەختانە خێزانی عەلی

چەوساندۆتەوە. لەوەوە ڕقێکی قووڵ لەنێوان ئێزیدییەکان و موسڵمانەکاندا هەیە. ئێزیدییەکان بکوژی حوسێن هەر وەکوو دامەزرێنەری تایەفەکەیان سەیر دەکەن[1].

ئێزیدییەکان دوای ئەوەی دان بەوەدا دەدەنێن کەوا ڕەحمەتی خوداوەند وەکوو حیکمەتەکەی بێکۆتاییە، هیچ دوودڵ نابن لەوەی ڕێز لە شەیتان بگرن. چونکە ئەمان شێلگیرانە باوەڕیان وایە، کە ڕۆژێك دێت شەیتان بەهۆی ئەو سەرپێچیکردنەی کە کردوویە شەرافەتمەندی خۆی بۆدەگێڕدرێتەوە و دێتەوە ناو فریشتەکان.

" بۆچی، ئەوان دەڵێن، شەیتان سوك بکرێ ؟ بۆچی دەخالەتی لەنێوان فریشتەیەکی لێقەوما و پاشاکەی بکرێ؟ ئایا خودا پێویستی بەوە هەیە، کە ئێمە نەفرەت لەوە بکەین کە خۆی سزای داوە؟ ناکرێ بگاتە ئەوەی لێخۆشبێ؟ چەند بتەوێ شمشێر لە دژی غەزەبلێگیراوێك هەڵبکشێین، کە لەوانەیە سبەینێ خوداوەند بیخاتە ناو شەرافەتمەندی خۆیەوە"

تورکەکانی میزۆپۆتامیا بەشێوەیەکی دیکە قوڵایی باوەڕی نەوەی ماردەکان لێك دەدەنەوە:

"ئێزیدییەکان، تورکەکان دەڵێن، بەهۆی تاڵان بڕۆییان هەستیان بە تاوان کرد و لە دادپەروەری دەترسان، زیاتر لە خەڵکەکانی دیکە لە ڕۆژی دوایی، لە ئاگری هەمیشەیی دەترسن و هەوڵدەدەن خۆیان لای شەیتان خۆشەویست بکەن بەوەی لەماوەی ژیانیاندا دەیپەرستن و دواتر پاراستنیان لە لایەن ئەوە وەختایەك دەکەونە ناو قوڵایی دۆزەخ". پیرۆزیی ئێزیدییەکان لەبەرامبەر میری تاریکستان، پاڵی بە دوایین پلە وە ناوە کە ئەوەندەی دەکرێ خۆیان (لا ٣٥٨) لە هەموو قسەیەك بەدووربگرن کە خەڵکانی دیکە دژی شەیتان بەکاریان

[1] ئەم قسەیە هێندە بێ مانا و نادرووستە شایانی، ئەوە نییە هیچ پەراوێزێکیشی بۆ بنووسین (وەرگێڕ).

دەهێنن. ئەم تایەفەیە نەك هەر ناوی شەیتان ناهێنن بەڵكو هەتا بەكارهێنانی چەند دەربڕینێك كە ئاوازەكەی لەو ناوەوە نزیك بێ خۆیان لێی بەدوور دەگرن. بۆ نموونە ڕووبار بە زمانی ئاسایی ناوی (شەت)ە، بەڵام چونكە ئەم وشەیە پەیوەندیەكی كەمی لەگەڵ وشەی شەیتان هەیە، بۆیە ئێزیدییەكان بە ڕووبار دەڵێن ئاڤێ مەزن. عوسمانییەكان بە بەردەوامی نەفرەت لە شەیتان دەكەن و بۆ ئەم مەبەستە وشەی نال بەكاردەهێنن كە واتەی نەفرەت لێكردن دەگەیەنێ. ئێزیدییەكان بە وریاییەكی زۆرەوە ئەو وشانە بەكاردەهێنن كە لەیەكچوونێكیان لەگەڵ ئەم وشەیە هەبێ، بەم شێوەیە لە جیاتی وتنی ناڵ، كە بە واتەی ناڵی ئەسپیش دێت دەڵێن سۆل، واتە ژێر پێی ناڵی ئەسپ كە وشەی سۆلكار دەگرێتەوە كە واتای ناڵبەند دێ بە مانای زمانە ئاساییەكان، ناڵبەندا یان شەیتان لە زمانی ئێزیدییەكاندا ناوی نییە، بۆ ناونانی تەنیا ئەم قسانە دەڵێنەوە شێخی مەزن یان شێخی گەورە"[1].

بەدبەخت ئەو كەسەیە كە لە وڵاتی ئێزیدییەكان نەفرەت لە شەیتان دەكات، ئەگەر گوێیان لێبێت ئەوا دەمودەست لەت و پەت دەكرێ. وەختایەك كاریان دەكەوێتە ناو شارە توركییەكان، لە هەموو شتێك زیاتر ئیهانەكردنیان بەوە دەبێت لە بەرامبەریاندا بە خراپ باسی شەیتان بكرێ ، ئەو كەسەی كە ئەم دەمدرێژییە دەكات ئەگەر لە ڕێگەدا تووشی ئێزیدیێك بێت ئەوا كوژراوە. زیاتر لە چەند كەسێكی ئەم تایەفە گیراون و بە تاوانی كوشتن لەلایەن دادگەی توركییەوە حوكمی لەسێدارە دانیان بەسەردا سەپێنراوە. ئەوان زیاتر حەز دەكەون بمرن لەوەی نەفرەت لە شەیتان بكەن.

لەسەرەوە باسی ئەو ڕقەم كرد كە لەنێوان تایەفەوانانی ئیسلام و شەیتانپەرستەكاندا هەیە، ئەم ڕقە هەردوو گەلی تا زەبروزەنگاویترین ڕادەی

---

[1] Le P.Garzoni

فەناتیزم ( دەمارگیریی ) هانداوە. بەم شێوەیە بۆ ئێزیدییەك چ کردەیەك ئەوەندەی شایان نییە لەوەی موسڵمانێك بکوژێ و بۆ ئیسلامەکەش هەر ئاوایە و تاجی شەهید بوون بەدەست دەهێنێ ئەگەر بەدەستی ئێزیدییەك بکوژرێ. بەم شێوەیە لە زەمانی کۆندا حاکمانی دیاربەکر، مووسڵ و ماردین لەناو ئەوکەسانەی کە حوکمی سێدارەدانیان بەسەردا دەسەپاندن، حاکم داوای دەکرد جەلادەکان ئێزیدی بن بۆ ئەوەی هەست بکەن بە دەستی ئێزیدی کوژراون و خۆیان بە شەهید بزانن. ئەگەر سەرۆکی ئێزیدییەکان دەسەڵاتێکی توند بەکارنەهێنێ، ئەوا هەموو گەل بە کۆمەڵ دەیانەوێ ڕۆڵی بکوژ (جەلاد) ببینن و هەموو شەش مانگێك جەلادێکی نوێ هەڵدەبژێرن. لەکاتی بەجێهێشتنی ئەم کارە کە وەك کارێکی شەرەفمەندانە و ئەوەندە پیرۆز لای ئێزیدییەکان سەیردەکرێ کە لەناو پیرۆزکردنی خەڵکدا دەچێتەوە ماڵەکەی خۆی و جەژنی بۆ دەگێڕن، پەسنی دەکەن و هەر کەس دەیەوێ ببینێ و دەستی لێبدات و ئەگەر لەکاتی کارەکەیدا چەند دڵۆپە خوێنێکی موسڵمانەکان بە جل و بەرگییەوە مابێتەوە، ئەوا ئەم جلە پارچە پارچە دەکەن و ئەم پارچانە وەکوو تفەرکێکی گرانبەها بەسەر خەڵك دابەش دەکرێ.

کاتێك ئێزیدییەك بە دەستی تورکەکان بکوژرێ بە بێ ئەوەی تۆڵەی بسەنرێتەوە، جەنازە ناشتن کە بە شێوەیەکی ئاسایی بە خۆشی دەبێت ئەوا بە بێدەنگی و بەبێ هەراو هۆریا بەڕێوە دەڕوات. خزمە هەرە نزیکەکانی مردووەکە ڕدێنیان دەتاشن وەك نیشانەیەکی ئابڕووچوون و لێناگەڕێن ڕیشیان بێتەوە تەنیا ئەوکاتە نەبێ تۆڵەی خۆیان دەسەننەوە ورۆحی هەڵچووی مردووەکە هێور دەبێتەوە. لەناو دەستەی فەقیرە سەرگەردانەکان خەڵکانێك هەن کە تەنیا بە نانی سەدەقە دەژین. فەقیر کە سەرپەرشتی ڕێوڕەسمی ناشتنی مردوو دەکات،

مردووەکە بە ڕاوەستاوی دادەنێ و بەناولەپی دەستی لە ڕوومەتی ڕاستی دەدات و پێی دەڵێ *بێشك* (بڕۆ بۆ بەهەشت).

با بگەڕێینەوە سەر بیروباوەڕی سەرەکی نەوەی ماردەکان. ئەوانە لە خەیاڵدانی خۆیان، پاشای جیهان، شەیتانی جوان و مەزنە و هیچ لە بەرزیی ڕۆحیی خۆی لە دەست نەداوە. بەڵام هەڵبەت لەسەر خەتی سیمای چەند شتێك هەیە کە تەواو خەمناکن کە وای لێ دەکەن کەمتر درەوشاوەتر بێت وەك لە پێش لێکەوتنیدا. شەیتان لەناو ڕۆحی ئێزیدی بەدیاردەکەوێ، بە نزیکەیی وەك ئەوەی چۆن فیلتۆن لە ناوەڕاستی ئەنجومەنی شەیتانیی خۆی دەردەخات.

" فۆرمەکان بە هیچ شێوەیەك لە ڕەونەقی ئەسڵیان دانەماڵراون، دۆڕاو، کەوتوو، گەورەی فریشتەکان دەناسرێنەوە. ئەمە شانازییێکی کەمێك نا ڕۆشنە وەك ئەوەی کاتێك خۆرەتاو هەڵدێ، هێشتا تاڵە داوەکانی دەرنەکەوتوون، ڕوانینێکی ئاسۆییانە بەناو تەمتوومان سپێدە پەخش دەکات، یان لە کاتی خۆرگیراندا ئەم هەسارەیە شاراوایە لەودیو مانگ بریسکەیەکی خەمناك دەداتەوە بەسەر ئەو خەڵکە و پاشاکان بە گەردەلوولی شۆڕشەکان دەترسێنێ. سیمای بە شوێنکاری هەروەتریشقە زامدار بووە و خەمبارییەکان بەسەر گۆنا زەردەکەیەوە ئێشك دەگرن"[1].

ئێزیدییەکان لەسەر شێوەی مار شەیتان دەپەرستن و لێرەوەیە یادەوەرییەکی کەمی لە ترادسیۆنی ئینجیلی خۆمان دەبینینەوە. ئێزیدییەکان لە ساڵێکدا شەوێکیان تەرخان کردووە بۆ ئاهەنگێکی گەورە لەسەر شەرەفی شەیتان و لەم شەوەدا کە دەکەوێتە دەیەمی مانگی ئاگستۆس، ئێزیدییەکانی دەر و ناوچە هەرە دوورەدەستەکان بە خۆیان و ژن و کچەکانیان لە نزیك چیایەکی بەرز کۆدەبنەوە کە پێی دەڵێن چیای عەبدولعەزیز و کەوتۆتە سێ

---

[1] *Paradis perdu,* chant I.

فەرسەخی باشووری ڕۆژهەڵاتی ماردین. لە بناری ئەم چیایەدا ئەشکەوتێکی لێیە کە هیچ کەس قوڵاییەکەی نەپێواوە، ئەم ئەشکەوتە لە بیروباوەڕی ئەواندا تاوەکوو ناوچەکانی دۆزەخ درێژ دەبێتەوە. وەختایەك نیوەشەو دادێت ئەو خەڵکە هەموو لەبەردەم ئەشکەوتەکە دەوستن، بزن و مەڕی زیندوو، پارە، نان، سەوزە، جلو بەرگ فڕێدەدەنە بنەبانی ئەشکەوتەکە؛ هەموو ئەمانە بۆ ڕێزگرتن لە پاشانشینی ترسناکی تاریکستان. پاشان لەبەر ڕووناکیی شاپڵیتە و مۆم، لەگەڵ دەنگی زوڕنا، کەڕەنا، سیمبال (سەنج) و تەمبوور، بە شێوەی بازنەیەك دەوەستن و لەسەر شکۆی ئیمپراتۆریای تاریکیی سەمادەکەن. دوای ئەم سەما تۆقێنەرە ئاپۆرەی خەڵکەکە بەرەو ژێر زەمینێکی بەرفراوان دەڕۆن کە هێندە زۆر لە ئەشکەکە دوور نییە. پیاو، ژن، کچی گەنج دەچنە ژێر زەمینەکە و لەناو تاریکاییدا و لەوێدا دەست بە بەرەڵلاییەکی بێسنوور دەکەن کە خەیاڵ بە ئاستەم جورئەت دەکات لە ئاستیدا بوەستێ[1]. ئەم شەوە، کۆبوونەوە و ئاپۆرەی زۆری کۆبوونەوەی ئەم خەڵکانەمان وەبیردەهێنێتەوە کە لەناو چیاکانی ئاسوورییەکانی سوریە یەکەمین ڕۆژی ساڵ کە ناویان ناوە بوك بیك (ئاهەنگی یەکگرتن) کۆدەبنەوە.

مووسا، محەممەد، بەشێوەیەکی تایبەتیش عیسا-مەسیح و پیرچاکە مەسیحییەکان لە لایەن ئێزیدییەکان پیرۆز کراون. " ئەوان دەڵێن، خوداوەند هەموو ئەو کەسایەتیانەی لە ئاپۆرەی خەڵکی جیاکردۆتەوە.، بۆیە دەبێت ڕێزیان لێبگیرێ بۆ ئەوەی ڕۆژێك بێ پاراستنیان بەدەست بهێنی". لە بیروباوەڕی ئێزیدییەکاندا جۆرێك لێبوردەیی (تۆلێرانس) هەیە کە دەگەڕێتەوە

---

[1] ئەم گێڕانەوەیە جگە لە خەیاڵی فەناتیزمی ئایینیی دەسەڵاتکارانی عوسمانی زیاتر هیچ شتێکی دیکە نییە و ئەوان ئەم تۆمەتەیان خستۆتە پاڵ زۆربەی گرووپ و تایەفە ئایینیەکانی دیکەش وەک (شەبەک و سارەلییەکان) (وەرگێڕ).

بۆ وەرگرتنی هەمەچشنە، بۆ چاولێکردنەوەی هەمەچشنەی هەموو ئایینەکانی سەر زەوی. ئێزیدییەکان هیچێکی تایبەتییان لەناو عەقیدەی خۆیان دا نییە، هیچ ڕەتناکەنەوە و بە هیوای بەردەستخستنی بەختیاری لە ژیانی دوارۆژیان و لە چەند شێوەیەکدا خۆیان دەخەنە ژێر پاراستنی هەموو پەرستنەکان و هەموو ئەوانەی لە شوێنگەی خودایی وەکوو هێزی گەورە خۆیان دەسەپێنن.

لە جەزیرە چەند دێرەیەکی مەسیحییەکانی لێیە و ئێزیدییەکان هەرگیز بە بەردەم ئەم کلێسانە دا ناڕۆن بە بێ ئەوەی ساتێك نەوستن. ئەگەر لەماوەی نەخۆشیدا ئێزیدییەك لە خەونی دا کلێسەیەکی مەسیحی بینی ئەوا دوای چاکبوونەوەی زیارەتی هەمان ئەو کلێسەیە دەکات بۆ سوپاسکردنی ئەو چاکەیەی کە چاکبوونەوەی خۆی پێبەخشیوە. من خۆم لە مەلاتیە ئێزیدییەکم بینیوە، کە سالّی ڕابووردوو بە پێیان پەنجا فەرسەخ ڕێگەی بڕیووە تا بچێ ئاستانەی دەرگەی کلێسەیەکی کاتۆلیکی ماچ بکات، بەلاّم ئێزیدییەکان ئەوەندە متمانەیان  بە مەزاری پیاوچاکانی موسلّمان نییە. لە ڕووی ئایینییەوە، ئێزیدییەکان بە تەواوی پێچەوانەی  بیروڕای تورکەکانن. بۆ نموونە شەراب کە لە قورئان قەدەغەیە، لای ئێزیدییەکان ئەم خواردنەوەیە پیرۆزیەکی گەورەی هەیە، دەخۆنەوە و بە وردی پەرداخ بە هەردوو دەست دەگرن، ئەگەر چەند دلّۆپێك کەوتە سەر زەوی، ئەوا بە شێوەیەکی ئایینیانە خاکەکە هەلّدەگرن کە دلّۆپەکانی بەسەردا ڕژاوە و دەیبەنە شوێنێکی شاراوە کە مرۆڤ پێی لێ نانێت.

لە لای ئەم نەتەوەیە هۆزێکی ئیمتیازدار هەیە، ئەو هۆزەی کە ئەرکی چاودێریکردنی پاسەوانی کردنی گۆڕی شێخی ئێزیدییەکان، دامەزرێنەری ئەم تایەفەی پێسپێردراوە. سەرۆکی ئەم هۆزە هەمیشە لەناو وەچەی سەردارە گەورکانی عەرەبەکان هەلّدەبژێردرێ، وەکوو پیرچاك و کەسایەتییەکی گەورە تەماشا دەکرێ، بەختەوەر ئەو کەسەیە کە بتوانێ جلێکی ئەم چاکە بەردەست

بخات  بۆ ئەوەی خۆی پێوە با بدات ! ئەو کەسە باوەڕ دەکات کە حەتمەن شوێنێکی لە بە هەشت بۆ دانراوە. سەرۆکی هۆز هێندە ڕێز لێ گیراوە کە هەمیشە گەنجێکی لە لایە کە پێی دەڵێن کۆچك یان مورید. بە بێ ڕاوێژی کۆچك سەرۆك ناتوانێ هیچ بکات. تەنیا کۆچك شکۆی فەخری وەرگرتنی بانگەوازی شەیتانی هەیە. کۆچك لەناو هەموو کۆڕ و مەجلیسەکاندا ڕاوێژی پێ دەکرێ، لەسەر سك لەسەر گلکۆی بەردینی شێخی ئێزیدییەکان ڕادەکشێ، دەخەوێ یان وا نیشان دەدا کە خەوتووە و لە کاتی خەودا ڕۆحی دۆزەخیی ئەو وەڵامەی پێ دەڵێ کە دەبێت وەڵامی ئەوانەی پێبداتەوە کە هاتوون پرسیاری لێ بکەن. بڕێکجار ئێزیدییەکان شوێنێك لە بەهەشت لە کۆچك دەکڕن و پێیان وایە زۆر شەرافەتمەند دەبن کاتێك ئەگەر کۆچك ژن لەناویاندا بخوازێ.

گەڕۆکەکان گوتویانە کە ئێزیدییەکان خەتەنە دەکەن، بەڵام ئەمە هەڵەیە و خەتەنەکردن تا ئەو ڕۆژە نەبێ کە ناچار بکرێن بچنە سەر ئایینی ئیسلام نایکەن. خوێندنەوە و نووسین، وەك نوێژ و ڕۆژوو، وەچەکانی ماردەکان بە شتێکی بێسوود لەم دونیایە سەیری دەکەن: " شێخی ئێزیدی، باوەڕدارەکان دەڵێن، دەرگەی بەهەشت دەکاتەوە". ئەمانە ئەو زانیارانە بوون کە توانیم لەسەر ئایینی ئێزیدییەکان کۆیان بکەمەوە، بێگومان وردەکاریی دیکە هێشتا بۆ ئێمە شاراوەیە، کە دەشێ هەرگیز ئاگەداری نەبین، چونکە ئەم گەلە هیچ نووسراوێکیان نییە[1]، هیچ نووسینێك نییە کە گەڕۆکە ئەوروپاییەکان بتوانن بە تەواوی بیروباوەڕی ئایینیان لێیەوە دەرئەنجام بکەن. دوای ئەوەی حافز پاشا

---

[1] ڕاستییەکەی لەو سەروبەندەدا هێشتا نەزانرا بوو کەوا ئێزیدییەکان کتێبی ئایینی تایبەت بە خۆیان هەیە و ڕۆژهەڵاتناسەکان زۆر بەدوای ئەوەوە بوون چۆن بتوانن کتێبی ئایینی ئێزیدییەکان بەردەست بخەن (وەرگێڕ).

ئێزیدییەکانی خستەژێردەسەڵاتی خۆیەوە، بە وردییەوە بە دوای ئەوەدا گەڕابوو داخۆ هیچ نووسراوێکی ئایینی یانْ هەیە، بەڵام هیچی نەدۆزیبۆوە. ئەم ئێزیدیانە جاران لەناو جەنگە ئایینیەکانی ڕۆژهەڵاتدا ئامادەیی یان هەبووە. گوتییێر، ڕاوێژکار، مێژوونووسی جەنگەکانی ئەنتیوش، ناوی ژمارەیەك هۆز لە کەناری دیجلەدا دەبات لە سەدەی دوانزەهەم، کە لە ڕووباری فوڕاتدا پەریونەتەوە و لە سوریەی جنوبی دا بڵاوبوونەتەوە و مەرگەسات و مەرگ یان هەڵگرتووە. گوتییێر ناوی پارسەکان (پارتەکان) بەم هۆزانە دەبەخشێ، بێگومان ئەو وڵاتەی کە لە کۆندا گەلی مێژوویی ئەم نەتەوەیەی تێدا ژیاوە. ئیلگاز کە لەلایەن نووسەری ڕووداوەکانی(کرۆنیکاریی) میری ماردین ناونراوە، سەرکردایەتیی ئەم نەتەوەی کردووە. ناوی ماردین ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لێرەدا هەر بەراستی مەبەست لە ماردەکانە کە لە سەرووتر بنچینەکەیمان دیاری کرد، نووسەری ڕووداوەکە دوای ئەوەی وەسفی ئەو شەڕانە دەکات کە لەنێوان ئەم عەشیرەتە وەحشیانە و خاچپەرستەکان ڕویداوە، بەم شێوەیەی خوارەوە ئەو ئەشکەنجەدانە تۆقێنەرانەیە دەگێڕێتەوە کە هێزەکانی ئیلگاز بەسەر ئەو مەسیحیانەیان هێنابوو کە بە دیل گیرابوون.

" زیاتر لە پێنجسەد سەربازی عیسای مەسیح، گۆتییێر دەنووسێ، بە دەست بەستراوەیی لە پشتەوە، پێوەند لە پێ، دوو دوو، کۆتیان لە ئەستۆ کرابوو ، وەك سەگ لەبەردەم سەرۆکی دڕندەدا ڕاگیرابوون، ئەویش بە خرۆشانەوە فەرمانی بە سەربازەکانی دەدا بە ئەشکەنجەی هەمەجۆر، لە ناویان بەرن. هەندێکیان بەدەم ئازارەوە دەمردن، بڕێکیان سەریان دەپەڕێندرا، هەندێکیان دەکران بە دوو لەتەوە. هەندێکیان بە ئەستوونێکەوە سەربەرەو خوار هەڵدەواسران، ژمارەیەکی تریان تیرباران کران، هەندێکی دیکەیان تاوەکوو چەناگە یان تاوەکوو ناوقەد زیندە بەچاڵ دەکران، ئیگاز ئامادەبوو و لە خۆشی ئەم بەربەریەتە تۆقێنەرەدا

زەردەخەنەی بوو!". ئەو گەلەی کە بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ سەربازەکانی خاچدراوەکان دەکرد بەر لە حەوت سەد و بیست و چوار ساڵ، ئەمڕۆ هێشتا هەمان سروشتی وەحشیگەرانەی خۆی پاراستووە.

لە باسکردنی گەلانی میزۆپۆتامیا بۆ ئێوە، سەکیزبێیکلوەکان[1] (ئەو پیاوانەی کە هەشت سمێڵ) یان پێوەیە لە بیر ناکەم، چونکە مووی پرچ و مووی کونەلووت و مووی سمێڵ و مووی ڕیشیان درێژن. گەڕۆکی تورك، ئەولیا چەلەبی بڕێك زانیاریی لەسەر ئەم نەتەوەیە سەیرە بۆ بەجێهێشتووین.

سەکیزبێیکلووەکان (هەشت سمێڵەکان) سەگی ڕەش یان زۆر لا پیرۆزە[2] و جۆرە پەرستنێك پراتیك دەکەن کە هەموو مێروویێکی سەر زەوی دەپەرستن، بە گوێرەی گێڕانەوەکانی ئەوان، کەشتی نوح بەرەو چیای ئارارات ڕویشتووە کە دەبوو لەوێدا بنیشێتەوە، بەڵام بەر گاشەبەردێك کەوتووە لە نزیك چیای مەزنی شنگاڵ، درزی تێکەوتووە ئاو هاتووتە ناوی، نوح بێهیوا بووە لەوەی خۆی ڕزگار بکات، بەڵام ئەو مارەی کە لە کەشتیەکەدا بووە بە فریای کەوتووە، بەمەرجێك کە پێغەمبەر نووح (پاتریارش) دوای نیشتنەوەی لافاوەکە بە خوێنی مرۆڤ نانی بدات. نوح پێشوازی لە پێشنیازەکە دەکات و مارەکە بە ددانە بڕەڕە درێژەکانی درزی کەشتییەکە دادەخات. لەکاتی دەرچوون لە کەشتیەکە مارەکە ئەو وادەیە وەبیر نوح دەهێنێتەوە کە پێی دابوو، بەڵام نوح بەگوێرەی ڕاوێژی فریشتە جوبرایل مارەکە دەسوتێنێ و خۆڵەمێشەکەی دوور فڕێ دەدات و خۆڵەمێشەکانی هەموو ژمارەیەکی زۆر مێش و مەگەزی لێکەوەتۆتەوە کە

---

[1] Sekiz biyikl سەکیز بیکیل واتە هەشت سمێڵ. ئەولیا چەلەبیش لە سیاحەتنامەکەیدا هەروا باسیانی کردووە (وەرگێڕ).

[2] ئەولیا چەلەبی دەڵێ سەکیزبێیکلووەکان سەگی ڕەشیان لا پیرۆزە و تەنانەت کە منداڵیان دەبێ، یەکەمجار شیری سەگی ڕەشی پێ دەدەن (وەرگێڕ).

ڕاوی مرۆڤ دەنێن. لێرەوە ڕێزگرتن بۆ هەموو جۆرە مێش و مەگەزێك لای سەکیزبێیکلووەکان سەرچاوەدەگرێ[1].

---

[1] ئەولیا چەلەبی لە (سیاحەتنامەدا) بەناوی (باسێکی کوردە پرچنەکان) ئاوهای نووسیوە: (لایەکی چیای شەنگار (چیای پرچن)ی پێدەڵێن چونکوو دانیشتوانەکەی وەکوو ئافرەت پرچ بەردەدەنەوە، زۆر پیس و چڵکنن و سەریان پرە لە ئەسپێ ومێتوولکە، بووزووی ڕەنگاوڕەنگ دەکەن بە شاڵ و شەپک، پشتێنی هەریر لە پشت دەبەستن و مێزەریان شەدە و هەریری ڕەنگاوڕەنگە، پێڵاویان کاڵە و یەمەنیی و کاڵەی کلکدار و پۆوچلیی و پێنەدی و سەدیی و هەزاریی و کپکەپلییە، چونکو شوێنەکەیان چیایە و ڕێگای بەردەڵان و سەختە، چەکەکانیان بریتییە لە شیر، خەنجەر، تفەنگ و جاب -جاب شتێکە نیشانچییەکانی عەنتاب بۆ تیرهاویشتن لەبەر پشتێنی خۆیانی قایم دەکەن-. لە تفەنگ هاویشتنا ئەوەندە دەستڕاستن چاوی کێچ و ئەژنۆنی وشتر دەپێکن. تفەنگەکانیان بینی بە پوولێک نایکڕی کەچی زۆر بە وردی نیشان دەنگێون. خەڵکەکە بە زۆریی کورتەباڵا، سەرخڕ و مل کورتن، هەر دەڵێی سەریان لەناو شانیانا هاتۆتە دەر، بەڵام شانیان بەرین، سنگە پڕ قینەکەیان پان، کەمەر باریک، باسک و ڕانیان ئەستوور و ناولنگیان فراوانە، زۆر ئازان، بەڵام سوارچاک نین، چاویان ڕەش وخڕە، برۆیان زۆر پڕە، کوردەکانی دیکە هەشت سمێڵیان پێدەڵێن، ئەویش لەبەر ئەوەی کە دوو سمێڵ، دوو برۆ، دوو قەفە مووی درێژی کوونەلووتیان، لیسپە مووەکانی هەردوو کونەگوێچکەیان درێژە. لەشیان لە تووکنیی دا وەکو لەشی بزنی ڕەش وایە. زاریان یەک تاکە کاڵەی پێوەدەچێ و ددانیان وەکو ددانی ئەسپە. منداڵیان هەتا دەگاتە دە ساڵی کۆرپە و ساوایە، بەڵام کە لە دە ساڵی تێپەڕی خۆی وەکو پیاوی بیست ساڵی پیشاندەدا. هەتا بڵێی ڕەقن. ژنیان پرچی دەگاتە ئەژنۆ، منداڵیان یەک ساڵ لە زگی دایکیدا دەمێنێتەوە و جا دەزێ، کە منداڵیان بوو لە پێش هەموو شتێکدا شیری سەگی ڕەشی دەرخوارد دەدەن. لەناو ئەمانەدا هەر کەس بەرد بۆ سەگێک ڕاوەشێنێ دەستبەجێ دەکوژرێ، ورد و درشتیان یەکی سەگێکیان هەیە، کە هاتنە سەر نان خواردن لە پێشدا بۆ سەگەکەی دادەنێن کە

کرۆنیکێکی کۆنی جەنگی ئایینی ئاماژە بە گەلێکی کۆن دەکات لە کەناری دیجلە، کە زۆر لە سەکیزبێیکلووەکان دەچن. ئەلبێرت داکس Albert d'Aix، لە گێڕانەوەی مەرگەساتی سوپای مەسیحییەکان ساڵی ١١٠١ بەناو چیاکانی پافلاگۆنی، گەلێکی موسڵمانمان نیشان دەدا کە وەحشیەتگەرییەکەی بەشێوەیەکی تایبەتی مەسیحیەکانی فەرەنسا و لۆمباردی سەراسیمە کردبوو.

"پیاوانی ئەم نەتەوەیەی خوراسان، ئەلبێرت داکس دەڵێ، بینینیان تۆقێنەر بوو: ئەم پیاوانە لە پێشەوە، لە پشتەوە، لە ڕاستەوە، لە چەپەوەی سەریانەوە تاجێك لەسەر شێوەی ملوانکە لەسەر و بە تەك ئەم تاجانە چەند تاڵە داوێك کە هەرگیز نایتراشن و شێوەیەکی ناشرینی پێ بەخشیون. سەرەڕای ئەوە هەرگیز ڕیشیان ناتراشن و بە درێژی دەیهێڵنەوە، بە جۆرێك کە لە ڕوخساری دەرەوەیاندا تەنیا دەتوانین لەگەڵ ڕوحە ڕەش و پیسەکان بەراوردیان بکەین".

---

ئەو تێر بوو جا بۆ خۆیان دەست پێدەکەن، سەگەکانیان لەگەڵ خۆیان دەنوێنن. سەگێکی ڕەش بە هەزار قرۆش و بە دە ئێستر سەودا دەکرێ. ئەم کوردانە بۆ هەر کوێیەك بچن پیواز و نان و شیرێژیان لەبەر پشتایە، لە کن ئەوان هەرکەس بە مست پیوازێك پان بکاتەوە سەری پان دەکەنەوە، سەیرتریش ئەوەیە کە یەکێ دەوڵەمەندیان بمرێ بە ئاوی پیواز دەیشۆن و قەبرەکەشی پڕ دەکەن لە پیواز. زۆرجار هۆی ئەم شتەم لە دیلەکانیان پرسیوە خۆیان لە وەڵامدانەوە دەبوێرن، تەنیا بە وشەی (پیواز خۆشە) وەڵام دەدەنەوە. جگە لەمە قسەیێکی نەستەق هەیە دەڵێن لە کوردێکیان پرسی ئەگەر ببی بە شا چ دەخۆی؟ گوتویەتی چۆزەرەی پیواز! بەراستی پیوازیان پێ خۆشە، شتێکی سەیری دیکە: ئەگەر جغزێك بە دەوری کوردێکدا بکێشی بیشمرێ لەو جغزە نایێتە دەرێ هەتا یەکێك نەبێ لاییکی جغزەکەی بۆ تێك بدا! ). بڕوانە: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، وەرگێڕانی سەعید ناکام، بەغدا، ١٩٧٩، لاپەڕە: ٨٢-٨٣ (وەرگێڕ).

ئەم پۆرترێتە بە تەواوی لەگەڵ سەکیزبێیکلووەکان ڕێك دێتەوە. ئەم گەلە، کە گەڕۆکەکان ئەمڕۆ لە میزۆپۆتامیا دەیبین، هەر ئەو گەلە بوون کە جاران لەسەر کەناری ڕووباری هالیز ئاکنجی بوون و ئەوەندە بووبوونە مایەی ترس و تۆقاندنی خەڵکی هەژار، خانمە بەگزادەی ناسک و ژنانی نازدار و ماترۆنە matrones دیارەکانی ڕۆژئاوا.

میزۆپۆتامیا دەڤەرێکی جیهانە، کە زۆرترین نەتەوەی تێدایە کە هەر یەکەکیان ئایینێکی جیاواز پەیڕەو دەکات. لەوێدا جوو، ئەرمەنی، کاتۆلیك، شاماستیك، یۆنانی، نەستووری، یەعقوبی، مەسیحی سان ژان Saint Jean دەبینرێن. دوای چەندین تایەفەی مەسیحی، موسڵمانی سوننی و شیعە، گەبر* (زەردەشتییەکان) یان ئاگرپەرست، مانی کە بەگوێرەی سانت ئۆگستن، ڕێز لە خۆرەتاو دەگرن چونکە لایان وایە وەکوو ئەمرازی ڕووناککردنەوە وایە، کە خوداوەند خۆی تێدا وجوودی هەیە، پاشان ئەو مرۆیانەی کە نەزری ژن دەکەن هەمان پەرستنی ئەنسارییەکانی لوبنان یان هەیە. چ تێکەڵاوێکی سەیری بیروباوەڕە! چ هەڵگێڕانەوەیەکی عەقڵە! و ئەم گەلانە، لە وەحشیگەرییەکی نەزانانەدا، لەم میزۆپۆتامیایەدا دەژین، کە گەڕۆکەکان باوەڕیان وایە لە هەر هەنگاوێکدا سێبەری جوانترین، گرنگترین فیگوری دەورانی تەوراتی تێدا بەدیاردەکەوێ! لەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن جەزیرە کە هۆزەکەی لە ئور Ur، لای کلدانییەکان هاتووە و ڕەشماڵەکانی خۆی تێدا هەڵداوە، ژمارەیەك مێگەلی گەورەی پەیامبەر (پاتریارش)، ناحوری[1] کوری تارح (تارێ) Tharé، لە ناوەڕاستی ئەو لەوڕگە دەوڵەمەندەی کە ئێستە پێی دەڵێن شنگاڵ

---

* گەبر: guèbre (zorastrien)

[1] ناحوری کوری تارح یا ناحوری دووەم، لە عەهدی کۆندا برای پێغەمبەر ئیبراهیمە (وەرگێڕ).

لەوەڕاندووە. لێرەوە بوو کە ئیبراهیم قسەی لەگەڵ خودادا کردووە. " دەرچۆ لە زەوی یەکەت خوا بە ئیبراهیمی گوت، لەسەر زەوییەکەت و خزمەکانی خۆت دەرچوو و وەرە ئەو زەوییەی کە من پێتان نیشان دەدەم. من لە تۆوە نەتەوەیەکی گەورە دروست دەکەم، و پیرۆزیی تۆ دەکەم و تۆ پیرۆز دەبی!. ئەوانە پیرۆز دەکەم کە تۆ پیرۆزیان دەکەیت و ئەوانەش بەر نەفرەت دەخەم کە تۆ نەفرەتیان دەکەیت. لە تۆوە هەموو خێزانەکانی سەرزەوی بەر ڕەحمەت دەبن!". خوداوەند ئاوها لەگەڵ ئیبراهیم لە کێڵگەکەکانی میزۆپۆتامیا قسەی کرد. بە چ زنجیرە شۆڕشی درێژی ئەم وڵاتە، کە ئایینی خوداوەندی ڕاستەقینەی ئەم وڵاتە لە دایك بوو، ئایا دەشێ ببێتە مۆڵگەی ناچیزەترین خورافیات، مۆڵگەی گەلۆریی هەرە ئاسەفبار؟ لەوێ لەم دۆڵەدا کە یەکەمین وشەی هەموو ڕاستی تێدا گۆ کرا، دوای چواردە سەدە، ترسناکترین هەڵەی ڕۆح، دواین پلەی هەموو قێزەونی ئەخلاقیی دەبینین.

## نامەی بیست و یەك

جەنگی کورد دژی تورکەکان لە ١٨٣٦ و ١٨٣٧-سەردانی ئۆردووی سوپای عوسمانی لە دۆڵی ئەنتی-تۆرۆس- حافز پاشا، سەرعەسکەری سوپای عوسمانی-بیروڕای حافز پاشا لەبارەی تالێران-سەرۆکێکی کورد لە کاتی لێپرسینەوەی لەناو ئەشکەنجەدان-ئامادەسازیی بۆ جەنگ دژی پاشای میسر.

بۆ بەڕێز میشوو

## لە ئۆردووی حافز پاشا، ئاگستۆسی ۱۸۳۷

ماوەیەکی زۆرە ئەو هۆزانەی کە من هەوڵ دەدەم ڕوخساری سەیروسەمەرەیان نیشان بدەم، بوون بە زارەترۆقی هاوسێیەکانیان و تۆقێنەری گەڕۆکەکان. بێوەستان لە حاڵەتی ڕاپەرین دژی بابیعالیی ئەم هۆزانە هەمیشە توانیویانە لە چیاکانی خۆیانەوە، بە سەرکەوتوویی لە دەست دادپەروەریی سوپا ڕابکەن. چەندین حوکمڕانی شارەکانی کەناری دیجلە و فوڕات یەك لە دوای یەك ویستوویانە بیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.، بەڵام هەوڵەکانیان، کە چەندین جار دووبارە کراونەتەوە، بەرەو ڕووی سەرکێشی بەرگریان بوونەتەوە. لەشکری محەممەدی دووەم ساڵی ۱۸۳۷، ئەوەی کە ئەوانی پێشوو نەیانتوانی وەدەستی بهێنن، ملکەچپێکردنی کورد و ئێزیدییەکانی تەواو کرد.

ڕەشید محەممەد پاشا، ئەو جۆرجییەی کە لەو شەڕانەی کە بەسەر یۆنانییەکان ساڵەکانی ۱۸۲۵ و ۱۸۲۷ سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ناو و شۆرەتی پەیدا کرد و پێنج ساڵ دواتر شکا و لە لایەن ئیبراهیم پاشا لە قۆنیە بە دیل گیرا، ساڵی ۱۸۲٦ حاکمی سیواس بوو. لە مانگی ئەیلوولی ۱۸۲٦، ڕەشید -محەممەد پاشا لە لایەن سوڵتانەوە فرمانی بۆ هات بەسەرکردایەتیکردنی سوپایەکی گەورە هێرش بکاتە سەر وڵاتی کورد و ئێزیدییەکان، عەلی ڕەزا، والی بەغدا، هەمان شتی کرد لە لای خۆیەوە، بە هەمان شێوە محەممەد پاشای والی مووسڵ. هەر سێ سەرکردەی تورك پێکەوە بە تەبایی دژی بەگی ڕواندز، سەرۆکی باڵای کوردەکان وەستانەوە. سوپای عوسمانی کە لە چل هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو،

پەلاماری قەڵای جەزیرە، ئۆردێ، تەلەعفەر، سنجاری دا کە لەژێر دەستی ڕاپەڕیوەکان دا بوون. بەگی ڕواندز کە بینی بە سوپایەکی ئاوها بەهێز دەورە دراوە، تێگەیشت کە مەحاڵە لە دەست شکست ڕزگاری ببێ: پێشنیازی کرد کە خۆی بەدەستەوە دەدات ئەگەر ببیەخشن.

بەگی ڕواندز خۆی تەسلیم بە ڕەشید محەممەد کرد.، ئەویش بە شکۆوە پێشوازی لێ کرد و ڕەوانەی کۆنستانتینۆبلی کرد. کاتێك گەیشتە کۆشکی ئیمپراتۆری، میری کورد برایە لای سوڵتان. بەگی ڕواندز سوێندی خوارد کە وەفاداری سوڵتان بێت و لەوە بەدوا چەکەکانی تەنیا بۆ داکۆکیکردن لە ئیمپراتۆریا دژی دوژمنان بەکاربهێنێ. سوڵتان بەخشینەکەی لێ قەبووڵ کرد و ڕەوانەی میزۆپۆتامیای کردەوە. لەژێر کاریگەریی ئەو هەموو لوتف وچاکەیەی سوڵتان، بەگی ڕواندز گوتی: " کەوا هەرگیز لە خۆی نابوورێ لەوەی ئیهانەی پادشایەکی ئەوەندە شەهامەتداری کردووە، کە تاقە بیانووی ئەوەیە کە ئەگەر پێشتر بیناسیبایە ئەوا هەرگیز شەڕی سوڵتانی نەدەکرد و ئەو ئاسوودە نابێ تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە لە ئاست بەخشندەییەکەی ئەو دا بێت، بەوەی هەموو کۆششێك بکات بۆ سڕینەوەی کەمترین شوێنکاری ئەو هەڵە گەورەیەی کە لەبەرانبەر ئەودا کردوویە". ئەم بەڵێنە ڕەسمییە بە جێ گەیەنرا. بەگی ڕواندز گەڕایەوە جەزیرە بە خۆیی و چەند کوردێکەوە کە بڕیاریان دا بەگەڵی بکەون چووە پاڵ هێزەکانی عوسمانییەوە[1].

---

[1] سەرچاوە مێژووییەکان بە جۆرێکی دیکەی جیاواز لەوەی پوژولا، باسی ئەم مێژووە دەگێڕنەوە. زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی، کە میری کۆرە خۆی داوە بەدەست مستەفا ڕەشید پاشا و لەڕێگەی ئەویشەوە ڕەوانەی ئیستەنبووڵ کراوە و سوڵتانی عوسمانی، سوڵتان مەحموود خۆی پێشوازی لێ کردووە و لێیی خۆش بووە، تا ئێرە زۆربەی گێڕانەوەکان هەر ئەوە دووپات دەکەنەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك وەك

دوای شکستی ڕواندز، جەنگ توونر تر بوو. یاخیبووەکان، تووڕە بەدەست خیانەتی یەکێك لە سەرکردە سەرەکیەکەیان، بە بێهواییەوە شەڕیان دەکرد. کورد لە هەموو لایەك پەیدادەبوون و سوپای عوسمانی بەڕاستی بە ئازایەتی سەرسەختانەی کوردەکان نیگەران بوو. کوردەکان زۆر بە دڵڕەقانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەو سەربازە تورکانە دەکرد، کە دەکەوتنە بندەستیان.، چاو و نینۆکیان دەردەهێنان و پاشان بە زیندوویی دەیانسووتاندن ! پاشا وەڵامی ئەم کردەوە هەمەجیانەی بەوە دایەوە لەگەڵ بە دیلگرتنی هەر کوردێکدا، یەکسەر سەری دەپەڕاندن. ئەم تۆڵەسەندنەوە وەحشەتناکە سێ مانگ درێژەی کێشا. تا نزیکەی دە هەزار کوردی چەکدار لە شەڕدا، یان لە ژێر ئەشکەنجەداندا مردن. ژمارەی سوپای عوسمانی کە لەو ماوەیەدا لەناوچوون بە چوار هەزار سەرباز دەخەملێندرێ.، ژمارەیەکی بێشوماری ئاوایيە کوردییەکان تاڵان و بڕۆ کران و سوتێنران.

لە مانگی شوباتی ١٨٣٧، ڕەشید-محەممەد پاشا بە (تا)یەکی کوشندە، لە دەوروبەری دیاربەکر مرد. سوڵتان سەرکردایەتیی سوپاکەی دایە دەست حافز پاشا و جەنگ بە هیچ شێوەیەك نەوەستا. لەشکرکێشیەکانی حافز پاشا بۆ سەر

---

پوژولا نووسیویەتی میری کۆرە نەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان بەڵکو سەرچاوە مێژووییەکان بۆ ئەوە دەچن، کە پاشای گەورە لەگەڕانەوەیدا کاتێك لە ئیستەنبوڵ بە سیواسدا دەگەڕێتەوە، هەر بە کەمەندی تەدبیری پیاوانی سوڵتان و بە فەرمانی سوڵتان خۆی، لەلایەن والی سیواس تیرۆر کراوە و تەرمەکەشی فرێدراوەتە ناو زەریا. بڕوانە: جمال نبز، الامیر الکردی(میر محمد الرواندزی الملقب بـ(میری کۆرە): مساهمة علمیة فی دراسة التاریخ الکردی علی صفحة مرأة الشواهد والادلة الشرقیة والغربیة، من مطبوعات الاکادیمیة الکردیة للعلم والفن، اربیل، ٢٠٠٧،صص: ١٤٨-١٥٠(وەرگێڕ).

میزۆپۆتامیا سەرکەوتنێکی زۆریان هەبوو. دوای ئەوەی زیاتر لە پانزە هەزار کوردی دەستبەسەر کرد، شەش هەزار خێزانی لەم نەتەوەیە گوێزایەوە بۆ دیاربەکر و زەوی پێدان بۆ کشتوکاڵ. ئاسایش بەم شێوەیە لە جەزیرە جێگیر بوو، حافز پاشا بەر لەوەی ناوچەکە بەجێبهێڵێ، بۆ خۆی پلانی ئۆردوویێکی دانا کە دروستکردنەکەی دەمودەست دەستی پێ کرد. لە هەمان کاتدا لەناو دانیشتوانەکانی تەلەعفەر و شوێنەکانی دیکە پێنجسەد پیاوی بۆ سەربازگیری برد و تێکەوڵاوی هێزەکانی ئیمپراتۆریای کردن. دوای ئەم ئەنجامە درەوشاوەیە، سەرعەسکەر هات هێرشەکانی دژ بە کوردەکانی ئەلەجە-داغ بەڕێوەبرد.

ئێستە باسی ئەو ڕێگەیەتان بۆ دەکەم کە لە مەلاتیەوە تاوەکوو ئۆردووی عوسمانی گرتمانە بەر. ٢٤ ی ئاگستۆس، لەگەڵ خۆر ئاوابوون، ماوەی دوو سەعات و نیو بەناو باخچە جوانەکانی مەلاتیەدا ڕۆیشتین و هێندەی نەبرد گەیشتینە ئاوایی ئەرکەت*، کە لە سەد ماڵێکی موسڵمان پێکهاتبوو. گوندەکانی مەلاتیە لەوێدا لایەنی ڕۆژئاواوە کۆتایی دەهات. لەگەڵ بەجێهێشتنی ئەرگەهـ، هەموو سەوزاییەك کۆتایی دێت، تەنیا بەرز و نزمی زەوی کلسیی، گردۆلکەی نزم و ڕووتەن نەبێ. پاشان، دەگەینە پێدەشتێکی گەورەی وشک و بێ دارو درەخت. لەوانەیە لێرەوە بووبێ کە ساڵی ١١٠٠، بۆهمۆندی*بەناوبانگ، میری ئەنتیۆش، کەوتبێتە بندەستی دامیسمانی** مەرزەبان.

لە دوای چوار کاتژمێر ڕۆیشتن، گەیشتینە ئاواییەکی کوردیی بە ناوی ئەرگەهـ. ئەم گوندە، لەسەر گردێکی زۆر بەرز درووست کرابوو خانووەکانی، یان باشتر بڵێم کۆخەکانی بەدیاردەکەوتن؛ لە دوورەوە، لە کەڵەکە بەردێك

---

* Erket

* Bohemond

**[ Damisman

دەچوون. دانیشتوانی ئەرگەهـ بە بێ بەرگری خۆیان بەدەستەوە دابوو بۆیە هیچ ئازارێکیان نەدابوون.

چۆن دەتوانن وێنەی ئەم دیمەنە بکێشن کە ئەو کاتانە لەبەر چاومە! چەند هەنگاوێك لە ئەرگەهـ، لە بناری گاشەبەردە سووتاوەکانی ئەلەجەداغ، لەسەر زەوییێکی تەپ و تۆزاوی و بێ سێبەر، چوار هەزار زیندانیی کورد لە هەموو زایەند و تەمەنێك دەبینران. تەنانەت یەك تاقە پارچە قوماشیشیان نەبوو بۆ ئەوەی ڕەشماڵێکی لێوە درووست بکەن، لەبەر چرقەی ئەم خۆرەتاوە گرگرتووە هەڵخرابوون ! بەوەی ناتوانن چیتر بەرگەی گەرمای بەتینی ڕۆژ بگرن، ، لەناو تەپ و تۆزدا دەم و چاویان نوقمی عەرەقە بووە. ئەم پیاو، ژن، کیژۆڵەی گەنج، زارۆکانە، کە زۆربەی هەرە زۆریان بە تەواوی ڕووت بوون، بڕێکیان تەنیا پارچەیەك قوماش بەدەوری کەمەریانەوە بوو. دەربڕینی ئازار و بێهیوایی لەسەر هەموو دەم وچاوەکان دیاربوو، ئا لێرەدا ئەشکەنجە، گیانکێشانێکی ئازاراوی، حەسرەتی قووڵ، هەر لە خڕەخڕی گیانکێشانێکی تۆقینەر دەچوو، کە لە سینگی پیاوەکانەوە دەهاتە دەرەوە، گریان و کرووزانەوەی ژنان، هاواری منداڵی بەرمەمکان، ڕۆحی دەپساند. ئەم چوار هەزار کوردە، بەدەم توندترین ئەشکەنجەدانەوە ڕاپێچکرابوون ، لە خەیاڵدانی مندا ئەو موعاناتە تۆقێنەرانەی حوکمدراوەکانی دوزەخ (ئەنفێرنۆ)* یان وەبیردەهێنایەوە.

---

* *Inferno* : واتــەی (دۆزەخ) دەگەیــەنێ بریتییــە لــە بــەناوبانگترین بەشــی داســتانی کۆمیدیای خوداوەنـدیی Divina Commedia ی نووسـەری بـەناوبانگی ئیتالیـایی دانتی، کە لە ساڵی ١٣٠٨ تا تـاوەکوو مردنـی سـاڵی ١٣٢١ نووسـیویە و لـە ڕوانگـەی ئاینی مەسیحایەتییەوە باسی دوای مردن دەکات (وەرگێڕ).

ئەم بەدبەختانە شەش ڕۆژ دەبێت، هەموو خواردنێکیان تەنیا کەمێك نانی ڕەش و قومێك ئاو بووە، کە لە جۆگەلەیەکی نزیك خۆیان دەیانهێنا. لەماوەی سێ ڕۆژدا، نزیکەی بیست منداڵێك لە باوەشی دایکیانا مردن، کە چیتر شیریان تێدا نەمابوو بیاندەنێ! دایکە جگەرسووتاوەکان نەیاندەویست لە جگەرگۆشە مردووەکانیان جیاببنەوە، بە مردوویی لە ئامێزیان گرتبوون، نەیاندەویست ددان بەوەدا بنێن، کە منداڵەکانیان مردوون. ئەم چوار هەزار کوردە، شەش سەد سەربازی لەشکری نیزامی چاودێرییان دەکردن.

چەند سەعاتێك لەژێر ڕەشماڵی کۆلۆنێلێکی تورك مامەوە، پێی وتم کە چاوەڕێی فرمانی سەرکردایەتیی سوپا دەکات بۆ ئەوەی ئەم بەدبەختانە بگوێزێتەوە بۆ مەڵاتیە یان بۆ نوختە خالێکی دیکە. زیندانیە کوردەکان چیتر مەحکوم نین بە مردن، حافز پاشا پرۆژەیەکی هەیە بۆ جێنشینکردنیان لە چەند گوندێکی هەمەچەشنەی پاشالقی خۆیدا، و زەویان پێبدەن بۆ چاندنی.

لە (ئەرگەهـ)ەوە تاوەکوو کامپی تورکەکان، زۆر بە سەختی ڕۆیشتین، ماوەی شەش سەعات، بەناو چیاگەلێکی گەورە و گران و جوانیەکی سروشتیدا ڕۆیشتین. ئەم چیایانە بەشێوەیەکی زۆر سەیرو سەمەرە پارچە پارچە بوون، بریتبوو لە بەردەوامیەکی نەپچراوەی گردی زۆر بەرز و داپۆشراو بە جەنگەڵستانی ڕەش. چەند زنجیرە چیایێك لە ئاسۆوە یەك لە دوای ئەوی دیکە وەکوو چەند شەپۆلی زەریا بەدیاردەکەوتن. هیچ ڕێگەیەکی دیاریکراو نییە: تاوێك بەسەر دۆندی چیایەکان دەڕۆیشتین لە چەپ و لە ڕاستماندا، خەرەندێکی گەورە و گران بوو، پاشان دادەبەزینە قوڵایی دۆڵەکە، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بەرەو لوتکە سەرکەوین. کاتێك ئەو لووتکە زەرد و ماهانەمان بینی کە لەوێوە ئەو سوپایەی کە لە لایەن حافز پاشا سەرکردایەتیی دەکرێ، پێیدا تێپەڕیووە بۆ ئەوەی چەندین تۆپهاوێژ لەو شوێنە قایم بکەن کە بارەگەی

سەرکردایەتیی لێیە، بە زەحمەت لەوە دەگەین چۆن کارێکی ئاوەها توانراوە بکرێ. چ هەوڵدانێکی پەرجوویی! ئەو ئەفسەرە تورکانە بەوەی بەناو ئەم چیایانەدا، ئەم هەموو ئەمرازە قورسەی جەنگ ڕادەکێشن چ ئازایەتییێکی سەرسەختانەیان تێدایە! دەتوانین ستایشی چاونەترسیی سەربازانی عوسمانی بکەین، ئەوانە لەبەرامبەر هیچ مەترسیەك، لە هیچ ماندووبوونێك ناپرینگێنەوە. هەر وەکوو پێشتر تێبینیمان کرد، سوپای تورك هیچی کەم نییە جگە لە سەرکردەی کارامە نەبێ بۆ ئەوەی بچێتە ڕیز لەشکرە هەرە ترسێنەرەکانی ئەوروپا.

لە گەشتی خۆمان بۆ ئەرگەهـ* بۆ ئۆردووی عوسمانی، پانزە گوندی کوردیم ژمارد، کە لە لایەن سوپای عوسمانییەوە وێران کرابوون. جەنگ ئەوەی بۆ ڕاپەڕیوەکان نەهێشتبۆووە تا گەنم و جۆیەکانیان دروێنە بکەن، من بینیم، لەناو دۆڵە چکۆڵەکان، لە بناری چیاکاندا، چەند شوێنێك گوڵەگەنم داپۆشیبوو، کە لاسکەکەی لەبەر خۆرەتاو سووتا بوو. زیانی دانەوێڵە لەم ساڵەدا، لە ئەنتی-تۆرۆس**، بێشومار بوو.

ناوە ناوە تووشی کۆمەڵێك بەردی کەڵەکەبوو دەبووین لەسەر شێوەی کێلە بەرد کە تەرمی کورد و تورکەکان، ئەوانەی کە لە شەڕدا کوژرابوون، داپۆشیبوو. دواجار گەیشتینە ئۆردووی تورکەکان، ئۆردووکە دەکەوێتە سەر بانێکی بەرفراوان لە نزیك گردێکی مەیلەڕەش و ڕووتەن. ئەم ئۆردووە شێوەی شارێکی دروستکراوی بێ بەرنامەڕێژی هەیە، لە شەش سەد خیوەت لەسەر شێوەی شەقام ڕێزکراون. ئەم ڕەشماڵانە فەوجێکی سوارەی

---

* ئەرگەهـ: Argah

** ئەنتی-تۆرۆس: بە تورکی Aladağ یان Aladağlar ، (وەرگێڕ).

١٥٠٠سەرباز، دوو فەوجی پیادە، کە هەر یەکێکیان ١٨٠٠ سەربازی هەیە بەخۆوە دەگرێ، کە هەمووی بەسەر یەکەوە دەکاتە ٥٤٠٠ سەرباز. سوپای ئیمپراتۆریا کە چاودێری ئەنتی تۆرۆسی دەکات ژمارەکەی لەوەی کە ئێستە باسم کرد کەمنابێتەوە.، ژمارەی ئەو سوپایەی کە حافز پاشا سەرکردایەتی دەکرد نزیکەی بیست هەزار سەرباز بوو.

خێوەتگەی سەرکردایەتیی گشتی لە قوماشی کەتانی فرەڕەنگ درووست کرابوو: شین، سپی، ڕەش، خۆڵەمێشی، سەوزی تێدا دەبینرا.، هەموو ئەم ڕەنگانە لە بەیداغێکی بچووکی سوور کە شێوەی خاچی هەبوو لەسەرەوە هەڵواسرابوو. ئەم خێوەتگە ڕەنگاوڕەنگە هەمەچەشنانە، کە لەسەر بانەکە کۆبووبوونەوە، نمایشێکی سەمەریان دەنواند. ژیان و جوولەم زیاتر لەم کامپە بینی، وەك لە هەموو ئەو شارە تورکیانەی کە من بینیمن، بارەباری مێگەلی مەڕ و بزن کە لە کوردەکان ڕفێنردابوون، دەنگی چەکوش وەشاندن لەسەر سندانی چەکسازەکان، کە لە دەبۆی چەکخانە دەنگی دەدایەوە، حیلەحیلی ئەسپان کە لەژێر قرچەی خۆرەتاو بەتاو بازیان دەدا، هاواری نان فرۆش و سەوزە و میوەفرۆشان کە لە مەڵاتیەوە هاتبوون، دەنگدانەوەی سەدای تەقەی چەکی کوردەکان و تورکەکان لە دوورەوە، هەموو ئەم هەزار هات و هاوارە ئاڵۆزە وێنەی هێمنی شارمان بۆ دەخاتە بەرچاو، هەتا لە ناوەندیی وێنەکانی جەنگدا. ئەم ئۆردووەی حافز پاشا، کە لە یەك کاتدا وەك ئەمرازی جەنگ، شاروباژێر بینیم، تا ڕادیەك بیرۆکەیەکی ئۆردووە کۆنەکانی سوپای ئیسلامم پێدەبەخشێ، لە سەردەمی جەنگی کۆنی خاچ و صەلیبدا، بەڵام لە بیرکردنەوەی خۆمدا، بە بەراوردکردنی ئۆردووی حافز پاشا بە ئۆردووی نورەددین و سەلاحەددین، ئەسەف دەخۆم کە جل و بەرگی تەسکی ڕیفۆرم جێگەی خەفتانی فراوان، پشتێنی ئاوریشمی، جامانەی کەشمیری و چەکی دەوڵەمەندی کۆنی جەنگاوەرانی موسڵمانی ڕۆژهەلاتی گرتۆتەوە.

بوونی ئێمە لەناو خێوەتەکاندا کونجکۆڵی سەربازەکانی دەوروژاند، لەسەر ڕێگەماندا ئەفسەرەکان پەلەیان بوو لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد و دەیانووت: " ئا ئەوەتانەن دوو تەرلەنجش-باشە* مۆسکۆڤیتییەکە ! کەمێك درەنگ گەیشتن بۆ ڕاهێنانی کوردەکان: گورگەکانی ئەلەجەداغ. ، بەو دووانە بڵێن لە زیندانەکانی مەلاتیە و ئۆرفە چی بەسەر کوردەکاندا دەگوزەرێ!

سەرعەسکەر کە لە هاتنی ئێمە ئاگادار کرایەوە فەرمانی دەرکرد خیوەتێکمان بۆ هەڵبدەن و هەموو شتێك، کە پێویستمان پێی بێ بۆمان بهێن. تاوێکی تر دەچین سەردانی دەکەین. لەژێر خیوەتێکی ڕازاوە بە قوماشی بریقەداری هیندی بینیمان سەرعەسکەر لەسەر چەند بالیفێکی قرمزی کەنار زێڕدا دانیشتبوو، لەگەڵ نزیکبوونەوەمان چەماوەیە و بە بەخشندەییەکی تەواوە سڵاوی لێ کردین. تکای لێکردین کە لە نزیك ئەوە دابنیشین. سەبیلی ڕازاوە بە بەردی گرانبەها، سۆربێت[1] و کافێی نایاب یەك لە دوای یەك لە لایەن ژمارەیەك خزمەتکارەوە پێشکەش دەکران.

حافز پاشا بەژن و باڵای مام ناوەندی و قەڵەو نەبوو، دەم و چاوی درێژ و تەواو جیاکەرەوە بوو. گەرمایی خۆرەتاوی ئاسیا دەم و چاویان ئەسمەر کردبوو، ڕدێنی ڕەش و کورت، چاوی ڕەش و پڕ بوو لە زیندوویەتییەکی خۆشنوود بە ڕووخۆشییەکی زۆر و لە شێوازیدا ئەمە بە هەیبەت بوو، ئەم جیاوازییە خانەدانییە لە لای هەموو تورکێکی شەرافەتمەند دەبینرێ. وەزیر جل و بەرگی ڕیفۆرمی لەبەردابوو: مێدالیایەکی بریسکاوەی ئەڵماسی بەسەر سینگەوە بوو.

---

* تەرلەنجش-باش: ڕاهێنەری سەرەکی.

[1] سۆربێت: Sorbet جۆرە شەرابێکە لە ئاوی میوە و شەکر کە لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرێن، (وەرگێڕ).

محەممەد حافز پاشا ساڵی ١٧٩٦ لە چەرکستان لە دایك بووبوو. خێزانەکەی یەکێك لە خێزانە هەرە نەجیبزادکان، بەهێزترینیان بوو لەناو ئەو خێزانانەی کە لەودیوی جنووبی قەوقازدا بڵاوبوون و لە هەموو کاتەکاندا دوژمنی سەرسەختی ڕووسیا بوون. ئەم خێزانە هەمیشە لە یەکەم ڕیزی ئەو جەنگانە ئامادەبوون کە لەنێوان موسڵمان و مۆسکۆڤیتییەکان دەکرا. محەممەد حافز لە وڵاتی خۆیدا پەروەردەیەکی موکومی وەرگرتبوو. لە حەڤدە ساڵی دا بە تەواوی زمانەکانی تورکی، عەرەبی و فارسی زانیووە. لەم تەمەنەدا بووە کە فێری قورئان بووە و بە تەواوی لەو سەرەوە تا کۆتایی لەناو حوجرەیەکی فەقێیایەتیدا قورئانی ئەزبەر کردووە. لەم خوێندنە سەرکەوتووە و نازناوی جیاکەرەوەی حافزیان پێبەخشی،یەکێك لە نازناوە هەرە جوانەکان، کە موسڵمانێك بتوانێ وەری بگرێ، بینوومانە خەلیفە و سوڵتان ئارەزووویان بۆ کردووە.

محەممەد حافز کۆیلە نەبووە وەك زۆربەی ئەو چەرکەسییانەی ئەمڕۆ پلەیەکی بەرزیان لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا هەیە. ئارەزووی بینینی جیهان و دروستکردنی ناوێك، محەممەدی لە تەمەنی هەژدە ساڵی لە پایتەختی ئیمپراتۆریادا بینییەوە. چووەتە ناو ڕیزی فەیلەقی هەهاگی (فەیلەقی سەربازی سەرای) بۆ خزمەتی سوڵتان و ماوەیەك لە دوای وەرگرتنی لەم فەیلەقە دەبێتە ئەفسەری باڵا. لەکاتی درووستکردنی لەشکری نیزامیی، محەممەد حافز پاشا داوا دەکات وەك سەربازێکی سادە بەگەڵ فەوجێکی سوارەی بدەن. بە خێرایی چەندین مەرتەبە دەبڕێ.، لیوتینان-کۆلۆنێلی سوارە لە دەورانی دوایین جەنگ لەنێوان ئیمپراتۆریای عوسمانی و ڕووسیا. دوای ئەم جەنگە کە دووجار بریندار دەبێت، محەممەد حافز پاشا یەك لە دوای یەك پلەی جەنەڕاڵی لیوا و جەنەڕاڵی فیرقەی سەربازیی وەردەگرێ. دواتر جەنەڕاڵی چەرکەسی گەنج هەڵدەبژێردرێ بۆ ئەوەی بچی کۆتایی بە پشێوییەکانی ئەلبانیا بهێنێ.، بە

تەواوی لە ئەرکەکەیدا سەردەکەوێ و سەرکەوتوانە دەگەڕێتەوە بۆ لای پاشاکەی، دوای ئەوە دەکرێ بە حاکمی سکوتاری و کوتاهیە.

لە مانگی شوباتی ۱۸۳۷ وەك ئەوەی لە پێشتر باسم کردبوو، حافز پاشا جێگەی ڕەشید محەممەد لە پۆستی سەرعەسکەریی سوپای تورۆسدا دەگرێتەوە. حافز پاشا ئەم کایە شکۆمەند و درەوشاوەیەی لە سایەی بەخشش و ڕەچاوکردنی سەرای عوسمانی وەرنەگرتبوو، بەڵکو هەمووی بە توانا و ئازایەتی خۆی وەرگرتبوو.

لەژێر خیوەتی جوانی وەزیردا، ژمارەیەکی زۆر، ڕم، شمشێری چەماوە، تۆپرەق، دەمانچەی ئاگردار، کە لە کوردەکان گیرابوون دەبینران.

" بە ئاماژەکردن بەم چەکە دەست بەسەرداگیراوانە، من بە سەرعەسکەرم گوت، ئەوانە یادەوەریی سەرکەوتنەکانی ئێوەن، شکۆمەندی بۆ ئێوە بەوەی نیزام، ئاسایشتان بۆ ناوچە کوردنشینەکان گەڕاندەوە!

وەڵامی دایەوە من تەنیا ئەوەم تەواوکرد، کە ڕەشید محەممەد پاشا، کە خوداوەند بەر دلۆڤانیی خۆی خست، دەستی پێ کرد!".

حافز پاشا کەمێك ئاگەداری کاروبار و کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕۆژئاوای ئێمە بوو، وازی لە باسوخواسی کورد و تالآن و بڕۆیی هێنا بۆ ئەوەی داوای دەنگوباسی چەندین دیپلۆماتی ئەوروپایی بکات. لەژێر خیوەتی پاشادا لەناوەندی ئەم چیایە کێویانەدا ئەوەندە سەراسیمە نەبوین بەوەی گوێمان لە ناوی تالێران بێ. حافز پاشا داوای لێ کردم داخۆ شازادە تالێران هێشتا لە ژیاندا ماوە. وەڵامیم دایەوە، کە کۆنە دیپلۆماتکار ماوەیەکی زۆرە لەسەر مردنە، بەڵام لەوەتای دەرچوونم لە فەرەنسا چیتر ڕۆژنامەم نەخوێندۆتەوە لەوە بێئاگام ئەگەر کۆتاییەکەی نزیك بووبێتەوە.

" گوێم لێبووه باسی دەکەن، سەرعەسکەری چەرکەس  لە قسەکانی بەردەوام بوو؛ وەکوو پیاوێکی زۆر ژیر باسی شازادە تالێران دەکەن، پێیان وتم کە ماوەی پەنجا ساڵە لە فەرەنسادا پیاوی هەموو دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکان بووە، وە من بەو  بەو ئەنجامە گەیشتووم، کە ڕەنگە شکۆمەندیی ئەم دیپلۆماتە بەقەد ئەندێشەکەی گەورە نەبێت".

من وەڵامی وەزیرم دایەوە کە بیروڕای هاوڕێیانی تالێران وەك ئەوەی وەزیر نییە، کە وادەزانێ دیپلۆماتێکی درەوشاوەیە و هەمیشە بەشێوەیەکی وەفادارانە لەژێر چەندین حوکوومەتی جیاجیادا خزمەتی وڵاتەکەی خۆی کردبێ.

"یەڤاش! یەڤاش! (لەسەرەخۆ! لەسەرەخۆ!) سەرعەسکەر وەڵامی دایەوە، مەحاڵە لەو هەشت یان دە حوکوومەتەی کە پەنجا ساڵە یەك بەدوای یەکدا جێنشینی یەکتر بوون، هیچ یەکێکیان نەبووبێت لەوانی دیکە دادپەروەرتر، ئەخلاقیتر بێت، و زیاتر لەگەڵ بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکانی وڵاتەکەتدا بگونجێت. کەوایە بۆچی تەنیا خۆی بۆ ئەو حوکوومەتە تەرخان نەکات، کە بەتایبەتی واپێدەچوو باشترین بێت بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیی دادپەروەری و شکۆمەندی و بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا بکات؟ بۆچی شازادە تالیرانت یەکێک نەبێت لەوانەی، کە ناوە سیاسییەکەی دەتوانێت ببێتە هێمای پەرستنی دڵسۆزانە و ڕاستگۆیانە و نیەتپاکی.

هیچ وەڵامێکم بۆ ئەم هەموو لۆژیکە پێ نەبوو و پێم وایە خەڵکی شەرافەتمەندی ئەورووپا بەشێوەیەکی دیکە حوکم لەسەر تالێران نادەن لەوەی پاشای سەرعەسکەریی ئەو کاتە لە چیاکانی تۆرۆس حوکمی لەسەر دەدات.

ئەم وتوێژە لێرەدا لێ گەڕاین. دیمەنێکی جوان هەموو سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا. خۆر بە هێواشی لەودیو بەرزاییە سەختەکانی ئەنتی تۆرۆس ئاوادەبوو و

دوایین تاڵە تیشکەکانی خۆی بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش لووتکەی چیاکانی بەرامبەرمانی دەنەخشاند . هەر یەك لە ئێمە بە بێدەنگییەکی تەواو لەم تابلۆ هەمەڕەنگە، نایابە ڕادەماین! ئەم تابلۆیە خوداوەند نەخشاندبووی! لەم ساتە کەیفسازییەدا، تیپی مۆسیقای عەسکەریی کە لە لایەن هونەرمەندێکی ئیتالی بەڕێوە دەچوو لە بەرامبەر ئەو خیوەتەی کە ئێمەی لێبووین وەستان. زۆر بە لەززەتەوە و پێکەوە میلۆدی دۆنیزیتی* یان دەژەنی. لەناوەڕاستی ئەم ئاوازە مۆسیقییە دڵگیرەدا، لەناوجەرگەی ئەم سروشتە سەخت و فراوانەدا، هەتا لەوکاتانەی کە خۆر ئاسمانی جێدەهێشت، ڕۆحی پڕ کردم لە هەستگەلێك کە وەسپ ناکرێ. مۆسیقاکە لەگەڵ خۆرئاوابووندا، تەواو بوو.

به حافزپاشام گوت:

" به بێ ئەو سەرکەوتنانەی کە ئێوە بەسەر کوردەکاندا بەدەستانهێناوە، هەرگیز ئەم چیا تۆقێنەرانە ئەم جوانی و خۆشنوودییە هاڕمۆنیەیان بەخۆیەوە نەدەبینی: پێشتر ئەلەجەداغ تەنیا دەنگی هەورە تریشقەی برووسکە، لوورەی ئاژەڵی وەحشی، یان دەنگی تەقەی دەمانچەی کوردەکانی لێوە دەهات. ئەوە لێرەوەیە کە گەواهی شکۆمەندییەکی جوانە بۆ ئێوە!

حافز پاشا بە زەردەخەنەیەکی ناسك وەڵامی دایەوە:

- ئەمڕۆ شتێك هەیە کە من زۆر شانازی پێوە دەکەم، ئەویش ئەوەیە کە ببینرێ لەناو ئەم چیایە تۆقێنەرانەدا، کە تا ئەمڕۆ دز و جەردەی وەحشی تێدا دەژیان، دوو بێگانەی تێدا ببینرێ، کە سەر بە یەکێك لە نەتەوە هەرە شارستانییەکانی گەردوونن".

* Domenico Gaetano Maria Donizetti گەورە کۆمپۆزیستێکی مۆسیقای ئیتالیاییە (٢٩ ی تشرینی دووەمی ١٧٩٧-٨ی نیسانی ١٨٤٨) (وەرگێڕ).

له چارەکە سەعاتە ڕێیەکی باکووری خێوەتی سەرعەسکەر، چیایەکی بەرز هەیە کە گاشەبەردێکی بەسەرەوەیە کە کۆتاییەکەی کونکراوە کە لەو لای دیکەی ئەشکەوتێکی سروشتیە. ئەم چیایە فەلامەزە لەگەڵ لاپاڵە داپۆشراوەکانی بە نوای بەردینی زل زل، کە دەبۆی چەك و شوێنگەی مکوومی لێبوو، کە لە دوورەوە هەر لە قەڵایەکی دەستکردی مرۆڤ دەچوو. ڕاپەڕیوەکان بەکۆمەڵ لەسەر ئەم چیایە شەڕیان دەکرد، لێرەوە بوو کە دوایین نوای یەکلاییکەرەوەیان بوو، کوردەکان باوەڕیان وابوو کە بەرزی ئەم چیایە دەتوانێ سوپای شاهانە تێکبشکێنێ ئەگەر جورئەت بکات پەلاماریان بدات: لێرەوە شێلگیرانە چاوەڕوانیان بوون. ٨ ی ئاگستۆس، لەگەڵ گزینگی خۆرەتاو، تۆپخانەی تورك، کە بەشێوەیەکی لێزانانە لەبەرامبەر گاشە بەردی گەورە دانرابوو، ماوەی دوانزە سەعات کوردەکانی هاڕی. تەقەی گەمارۆدراوەکان جوامێرانە وەڵامی ڕەشاشی عوسمانی یان دەدایەوە، بەڵام هیچ شتێك نەبوو بەرگەی حەماسەتی عەسکەری عوسمانی بگرێ. بەسەر لووتکەی چیاکە سەرکەوتن و کوشتارگەیەکی تۆقێنەریان بۆ یاخیبووەکان نایەوە: هەزار و پێنجسەد کوژراو و بریندار لە گۆڕەپانەکە بەجێمابوون. گەورەترین ژمارەییان بەناو بەرزاییەکاندا ڕایان کرد. سوپاکەی حافز پاشا هەر تەنیا سێ سەد کەسی لەدەست دا. جەنگی ٨ ی ئاگستۆس لە هەموو جەنگەکان گرنگتر بوو، کە کرایە سەر کوردەکانی ئەلەجەداغ، تا ئەو ڕۆژە جەنگ هەر تەنیا جۆرە ڕاونانێك بوو کە دژی ئەم هۆزگەلە وەحشیانە دەکرا: کە هەر کات ڕاودەنران خۆیان دەشاردەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە کاتێك کە ببینن مەترسیان بەسەرەوە نەماوە کۆببنەوە، تەنیا بەشێوەیەکی بچووك بچووك دەتوانرا شەڕیان لەگەڵدا بکرێ. جەنگی ٨ ی ئاگستۆس گەورەترین گورز بوو لە کوردەکان وەشێنرا.

کوردەکان هەرچی چەك و ئازووقەیەك کە هەیان بوو لە ئەشکەوتەکەیان دانابوو، ئێستە ئەوانە هەموویان لە بندەستی حافز پاشا دان[1].

لەناو کوردەکان دا پیاوی خەسڵەت گەورەیان هەیە. لەشکرێکی سوپای عوسمانی یەکێك لە سەرکردە کوردە هەرە ترسناکەکانیان دەستگیر کردبوو کە

---

[1] لە مانگی شوباتی ١٨٣٨ لە ئەسکەندەرییە بووم کاتێك لە ڕێگەی *Moniteur Ottoman* زانیمان کە سوڵتان مەحموود لە سۆنگەی ئەو سەرکەوتنە درەوشاوەیە کە لە دژی کوردەکان بەدەستی هێناوە، فەرمانێکی بۆ حافز پاشا ناردووە بە دەربڕینی گەرمترین گوزارشتی ستایش بێجگە لەوە سوڵتان ویستوویە بە جیاوازکردنێکی تەواو جیاوازەوە وەزیرەکەی شەرافەتمەند بکات بەوەی پۆرتریتی خۆی بۆ ناردووە لەگەڵ ئەم نامەیەی خوارەوە بە دەست و خەتی خۆی:

"وەزیرەکەم محەممەد حافز پاشا

ئەو بەها و دڵسۆزییە نمونەییەی کە جەنەڕاڵەکانی فیرقە، لیوا و هەروەها تەواوی لەشکرەکانی ژێر فەرمانی ئێوە لە هێرشە شکۆمەندەکانی سەر سنجار-داغ، تەلەعفەر، ئاقچە-داغ، ئەلەجەداغ نواندیان سەرەنجی منی بە تەواوی ڕاکێشا و شایانی ئەوەیە ستایشی هەرە دادوەرانە بکرێن. تۆ لە جیاتی من هەستی ئیحسانی باوکانەی، من بە ئەوان ڕابگەینە، ئەوە بە خۆشنوودییەوە کە من هەموویان خەڵات دەکەم و پابەندم بە سێرڤیسی سوپاکەم و بە لوتفەوە ئامادەم بۆ هاودەنگییان".

" هەرچی سەبارەت بە تۆیە وەزیرەکەم، لە سۆنگەی ئەو ڕێکخستنە کارامەییەی کە ئەوەندە قودرەتمەند بوو لە سەرکەوتنی ئەو لەشکرکێشیە شکۆمەندەدا، ئەوا بۆ زامنی دەربڕینی پێزانینی تایبەتیی خۆم، پۆرترێتی خۆمتان بۆ دەنێرم. ئەم پۆرتریتە حەماسەیە بۆ تۆ دەبێتە پاڵنەرێکی زیاتر بۆ دەست لە پشتدان. ئەوە بە تەواوی وەبیر خۆت بهێنەوە، کە بە تایبەتی پەروەردەکردن و پاراستنی بەرژەوەندی هێزە نیزامییەکانم دوو بابەتگەلی گرینگن لە چاودێریکردنی بەردەوامی من و لەوبارەیەوە سەرنجی وریایی جدیانەی ئێوە بۆ ئەوە ڕادەکێشم".

به ئاستەم سی ساڵ دەبوو. باڵا بەرز و ڕێکپۆش بوو. کە ئێمە تا ئەو کاتە ڕێکەوتی کوردێکی ئاوها قۆزی وەك ئەومان نەکردبوو. هێنایانە بەردەم حافیز پاشا. ئەگەر وەزیرێکیش بهاتبایە بن خێوەتی سەرعەسکەر نە بەوشێوە جیاوازە و نە بەو وردییەوە پێشوازی لێ نەدەکرا. حافیز پاشا و قازی سوپا هیلاك بوو بوون لەوەی هەموو هەوڵێکیان بۆ وەقسەهێنانی دا بۆ ئەوەی زانیاریی لەسەر کوردەکان ئاشکرا بکات. هەتا گەیشتە ئەوەی سەرعەسکەر قەولی پێدا بیکاتە کۆلۆنێل لە یەکێك لە فەوجەکانی خۆیدا، ئەگەر بە ڕاستی وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە.

" کوردە دیلەکە وەڵامی دایەوە، ئەگەر تۆ باوەڕت وایە لەمندا بەگێکی دیکەی ڕواندز! دەدۆزیتەوە، ئەوە خۆت بەهەڵەدا دەبەیت پاشا. دوای ئەوەی سەرۆکی کوردەکان بووم، هەرگیز نابمە سەرۆکی پیاوگەلێکی دیکە، ئەگەر ببمە سەرۆکی یەکێك لە فەوجەکانی تۆ، ئەوا تەنیا بۆ ئەوەیە، کە چەکەکانم دژی تۆ بەکاربهێنم، خودا دەزانێ من خیانەتکار نیم! هەرچی سەبارەت بەو زانیارییانەشە کە لە منی چاوەڕێ دەکەی، تۆ هەرگیز نایانبیستی.، بەدبەختی منی خستۆتە بەردەستی تۆ، هەرچیەکت لە دەست دێ دریغی مەکە".

پاش ئەوەی بێهیوا بوو لەوەی بە نەرمی چۆکی پێدا بدەن، ئەشکەنجەیان دا. جەنەڕاڵ بە دەستی خۆی پێنجسەد داری لە بن پێی دا. لەکاتێکدا کە لەسەر سك ڕاکشێنرابوو و لێی دەدرا، داوای سەبیل (شیبوکی)* کرد، بۆیان هێنا. بەکاوەخۆ سەری بەرز کردەوە بە دەستی چەپی گرتی، دەستی کرد بە سەبیلکێشان وەك ئەوەی هەست بە ئازار نەکات! دووکەس کە ئەرکی ئەشکەنجەدانی کوردەکەیان پێسپێردرابوو، بڕێکجار لە لێدان دەوستان. ئەم سەرکردەیە بۆ ماوەی دو ڕۆژ لەسەر یەك بەم ئەشکەنجەدانە تۆقێنەرە سزای

---

* schibouk

به ئاستەم سی ساڵ دەبوو. باڵا بەرز و ڕێكپۆش بوو. كە ئێمە تا ئەو كاتە ڕێكەوتی كوردێكی ئاوها قۆزی وەك ئەومان نەكردبوو. هێنایانە بەردەم حافیز پاشا. ئەگەر وەزیرێكیش بهاتبایە بن خێوەتی سەرعەسكەر نە بەوشێوە جیاوازە و نە بەو وردییەوە پێشوازی لێ نەدەكرا. حافیز پاشا و قازی سوپا هیلاك بوو بوون لەوەی هەموو هەوڵێكیان بۆ وەقسەهێنانی دا بۆ ئەوەی زانیاریی لەسەر كوردەكان ئاشكرا بكات. هەتا گەیشتە ئەوەی سەرعەسكەر قەولی پێدا بیكاتە كۆلۆنێل لە یەكێك لە فەوجەكانی خۆیدا، ئەگەر بە ڕاستی وەڵامی پرسیارەكانی بداتەوە.

" كوردە دیلەكە وەڵامی دایەوە، ئەگەر تۆ باوەڕت وایە لەمندا بەگێكی دیكەی ڕواندز! دەدۆزیتەوە، ئەوە خۆت بەهەڵەدا دەبەیت پاشا. دوای ئەوەی سەرۆكی كوردەكان بووم، هەرگیز نابمە سەرۆكی پیاوگەلێكی دیكە، ئەگەر ببمە سەرۆكی یەكێك لە فەوجەكانی تۆ، ئەوا تەنیا بۆ ئەوەیە، كە چەكەكانم دژی تۆ بەكاربهێنم، خودا دەزانێ من خیانەتكار نیم! هەرچی سەبارەت بەو زانیارییانەشە كە لە منی چاوەڕێ دەكەی، تۆ هەرگیز نایانبیستی.، بەدبەختی منی خستۆتە بەردەستی تۆ، هەرچیەكت لە دەست دێ دریغی مەكە".

پاش ئەوەی بێهیوا بوو لەوەی بە نەرمی چۆكی پێدا بدەن، ئەشكەنجەیان دا. جەنەڕاڵ بە دەستی خۆی پێنجسەد داری لە بن پێی دا. لەكاتێكدا كە لەسەر سك ڕاكشێنرابوو و لێی دەدرا، داوای سەبیل (شیبوكی)* كرد، بۆیان هێنا. بەكاوەخۆ سەری بەرز كردەوە بە دەستی چەپی گرتی، دەستی كرد بە سەبیلكێشان وەك ئەوەی هەست بە ئازار نەكات! دووكەس كە ئەركی ئەشكەنجەدانی كوردەكەیان پێسپێردرابوو، بڕێكجار لە لێدان دەوستان. ئەم سەركردەیە بۆ ماوەی دو ڕۆژ لەسەر یەك بەم ئەشكەنجەدانە تۆقێنەرە سزای

---

* schibouk

چەشت. سێیەم ڕۆژ، کوردە خۆڕاگرەکە ڕووتکرایەوە و خرایە ناو قازانێکی گەورەی پڕ ئاوی کوڵاو. بەردەوام هەمان ئەو پرسیارەیان لێ دەکرد لەسەر کوردەکان، بەڵام یەك وشە چییە لە زاری نەهاتە دەرەوە.

" تۆ وەڵام نادەیتەوە، حافیز پاشا پێی گوت، ئایا تۆ گوێت لە قسەکانم نییە؟".

کوردەکە سەری هەڵبڕی، ڕوانینێکی پڕ لە تووڕەیی بەسەر دوژمنەکانیدا گێڕا، پاشان بە دەنگێکی لەسەرەخۆ گوتی:

"لە سایەی خوداوە کەڕ نیم و چاک دەبیستم، بەڵام زمانم بۆ وەڵامی پرسیارەکانت لاڵە.

- بە چ ئەشکەنجەیەکی سەختتر دەتوانین وا بکەین ئەم پیاوە قسە بکات؟ قازی بە سەرعەسکەری گوت.

کوردەکە، دەستی بۆ پیاوێک درێژ کرد کە بەرامبەری ڕاوەستا بوو و بە شکۆ و شانازییەکی بێهاوتاوە گوتی:

" هیچ ئەشکەنجەیەک بۆ من لەوە تۆقینەرتر نییە لەوەی لێرە بە چاوی خۆم کوردێکی ترسنۆك دەبینم براکانی جێهێشتووە بۆ ئەوەی خۆی ڕادەستی دوژمنەکانمان بکات!!!".

ئەو کوردەی کە ئەو قسانەی ئاڕاستەکرابوو، لە ناکاوێکدا دەمانچەی لە بەر پشتێنی دەرهێنا، لوولەکەی خستە ناو دەمی خۆی و لە شەرمی خیانەتەکەیدا مێشکی خۆی پژاندا! کوردە بەدبەختەکەی ناو ئاوە کوڵاوەکەش، پاش ساتێک مرد.

سەردەمانی کۆنیش نموونەی نیشتمانپەروەریی لەوە نایابتری بەخۆیەوە نەبینییوە. هیچ ئەفسەرێك، هیچ سەرۆکێك نە لەناو یۆنانییەکان، نە لەناو ڕۆمانییەکان ئەوەندە خۆڕاگریی پاڵەوانانەی نەبووە وەك ئەم گەنجە هەمەجیە کە جیهان هەرگیز ناوی نازانێ.

دەمبیست لە کامپی عوسمانلییەوە دەوترا کەوا شۆڕشی کوردەکان لە لایەن محەممەد عەلی یەوە دنە دراوە و بە چەك و ئازووقە پشتگیرییان دەکات. " تورکەکان دەڵێن بە بێ کۆمەکی پاشای میسر، کوردەکان ئەو ماوە زۆرە شەڕیان پێ نەدەکرا. ئەم قاوە کە لە وڵاتدا بڵاوبۆتەوە دەشێ بڕێك ڕاستی تێدا بێت.

دیارە دەبێت لێرەدا تێبینی ڕووداوێکی گرنگ بکەم، ئەویش ئەوەیە کە گەرچی کوردەکان شکاون، بەڵام هەموو ڕۆژ سەربازی نوێی عوسمانی لە ئاسیای بچووکەوە دەگەن. هەموو ئەم سەربازانە بە بیانووی پاڵپشتیکردنی سوپای حافز پاشا دێن، بە گرووپی بچووك بچووك چیای تۆرۆس دەبڕن، لەو لایەی کە لەسەر فوڕات و دەروناوچەکانی ئۆرفە، پایتەختی میزۆپۆتامیا بە سموستا دەگات. ئەم گردبوونەوەیە کە بە بێ هەراو هۆیا لە دەرەوەی تۆرۆس دەبێت، دەشێ نیازی گەورەی جەنگ لەلایەن سوڵتان بشارێتەوە بەو پێیەی کە ملکەچکردنی کوردەکان ئەمڕۆ بە تەواوی تەواو بووە، ڕێگە بەوە نادا بیر لەوە بکرێتەوە لەوانەیە سوڵتان خواستی شکاندنی دوژمنی دیکەی هەبێ؟ ئەم مانۆرە کە هیچ کەس گرنگی پێنادات، مەبەست لێی بۆ فریودانی وریایی لەشکری میسرییەکان بێ، کە بەرگری لە ڕێڕەوەکانی تۆرۆس یان پێسپێردراوە ، ئەم کۆڵەگە کیلیکیاییەی ces piles ciliciennes ، کە زۆر باسی لێوە کراوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگری-پاشا هەموو کاتێکی پێویستی بە مەحموود داوە بۆ گردکردنەوەی سوپایەك لە لای ئۆدیسە Edesse یان ئەلبیرEl-Bir، لە ترسی ئەوەی کە نەوەکا لەلایەن مەولاناکەی بشکێ؟ گەرچی ئێمە پێمان وانییە وا بێ. محەممەد عەلی هەست بە هێزی خۆی دەکات و لەشکری سوڵتان چوار ساڵ بەر لە ئێستە، گەورەترین بەڵگەیان لەسەر لاوازیی خۆیان دا بەدەستەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر هێشتا لەشکری سوڵتان لێی بترسن. سوپای تورك ئەمڕۆ نە ژمارەیان هێندە زۆرتر بووە و نە باشتریش ڕێکخراوترن وەك

لەوەی ساڵی ١٨٣٢ و سوپای ئیبراهیم پاشا، ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبێت. لێرە هیچ کەس گومانی لەوەدا نییە، کە سوڵتان یەکەمین دەرفەتی لەبار دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە یاخیانەی، کە بەهۆی شۆڕشەوە لێیەوە دابراون بیانگێڕێنێتەوە[1].

[1] ئەو ئامادەسازییەی کە بەبێ هەرا و هۆریا لەوەتای دوو ساڵە لای ئۆرفە، ئەدیسای کۆن دەبینرێ بەڕێوە دەچێ، کە ئامانجی ڕاستەقینەی بۆ لەشکرکێشی جەنگێکی نوێیە دژ بە محەممەد عەلی (بڕوانە پەراوێزی کۆتایی ئەم بەرگە).

## نامەی بیست دوو

بۆ بەڕێز میشوو

# ئۆرفە، ٤ ی سێپتامبەری ١٨٣٧

" سێ بەڵای گەورەی ڕۆژهەڵات، وەك پەندێكی پێشینانی ئەم وڵاتە دەیلێت، بریتین لە تاعوون، ئاگركەوتنەوە و نەبوونی وەرگێڕی كارامە و ڕاستگۆ" هیچ شتێك لەم پەندی پێشینانە ڕاستتر نییە، هەموو ساڵێك تاعوون بەشێوەیەكی ترسناک دانیشتوانی موسڵمانی ئەم وڵاتە قڕ دەكات. هیچ مانگێكیش ناگوزەرێ بێ ئەوەی ئاگر چەند گەڕەكێكی سمیرنا، لە قاهیرە تا ئیستەنبووڵ نەماشێتەوە. ئێوە دەزانن، كە كۆمەڵەی ماڵتێیی Société de Maltais، جوو، یۆنانی و عەرەبی میسری، كە بە ئاستەم كەمێك فەرەنسی، توركی، عەرەبی و ئیتالی دەزانن خۆیان دەخەنە خزمەت گەڕۆكە ئەوروپاییەكانەوە: نەك هەر هەستی شەرەفمەندی و سەرڕاستی زۆر بەدەگمەن لەناو ئەو خەڵكانەدا دەبینرێن، بەڵكو زۆربەیان ئاگەداری ڕووداوەكانیش نین. ئێمە زۆر ماندوو دەبووین لە گەیاندنی پەیامە زارەكییەكانمان، چونكە وەرگێڕەكانمان یان لێمان حاڵیی نەدەبوون، یانیش بە ئارەزووی خۆیان دەستكاری قسەكانیان دەكرد و دەیانشێواندن. لێكۆڵینەوەی دابونەریتی گەلانی ڕۆژهەڵات زۆر بەسوودتر دەبێت ئەگەر بتوانرێ پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتەكە ببەسترێ. لە وتووێژی خۆم لەگەڵ موسڵمانێك، ئەرمەنیەك

یان یۆنانییەك زیاتر لە چەند جارێك دەوەستام بۆ گەڕان بەدوای ئەو بیرانەی کە لەگەڵ دەنگ و لە دەربڕینی سیمایاندا بەدیم دەکرد. ئێوە گوتوتانە بۆ ئەوەی سەفەرێکی بەکەڵك بکەیت بۆ ڕۆژهەڵات دەبێت دووجار سەفەر بکەیت؛ لەوانەیە یەکجار سەفەر بەس بێ ئەگەر پێش سەفەر زمانی ئەو وڵاتەی، کە بە نیازی چوونیت هەیە، بزانیت.

بە چاوپۆشین لەو بێزارییەی کە بیروڕاکان بە زاری کەسێکی نەزاندا تێپەڕ دەبن، هێشتا خەوشگەلی دیکە بۆ گەشتیارەکان لە ئارادایە. ئەوە بەشێوەیەکی سەرەکی دەوەستێتە سەر ئەو وەرگێڕەی کە لە خزمەتی گەشتیارەکە دایە، جانتای پارە و ژیانی لە دەست ئەو دایە، بە پارەی گەشتیارەکە وەرگێڕ پارە دەدا، بڕەپارەیەك کە لای ئەو باش بێ، وەرگێڕ ئەگەر بیەوێ، دەتوانێ لە ناوەڕاستی بیاباندا گەشتیارەکە بە جێ بهێڵێ و لێبگەڕێ لە تینووتیان و لە برسان بمرێ. من لە سێ مانگی ڕابووردودا بەخۆم، خۆم لەناو ڕەوشێکی ئاوەها دیتەوە. لە ئیستەنبوولەوە دەرچووم بە نیازی گەشتێك بەناو بەشێکی کوردستاندا، بینینی ڕووباری دیجلە و کەلاوەکانی بابل و ئەوەتا وام لە مەلاتیە. لە ئیستەنبوولەوە بەڕێز خاچادۆر وەکوو وەرگێڕ بە گەڵمان خرابوو، بەڵام لە مەلاتیەوە ڕەتیکردەوە کە لەگەڵمان بێت و وەکوو ئەو وەرگێڕانەی بەر لە ئێستە باسم کردن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردم. بەو پێیەی لەناو چۆڵەوانیی ئاسیا لە دایك بووبوو، جورئەتی کرد پێمان بڵێ کە هێزی ئەوەی نییە لە کاتی قرچەی گەرمای مانگی سێپتامبەردا بیابانی مووسڵ ببڕێ کەچی بڕیاری دا بەردەوام بێ لەگەڵمان ئەگەر بمانەوێ لە شەش سەعات زیاتر لە ڕۆژێکدا نەڕۆین، یان ئەگەر ئێمە مانەوەکەمان لە مەلاتیە درێژبکەینەوە تاوەکوو کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم. من نەمدەتوانی پێشنیازەکانی قەبووڵ بکەم. من بۆ ئەوە نە هاتوومەتە ڕۆژهەڵات تا بە قرچەی خۆرەتاو وڵاتەکە نەبینم و ئەو بڕە پارە

پێویستەشم پێنەبوو تا چاوەڕوان بکەم ڕۆژە جوانەکانی پاییز بهێنێتەوە تا ڕێبەرە دڵسۆزەکەم زیندوو بکاتەوە.

محەممەد حافز-پاشا هیمەتی کرد وەرگێڕی خۆی بەگەڵ داین بۆ هاوەڵیکردنمان تاوەکوو حەلەب. ئەم وەرگێرە گەنجێکی یۆنانی خەڵکی سمیرنا بوو و ناوی پێترۆ* بوو. ئەو ڕووداوەی دوای ئەوە باسی دەکەم دەشێ بیرۆکەیەك لەبارەی ئەخلاقیەتی ئەوەوە بەدەستەوە بدات.

سەرعەسکەر بە پارە پادداشتی هەموو ئەوانەی دەدایەوە کە پاشماوەی چەند کوردێکی خوێنڕێژیان دەهێنا. سەری کوردێک بەرامبەر بە ۲۰۰ پیاستەر (۵۰ فرەنك) بوو، دەستێك ۱۰۰ پیاستەر، قاچێك بە هەمان نرخ. وەرگێڕەکەی حافز پاشا پێی وتین، ڕۆژێکیان کاتێك لە مەڵاتیە هاتۆتە بارەگای سەرکردایەتی، لەسەر ڕێگە پیرەژنێکی تورکی بینیوە، کە لە لایەن کوردەکان کوژرابوو، بەڵام هێشتا هەر هەناسەی دەدا. پێترۆ ئەو کاتە هیچ پارەی لە گیرفان دا نەبووە، بۆ ئەوەی پارەی دەست بکەوێ، خەیاڵی کردووە هەردوو گوێچکەی پیرەژنە بەسەزمانەکە کە لە گیانەڵا بوو ببڕێ. کاتێك دەگاتە ئۆردوو، بە هیچ شێوەیەك ناترسێ و هەردوو گوێچکەکە، وەك ئەوەی گوێچکەی کورد بن، بە حافز پاشا نیشان دەدات و ۱۰۰ پیاستەر لە بریتیان وەردەگرێ. من داوام لێکرد کە داخۆ بۆچی چاوەڕوانی نەکردووە تا دواجار پیرەژنەکە ڕۆح بدات بەر لەوەی گوێچکەی ببڕێ، زۆر بە سادە و ساکارییەوە وەڵامی دامەوە: " کە زۆر پەلەی بووە و کاتی ئەوەی نەبووە چاوەڕوان بکات و باوەڕی نەکردووە، کە ئازاری زۆری پێبگەیەنێ بە بڕینی هەردوو گوێچکەی کە پارەی بۆ دەکات و بە بێهوودە لە دەست لاشەخۆرەکان دەربازی بووە". تورکێك هەرگیز تاوانبار نابێت لە پابەند بە چاوچنۆکییەکی ئاوەها.

---

* Piétro

پێترۆ ناو و جل و بەرگی خۆی گۆڕی، ناوی موستەفای وەرگرت و جل و بەرگی ئەفسەرێکی میلیشیای نوێی لەبەرکرد و خۆی کرد بە ئەفسەرێکی موسڵمانی پلە یەك. گەنجەکەی سمیرنا کە لە ڕواڵەتدا هەرگیز مەسیحی نەبووە، لەرەی دەنگ و شێواز و سیمای گری تورکێکی وەرگرت. بۆ ئەوەی ڕۆڵەکەی خۆی بە چاکی بەڕێوە ببات، مەسیحییەکی کەنارەکانی مێلەس* ئەگەر بیەوێ دەتوانێ نوێژەکانی (نوێژی تورك) لەناو ئاپۆرەی ئیماندارانی ڕاستەقینەدا نوێژ بکات. پێترۆ، کاتێك تورکەکان ڕایاندەگرتین، سەرۆکانە قسەی دەکرد و هەموو بە پەلەپرۆزێ گوێڕایەڵیان دەکرد و هەرچی بویستایە پێیان دەدا. ئەوە تەنیا دەوەستایە سەر ئێمە ئەگەر پارەیەکمان بەوانە بدابایە کە دەیانحەواندینەوە و خواردنیان بۆ دەهێناین، ئەم عوسمانییە بەسەزمانانە باوەڕیان وابوو کە ناچارن هەموو شتێکمان بە خۆڕایی بدەنێ، بۆ ئەمە تەنیا پێترۆ ئەفسەرێکی موسڵمان بوو و ئێمەش هاوڕێیانی حافز پاشا بووین.

ڕۆژی ٣٠ی ئاگستۆس لە سەعات چواری بەیانی مەلاتیەمان بەجێهێشت. ئاسۆی ڕۆژهەلاتیی کەمە کەمە لەناو تەمتوومانی ڕوون وەدەردەکەوت و دەتوانرا یەکەمین تاڵەتیشکی گزینگ، لێرە و لەوێ ببینرێ، بەرەو ناوچەکانی ڕۆژئاوا و چەند ئەستێرەیەك هێشتا هەر دەبریسکانەوە و وادیار بوو وەك ئەوەی لە گومەزی ئاسمان مابنەوە بۆ ئەوەی سلاو لە هەڵهاتنی خۆرەتاو بکەن. چڵی دار پرتەقاڵ، درەختی لیمۆ، ئەسپیندار و درەختی بادام بەسەر سەرمانەوە دەهاتن و دەچوون بە نەسیمێکی نەرم، کە بە دەربڕینی سەعدی گوتەنی دڵۆپی شەونم، وەک *ئەڵماسگەل بەسەر گوڵی ئەرخەوانیی، یان وەك فرمێسك بەسەر گۆنای کیژۆڵەیەکی شەرمن کە کەمێك دڵی شکێنرابێ*، بریسکەی دەدایەوە.

سەفەرنامەی پێنجەم

# کورد
# لە سەفەرنامەی ڤیکتۆر لانگلوا
# بۆ کیلیکیا و چیاکانی تۆرس
# ساڵەکانی ١٨٥٢-١٨٥٣



لويس ڤيكتۆر لانگلوا ( ١٨٢٩-١٨٦٩ )

# VOYAGE

# DANS LA CILICIE

ET

## DANS LES MONTAGNES DU TAURUS

**Exécuté pendant les années 1852-1853**

PAR ORDRE DE L'EMPEREUR
ET SOUS LES AUSPICES DU MINISTRE DE L'INSTRUCTION PUBLIQUE
ET DE L'ACADÉMIE DES INSCRIPTIONS ET BELLES-LETTRES

PAR



**VICTOR LANGLOIS**

« Magnificas Asiae perveniemus urbes. »
Ovide, *Fast.*, II, 2, 21.



**A PARIS**

CHEZ BENJAMIN DUPRAT

LIBRAIRE DE L'INSTITUT, DE LA BIBLIOTHÈQUE IMPÉRIALE ET DU SÉNAT,
DES SOCIÉTÉS ASIATIQUES DE PARIS ET DE LONDRES,
RUE DU CLOITRE SAINT-BENOIT (RUE FONTANES), 7,
PRÈS LE MUSÉE DE CLUNY.

1861



(سەفەر بەناو کیلیکیا و چیاکانی تۆرۆس)

# پێشەکی

لویس ڤیکتۆر لانگلوا Louis Victor Langlois ناسراو بە ڤیکتۆر لانگلوا ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسایی و پسپۆری بواری پارەناسی numismatique و شارستانییەتی ئەرمەنی بوو. ڤیکتۆر لە ٢٠ ی ئاداری ١٨٢٩ لە دییێپ Dieppe لە دایك بووە. لە ١٤ ی ئایاری ١٨٦٩ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە. ماوەی دوو ساڵان قوتابی قوتابخانەی تایبەت بە زانستی خوێندنی مێژوو (قوتابخانەی نیشمانیی شارت l'École des chartes) بووە و پاشان چووەتە قوتابخانەی زمانەکانی ڕۆژهەڵات[1]. لە ساڵەکانی ١٨٥٢-١٨٥٣ لەلایەن حوکومەتی فەرەنسییەوە ئەرکی سەفەرێکی زانستیی پێ سپێردراوە بۆ کیلیکیا و دوای گەڕانەوەشی ڕاپۆرتێکی لەبەردەم ئەکادیمیای نەخشەسازیی و هونەرە جوانەکان پێش کەش کردووە[2]. لانگلوا ڕاپۆرتەکەی لە دانیشتنی ٢٥ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٥٣ لە بارەگەی ئەکادیمیای فەرەنسی بەناوی (ڕاپۆرت لەبارەی هەڵکۆڵینە ئارکیۆلۆژییەکانی کیلیکیا و ئەرمێنیای بچووك لە ساڵەکانی ١٨٥٢-١٨٥٣) پێشکەش کردووە، کە ساڵی دواتر لە پاریس (١٨٥٤) وەکوو کتێب بڵاوکرایەوە[3]. دوای ئەوە پاش حەوت ساڵ، لە ساڵی ١٨٦١ لە

---

(1) l'École des langues orientales

(2) l'Académie des inscriptions et belles-lettres

(3) Rapport sur l'exploration archéologique de la Cilicie et de la Petite-Arménie pendant les années 1852-1853, Imprimerie nationale, Paris, 1854.

پاریس سەفەرنامەی خۆی بەناوی (سەفەر بەناو کیلیکیا و چیاکانی تۆرۆس)[1] لە پاریس بڵاوکردەوە. چەندین لێکۆڵینەوەی لەبارەی شارەستانییەتی ئەرمەنی پێشکەش کردووە بەتایبەتی لەبارەی ئەرمێنیای بچووك[2] و خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوە و کتێبی مێژوویيە و جگە لەوە کتێبی (پارەناسیی ئەرمەنی)[3]، پاریس، ١٨٦٩ یەکێکە لە کتێبە یەکەمینەکان لەم بوارەدا.

## کورد لە سەفەرنامەکەدا

سەفەرنامەکە بەناوی (سەفەر بەناو کیلیکیا و چیاکانی زاگرۆس، کە لە ساڵەکانی ١٨٥٢-١٨٥٣ لەسەر فەرمانی ئیمپراتۆریی و لەژێر چاودێریی وەزیری فێرکردنی گشتیی و ئەکادیمیای نەخشەسازیی و هونەرە جوانەکان لەلایەن ڤیکتۆر لانگلوا کراوە) و ئێمە لەم وتارەدا تەنیا ئەوەی لەم سەفەرنامەیەدا تایبەتە بە کورد، دەخەینە پێشچاو و توخنی بوارەکانی دیکە ناکەوین. ڕاستییەکەی زانیارییەکانی ناو ئەم سەفەرنامەیە لەبارەی کورد لەم بەشەی ئیمپراتۆریای

---

[1] Louis Victor Langlois, Voyage dans la Cilicie et dans les montagnes du Taurus Exécuté pendant les années 1852-1853 par ordre de l'empereur et sous auspices du ministre de l'instruction publique de l'Académie des inscriptions et belles-lettres, Paris, 1861.

[2] شانشینی ئەرمێنیای کیلیکیا یان شانشینی ئەرمێنیای بچووك لە کیلیکیا لە باشووری-ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لەلایەن ئەو پەناهەندە ئەرمەنیانە دامەزرا، کە لە دەست سەلجوقییەکان بۆ ئەرمێنیا ڕایان کردبوو. ئەم شانشینە سەربەخۆ بوو و هاوپەیمانیی مەگۆل بوو و لە ١٠٨٠ تا ١٣٣٥ لەلایەن مەملووکەکانەوە ڕوخێندرا و پایتەختەکەشی شاری (سیس) یان شاری (کۆزات) ی ئێستە بوو (وەرگێڕ).

[3] Victor Langlois, Numismatique de l'Arménie, Paris : C. Rollin : A. Durand ; Londres : M. Curt, 1859.

عوسمانی و لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بۆ ئێمە زۆر گرنگ و پڕ بایەخن و بۆ دووبارە نووسینەوەی ئەڵقە ونەکانی مێژووی ئێمە بە دڵنیاییەوە سوودی زۆری دەبێت. نووسەر دوای گەیشتن بە شاری (سیس) پایتەختی کیلیکیا و دوای مانەوەی شەش ڕۆژ ویستویە بچێ بۆ ئەو بەشەی چیاکانی تۆرۆس کە تورکمان و ئەرمەنەکانی لێ دەژین، لە کاتی چوونی بۆ شاری ئانازارب Anazarbe، دووەمین نیشنگەی شازادەکانی ئەرمەن، نووسەر لەگەڵ ئیسکۆرتەکەی بۆ یەکەمجار تووشی کوردەکانی هۆزی ئەفشار دەبێت، کە دەیانەوێ ڕێگەی لێ بگرن، تا ئیسکۆتەکە ناچار دەبن دەست بکەنەوە. نووسەر هەرچەندە لەم بەرەوڕووبەڕوو بوونەوەیەدا گوللەیەك بەر قاچی دەکەوێ و بریندار دەبێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەسەفەرەکەی خۆی بەردەوام دەبێت و سەری کەلاوەکانی مالیوس Mallus و لاجازۆ Lajazzo دەدات، کە دەرگەی ئەرمینیا بوو لە دەورانی خاچپەرستەکان و عەمباری بازرگانی ڕۆژهەڵات بووە لە سەدەکانی ناوەڕاست.

لە زستانی ١٨٥٢-١٨٥٣ نووسەر لەناو چیاکانی تۆرۆس بووە و لەوێدا خەریکی هەڵکۆڵینە ئارکیۆلۆژییەکان بووە، کە ئێستە بەشێکی ئەو هەڵۆکڵینانە لە مووزەخانەی لوڤەردا هەڵگیراون. لە دووەمین گەشتی بۆ باکووری-ڕۆژهەڵاتی تۆرۆس چووەتە ناو عەشیرەتە تورکمان، کورد و ئەرمەنەکانی تۆرۆس. لە لاپەرە (١٨ ی سەفەرنامەکە) تابلۆکانی دابەشبوونی ئیتنیکی تۆرۆس نیشان دەدات و ژمارەی دانیشتوانی سەرلەبەری کیلیکیا بە سەد و پەنجا هەزار کەس دەخەملێنێ ( لا :١٧) و لێرەوە نووسەر باسی دابەشبوونی فراکسیۆنە ئیتنیکییەکانی کیلیکیا دەکات، کە هەر دانیشتوانێك کاراکتەری جیاکەرەوەی خۆیان دەپارێزن و بەشێوەیەك یەك نەتەوە نین، بەڵکو کۆمەڵە گردبوونەوەیەکی کەسەکانن بە بێ هۆمۆژینیتێ و بەردەوام دابەش بوون، کە ئەستەمە بتوانن لەناو

یەکەیەکی سیاسیی هاوبەشدا یەك بگرن (لا: ١٧). نووسەر دواتر لە لاپەرەی دواتر ژمارەی سەرلەبەری دانیشتوانی کیلیکا بەوردی بە ١٤٧.٦١٨ سەد و چل و حەوت هەزار و شەشسەدوهەژدە کەس دەخەملێنێ و دابەشی سەر سێ چینی سەرەکی کردوون. ئەوەی جێگەی سەرەنجدانە سەرجەم گرووپەکانی ناو کیلیکیا ئاکنجین، تەنیا کوردەکان نەبێ، کە کۆچەرن و ژمارەی تەواوی کورد لە کیلیکیا بە بیست هەزار ٢٠.٠٠٠ کەس دەخەملێنێت ( لا: ١٨). نووسەر دەنووسێ : "دانیشتوانی ئێستەی کیلیکیا نیشتەجێ یان کۆچەرن، جگە لە کوردەکان و چەردەیەك هۆزی تورکمان و دۆم و قەرەجەکان نەبێ، کە سەر بە کاتیگۆری دوایین، ئەوانی دیکە هەر هەموویان لەناو شار و ئاوایيەکان دەژین (لا: ١٨). واتە بە قسەی نووسەر سەرجەمی ئەو بیست هەزار کوردەی، کە لە کیلیکیا و چیاکانی تۆرۆس دا دەژین، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆچەر بوون.

نووسەر لە باسی تورکمانەکانی ئەلرەمەدان-ئۆغلۆ El-Rhamadam-oglou، کە تا ئەوکات کۆچەربوون و لەم دۆڵ بۆ ئەم دۆڵ، لە دۆڵی کیلیکیا جێنشین دەبن و لەگەڵ تورکمانەکان تێکەڵ دەبن و لەو تورکمانانە جیا دەبنەوە، کە دواتر دێن بۆ تۆرۆس و پێدەشتەکانی کیلیکیا. ئەم جیابوونەوە لەنێوان تورکمانەکانی نیشتەجێ و تورکمانە کۆچەرەکان، کە بەناوی ئیۆرۆکەکان Iourouks ناسراون، بووبە سۆنگەی گۆڕینێکی تەواو لە کاراکتەری تورکمانە ئاکنجییەکان بەوەی چیتر خەون بە شەڕوشۆرەوە نەبینین تەنیا بۆ بەرگری کردن لە مەڕومالاتیان و خەرمانەکانیان نەبێ، یان کاتێ تورکمانە ئیۆرکەکان Iourouks و کوردەکانی هاوسێ یان چاویان تێ دەبڕن (لا: ٢٠).

LIBRAIRIE DE BENJAMIN DUPRAT

Rue Fontanes (Cloître-St-Benoît), 7, à Paris.



# VOYAGE DANS LA CILICIE

ET

## DANS LES MONTAGNES DU TAURUS

Exécuté pendant les années 1852-1853

PAR ORDRE DE L'EMPEREUR
ET SOUS LES AUSPICES DU MINISTRE DE L'INSTRUCTION PUBLIQUE
ET DE L'ACADÉMIE DES INSCRIPTIONS ET BELLES-LETTRES

Par **VICTOR LANGLOIS**



En 1852, M. Victor Langlois fut chargé, par ordre de l'Empereur, d'une mission scientifique en Karamanie, l'ancienne Cilicie, contrée presque inexplorée, que les Lusignans d'Arménie avaient possédée pendant près de trois siècles, à la suite des Guerres Saintes, et qui conserve encore aujourd'hui le souvenir de la domination française. Cette province de l'Asie Mineure est sans contredit l'une de celles où l'on trouve le plus de ruines

1861

کوردەکان زۆر لە تورکمانەکان جیان، کوردەکانی کیلیکیا کۆچەرن و سەر بە کاستی (عەشیرەت)ی جەنگاوەرن، بەپێچەوانەی ئەو هۆزە کوردانەی گوزان Guzan یان ئەو جوتیارانەی، کە لە کوردستانی جنووبیدا دەژین و وایان پێ

دەڵێن. کوردەکانی پاشالقی ئەدەنە هاوینان لە دەوروبەری سێساریێ Césarée هەوراریان هەڵ دەدەن و زستانانیش دێنەوە ڕەشماڵەکانیان لە نزیك مەرەش لەسەر ئەو ڕێگەیەی، کە دەچێ بۆ ئانازارب Anazarbe ڕەشماڵیان هەڵ دەدەن. ئەوانە چوار هۆزی تایبەتن و بەهەموویان پێنج هەزار ڕەشماڵن. ئەوە ناوی هۆزەکانیانە لەگەڵ ژمارەی مێگەلەکانیان.

| ناوی هۆزەکان (لیوای ئەدەنە) | ژمارەی ڕەشماڵ | مەڕ | بزن | مانگا و گامێش | حوشتر |
|---|---|---|---|---|---|
| کارەلار Karalar | ٦٠٠ | ١٠٠٠٠ | ٢٠٠٠ | ٦٠٠٠ | ١٧٥ |
| لەك Lek | ١٥٠ | ٥٠٠٠ | ٢٠٠٠ | ٣٠٠٠ | ١٥٠ |
| ئەفشار Afchar | ٣٠٠٠ | ٤٠٠٠٠ | ٣٠٠٠ | ٤٠٠٠٠ | ٩٠٠٠ |
| کارەسەنتەلی Karsanteli | ١٣٠٠ | ٤٠٠٠٠ | ٤٠٠٠ | ١٢٣٠٠ | ٣٥٠ |

| NOMS DES TRIBUS KURDES. | | NOMBRE des tentes. | NOMBRE DES BESTIAUX. | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | Moutons. | Chèvres. | Bœufs et vaches. | Chameaux. |
| LIVA D'ADANA. | Karalar. | 600 | 10,000 | 2,000 | 6,000 | 175 |
| | Lek. | 150 | 5,000 | » | 3,000 | 150 |
| | Afchar. | 3,000 | 40,000 | 3,000 | 40,000 | 9,000 |
| | Karsanteli. | 1,300 | 40,000 | 40,000 | 12,500 | 350 |

لەناو ئەمانەدا هۆزی بەژمارە زۆری ئەفشار لە هەموویان ترسناکترن. ئۆردووەکانیان لەناو زۆربەی بەشی ئاسیای بچووك پەرت و بڵاون، لەڕێگەی تاڵان و بڕۆ و دڵڕەقییان ترس و تۆقین بڵاودەکەنەوە. کورد لەسەر ژیانی کۆچەریی ڕاهاتوون و بەرگەی ئەو دەسەڵاتە ناگرن کە پاشاکانی ویلایەتەکان دەیانەوێ بەسەریاندا بسەپێنن، کە بەردەوام شەڕیان لەگەڵدا دەکەن بۆ ئەوەی

باج بدەن. زۆرینەی کوردەکان لەسەر ئایینی ئیسلام نین[1]، بڕێکیان سەر بە تایەفەی سوننین[2]، ئەوانی دیکە ئێزیدین و شەیتانی عیبرییەکان، عەرەبەکان و تورکەکان دەپەرستن، کە تەنیا خوداوەندی سێتسی Seth میسرییە کۆنەکانە، کە مەسیحییەکان کردوویانە بە شەیتان ( ل. ٢٣).

پێم وایە لانگوا ئارگیۆمێنتەکانی لەبارەی کوردەوە تەنیا لەسەر ئەو کوردە کۆچەرانەی کیلیکیا نووسیویە، کە ئەو دیونی بۆیە نووسیویە: "کوردەکان هێندە گرنگی زۆر بە پەرستنی دەرەکی نادەن و بەدەگمەن دەیانبینین کە لەکاتی نوێژکردندا کڕنووش بەرن" ( ل. ٢٤). لانگلوا لە بەشی زمان باسی زمانی هەرە بڵاو دەکات لەناو کارەمانی Karamanie ، کە زمانی تورکییە و کەمێك جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو زمانە تورکییەی کە لە ئیستەنبووڵ و سیمیرنا (ئەزمیر) قسەی پێ دەکەن (ل. ٢٥). هەروەها لە باسی زمانەکانی دیکەی پاشالیك باسی زمانی کوردی دەکات و پێی وایە "زمانی کورد دیالێکتێکی زمانی فارسییە " (ل. ٢٥).

نووسەر لە باسی مێژووی کیلیکیا لای وایە لە سەدەکانی ناوەڕاست هێزی خۆی لەدەست داوە و بووەتە گۆڕەپانی جەنگ کە بێزەنتین و ئەرمەنەکان لەوێدا شەڕیان دەکرد و دواتر لە دەورانی جەنگیزخان و تەیموری لەنگ بۆتە بیابانێکی بەرفراوان، کە هۆزە تورکمانەکان و کوردەکان پەلاماریان داوە (ل. ٦٤-٦٥).

---

[1] دیارە لێرەدا مەبەستی نووسەر تەنیا کوردەکانی کیلیکیایە، تەنیا کوردەکانی ئەوێ گەڕاوە.

[2] دیارە دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە نووسەر تەنیا بەناو چیاکانی تۆرۆسدا ڕۆیشتووە.



# JOURNAL DU VOYAGE.




Cavalier kurde de la tribu Afchar.

کاتێك نووسەر باسی سەفەرەکەی دەکات بەرەو ئەدەنە کە پێدەشتێکی قاتوقڕی نەچێندراو بووە و لە زستانان تورکمان و کوردە کۆچەرەکان تێیدا ڕەشماڵ و دەواریان لێ هەڵداوە و لە چیاکان هاتوونەتە خوارەوە (ل. ١١٩). کاتێکیش دەگاتە ئەدەنە دەنووسێ : " ئەدەنە کەوتۆتە پێدەشتێکی بەرفراوان، کە لە زستانان هۆزە تورکمان و کوردەکان ڕەشماڵی لێ هەڵدەدەن، بڕێکجار گەشتیار ناچار دەبێت بۆ گەیشتن بەسەر چیا، کە شارەکانی سیس Sis و زەیتوون Zéithoun و هادشین Hadchin و مەرەشی لێیە بەناو ڕەشماڵەکانیان سەفەر بکات کە لە مەترسی بەدەر نییە (ل. ١٢٠).

نووسەر لە سەفەرەکەی خۆیدا، کە نەیتوانیوە بچێتە ناوچەی زەیتون، بە ئاراستەی ئانازارب Anazarbe ڕۆیشتووە و گەیشتوونەتە نزیك کۆمەڵە ڕەشماڵێك کە پیاوانی ئیسکۆرتەکەی پێیان وتوە ئەوانە ئۆردووی کوردەکانی ئەفشارن، کە زۆرجار کاروانیان ڕووت کردۆتەوە و تالآنیان کردوون. یەکێك لە کوردەکان، کە دوو ئەفسەرەکەی ئێمەی بینیوە، چووە هۆزەکەی وریاکردۆتەوە. نزیکەی چل پیاو ڕێگەیان لێ گرتین، ئێمە ژمارەمان لە دوژمنەکانمان کەمتر بوو، بەڵام (پیاوانی ئێمە ) هەموویان چەکی چاکیان پێبوو و بڕێکیان دوو چەکیان پێبوو، کوردەکان کە چاویان بڕیبووە بارەکانمان دەیانویست بمانترسێنن بە زۆری ژمارەکەیان و مەبەستیان بوو لە پشتمانەوە بسووڕێنەوە . تەقە دەستی پێ کرد و زاپیتەکانمان وەڵامیان دانەوە. بۆترۆسی ئازا بە هەڵەشییەوە بەرەو پێشیان چوو و دەستی بە پریشکی چەکەکەی بریندار بوو و منیش قاچم بریندار بوو و سەرۆکی زاپیتەکانیش گوللەیەك بەر ملی کەوت. ئەو شەڕە تەقەیە دە دەقیقەیەکی خایاند و کوردەکان بینیان، کە ئێمە سوورین لەسەر ئەوەی بەرگریی لەخۆمان بکەین و بێهیوابوون لەوەی دەست بەسەر بارەکانماندا بگرن، گەڕانەوە بۆ ئۆردووەکانی خۆیان. چاومان لێبوو دوو

کەسیان کە گوللەی تفەنگەکانی ئێمە پێکابوونی، لە ئەسپەکانیان گلان، بەلام هاورێکانیان هەڵیان گرتنەوە

ڕاڕەوەکە کرایەوە و ڕێگەکە ئازاد بوو. بە ناو بێشەیەکدا کە لە پشتەوە ڕەشماڵی کوردەکانی دەشاردەوە، لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین. بیست دەقیقە دواتر (ئانازارب Anazarbe ) مان تێپەڕ کرد، و ژمارەیەك سوارە کە دەنگی تەقەکانیان گوێ لێ بووبوو، بە نیازبوون بە دەنگمانەوە بێن، ئەوانە تورکمانە ئازاکانی هۆزی بۆزداغان-ئۆغلو Bousdagan-oglu بوون، کە بەگەرمی پێشوازییان لێ کردین (ل. ١٣١-١٣٢).





باوکە ژاك ڕیتۆرێ

(١٨٤١-١٩٢١)

# سەرپۆتێك لەبارەی
# ژیان و بەرهەمەكانی "ژاك ڕیتۆریّ"وە
# ١٨٤١-١٩٢١

ڕیتۆری ژاك* لە ٢١ی ئاگستۆسی ١٨٤١ لە ئەسقەفیەی Boyges لە شاریتیّ-سوغ-لوار** لە فەرەنسا لەدایك بووە. لە نۆزدەساڵیدا چووەتە ناو ڕاهیبەكانی سانت- ماكسیمین. لە ١٩ ی تشرینی یەكەمی ١٨٦١ بووە بە دۆمینیكانی توولوز. لە ساڵی ١٨٦٥ كراوە بە سەردەستەی ڕاهیبەكان لە دێرەی مازیەر، وەك چۆن خۆی حەزی لەوە بووە خۆی بۆ كاری مسیۆنێری تەرخان بكات، هەر زوو بانگی دەكەن بۆ كلێسەی كۆربان كە باوكە جەندەل لەوكاتەدا خەریكی ئامادەكردنی چەند ئەركی مسیۆنێری بووە. لە ساڵی ١٨٧٤ بە هاوەڵی لیۆن، نوێنەری پاپا دەچێتە میزۆپۆتامیا و لە ١١ی ئاگستۆس دەگەنە میزۆپۆتامیا. سەرەتا وەكوو قەشە لە نشینگەی مار یەعقوب لە كوردستاندا ئاكنجی دەبێت. ڕیتۆری تاوەكوو ساڵی ١٨٧٩ هەر لە مار یەعقوب دەمێنێتەوە، لەویّ شارەزای زمان و ئەدەبی ئاسووری- كلدانی دەبێت و لە هەمان كاتدا قوتابخانەیەكی مسیۆنێریی فەرەنسی لە ناوچەكە بەڕێوە دەبات و لەناو ئاسوورییە چیاییەكاندا كار دەكات. ساڵی ١٨٧٩ بانگ دەكریّ بۆ مووسڵ لەبەر ئامادەنەبوونی باوكە دوڤال، ئەركی تەواوی مسیۆنی فەرەنسی بەڕێوە دەبات. هەر لەو ساڵەدا

---

* Rhétoré Jacque

** Charité-sur-Loire

گەشتەکەی لە مووسڵەوە بۆ ناوچەکانی ئەربیل (هەولێر)، کەرکووك و سلێمانی لە ١٧ی حوزەیران دا دەست پێکرد و ڕۆژی ١٧ی ئاگستۆس گەڕایەوە مووسڵ. دوای گەڕانەوەی پ. دوڤال لە ساڵی ١٨٨١ لەگەڵ دوپلان ڕەوانەی ناو ئەرمەنییەکانی وان دەکرێ و یەکەمین نشینگەی مسیۆنێریی لەوێ دەکاتەوە و تا ساڵی ١٨٩٣ هەر لەو نشینگەیەدا دەمێنێتەوە. لەم ماوەیەدا فێری هەردوو زمانی ئەرمەنی و تورکی دەبێت. وێرای نارەزا بوونێکی زۆر، کەچی توانی پارچە زەوییێکی بەرفراوان لە ناوچەکەدا بکڕێ و چەند ژووری لە تەنیشت یەکدا و باخچەیەکی نایابی لەسەر دروست کرد. ساڵی ١٨٩٣ لە لایەن فروهرێرس بانگ دەکرێ بۆ قودس و لەوێ لە قوتابخانەی تەوراتیدا، کە تازە کرابۆوە تا ساڵی ١٨٩٧ دەرسی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان دەڵێتەوە. دوای گەڕانەوەی ساڵی ١٨٩٧ دووبارە لە وان جێگیر دەبێتەوە. لە وان دووبارە دەستدەکاتەوە بە دروستکردنی نشینگە و نوێژخانە و سەرپەرشتی ئامادەکردنی کتێبی ئەو قوتابخانەیە دەکات، کە مسیۆنی فەرەنسی توانیبووی بیکاتەوە و هەروەها سەرۆکایەتیی فۆنداسیۆنێکی خوشکانی دۆمینیکانیشی دەکرد. لەم ماوەیەدا ئەرکی بڵاوکردنەوەی مسیۆنێکی تایبەتی پێسپێردرابوو لە ئێران و چەند ماوەیەکیش لە وێدا ماوەتەوە.

لە ساڵی ١٩٠٨ دووبارە بانگ کرایەوە بۆ کڵێسەی مار یەعقوب و نازناوی کەشیش وەردەگرێ. هەر زوو لە ئاشیتە لەناو جەرگەی ئاسورییەکان نشینگەیەك دەکاتەوە. لەم ماوەیەدا نەخۆشیەکی سەخت ناچاری دەکات بیگوزنەوە بۆ مووسڵ و خرایە ژێر چاودێریی پزیشکییەوە. ساڵی ١٩١٣ لە ئامادەنەبوونی بێرێ Berée دا بەڕێوەبردنی هەموو مسیۆنی فەرەنسایی لە ئەستۆ دەگرێ و دواتر ساڵی ١٩١٤ نوێنەرایەتیی مسیۆنێری* بە ئەستۆ دەگرێ.

---

* نوێنەرایەتیی مسیۆنێری: Délégation apostolique

له سالانی یەکەم جەنگی جیهانییدا لە مووسڵ گەواهی یەکەمین بێڕێزیی تورك دەدات دژ بە مسیۆنی فەرەنسی. لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا بە دیلیی لە چلەی زستانا لەگەڵ باوکە بێریێ و باوکە سیمۆن دووریان دەخەنەوە، یەکەمجار بۆ ماردین و ساڵی ١٩١٥ گەواهی قەتڵوعامی مەسیحییەکان دەدا؛ لەو بارەیەوە یادداشتنامەکانی، کە سالانی ١٩١٥-١٩١٦ نووسیونی سەرچاوەیەکی مێژوویی دەستی یەکەمی کەموێنەیە[1]. لە ماردین دەبوو بۆ دیاربەکر و دواتر بۆ خارپووت بگوازرێنەوە، کە ناوەندی عەسکەریی ناوچەکە بوو. ئەوان داوایان لە دەسەلاتدارانی ناوچەکە کردوووە ،کە تا داهاتنی ئاشتی هەر لەو ناوچەیەدا بمێننەوە. موتەسەریفی ماردین، حیلمی بەگ بۆیان تێدەکەوێ و لەسایەی دەخالەتی موتەسەریفدا بۆ ماوەی دوو ساڵ هەر لە ماردین دەمێننەوە و بەرهەمی مانەوەی لە ماردین ئەم یادداشتنامەیە، کە تاکوو ئێستە بە ئیتالی و فەرەنسی چاپ کراوە و وێنەیەکی کارەستباری قەتڵوعامی مەسیحییەکان لە ساڵی ١٩١٥-١٩١٦دا دەگێڕێتەوە. دواتر دووریان دەخەنە بۆ ئەنقەرە و دوایی بۆ ئیستەنبوڵ و مەنفا، کە بە ئاگربەستی تشرینی دووەمی ١٩١٨ کۆتایی دێت. ڕیتۆرێ تاوەکوو کۆتایی ساڵی ١٩١٩ هەر لە ئیستەنبوڵ دەمینێتەوە، سەرەتای ساڵی ١٩٢٠ دەگاتەوە مووسڵ و لە تەمەنی ٧٩ ساڵیدا هەر بەردەوامی کارکردن بۆ مسیۆنی فەرەنسی دەبێ، تا ڕۆژی ١٤ ی ئاداری ١٩٢١ لەناکاو لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە مووسڵ کۆچی دوایی دەکات، دوای ئەوەی شەست ساڵی ڕەبەقی لە نەزری ڕەهبانی ئایینی و چڵ و حەوتەمین ساڵی تەمەنی لە مسیۆنێریدا تەواو دەکات.

---

[1] دەستخەتی فەرەنسی ئەم یادداشتنامەیە ئێستە لە ئەرشیڤی پرۆڤانسی دۆمینیکان لە فەرەنسا پارێزراوە، چاپی ئەم یادداشتانە یەکەمجار بە ئیتالیایی (٢٠٠٠) و دواتر ساڵی (٢٠٠٥) بە فەرانسەیی بڵاوکرایەوە (وەرگێڕ).

باوکه ژاك ڕیتۆرێ ماوەی چل ساڵ لەناو ئاسوورییەکانی کوردستاندا کار دەکات و بە هەمان شێوە ئەرمەنی و کوردەکانیش بەشێکیان لەناو کارەکانیدا هەیە.

ژاك ڕیتۆری لە دوای خۆی کۆمەڵێك بەرهەمی ڕەسەنی بەجێهێشووە کە بەمە خزمەتێکی زۆری زانست و زانیاری کردووە. بە گوێرەی بەدوادچوونەکانی ئێمە ڕیتۆری ئەم بەرهەمە چاپکراوانەی لە دوای خۆیەوە بەجێهێشتووە:

1- "Une tournée apostolique (dans le diocèse de Zakho", Rapport daté de Mar-Yacoup (Kurdistan) le 24 mai 1876, et adressé au Très-Révérend Opère Duval, Pro-Préfet apostolique à Mossoul"[1] In *A.D*, n° 16, 1876, p.465-473; n° 17, 1877, p. 16-24.

2-"Voyage d'un missionnaire dans les provinces de Kerkouk et de Soleimanié de l'Empire turc"[2], In A.D, N° 233, novembre 1879 (19ᵉ année), (pp.490-493), N° 234, decembre 1879, (19ᵉ année), (pp 540-545); 1880 (pp: 207-210; pp: 353-367).

3- "La famine en Mésopotamie et dans le Kurdistan", In A.D, 1880, p. 159-165.

4- "Mission d'Arménie: Van", In A.D, n° 260, 1882, p.58-64.

5-"Rapport sur les nestoriens des monts Hakkâri", In A.P.F, t.LV, n°330, septembre 1883, p.283-308.

---

[1] هەمان وتار بە کەمێك کورتکردنەوە لە گۆواری A.P.F ژمارە ٤٨ی ساڵی ١٨٧٨، لا: ٤٠٦-٤٢٦دا دوبارە بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ).

[2] ئەمەیان ئەم بەشەیە، کە لەم کتێبەی بەردەستاندا کراوە بە کوردی (وەرگێڕ).

6-"Chronique de nos Missions: lettre d'un missionnaire de Mossoul", Lettres datées d'Achitha le 1 ère novembre, le 4 decembre, 21 décembre et 28 décembre 1908" In A.D, n° 49, octobre 1909, p. 439-441.

7-"Chronique de nos Missions: lettre d'un missionnaire de Mossoul: Lettre datée d'Achitha le 6 décembre 1909 et extrait d'un Rapport à Mgr Charmetan", In A.D, n° 50, 1910, p. 260-266.

8-Grammaire de la langue soureth, ou chaldéen vulgaire selon le dialecte de la plaine de Mossoul et des pays adjacents[1], Mossoul : Imprimerie des pères dominicains, 1912, (276p).

9-Una finestra sul massacro: documenti inediti sulla strage degli armeni,1915-1916[2]; [a cura di] Marco Impagliazzo, Milano : Guerini e associati, 2000, (254 p)

10-Les chrétiens aux bêtes : souvenirs de la guerre sainte proclamée *par les Turcs contre les chrétiens en 1915*, préface par Jean-Pierre Péroncel-Hugoz ; étude et présentation du document par Joseph Alichoran, Paris : Cerf, 2005, (397).

---

[1] به گوێرەی توێژەر Alichoran دەستنووسی ئەم کتێبە کە ئێستە لە ئەرشیڤی پرۆڤانس لە فەرەنسا هەڵگیراوە و چەند شوێنێکی لێفەوتاوە و مێژووی ساڵی ١٩١١ی ئاشیتەی بەسەرەوەیە لەم کتێبە چاپکراوە زۆر پوختە تر و تەواو ترە، بڕوانە ...Les Chrétiens لا: ٣٨٢.

[2] ئەمەیان وەرگێڕاوی ئیتالیایی یادداشتەکانی ساڵی ١٩١٥-١٩١٦ی نووسەرە، (وەرگێڕ).

## سەرچاوەکان

1-G.Galland, O.P, Figures dominiciane contemporaines: VII Le R.P. Jacques Rhétoré, In "A.D", LVI-LVII, 1920-1921, pp. 201-213.

4-Les chrétiens aux bêtes : souvenirs de la guerre sainte proclamée par les Turcs contre les *chrétiens en 1915*, préface par Jean-Pierre Péroncel-Hugoz ; étude et présentation du document par Joseph Alichoran, Paris : Cerf, 2005.

## کورتکراوەکان:

L'Année Dominaicane : A.D

Annales de la Propagation de la foi : A.P.F

le bon Dieu qui nous éprouve, nous fortifie aussi et ne nous laisse que la pensée de continuer simplement sans nous plaindre, et le désir de nous dévouer pour suppléer au zèle de ceux qui nous manquent, en attendant que nous nous remettions peu à peu de cette secousse si peu attendue. Nous restons seulement surpris de ce que, la ville de Mossoul étant réputée la plus saine de toute la Mésopotamie, et l'état général de nos santés étant habituellement très-bon, il faille si peu de chose pour enlever un homme d'une manière aussi impitoyable. Heureusement que le travail étant grand ici et amenant parfois les religieux à outrepasser leurs forces, on peut dire de chacun de nos regrettés défunts, qu'il est mort à la tâche et à la peine, et c'est là le meilleur éloge que puisse mériter un missionnaire catholique.

Cher Père, j'ai laissé aller ma plume à vous dire ce qui pouvait intéresser nos Frères de France sur la mort de notre cher P. Aubry : puissiez-vous en tirer quelques lignes pour les édifier sur les épreuves de notre chère Mission.

Adieu, cher ami, priez pour moi et croyez-moi, tout vôtre en Notre-Seigneur.

F. Henri ALTMAYER,
des Fr.-Prêch.

## VOYAGE D'UN MISSIONNAIRE

### DANS LES PROVINCES DE KERKOUK ET DE SOLIMANIE DE L'EMPIRE TURC.

### I.

*De Mossoul à Ervil.— Le Zab.—Ervil.—Aincawa et sa chrétienté.*

Je partis de Mossoul le 17 juin. Le pacha m'avait délivré un sauf-conduit conçu dans les termes les plus favorables et qui devait me servir auprès des autorités que je trouverais sur mon parcours. Pour voyager avec plus de sécurité, je m'étais uni à une caravane se rendant à Ervil. Toutes les routes étaient alors remplies de voleurs, qui, profitant des embarras du gouvernement à la suite de la guerre turco-russe, rançonnaient et dévalisaient impunément les voyageurs. Dès notre première halte, ils nous mirent à contri-

## ١

# له مووسڵەوە بۆ ئەربیل- زاب- ئەربیل - عەنکاوە و مەسیحییەکانی

ڕۆژی ١٧ی حوزەیران لە مووسڵ وەدەرکەوتم. پاشا پسوولەیەکی گوزەرنامەی بۆ کردبووم، کە بەشێوەیەکی تەواو دۆستانە نووسرابوو و دەبوو لەلایەن ئەو دەسەڵاتدارانەی کە لەسەر ڕێگە تووشیان دەبووم، بەکەڵکم بێت. بۆ ئەوەی زیاتر بە دڵنیایی سەفەر بکەم، بەگەڵ کاروانێك کەوتم، کە دەچوو بۆ ئەربیل. لەم سەروبەندانەدا هەموو ڕێگەکان پڕ بوون لە جەردە، ئەوانە دەرفەتی گیرگرفتی حوکوومەتیان قۆزتبۆوە لە دوای جەنگی تورکیا- ڕووسیا*، بە فێڵ

* جەنگی ڕووسیا- تورکیا ١٨٧٧-١٨٧٨: ئەم جەنگە دەرئەنجامی یەکەمین هەوڵدانی بزووتنەوەی پان- سلافیزم بوو، کە ڕێگەی بۆ ئیمپراتۆریای ڕووسیا خۆش کرد بۆ ئازادی گەلانی سلاڤ لەژێردەستەیی تورك تێبکەوێ. بزووتنەوە و ڕابوونی گەلانی بۆسنیا و هەرزەگۆڤینیا ساڵی ١٨٧٥ و دواتر شۆڕشی بولگارستان لە نیسانی ١٨٧٦ کە زیاتر لە ١٥٠٠٠ بولگار بە دەستی سوپای عوسمانی قەتڵوعام کران، دەنگی ناڕەزایی لە هەموو ئەورووپا بەرزبۆوە لە بەریتانیا ولیام گلادستۆن و لە فەرەنسا ڤیکتۆر هۆگۆ بەگەرمی ناڕەزاییان دەربڕی. لە کۆنفرەنسی ئیستەنبووڵ کە ڕووسیا، بەریتانیای فەخیمە و نەمسا بەشداربوون، داوای ئۆتۆنۆمی یان بۆ مەسیحییەکان کرد. دواتر تەنگژەی نێوان ڕووسیا و تورکیا بەرەو جەنگ ڕۆیشتن و ڕووسیا لە دوو بەرەوە پەلاماری ئیمپراتۆریای عوسمانی دا: بەرەی قەوقاز و بەرەی بالقان. سوپای عوسمانی لە

پارەیان وەردەگرت و بڕێ‌ڕەحمانە گەشتیارەکانیان ڕووت دەکردنەوە. لە یەکەم وچانماندا، شەوەکەی بە دزینی پێنج چارەوێی کاروانەکەمان، باجی خۆیان لێ وەرگرتین. من خۆشحاڵم بووم بەوەی نەبووم بە قوربانیی جەربەزەییان، چونکە وڵاخەکانم لە هەمان ئەو گۆڕەپانە بوون، کە دزییەکەی تێدا کرا بوو. هەشت سەعات دوور لە مووسڵ ڕووباری جوانی خازر Khazer مان بڕی و دوو کاتژمێر دواتر گەیشتینە لێواری زێی گەورە Grand-Zab.

ئەم ڕووبارە لە کۆندا بە ناوی لیکیوس* ناسراوە کە پێدەشتی ئەربیل دیاری دەکات، کە بۆ هەمیشە بە سەرکەوتنی ئەسکەندەری گەورە بەسەر پاشای فارس، داریۆش دا لەو شارەدا، دەناسرێتەوە. زێی گەورە لەناو بەرزایی چیاکانی کوردستانی سەروو هەڵدەقوولێ ولەوێوەوە بە تاو دەرژێتە ناو ڕووباری دیجلە، کە لەوێوەوە بە ڕۆژەڕێیەك لە لای مووسڵەوە تێکەڵی دەبێت. ناوەکەی کە لە عەرەبی و یۆنانی دا واتەی گورگ دەگەیەنێ، لەوەوە هاتووە کە ئاوەکەی تیژڕۆیە و هەموو شتێك لەسەرە ڕێگەی خۆیدا ڕادەماڵێ و لە گەلە گورگی پەلاماردەر دەچێ.

ئێمە لەسەر شێوەی دابی وڵاتەکە، واتە لەناو جۆرە کەشتییەکی نوح لەم ڕووبارە ترسناکە پەڕینەوە، کە مرۆڤ و بارەکانیان پێکەوە تێکەڵ و

---

کۆتایی شەرەکە ئەوها تێکشکا، کە ئیدی گرتنی ئیستەنبووڵ یش چاوەڕوانکراو بوو ئەگەر هاوکێشە نێودەوڵەتییەکان ڕێگەیان بدابوایە. عوسمانییەکان لە ٣ ی ئاداری ١٨٧٨ پەیماننامەی سان ستیفانۆ یان لەگەڵ ڕووسیا مۆرکرد. ئەنجامەکانی ئەم جەنگە بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانی هێندە کارەستبار بوو، کە دەسەڵاتی عوسمانی بە فیعلی تەنیا لە ئیستەنبووڵ گیری خوارد بوو (وەرگێڕ).

* Lycus: ئەم ڕووبارە بە یۆنانی کۆن پێی دەڵێن Lykos و بە لاتینی Lycus، بە کوردیی (زێی گەورە) و بە عەرەبی (الزاب الاعلی)ی پێ دەڵێن (وەرگێڕ).

کەڵەکە بووبووین، وڵاخەکانمان بە کەڵەك کە ڕادەکێشران، بەشوێنمانەوە بوون.

لەولای دیکە، لەسەر کەناری ڕووبارێکی زۆر درێژبۆوە، ئاوایی زیوە*ی لێیە، کە کوردە ئێزیدییەکان Jézidis یا شەیتان پەرستەکانی لێن. کاروانەکەمان سپێدەی ڕۆژی ١٨ی حوزەیران وەستا و ئێوارە لەگەڵ خۆر ئاوابوون، بەڕێ کەوتەوە. ئێمە لە دەشتاییەکانی ئەربیلدا بووین، خەیاڵم دووبارە ئەم پێدەشتە پان و بەرینەی سوپای جەنگاوەریی دەهێنایە بەرچاوان و لەوە تێدەفکریم چۆن دواجار خەڵکی لەگەڵ شکۆیەکانیاندا دەڕۆن و چۆن هەر تەنیا خوداوەند بەتاك و تەنیا دەمێنێتەوە. بەدوای ئەوەدا دەگەڕام ئەم خەونانەی ڕابووردوو درێژبکەمەوە، بۆ ئەوەی خۆم لەم شەکەتییە ببوێرم، کە بەدەست ئەو ڕێگە سەختە و هەڵبەز و دابەزی وڵاخەکەمەوە تووشی بووبووم. وێڕای ئەوە ماندوو و شەکەت هەر گەیشتمە ئەربیل. پەلەم کرد بچم شوێنێك لە خان بدۆزمەوە بۆ ئەوەی تێیدا بحەسێمەوە، تا ئەو کاتەی چاوەڕێی کاروانێکی دیکە بکەم، کە بۆ کەرکووك بچێت. بەڵام هێندە ماندووبووم دەبوو واز لەوە بێنم بۆ ئەو دەمە دوورتر بڕۆم و بە پێزانینیەوە داوای چەند مەسیحیێکی عەنکاوەم قەبووڵ کرد، بۆ ئەوەی بچم لە لای ئەوان بحەسێمەوە. عەنکاوە Aïncawa تەنیا نیو کاتژمێر لە ئەربیلەوە دوورە. بەڵام پێش ئەوەی ئەم شارە ناودارە کەونارایە بەجێبهێڵم، ڕێگەم بدەن با پێتان بڵێم ڕەوشی ئێستەی شارەکە چۆنە.

ئەرڤیل** یا ئەربیل، ئەربیلای کۆن، ئەمڕۆ هێشتا لەسەر هەمان شوێنی کەونارای شاری ئاشوورییە. شارەکە کەوتۆتە سەر بەرزایی "گردێك" کە بە

* Zaoua

** Ervil

شێوەیەکی ڕێکوپێك بە دەستی مرۆ دروست کراوە و لەوێوەوە بە شکۆوە بەسەر تەواوی پێدەشتەکەدا دەڕوانێ. دواتر بە تێپەڕبوونی کات، خەڵکەکان هاتوون لە بن پاڵی گردەکە خڕبوونەتەوە و ئەوە وای کردووە کە شارە نوێیەکە لە دوو بەش پێك بێ، قەلا یان بەرزە شار کە بەڕێوەبەر و بنەماڵە کۆنەکانی تێدا دەژین و نزمە شار، کە "کورتەك"**ی پێدەڵێن و بە شێوەیەکی بنچینەیی بریتین لە بازرگانەکان. لەبەر هەڵکەوتەی شوێنە تۆپۆگرافییەکەی، لەنێوان پێدەشت و چیادا، ئەربیل بڕێك بایەخی بازرگانیی پاراستووە.، کورد، تورکمان و عەرەب بە کاروانی بەردەوام دەگەنە شارەکە و بەرهەمەکانیان بۆ فرۆشتن دەهێنن بۆ شارەکە، یان بەرامبەر بە کاڵای خۆراکی دیکە دەیگۆڕنەوە. بێجگە لە چەند بنەماڵەیەکی جوولەکە، خەڵکەکە هەموویان موسڵمانن و دەشێ دانیشتوانەکەی بگاتە دوانزە تا پانزە هەزار کەس. موسڵمانەکان بە تورکییێکی- شێواو قسە دەکەن، جوولەکەکان بە کلدانی بازاڕیی قسە دەکەن، کە زمانی هاوبەشە لەگەڵ مەسیحییەکانی هەموو کوردستاندا.

تاقە مەسیحییەک چییە لە ئەربیل ناژی، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم شارە لە دەورانی کۆندا مەسیحیی تێدا ژیاوە و شوێنی نیشتەنی مەترانێکی کاتۆلیکی بووە. خەڵکە مەسیحییەکە، چەوساوە و لە بەشمەینەتییێکی بەردەوامدا بوون لەم هەرێمەدا، ماوەیەکی درێژ دەبێت وازیان لەم شارە هێناوە بۆ ئەوەی زۆر دوورنا، لە شوێنکدا گردببنەوە کە ئەمڕۆ ئاوایی عەنکاوەی کلدانییەکانە.

خۆشنوود بووم کە بەخششی خوادوەند ناچاری کردم لەم شوێنە گرینگەی مەسیحایەتی وچان بدەم، کە من بۆ خۆم وام دانابوو تەنیا لەکاتی گەڕانەوەمدا سەردانی بکەم. بەداخەوە لاباڵی جیابووەوە کە نەتەوەی کلدانییەکانی دابەش کردووە لەناو ئەم خەڵکە کاری کردووە. بەم شێوەیە

---

** *Kotrak*

لەجیاتی ئەوەی بەخێرهاتنم بکەن، وەکوو گومانلێکراوێك وەریان گرتم. بانگەشەی ئەوەیان کرد کە من نیازی بەلاتینیزەکردنی ئاواییەکەم هەبێ. گومڕایی بێناو! لە هەموو لایەکەوە دەنگی نارەزایی بەرزبۆوە. (هاوڕێکانم، رۆژێکیان من پێم گوتن، ئێمە ئەگەر بمانەوێ کلدانییەکان لاتینیزە بکەین، ئەوا پارە بە مامۆستای گوندەکانیان نادەین تا زمان و وێردی ئایینی مەسیحیی تایبەت بە نەتەوەی خۆیان بلێنەوە. ئەوەی ئێمە لە ئێوەمان دەوێ، ئەوەیە کە مەسیحی خاوەن باوەڕ و سەرڕاست بن لەگەڵ کڵێسەی پیرۆز، ئەوە بەلای ئێمەوە گرنگ نییە، کە ئێوە عەقیدەی ئایینیتان بە لاتینی بێ یا بە کلدانی. بڕوا بکەن، ئەگەر کلێسە دایکی هەمووومان، ببینێ ئێمە ئامانجێکی دیکەی بەدەر لە پیرۆزیکردنی رۆحی ئێوە لە کۆششی ئێمەدایە، ئەوا یەکەم کەس دەبێت سزامان دەدات). ئەم قسانە وا پێدەچوو رۆحەکانی هێور کردەوە، بەڵام لە هەمان رۆژدا نامەیەك لە مووسڵەوە لە جیابووەوەکان هاتبوو، کە تێیدا وتبووی: (فەرەنسییەکان بە قسەی ڕیاکارانە هەڵخەڵەتێنەرن، وریایان بن، ئەو کاتەی قسەتان بۆ دەکەن خێر بکەن). شەیتان بۆ خۆی ناتوانێ لەمە زیاتر لێزانانەتر قسە بکات. لە نوێوەوە ڕیسەکەم بوو بە خوری و دیسان کەوتمەوە بەر دیدەی گومان.

هەڵبەت، بەداخەوەم کە نەمتوانی کار لەم خەڵکە بکەم، چونکە بۆم دەرکەوت بڕێك حەماسەیان تێدا بوو بۆ پراکتیکردنی ئایینی، ئەوەی کە بەداخەوە بەرەبەرە لەناو نەتەوەی کلداندا کەم دەبێتەوە، بە تایبەتی لەوەتەی ئەو جیابوونەوەیەوە ناوچەکەی کردۆتە بیابان. هەموو رۆژ ژمارەیەکی زۆری بەشداری نەریتی ئایینی پیرۆزم دەبینی، زۆر کەسیان خۆیان لە قوربانی پیرۆز نزیك دەکردەوە و یەکشەمموان کڵێسە لە هامشۆکەرانی ئایینی پیرۆز چۆڵ نەدەبوو و منیش بە سیفەتی نوماینەدەی سانت دۆمینیکان، بەتەواوی بەوە خۆشنوود دەبووم، کە دەمبینین لەناو هەموو ئەم پراتیکانەدا سانت ڕۆسێر

کیتابی هاوبەشی نوێژکردن بوو، چ بە شێوەیەکی تایبەت و چ بە شێوەیەکی گشتی. شاژنە قەدیسی ڕۆسێری زۆر پیرۆز ئەم خەڵکە داماوە لە گومڕایی خۆیان ڕزگار دەکات و منیش هیواخواز بووم و کاتێ باسی نوێژە پیرۆزەکانیانم بیست، هیوای ئەوەم بۆ دەخواستن.

شەش قەشە ئەم مەسیحییانە بەڕێوە دەبەن کە بریتین لە دووسەد و پەنجا بنەماڵە. قوتابخانەی کوڕان و قوتابخانەی کچانی لێیە. زۆرینەی خەڵکی عەنکاوە جووتیارن، دەستی کارامەیان باشترین بەشی پێدەشتی ئەربیل بەرهەم دەهێنن و ئاواییەکەیان بووەتە کۆگەی وڵات.

## ٢

# له عه‌نكاوه بۆ كه‌ركووك- زێی بچووك -ئاڵتوون كۆپری- شار و مه‌سیحیایه‌تیی كه‌ركووك

له كۆتایی پێنج ڕۆژدا، له سایه‌ی چاكه‌ی قه‌شه ئه‌لیاس، كه میوانداریی كردم ته‌واو ماندوویێتیم حه‌سابۆوه. به‌وه‌ی كه هیچ كارێكم له‌ناو ئه‌م دانیشتوانه‌دا نه‌بوو، كه پێشوازییان لێ نه‌كردم، ته‌نیا ئه‌وه‌م له‌سه‌ر مابوو، كه ملی ڕێگه‌كه‌م بگرمه به‌ر. كاتی مانه‌وه‌م له عه‌نكاوه، دوو كاروان له ده‌وروبه‌ری ڕووت كرابوونه‌وه، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا متمانه به پشتیوانی خودایی، دوودڵ نه‌بووم له‌وه‌ی خۆم به‌گه‌ڵ كاروانێك بده‌م كه بۆ كه‌ركووك ده‌چوو. ئه‌وه‌یان ئێواره‌ی ٢٤ی حوزه‌یران بوو. دوای سێزده كاتژمێر ڕۆیشتن گه‌یشتینه ئاڵتوون كۆپری Altoun- Kupri، پردی زێرین le Pont-d'Or ، ئاواییه‌كی موسڵمان، كه به‌م شێوه‌یه به‌هۆی پردێكی كه‌ونارای زۆر جوان دروستكراو ئاوا ناویان ناوه. به‌ڵام ئه‌مڕۆ زۆری تێكچووه، ئه‌م پرده كه‌وتۆته ئه‌م شوێنه له‌سه‌ر ڕووبارێك كه پێی ده‌ڵێن زێی بچووك. له‌وێ ماسیی فره گه‌وره ڕاو ده‌كه‌ن، كه له مووسڵ پێی ده‌ڵێن ماسی تۆبی* ، تێده‌گه‌م كه ماسییه تۆبییه بچووكه‌كان زاره‌ترك بووبوون، چونكه گه‌وره‌ییه‌كه‌ی ماسییه تۆبییه‌كان به‌جۆرێک بوو به‌قه‌د

---

* *poisson de tobi*

باری کەرێك قوورس دەبوو. من خۆم یەکێکم بینی لە تەنکەی ڕووبارەکەدا بوو، سەرەتا بە قەدی درەختێك کە بە ڕێکەوت لەوناوەدا کەوتبووە، هەڵمگرتەوە.

لە ئاڵتوون کۆپری بە دە کاتژمێر گەیشتینە کەرکووك، ڕێگەم بدەن با ڕووداوێکی ئاکنج بوونی خۆمتان لەم شارەدا بۆ بگێڕمەوە. کاتژمێر دووی بەیانی بوو وەختایەك چوومە ناو شارەکە، چونکە نەمدەویست بەو ناوەختە، مەتران، کە دەبوو لای ئەو بمێنمەوە، جاڕس بکەم، چووم لە دەرگەی خانێکم دا. ڕەتیان کردەوە دەرگەم لێ بکەنەوە. چووم بۆ لای خانێکی دیکە، هەمان وەڵام. خۆم ئامادە کرد لەسەر تەختەبەندێك کە لەناو کۆڵانەکە بەجێ هێڵدرا بوو، بخەوم، وەختایەك بینیم خاوەنەکەی هات و لەسەر تەختەبەندەکە دەریکردم. بۆ ئەوەی کەس جاڕس نەکەم و بە ئیسراحەتی خۆم پاڵ بدەمەوە، چونکە لەو دوو قۆناغە بەزۆرەی کە لە عەنکاوەوە بڕیبوومان، زۆر شەکەت بوو بووم، بۆیە قاڵیەکەم لە سوچێکی کۆڵانەکەدا ڕاخست و دەمودەست لێی ڕاکشام. وەك کەسێکی زۆر بەختیار نوستبووم، پاش تاوێک تێپەڕینی ڕەوە حوشترێك بەناو ئەو کۆڵانەی کە منی تێدا خەوتبووم، ناچاریان کردم لەوێش هەڵبەقەنێم. ئەوکاتە هەستم کرد دوو سەرپێچ kafiés ، کە لە ڕێگە سەرم پێ بەستبوونەوە، ون بوون و بۆم دەرکەوت ئەو دوو زاپیتەی (ژەندارمە)، کە منیان لە ئاڵتوون کۆپرییەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنا، دزیبوویانن! کەوایە درووود بۆ سوڵتان بۆ ئەم بیرۆکە درووستەی، کە تازە دەستی بە چاکسازی کردووە لە ژاندرمەری ئیمپراتۆریاکەیدا، بە دانانی پیاوەیلی دڵسۆز، گەشتیارانی هەژار سوپاسگوزارێکی هەمیشەیی سوڵتان دەبن، چونکە ژەندەرمەکانی ئەمرۆ لە ترسناکترین دزەکانن.

ڕۆژەکانی هەوەڵ بەختم خراپ بوو، بەڵام دواتر بە زیادەوە تۆڵەم بۆ کرایەوە. بە موحیبەتێکی تەواو باوکانە لەلایەن پیرە مەتران، مۆنسەنیۆر Monseigneur یۆحەننا و مەسیحییەکانی دیکەی وەك ئەو بە چاکترین شێوە پێشوازییان لێ کردم. لەوێ جیهانێکی مەسیحی هەرە بەهێزی خوداپەرستیم بینی، ڕۆحانیەتی یەکگرتوویی، حەماسەتخواز بۆ پراتیکیکردنی ئایین، ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی بۆ مەترانی پیرۆز. جیاوازخوازی بەشوێن ئەوەدا گەڕاوە ئەوانیش دابەش بکات، بەڵام لەبەرامبەر سادەیی ئایینی ئەم خەڵکە میهرەبانە مەسیحییە و وریایی قەشەکەیاندا سەرنەکەوتووە.

باوەڕی ئایینی مەسیحییەکانی کەرکوك بەرودوا لە ڕاگرتنی کڵێسەکەیاندا بوو، کە وێرای هەژاریی کڵێسەکە، کەچی پاك و تەمیز و لێزانانە ڕازابۆوە. جاران تاجی زێڕ و زیو کە بە نەزر پێیان درابوو، دیکۆری سەری مریەم و پیرۆزەکانی ڕازاندبۆوە، بەڵام ئەم دەوڵەمەندییە هەمیشە جێگەی مەترسییە لەناو کڵێسەی مەسیحییەکان. ساڵێك دەبێت، لە شەوێکدا، هەموویان بە کاسەکانەوە، بە جلوبەرگی قەشە و شتە گرانبەهاکانی دیکەشەوە، دزران.

کۆمەڵگەی مەسیحییەکانی کەرکوك لەناو شارەکەدا پەنجاماڵێك و لە دەروبەری (قۆریە Coria)ش بیست بنەماڵەیەك دەبن. ئەم گرۆ بچکۆلانەیە لەناو دەوربەرێکی سی هەزار کەسیدا ون بووە. لەم ژمارەیە، کۆمەڵگەی جوولەکە نزیکەی دووسەد ماڵ دەبێت، ئەوانی دیکە موسڵمانن. بەڵام ئێمە شادمانین کە دەبینین وێڕای هەمەچەشنەیی ئایینەکان، کەچی خەڵکەکە لەناو هارمۆنییەکی باشدا پێکەوە دەژین. موسڵمانەکان هەر وەکوو مەسیحییەکان بە قەشە دەڵێن وەستا Oustha، واتە سەردار Maître، پیرە مەتران évêque بەگشتی ڕێز لێگیراوە. من ئەوە تەواو سەراسیمەی کردم کە بینیم هاوسێ موسڵمانەکان

وەك باوكێك مامەڵەی لەگەڵ دەكەن و بە هەموو بڕوایەكیانەوە جیاوازیەكانیان خستۆتە خزمەتی بڕیاری ئەو.

بێجگە لە مەتران، دوو قەشە مەسیحییەكانی شارەكە و یەكێكیش مەسیحییەكانی دەوروبەری قۆریە بەڕێوە دەبەن. لەناو شاردا قوتابخانەیەكی كوڕان هەیە كە لەلایەن مسیۆنی تەبشیرییەوە پشتیوانی دەكرێ و منداڵەكان تێیدا فێری نوێژ، عەقیدەی مەسیحیایەتی، خوێندنەوە و نووسینی كلدانی دەكرێن. ئەمە بۆ شارێكی وەك كەركووك شتێكی بنچینەییە و ئەوەی بەتایبەتی جێگەی تووڕەییە ئەوەیە كە بۆ خوێندنەوە و نووسینی توركی كە زمانی هاوبەشی تەواوی دانیشتوانی شارەكەیە، منداڵەكان ناچارن بچن لە لای مەلایەكان لە مزگەوت دەرس بخوێنن. هەرچی كچەكانیشن، لەناو نەزانییەكی تەواودا پشتگوێ خراون.

چەندە ئەم مەسیحییە چاكانەی كەركووك لێمان پاڕانەوە بۆ ئەوەی ئێمە گرینگیان پێ بدەین بۆ ڕێنوێنیكردنی منداڵەكانیان و بۆ كەسانی دیكە كە وا پێدەچێ بۆیان بەسوود بێت. دەبێت لەناو ئەوانەدا فۆنداسیۆنێكی مسیۆنێری و خوشكان دابمەزرێت. بەڵام ئەوەندە ناوچەی دیكەی گرینگ داوای ئالیكاریی ئێمە دەكات و ئێمەش ئەوەندە كارمەندمان نییە بۆ ئەو شوێنە بەربڵاوەی كە پێمان سپێردراوە!

كەركووك لە ساڵنامە مەسیحییەكانی یەكەم سەدەی مەسیحیایەتیدا بەناوبانگە. هەزاران شەهید خوێنی خۆیان ڕشتووە بۆ ئایین لەژێر چەوساندنەوەی فارسەكان. ئەمڕۆ ئێستاكەشی لەگەڵدا بێ كەركووك، شاری كڵێسەی مار-تامازغەر Mar -Tamazghar، كە لەسایەی دەورانی كۆنستەنتینندا دروست كراوە، بەگوێرەی گێڕانەوەكان بەشێكی شوێنەوارە گرانبەهایەكانی پاراستووە.

جگە لەو پاشماوە پیرۆزە، کەرکووك شتی پیرۆزتری بەهەمان شێوە گرانبەها لەخۆ گرتووە، ئەگەر بڕوا بە گێڕانەوەکانی وڵاتەکە بکەین. ئەوانە برییتن لە جەستەی سێ گەنجەکە کە فڕێ دراونەتە ناو توون: ئەننانی Ananie، ئازەری Azarie و میزایل Misaël. ئەم ئێسکوپرووسکانە لەناو مزگەوتێکدا نێژراون کە موسڵمانەکان و جوولەکەکان یەکجار لە ساڵێکدا زیارەتیان دەکەن.

کەرکووك، بە هەمان شێوەی ئەربیل Ervil، لەسەر گردێکی ئاشووری بنیات نراوە، لەوێش شارەکە دابەشی سەر قەڵا یا بەرزەشار و نزمەشار بووە. ئاوی زۆر ڕێگەی پێ داون باخچەی گەلێك جوان دروست بکەن، کە هەموو درەختە گەرمەسێرییەکانی تێدا دەبێت: دارپرتەقاڵ، دارهەنار، لیمۆ، دارخورما. لەگەڵ گوڵاو کە ئاوێکی بۆندارە وەک عادەت وایە بەسەر و جلوبەرگی ئەو کەسانەیدا دەپرژێنن کە هاتوون سەردانیان بکەن. وێرای ئەوەی لەوەی بەغدا کەمتر گەشە دەکات، دارخورما دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بەشێوەیەك لە هەموو ماڵێکی نزمە شاردا ڕواوە و دەبینین سەری شکۆی بەرز کردۆتەوە و بە هێشووی گەورە تێکەڵی منارە و گومەزی مزگەوتەکان دەبێت، ئەوەی کە دیمەنێکی دڵڕفێن و ڕەنگێکی تەواو ڕۆژهەڵاتیانەی بە شارەکە بەخشیوە.

شارەکە وا پێدەچێ لەسەر زەوییێکی گڕکانیی دروست کرابێ. لە دەورەی شوورەکانی شارەکە، لە دەوروبەری ئەو گردانەی کە لەنزیك شارەکەن، لە شەقارەکانی زەوییەکەدا، لە زۆر جێگەدا ئاگرێکی شینباوی لێ بەرز دەبێتەوە، کە بە زمانی بازاڕی پێی دەڵێن بابە گوڕگوڕBaba gourgour. لە یەك کاتژمێری شارەکە و لەسەر ڕێگەی ئاڵتوون کۆپری، سەرچاوەکانی نەوتی لێیە، کە گەلێك زۆرە و لە کۆندا لە لایەن زەینەفۆنەوە ناوی براوە. ئەم نەوتانە هەر بە دەرنەکراوی ماونەتەوە. لە ناوەڕاستی ئەم چاوگە [نەوتانەدا، وەرگێڕ] جۆگەلە ئاوێکی ڕوونی هەڵدەقووڵێ کە ئاژەڵەکان بە هەڵپە لێی دەخۆنەوە. بە گوێرەی

ئەو تێبینیانەی ئێمە کردمان، ئاوەکە زوو قەڵەویان دەکات. هاوشارییەکان لایان وایە ئەم ئاوە چارەسەرێکی چاکە بۆ بڕێك نەخۆشیی پێست.

ماوەی پانزە ڕۆژی مانەوەم، بە پێشوازیی گەرم و دڵاوایی مەسیحییەکانی کەرکووك خۆشنوود بووم، کە ئەگەر بە ویستی خۆم بوایە هەر لەوێ دەمامەوە، بەڵام شوێنی دیکەی کڵێسەی خودایی بانگەوازیان لێ دەکردم. نەمزانی چۆن چاکەی ئەو پێشوازییە بەخشندانەیە بدەمەوە کە لێیان کردم.، بێگومان ئەوە ژنە کرێکارەکانی پاریس بوون کە یاریدەیان دام ئەم ئەرکەی پێزانینە بە ئەستۆ گرم. من لەگەڵ خۆمدا باوڵێکی ڕازانەوەی نەخش و نیگار و پەڕۆی سپی (تەوەرك)ی کڵێسەم پێ بوو، کە بە دەستی خێرخوازانەیان ئامادە کرابوو، دابەشم کرد بۆ ئەوەی هەموو ئەو بەخششە، کە بۆ کاتێدراڵ و ئەسقەفیەکەی نێردرا بوو، بدەمە دەست مەترانی پیرۆزی خانەخوێیەکەم.

## ٣

# ڕێگەی سلێمانی- هۆزی هەمەوەند

٩ی تەمموز ماڵئاواییم لە شاری ئازیزی کەرکوك کرد و لەگەڵ کاروانێکدا کە بۆ سلێمانی دەچوو، بەڕێکەوتم. دەبوو بەناو هۆزی گەورەی هەمەوەندەکاندا تێپەڕ بین کە هەموودەم بە ڕاوڕووتکەر ناسراون. بەگوێرەی ئەوەی بیستبووم و بۆمیان گێڕابۆوە، دەبوو بڕیار بدەم ئەگەر بمەوێ تەواو دڵنیابم.

بەشێوەیەکی گشتی، هەمەوەندەکان Amawandes تەنیا لەسەر ئەو دەستکەوتانە دەژین کە لە گەشتیارەکانی دەسەنن و کارکردن لای ئەوان مایەی شەرمەزارییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك دەڵێن شەهامەتی ئەوەیان هەیە پەلاماری ڕێبواری تاك و تەنیا نادەن، بەڵکوو تەنیا پەلاماری کاروانەکان دەدەن. ژن و منداڵەکانیش دێن بۆ دەستکەوت و هەموویان دەبێت شێوازی پەلامار و ئاڕاستەی شەڕکردن بزانن. هەمەوەندی چاك، وەك دەڵێن لەبەردەم خوداوەندا شەرافەتمەند نابێ ئەگەر شوێنی چەند برینێك بەسەر جەستەیەوە نەبێ کە لە شەڕدا بریندار بووبێ. قوربەسەر ئەو کەسەیە کە بەر لەوەی ئەو نیشانەی ئازایەتییەی پێوە بێ، مەرگ پەلاماری بدات، بەڵام ئەگەر لەناو کۆمەڵێك دۆست و یاردا بمرێ، ئەوا ئەوانە ئەوە لەدەست نادەن هەوڵێکی خێرخوازانەی بۆ بدەن بەوەی خەنجەرەکانیان دوای مردنی دەخەنە سەرینی، تاوەکوو بتوانی

لە ڕۆژی مەحشەردا نێوچەوانی بەرز بکاتەوە. وا دەبێت مردووەکان لەناو گۆڕ دەهێننە دەرەوە، تا ئەم ئەرکە چاکەیەی لەگەڵدا بکەن. بابیعالی هەر تەنیا بەناو دەسەڵاتی بەسەریاندا هەیە، هەر چەند ڕۆژێك بەر لە ڕۆیشتنی من، کارمەندێکی باجگریان کوشتبوو. بۆ ئەوەی ڕاوڕووتی خۆیان زۆر بەبێ زیان ڕایی بکەن، هەموویان ڕێکخستنێکی جاسووسکارییان لە ناو ناوەندە سەرەکییەکانی حوکوومەتدا جێگیر کردووە، بۆ گۆڕینی ئاڕاستەی ئەو هەنگاوهەڵگرتنە، ئەوەش کە ئەوانە [ناوەندە حوکوومییەکان، وەرگێر] دەیانەوێ بیگرنە بەر، یا بۆ ئاگادارکردنەوەی سەرۆك هۆزەکان لە وادەی خۆیدا دەینێرن. ئەوانە هەرکاتێك بەوە بزانن کە سوپای نیزامی هێرش دەکاتە سەر هۆزەکە، دەمودەست جاڕ لەناو هەموان دەدەن، هەموویان سواری ئەسپە خۆشەویستەکانیان دەبن و بەتاو بۆی دەردەچن و لە نێوان چیاکان، خەرەندەکان، تاوێرە بەردەکان، ڕووبارەکان، ئەسپە سەرکێشەکانیان وەك ئەوەی باڵیان هەبێ، هەموو کەند و کۆسپەکان دەبڕن و بە چەند کاتژمێرێك دەگەنە سنووری ئێران کە لەوێدا دەستی تۆڵەی سوڵتان ناتوانێ چیتر پێیان ڕابگات. بەڵام لە ئێرانیش ناتوانن واز لە دابی خۆیان بهێنن و دواجار (شا) ڕاویان دەنێ، ئەوسا دێنەوە ناو تورکیا، تا ئەوکاتەی سەرلەنوێ ڕەدوویان دەنێنەوە.

لەکاتی سەفەرەکەی مندا، هەمەوەندەکان جورئەتی ئەوەیان کردبوو تەتەری ئینگلیزیی (تاران) یان گرتبوو. دوای ئەوەی ژمارەیەك لە پیاوەکانی پاسەوانییەکە بریندار دەکەن، دەست بەسەر پارەکەدا دەگرن. دەمودەست سەدان سەرباز لە کەرکووکەوە بۆ سەر چەمچەماڵ، ناوەندی ئیداری هۆزەکە دەنێردرێ. لە سایەی بوونی ئەم لەشکرەدا، کاروانەکەی ئێمە هیواخواز بوو بەسەلامەتی بتوانێ تێپەڕ ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا، من بەچاوی خۆم بینیومە ئەو ڕۆژەی بە چەمچەماڵ Chamchamar دا تێپەڕ بووم، هەمەوەندەکان هێندە

زۆر بە بوونی ئەفسەرەکان سەغڵەت نەدەبوون. ئەو ڕۆژە، ئاغای هۆزەکە ئاهەنگی زەماوەندی ژنی نوێی دەگێڕا. بۆ شەرافەتمەنکردنی ئاغا، دوو یا سێسەد سوار لە هەموو لایەکی هۆزەکەوە هاتبوونە چەمچەماڵ. ئێوارە، هەموویان لەو شوێنە کۆببوونەوە کە ئەفسەرەکان خێوەتیان لێ هەڵدابوو و بەرامبەر بە خێوەتەکانیان، لەبەر چاوی ئەم لەشکرە حەپەساوەدا، بۆ ماوەی زیاتر لە سێ کاتژمێر، زەماوەندێکی هەرە بەشانوشکۆیان ساز کرد. هەموویان تا تەوقی سەریان چەکدار بوون؛ ڕم لە مشت، شمشێر بە لاتەنیشت، خەنجەر و دەمانچە بەپشتێن، تفەنگ لە شان. شتێکی نارەحەت بوو بە تایبەت بۆ لەشکرەکە، چونکە هەموویان پڕچەك بوون بە دەمانچەی هەژدە گوللەخۆری چەکی سوپای نیزامی. ئەمانە چۆن توانیویانە ئەم چەکە قەدەغانە بەردەست بخەن، کە تەنیا لەناو دەبۆی دەوڵەتدا هەیە؟ هەمەوەندەکان وەسیلەی تایبەت بە خۆیان هەیە. کاتی جەنگی تورکی-ڕووسی، لەسەر شێوەی گرووپی ژمارە زۆر بە حەماسەتێك بەشداری شەڕەکە بوون کە ئێمە باوەڕمان پێ نەدەکردن، پاشان، وەختایەك چەکیان بەردەست کەوت و چەکدار بوون، بە چەك و جبەخانەکانیانەوە ڕایان کرد.

لە سایەی خودا توانیمان بەبێ هیچ کێشەیەك بەم وڵاتی دزانەدا تێپەڕ ببین. ڕۆژی ١٠ی تەمموز دۆڵی بازیان مان بڕی و ئێوارە لە پێدەشتی سلێمانی گەیشتینە شوێنێك کە پێی دەڵێن کانی جنە*، لەوێوەوە شەومان لەناو هۆبە ڕەشماڵێکدا بەسەر برد. بۆ سبەینێیەکەی، ١١ی تەمووز، ڕێگەکەمان گرتە بەر و تەنیا چوار کاتژمێرمان مابوو بۆ ناو شار. ئەو پێدەشتەی کە ئێمەی پێدا ڕەت دەبووین، کەوتبووە نێوان دوو زنجیرە چیا، کە یەکێکیان دەیڕوانیە ئێران.

---

* Kani-Jena

لەناوەڕاستی ئەم زنجیرە چیایەدا چیای پیرەمەگرون بوو، کە زۆر لە دوورەوە دەبینرا. ئەم هەرێمە وا پێدەچێ زۆر بەپیت بێ، شارەکە لە دوورەوە دیار بوو وەك ئەوەی بە ئاسوودەیی لە ناوەڕاستی دارستانێکی دار و درەختی سەوزدا ڕاکشابێ.

## ٤

# سلێمانی، مەسیحیایەتی و شار

هەر تازە گەیشتبوومە ناو شار، کە بینیم مەسیحییەکان پەلەیان بوو بۆ ئەوەی بێن بەخێرهاتنم بکەن، من دڵشاد بووم بە بینینی ئەم گەواهییە خێرایەی ڕووخۆشی کە من چاوەڕوانی نەبووم، چونکە دەمزانی کە لایەنگیرانی جیابوونەوە لەناو ئەوانیشدا چەند دەنگدانەوەیەکی هەبووە. بەڵام مۆنسەنییۆر یۆحەننا ڕێگەی بۆ خۆش کردبووم و منیش لەلایەنی خۆمەوە هەوڵم دا بۆ ئەوەی پێزانینی زۆر میهرەبانانەم بەرامبەریان بنوێنم، بۆ تێکشکاندنی ئەو گەندە بیرۆکانەی کە دەیتوانی پارچە پارچەیان بکات. بەڵام هەوڵەکان زۆر سەرکەوتووتر بوون وەك لەوەی عەنکاوە و دەتوانم بڵێم لەماوەی هەموو مانەوەکەمدا، تەنیا مایەی ڕەزامەندی بووم لەناو ئەم کەمە مەسیحییانەدا. وتەکانی خوام لەناویاندا بڵاو کردەوە، ڕازەکانی ئایینی مەسیحیایەتیم پێبەخشین و لە هەموو ئەم کردارانەدا، توانیم باوەڕی مەسیحییەکان بە مسیۆنێرەکان وەدەست بێنم.

مەسیحییەکانی سلێمانی تەنیا بریتی بوون لە بیست ماڵ. سەرجەمی دانیشتوانی شارەکە نزیکەی پانزە هەزار کەسە، کە لەم ژمارەیە جوولەکەکان بریتین لە دووسەد و پەنجا بنەماڵە، موسڵمانەکان زۆرینەی شارەکە پێك دەهێنن. ئەم موسڵمانانە بە دابونەریت هەروەها بە زمان کوردن، واتە کەم هاوسۆزییان هەیە بۆ مەسیحییەکان. ئەوانە [واتە مەسیحییەکان، وەرگێڕ]،

ئەوەی ماوەتەوە هیچیان نییە تا بتوانن بەسەر هاونیشتمانییەکانی خۆیاندا بیسەپێنن، چونکە، بێجگە لە ژمارەی بچووکیان، زۆرینەیان هەژارن و تەنیا بە ڕەنجی کاریان دەژین. دوو قەشە بەڕێوەیان دەبەن، یەکێك لەوانە سێ یا چوار منداڵ فێری خوێندنەوەی کلدانیی دەکا، ئەمە هەموو ئەو قوتابخانەیە کە لەوێ هەیە. کە بەمە دەتوانن حوکم لەسەر نەزانیی ئەم دانیشتوانە بدەین، کە بەڕاستی مایەی ئەسەفبارییە. ئەم مەسیحیانە سەر بە دیۆسێسی (ئەسقەفیەی) diocese کلدانیی سنە-ن لە ئێران. ئێڤێك (مەتران)، کە نشینگە هەمیشەییەکەی لە سنەیە، کە حەوت فەرسەغ لە سلێمانییەوە دوورە، بۆ ئەو سەختە چاودێریی بەرژەوەندییەکانی ئەم کۆمینیتەیە بکات و وەك چۆن لە لایەن شای ئێرانەوە فەرمانی بۆ دێت نەوەکا سوڵتانی عوسمانی، ناتوانێ لە لایەن حوکوومەتی ناوخۆوە هیچ بە هانای مەسیحیەکانی سلێمانییەوە بێت، بە شێوەیەك کە ئەم خەڵکە هەژارە نە پشتگیری دەکرێن و نە لە کاتی ئاستەنگ یا لە کاتی ئازار و مەینەتدا، کە بڕێك جار بەدەستییەوە دەناڵێنن، پارێزگاری دەکرێن.

سلێمانی تەنیا سەد ساڵێك دەبێت دامەزراوە، بە هەمان شێوە هیچ شوێنەوارێکی تێدا نابینرێ، هەموو ماڵەکان وەك چۆن لە ئاواییە سادەکاندا وایە لە خشت دروست کراون. ئەم شارە وەك کۆگەی بازرگانی وایە لەنێوان تورکیا و ئێران و یەکێك لە بەرهەمە پڕ قازانجەکانی بنێشتی کەتیرەیە، کە کاروانەکان بە برێکی زۆر لە ئێرانەوە دەیهێنن، بەڵام لە ناو وڵاتیشدا بەناوی کەتیرە کۆی دەکەنەوە. ئاووهەوای شارەکە لە هاویناندا مام ناوەندییە. شارەکە کەوتۆتە شوێنێکی نایابەوە، ئاوێکی زۆری تێدایە، ئەمە وای کردووە هەر ماڵێك باخچەیەکی دار و درەختی بەبەر و حەوزێکی لە ناوەڕاستە کە ئاوەکەی هەموو شەوێك نوێ دەبێتەوە، هەبێ.

ئەم ئاوە زۆر و فرەیەی سلێمانی بە ڕێگەیەکی دەستکرد لە ڕێگەی سیستمێکی تایبەتەوە، کە پێشتر بەکارهێنانیم لە وڵاتی ئەربیل و کۆیسنجاق بینیبوو دەستەبەردەکرێ. ئەم سیستمە بریتییە لە هەڵکەندنی چەند ژمارە بیرێك کە لە قووڵاییدا یەك دەگرنەوە. بەم شێوەیە بیرێك دەڕژێتە ناو ئەوی دیکە و دواجار لە هەموو ئەوە ئاوانەی کە کۆدەبنەوە، بڕە ئاوێکی بەقەد ڕووبارێکی ڕاستەقینەی لێ دەکەوێتەوە. ئەم جۆرە بیرانە لە ناو هەموو وڵاتدا پێیان دەوترێت کارێز*.

* *kariz*

# L'ANNÉE

# DOMINICAINE

BULLETIN MENSUEL

DE L'ORDRE DE SAINT-DOMINIQUE

TOME DIX-NEUVIÈME

VINGTIÈME ANNÉE

Janvier à Décembre 1880



PARIS

AUX BUREAUX DE L'ANNÉE DOMINICAINE

9, rue Jean de Beauvais.

1880

# VOYAGE D'UN MISSIONNAIRE

## DANS LES PROVINCES DE KERKOUK ET DE SOLIMANIÉ DE L'EMPIRE TURC.

(Suite. Voir les nos 233 et 234.)

---

Grâces à Dieu, nous pûmes traverser sans accident ce pays de voleurs. Dans la journée du 10 juillet, nous traversions la vallée de Bazinan et le soir nous débouchions dans la plaine de Solimanié en un lieu appelé Kani-Jena, fontaine des femmes, où nous passâmes la nuit au milieu d'un village de tentes. Le lendemain, 11 juillet, nous poursuivons notre route; nous n'étions plus qu'à quatre heures de la ville. La plaine que nous traversions s'étend entre deux chaînes de montagnes, dont l'une regarde la Perse; du milieu de celle-ci s'élance le pic de Maguedroun que l'on aperçoit de très-loin. Ces contrées semblent assez fertiles, la ville nous apparaissait de loin comme étendue mollement au milieu d'un bouquet d'arbres verts.

## IV.

### *Solimanié, la chrétienté et la ville.*

A peine entré en ville, je vis les chrétiens s'empresser de venir me saluer, je fus heureux de recevoir ce prompt témoignage d'une sympathie à laquelle je ne m'attendais pas, car je savais que le parti schismatique avait rencontré quelques échos parmi eux. Mais l'excellent Monseigneur Johannan m'avait préparé les voies, et, de mon côté, je m'appliquai à leur témoigner le plus de bienveillance possible, pour détruire les fausses idées qu'on avait pu leur faire partager. Mais efforts eurent là plus de succès qu'à Aincawa et je puis dire que, pendant tout mon séjour, je n'ai éprouvé que des satisfactions au milieu de cette petite chrétienté. J'y ai prêché la parole de Dieu, administré les sacrements et dans tous ces actes, j'ai pu constater la confiance des chrétiens dans le missionnaire.

La chrétienté de Solimanié se compose de vingt fa-

# ٥

# تێپەڕبوون بەناو هۆزی شوان

# - ڕێگەی کۆیسنجاق

ڕۆژی ١٩ی تەمووز سلێمانیم بەجێهێشت، هەموو دانیشتوانە مەسیحییەکان لەگەڵ مندا هاتنە دەرەوەی شار. ڕێگەی کۆیسنجاقم گرتە بەر، کە بەهیوا بووم بۆ سبەینێیەکەی بگەمە کۆیسنجاق، بەڵام متمانەم بە هۆزی شوان نییە، کە دەبێت بە ناو وڵاتیاندا تێپەڕ ببم.

لەم گەشتەمدا لە سێ کاتژمێری سلێمانی، لەلایەن ئەو زاپیتانەوە، کە حاکمی شار وەکوو ڕێنیشاندەر بەگەڵیان دابووم، بەجێیان هێشتم. کە ئەمە دواتر بووە هۆی ئەوەی ڕێگەکەم ون بکەم و دوای شانزە کاتژمێر ڕۆیشتن، گەیشتمە ئاوایی ئاغجەلەر، لەناو جەرگەی هۆزی شوان. ناوچەکە نایاب و گەلێك دڵگیر بوو، بەڵام کەوتبوومە ناو ناوەندی کوردانی هەرە چاوچنۆك. هۆزی شوان ناو و ناوبانگیان وەك ئەوەی هەمەوەندەکانی هاوسێیانە، بەڵام زۆر ترسنۆکتر و بوودەڵەترن لەوان. دەبێت بزانن ئەوانە بە چ ڕوانینێکی ویستراو چاویان بڕیبوە سەر بارەکانم و بە چاوچنۆکییەکی سەیرەوە لە هەموو لایەکەوە دەستیان لێ دەدا. ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبوایە کە سڵیان لە ناوی فەرەنگ دەکردەوە، بێگومان بە کراسەکەی بەریشمەوە ڕووتیان دەکردمەوە. لە ئاغجەلەر دەبوو زێی بچووك ببڕم، کە شەش کاتژمێر دوور بوو. لەم ڕێگە کورتەدا چوار جاران لە لایەن ڕێنیشاندەرەکانم بەجێهێڵدرام و بە زەحمەتێکی زۆر و بە هەڕەشەی تەواوی تووڕەیی فەرەنسا و سوڵتان توانیم ڕێنیشاندەرێکی

دیکه بەردەست بخەم. بەیەکجار چوار لەو چەپەڵانە لەناکاو دەوەستن و دەمانچەکانیان بەرەو ڕووم وەردەگێڕن و داوا دەکەن، کە دەستبەجێ پارەی هەقدەستەکەیان بدەمێ: (لە زێیەکە نەك لە پێشتر، من پێم گوتن، ئێمە وا ڕێك کەوتین). تاویان دایە لغاوی ئەسپەکەم و لوولەی دەمانچەکانیان خستە ناو قاچەکانمەوە و دەستیان کرد بەوەی بە خراپی مامەڵەم لەگەڵدا بکەن. ئەحمەد، یەکێك لە نۆکەرە موسڵمانەکان، کە بەردەستی من بوو، بە توورەییەوە بۆ لام تاوی دا، منی لە بندەستی ئەوان دەرهێنا و بە جەسووریی خۆیەوە دواجار توانیی بیانترسێنێ و دووریان بخاتەوە. لە ئاواییەکدا تازە پێمان تێنابوو، کە لە دوورەوە بیست سوارەیەکمان بینی، بۆ لای گوندەکە دەهاتن: (ئەوە هەمەوەندەکانن! لە هەموو لایەکەوە هاواریان لێ هەڵسا، دێن بۆ لای ئێمە بۆ ئەوەی دەست بەسەر گەنجینەی ئەم فەرەنسییەدا بگرن. با ڕاویان بنێین ! با ڕاویان بنێین ! بۆ ئەوەی هیچ زیانمان پێنەگات!). ژنەکان سینگی خۆیان دەکوتی، پرچیان دەڕنییەوە. ژاوەژاوێکی لەڕادەبەدەر بە دەوری منەوە بوو. لەناکاو پیاوێکی کەتەی بەهێزی ڕم بەدەست لەناو خەڵکەکەوە بەرەو ڕووی من هات و نەڕاندی: (لە ئەستۆی من! هیچ مەترسە، وەرە لای من، بە هێمنی دابنیشە و کالیۆنی خۆت بکێشە وەك ئەوەی هیچ نەبووبێ، من ئەرکی پاراستنت لە ئەستۆ دەگرم). بە دڵێکی پاکەوە خۆم خستە ژێر دەستی ئەم پارێزەرە خوداییە و وەك چۆنی پێ گوتبووم ئاوام کرد. سوارەکان دەهاتنە پێشەوە، ژاوەژاوەکە بەردەوام بوو، هەستم بە کامەرانی نەدەکرد. دواجار سوارەکان دەتوانرا جیا بکرێنەوە و بناسرێنەوە، ئەهۆ شادومانی! ئەوە ئاغای گوند بوو، کە لەگەڵ دارودەستەکەی لە لەشکرکێشییەك دەگەڕایەوە. جارێکی دیکەش لەناو ترس ڕزگارم بوو. دواجار دوای ئەوەی تەواوی ڕۆژەکە لەگەڵ هۆزی شوانەکان شەڕم بوو، بۆ ئێوارە گەیشتمە کەناری زێی بچووك، ئاوایی

گرد-خەبەر*. مودیری گوندەکە چەند ڕێنیشاندەرێکی بەگەڵ دام بۆ تەواوکردنی ڕێگەکەم و بە بێ دواکەوتن لە ڕووبارەکە پەڕیمەوە. هەناسەیێکم لەدڵەوە دا و گەیشتمە ئەو بەری ڕووبارەکە. ئیدی وڵاتی هۆزی شوانم بەجێهێشت بوو، تۆقین و ترسەکان ڕەوینەوە. لە قووڵایی دڵمەوە شوکرانەبژێری خوداوەند بووم، کە لەناو ئەم هەموو مەترسییەدا ساغ و سەلامەت دەربازبووم. لەم ناوچەیە لەژێر کاریگەریی دواهەمین زەردەی خۆرەتاودا سروشت زۆر زیاتر ڕووخۆشتر بوو، گرد-خەبەر لەسەر تاوێرە بەردێك لەناو هێلانەیەکی سەوزایی هەڵنیشتبوو، ماسی تۆبی لە پانی ئاوەڕۆی ڕووبارەکە یاریان دەرکرد، بە سەدان کیسەڵ هاتبوون لە کەناری ئاوەکە هەناسە بدەن. بەڵام من کاتی ئەوەم نەبوو بچمە ناو تێوردبوونەوەیەکی بەسۆز، درەنگم بوو بۆ ئەوەی لەم کەنارە نامیواندۆستە دوور بکەمەوە. بە دنەدانی پیاوێك لە هۆزی شوان، کە بە ڕێکەوت لەسەر ڕێگەمان تووشی بووبووین، خەریك بوو جارێکی دیکەش لەلایەن ڕێنیشاندەرەکانمەوە خیانەتم لێ بکرێتەوە. چووم لەناو ڕەشماڵە گوندێك لە دوو کاتژمێری زاب خەوتم. بە شەو ڕۆیشتم. ئیحساسێکی نوێ چاوەڕوانی دەکردم. لەگەڵ یەکەم گزینگی خۆرەتاودا، وەختایەك بەگوێرەی دەربڕینی موسڵمانەکان، لەگەل گزینگ کاتێك هێڵی سپی لە هێڵی ڕەش جیا دەکرێتەوە، بینیم ڕێنیشاندەرەکانم لەناو خۆیاندا وتوویژ دەکەن و پاشان لەناکاو بە هەموو هێزیانەوە هەڵاتن. ئەحمەد بانگی لێ کردن، هیچ وەڵامێك نەبوو. بەدوایاندا ڕای کرد، ئەوان خێراتر ڕایان دەکرد. من قەناعەتم وابوو، کە کەوتووینەتە ناو بۆسەیەکەوە: (خۆتان ئامادە بکەن بۆ بەرگریکردن لە خۆتان)، من بە دوو بەردەستەکانم گوت. بەردەوام بووین لە ڕۆیشتنەکەمان، بە وریاییەوە

---

* لە تێکستە فەرەنسییەکەدا ناوی ئاواییەکە بەم شێوەیە نووسراوە: Guert-Khabar بەڵام من پێم وایە ئەمە ئاوایی (گرد- خەبەر)ە (وەرگێڕ).

لەناو ئەم چیایە کێوییانە دەڕۆیشتین، سەرنجمان لە هەموو شتێکی دەوروبەرمان دەدا. تووله ڕێگەکە بەرەو دۆڵێکی بەرتەسکی دەبردین، کە جۆگەلە ئاوێکی بە ناوەڕاستدا تێدەپەڕی، ئاوەکەی لەگەڵ یەکەم تاڵەتیشکی خۆرەتاو دەبریسکایەوە. چاومان دایە بەرزاییەکە و لە دوورەوە کوردەکانمان لە شوێنی خۆیانەوە لێ دیاربوو، کە هەر یەکەیان لەلای خۆیەوە لەسەر کەناری ئاوەکە چەقی بوون. ڕەوشەکە ترسناك بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر چووینە پێشەوە: کوردەکان هەر لە شوێنی خۆیان مانەوە. دواجار ئێمە نزیك کەوتینەوە و زانیمان ئەوان نوێژی بەیانییان دەکرد! (سێنیۆر*، یەکێك لەوانە لە دوورەوە هاواری بۆ کردم، تووڕە مەبە کە ئێمە تۆمان بەجێهێشت. ئێمە دەترساین لەناکاو پێش ئەوەی بتوانین دەستنوێژەکانمان هەڵبگرین و نوێژەکانمان بکەین خۆرمان لێ هەڵبێ). دیسان جارێکی دیکە ترسەکەم ڕەوییەوە. بەڵام ئەم ئاگادارکردنەوانە بەلای کەمەوە سوودی ئەوەیان هەبوو مسیۆنێر لەناو گوماندا نەهێڵنەوە و مانەوەی بڕوابوون بە خوداوەند، بەوەی کە تاکە پارێزەری بوو بەرامبەر بە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە لەناو جەرگەی ئەم دەرو ناوچە کێوییانەدا.

گەیشتینەوە لوتکەی چیاکان، خۆر هەڵهات بوو و تیشکەکانی پێدەشتێکی جوانی زیوین دەکرد، کە لەپێش ئێمەدا دەڕۆیشت. لەو بەرەوە، کۆشکێکی مکوممان بەدی دەکرد و لە نزیك ئەوەوە گرووپێکی خەڵك، ئەوە کۆیسنجاق بوو. سڵاوم لە فریشتەی پارێزەر کرد بەوەی کە یاریدەی دام ڕووناکییەکی تەواو لەسەر ئەم میللەتە بڵاو بکەمەوە. چەند کاتژمێرێك دواتر دەچمە ناو ئەم شارەوە. ڕۆژی ٢٢ی تەمووز بوو.

---

* seigneur: مەولانا، بە عەرەبی (سید).

# ٦

## کۆیسنجاق: مەسیحیایەتی،
## شارەکە و کوردەکانی. هەرمۆتە

گەیشتنم شادی و خۆشی خستە ناو مەسیحییەکان، چونکە لەم ڕەوشی بەش مەینەتی و بێچاودێرییەی کە خۆیان تێدا دەبینییەوە، بە تایبەت لەم چەند ساڵانەی دواییەوە، حەزیان دەکرد قەناعەت بە خۆیان بهێنن، کە من هاتووم چارەسەری ڕەوشی سەختیان بۆ بکەم. ئەفسووس! من چ دەتوانم بکەم؟ من تەنیا دڵدانەوەم پێ بوو پێیان ببەخشم، تەنیا قسەم پێ بوو بۆ ئەوەی بەناوی خوداوە هیواخوازیی مەسیحییەکان لە موعاناتە سەختەکانیان وەبیر بهێننمەوە.

کۆیسنجاق ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی دە هەزار کەسە، لەو ژمارەیەدا، جووەکان سی بنەماڵە و مەسیحییەکانیش بەقەد ئەوان دەبن. هەموو ئەوەی دیکە موسڵمانن. بەڵام چ موسڵمانێك! کوردی شانازیکار، دەمارگیر، جاهیل و تا دوا ڕادە بەچاوی سووك قێزیان لە مەسحییەکان دەبێتەوە. تەنیا بە ناوی خەوشداری گاور، بێ ئیمان بانگیان دەکەن، لە چاوی ئەوان منیش تەنیا سەرۆکێکی گاورەکان بووم. لەوێ لەکاتی ڕۆسێردا ناچار دەبووم خاچەکەم بشارمەوە تا نەبینرێ کاتی ڕۆیشتنم بەرجنێو نەکەوێ. خانەخوێیە ئایینییەکەم، کە لە هەموو لایەکەوە ڕێزی لێ دەگیرێ، کەچی مایەی گاڵتەجاڕیی ئەم کوردە بێشەرمانە بوو. لە ناوەندێکی ئاوەهادا، مەسیحییەکان بە ئاستەم ئازادیی ئەوەیان

هەیە ئاینی خۆیان پیادە بکەن و ڕێگە نادەن مەسیحییەکان کڵێسەیەك درووست بکەن و ناچار کراون لەناو جۆرە ژوورێکی نیوە دەرگە و پەنجەرە شکاو لەژێر زەوی، کە بە عاستەم هەوا و ڕووناکی پێدا تێپەڕ دەبێت بژین. هاوینان لەبەر گەرما و هەموو جۆرە مێروولەیەك کە هووروژمی بۆ دەبەن، ئەستەمە لەناویدا بمێنێتەوە. جارێکیان قەشەیەك لە یەك تاقە ڕۆژدا پەنجا دووپشکی کوشتبوو. هەرچەندە کە هیچ شتێك لەناو ئەم کلێسە هەژارەدا نییە کە ببێتە هۆی چاوتێبڕینی دزەکان، کەچی دوو ساڵ بەر لە ئێستە، بە تەواوی ڕووتیان کردەوە تا ئەو ڕادەیەی کە پەیکەرێکی جوانی سانت پاکیزەیان گڵاو کردبوو و شەرمەزارانە پارچەیان لێ بڕیبۆوە. ویستم تابلۆیەکی جوانی مەسیح لەسەر خاچ لە کڵێسەکە بەجێبهێڵم. - (نەخێر! نەخێر ! قەشەکان پێیان گوتم، هەڵیبگرە بۆ هی دیکە، ئەگەر موسڵمانەکان بێن و بزانن ئەم تابلۆیەمان هەیە دێن گڵاوی دەکەن و پارچە پارچەی دەکەن). سێ قەشە ئەم کۆمیونیتەیە بەڕێوە دەبەن. قوتابخانە کە پێشتر دروست کرابوو، چیتر لێی نەبوو.، من دووبارە دروستکردنەوەیم لەناو یەکەمی ئەو کارە چاکانەدا یادداشت کرد بوو، کە دەبێ لەم وڵاتەدا بکرێ.

کۆیسنجاق ئاووهەواکەی (تا) دارە، ئاووهەوای لە هاویناندا زۆر ساغ نییە. دەوروبەری شارەکە چەند باخچەیەکی تاڕادەیەك سەوزی لێیە، بەڵام بەهەشتی وڵاتەکە گوندێکی چکۆڵەیە، ئاوایی بچووکی هەرمۆتەیە لە سەعاتە ڕێیەکی کۆیەوە دوورە. لەوێ لە کەناری جۆگەلەیەکی چکۆلە، دار و دارستانێکی چڕوپڕی تێکچرژاو، هەموو چەشنە درەختێکی لێیە کە میوەی تەڕی نایابی هەیە، بە تایبەت هەنار کە ناوی هەرمۆتە لەوەوە بەسەر گوندەکەدا براوە. ئەم گوندە هەمووی مەسیحییە و چوار ساڵ دەبێت بیست ماڵێك تێیدا بە خۆشییەوە لەسەر بەرهەمی باخچەکانیان دەژیان. بەڵام ئەم ناوچەیە هەڵبژاردراوە زۆر

جوان بوو بۆ ئەوەی لە بن دەستی گاورەکان بمێنێتەوە. ئاغا کوردەکانی کۆیە، بە سوود وەرگرتن لە پشێویی حوکوومەت، بیریان لەوە کردەوە دەست بەسەر ئەم پارچە زەوییە جوانەدا بگرن و بە زەبری تەنگ پێهەڵچنین و بە کۆمەگی دزەکان کە بە دزییەوە پشتیوانییان لێدەکردن، پێی گەیشتن. وێران و بێئاسایش، مەسیحییە هەژارەکان ناچار بوون زەوییەکە بەجێبهێڵن و لەکاتی گەشتەکەی مندا شەش بنەماڵە هەر لەوێ مابوونەوە، بەڵام ڕەوشی ژیانیان لە سۆنگەی دزان، کە نزیکەی هەموو شەوێك دەچوونە سەریان، ژیانیان تاڵ بووبوو. ئەم دزانە زۆربەیان ئەفسەرە چاوچنۆکەکانی سوپای نیزامی بوون. وڵات تا ئەو ڕادەیە بە دزان تەنرابوو کە ڕێگەیان نەدام سەفەرێکی کورت لە کۆیەوە بۆ هەرمۆتە بکەم، بە بێ ئەوەی چەند پیاوێکی چەکدارم لەگەڵ نەبێ. کڵێسەی هەرمۆتە کە بەم زووانە لەلایەن مۆنسەنییۆر یۆحەننا دروست کرابوو، هەرە نایابترینی ئەسقەفیەکەی بوو، بەڵام لە وڵاتێکی ئاوەهادا نەدەکرا چارەنووسی هەموو ئەوانی تری لێوە دوور بگرێ، ئەویش تاڵان کرا و دزەکان هەتا کتێبی عیبادەتیشیان دزی بوو، کە بەشێوەیەکی ئاسایی هیچ قیمەت ناکات.

لە نزیکی کۆیە، کەمێك لەو دیوو ئەو ڕێگەیەی کە بۆ هەرمۆتە دەچێ، شوێنێکی پیرۆزی بۆ مەسیحییەکان لێیە، کۆنە دێیەکە بەناوی مار- بەهنام*ەوە. ئەمڕۆ هێشتا دیواری حەوشەکە، چەند ژوورێکی چکۆڵە و کلێسەکەی هەر ماوە. نووسینێکی کۆن، بە زمانی کلدانی، باسی ئەوە دەکات ئەم کڵێسەیە چەندین جار لە سایەی ستەمی ئێرانییەکاندا تێك دراوە و دووبارە ساڵی مەسیحیی ١٢٨٣ دروست کراوەتەوە.

لە کۆیسنجاق (تا)م گرت، مەسیحییەکان ویستیان دەرفەت لەوە وەربگرن بمهێڵنەوە، بەڵام مەسیحییەکانی شەقڵاوە بە پێ هاتبوون پێم بڵێن: (باوکە، بە

---

* Mar-Behnam

زووترین کات وەرە لای ئێمە، تۆ هەر کە تامی ئاوی سازگار و شیرینی ئێمە بکەی، چاك دەبیتەوە). شێوەی ڕووسوور و شان بەرینی ئەم خەڵکە میهرەبانە هێندە بەهێزبوو، بە بەراورد لەگەڵ ڕەنگ و ڕووی زەرد و سروشتیی لەڕی کۆییەکان بە ئاسانی قەناعەتیان پێهێنام کە شارەکەیان بەڕاستی وڵاتی لەشساغییە. جگە لەوە، لەبەر ئەوەش کە ئەرکی خۆم لە کۆیسنجاق تەواو کردبوو، ڕۆژی ٣٠ی تەمووز سبەینەیەکەی لەگەڵیان بەڕێکەوتم.

# ٧

# ڕێگەی شەقڵاوە: ئاوایی شەقڵاوە.
# چەوساندنەوەی مەسیحییەکان لە لایەن کوردەکانەوە

ڕێگەکەمان بەناو دوو زنجیرە چیادا تێدەپەڕی. سێ (٣) کاتژمێر لە کۆیەوە، لە ڕووباری کرۆژ* پەڕینەوە، کە ئاوەکەی گۆگردییە، سەرچاوەکەی هێندە لەو ناوچەیە دوور نا، لە چەند ئەشکەوتێکی قووڵ هەڵدەقووڵێ. کاتژمێرێك لەولاتر لەژێر سێبەری تاڤگەی سناوا** پشوومان دا، دوورتر، بەدرێژیی ڕێگەکەمان ئاواییە کوردەوارییەکانی نازەنین، هیران و گەرۆتە لەسەر ڕێگەمان بوون کە دەروبەرەکەی هەر تەنیا باخچە و دارستانی نایاب بوون. ئێوارە گەیشتینە ئاوایی سپیگرە، کە پڕبوو لە دارمێو و لە نزیکی ئەوە تاڤگەی گۆڕەمیر، یەکێك لە تاڤگە نایابەکانی ئەم وڵاتە حەساینەوە. ئاوەکەی وەکوو هەوا ڕوون بوو، دوو مەتر لە قووڵایی ئاوەکە شتەکانمان ئەوها بە ڕوونی دەبینی، وەك ئەوەی لەژێر دەستماندا بێ. دواجار دوای چەند ماوەیەك لەوێوە، لە دیمەنێکی دڵڕفێندا گەیشتینە شەقڵاوە و نیو سەعات دواتر، هەموو دانیشتوانە مەسیحییەکانمان بینی، کە بۆ دیدەنیی من هاتبوون.

---

* نووسەر لە تێکستە فەرەنسیەکەدا نووسیوویە ڕووباری کۆلۆش Koloch، بەڵام من پێم وایە ڕاستییەکەی ڕووباری کرۆژـە، مەگەر لەو ساڵانەدا ناوەکەی کۆلۆش بووبێ و دواتر گۆڕانی بەسەردا هاتبێت، (وەرگێڕ).

** Sennawa

ئەو ئاپۆرەیەی کە لەپێش منەوە دەڕۆیشتن، بە تووله ڕێگەیەکی بچووکی پێچاوپێچدا بە ژێر درەختەکاندا منیان برد. بۆنی هەزار گوڵ و میوەی بۆنخۆش، باڵندەی بێ ئەژمار جریوەجریویان بوو، جۆگەلەی زولاڵی وەکوو کریستاڵ لە هەموو لایەکەوە لەژێر ئەم سێبەرە جوانانە هەڵدەقولان، بەڕاستی دیمەنێکی ئەفسووناوی بوو. بەم شێوەیە گەیشتینە ناوکەپرێکی دارین کە لەژێر سێبەری سێ دارتووی گەورە دروست کرابوو. ((ئالێرە دابنیشە، سەرۆکی قەشەکان بە منی وت، ئەوە شوێنی تۆیە، تۆ لەگەڵ مندا دەبیت)). حەسیرێك بۆ من لە کەناری جۆگەلەیەکی چکۆلە کە بە بەردەم کەپرە دارینەکەدا دەڕۆیشت، ڕاخرابوو، چوارمەشقی دانیشتبووم و هەموو مەسیحییەکان دەهاتن دەستم ماچ بکەن. ((هاوڕێیەکانم، من پێم گوتن، دەزانن وڵاتەکەتان هەر بەهەشتێکی سەر زەوییە بۆ خۆی، ئێوە دەبێت چاکتر خزمەتی خوا بکەن، چونکە پارچەیەکی ئاوا جوانی داونەتێ لەم جیهانە)). ((باوکە، پیرە پیاوێك وەڵامی دامەوە، کەمێك چاوەڕوان بە تۆ دەبینی ئەو بەهەشتەی ئێمە، کە لەوەی باوکە ئادەم دەچێ، شەیتان دێتە ناویەوە و هەموو ئەو شتە باشانەی خودا بە ئێمەی بەخشیون، تاڵی دەکات)). - پیرە پیاوەکە ڕاستی پێگوتم، چونکە دەستەڵاتی کوردی وەك هەموو لایەکانی دیکە بەتوندی خۆی سەپاندۆتە سەر ئەم وڵاتە. ئاواییەکە لە نزیکەی دوو سەد بنەماڵە پێك هاتبوو.، لەم ژمارەیە مەسیحییەکان بریتی بوون لە هەشتا بنەماڵە، ئەوەی دیکە هەمووی موسڵمان بوو. میرێکی بەدەسەڵات تێیدا نیشتەجێ بوو و لەوێوە لە ڕێگەی ئاغا و سەیدەکانییەوە حوکمڕانیی هەرێمەکەی دەکرد. میر پێویست بوو دەسەڵاتی حوکوومەت بناسێ، بەڵام ئەوەندە گوێی پێنەدەدا. لەژێر دەسەڵاتی ئەودا مەسیحییەکان مەملووك، واتە موڵکی موسڵمانەکان بوون. لە ناوچەی دیکەی کوردستاندا، ئەم سیستمە هێشتا و هەتا لە ئاستێکی لە شەقڵاوە بەرفراوانتریش زاڵ بوو، بەڵام

ئەمەیان ڕەوشی مەسیحییەکانی ئەم ئاواییەیە. هەریەك لەوانە [لەو مەسیحیانە، وەرگێڕ] ژێردەستەی ئاغایەك یان دەرەبەگێکن، کە دەبێت ساڵانە بڕێك سەرانەی بداتێ کە بە عورف و عادات دیاری کراوە. بەشێوەیەکی گشتی، ئەم سەرانەیە داوای دەیەکی هەموو بەرهەمێك دەکات. وەختایەکیش مەسیحییەکی بێ میراتگرەوە دەمرێ، ئەوا موڵکەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئاغاکەی. هەرجارێك کە باوکێك یەکێك لە منداڵەکانی ژن بێنن، ئاغا هەقی بڕێك پارەی هەیە. بەڵام جگە لەوەی کە بە گوێرەی عورف و عادات دەدرێ، هێشتا ئەوە هەیە کە دەربەگەکە بۆ هەوەسی خۆی داوای دەکا و ئەمەیان لە هەموویان قورسترە. بەم شێوەیە بێگار دەسەپێنێ، دەبێت جۆلایی جلوبەرگی بۆ بکات، تۆ و دانەوێلە یا پارەی لێوەردەگرێ و بێگومان هیچی ناگەڕێنێتەوە. کوردێك قەرز بداتەوە مەسیحییەك، ئەوە شەرمەزارییە! بێجگە لەوە مەسیحییەکان هەقی ئەوەیان نییە دەست لە بەرامبەر کوردێك کە لێیان بدات، بەرز بکەنەوە، هەتا ئەگەر بەرامبەر بە خۆی ژنەکەی و منداڵەکانیشی سەر ببڕن. زیاد لەوە مافی ئەوەشیان نییە بەو چەشنەی خۆیان دەیانەوێ جلوبەرگ لەبەر بکەن. ڕەنگ، چۆنایەتی قوماشەکان، هەتا شێوەکەشی، بەسەریاندا فەڕز دەکرێ و ئەوە جێگەی گومان نییە، کە ئەگەر جەمەدانی یا چاکەت و شەرواڵێکی گرانبەها لەبەر بکەن، کوردێکی چاوچنۆك لەبەری دادەماڵێ. لە دیوەخان دەبێت هەمیشە خۆیان لەدوایین ڕیزدا بنێن و بەختەوەرن کاتێك داوایان لێدەکەن دابنیشن. ((گاور و سەگی مەسیحییەکان، تیشکی خۆرەتاو گڵاو دەکەن))، ئەم کوردە دەمارگیرانە وا دەڵێن و لەم جیهانە مافی هیچ موڵکێکیان نییە. ئاغا دەتوانێ بازرگانی بە مەسیحییە مەملوکەکانییەوە بکات. بە تەواوی یا بەشێکی دەفرۆشێتە ئاغایەکی دیکە،. بەدبەخت ئەو مەسیحییەیە کە دەکەوێتە بن دەستی دوو ئاغا لە یەك کاتدا! هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە ئەوەی بتوانێ

دەیقاچێنێتەوە و بەدبەختە لەبەرامبەر ئەوەدا زیاتر تەنیا شیمانەی کوڵەمەرگییەکی بێ کۆتایی لەبەردەمدایە.

میری شەقڵاوە، وێڕای ڕوونیشاندانی پیاوچاکی و دووپاتکردنەوەکانی بەقازانجی مەسیحییەکان و ئیستبدادی هەرە سەختی، میر نە بێگاریان پێدەکا و نە هیچ جۆرە کۆیلەگەرییێك.ماڵەکانی بەوان دروست کردووە، باخچەکانی، کێڵگەکانی، ڕەزەکانی بە دەستی ئەوان دروست کراوە، تاڤگەی ئاوی کونکردوون، کەناڵی ئاوی پێهەڵکەندوون یا دروست کردوون. بە سایەی کاری بە خۆڕایی و بەزۆری مەسیحییەکانەوە، بووەتە گەورەترین و دەوڵەمەندترین موڵکداری وڵات. ئەویش سەرانەی دانراوی لێ داوا دەکردن، سەییدەکان کە سەرانەکان دەسەنن، بێگومان کە بەشی ئاغاکەیان دەبرد، بەشی خۆشیان دەبرد. ئەم سەیدانە هەمیشە چەك و خەنجەریان پێیە، بەبێ وەستان دەچنە ناو باخچەکان و بە ڕەزا یان بەهێز، هەرچییێك بۆیان بشێ دەیبەن. برێك جار، لە هاوینان، ڕەوە ئێستر و گامێشی میر، کە هیچ لەوەڕیان چنگ ناکەوێ، ئەوا بەریان دەدەنە ناو باخچەی مەسیحییەکان کە تێیدا لۆکە و ڕۆنیاس* و بەرووبوومی دیکە هەڵدەوەشێننەوە کە بۆ خاوەنەکانیان هەموو هیوایەکی دوارۆژیانە.

لە ڕەوشێکی ئاوهادا، کوڵەمەرگی تاقە بەشی زۆرینەی مەسیحییەکانە، ئەگەر یەکێك لەناو ئەوانەدا لەبەر زۆریی کارکردن و لەدەمی خۆگرتنەوە برێك دەست پێوە بگرێ، وەختایەك کوردەکان پێی دەزانن دەمودەست ماڵەکەی تاڵان دەکەن. خۆشی بە خۆی ئەگەر خۆیشی بە ساغی دەربچێ، چونکە، لە وڵاتی شەقڵاوە دا، خوێنی گاور نرخی هەرزانە و ئەوە شتێکی دەگمەن نییە کە بڵاو بێ.

---

* ڕۆنیاس: garance بە عەرەبی (الفوه، العروق الحمر)ی پێ دەڵێن، (وەرگێڕ).

# ٨

# کوشتنی سارا- مەسیحییەکانی شەقڵاوە= - باخچەکانی ئاوایی

خودا ویستی کاتی چوونم بۆ شەقڵاوە گەواهی ئەم وەحشەتگەرییەبم.

لەو ئاواییە کچێك هەبوو بە ناوی "سارا"وە، تەمەنی دەوروبەری ٢٢ ساڵ دەبوو، هەتیوێکی بێ باوك و دایك بوو. لە لای داپیرەی دەژیا و ئاگای لە پیرەژنەکە دەبوو و سۆنگەی بەهێزکردنی ئایینی و لە هەمان کاتدا هەموو کۆمیونیتەی مەسیحییان بە ناسکییەکەی، باوەڕدارییەکەی و کۆششی بۆ نوێژ و هامشۆکردنی شوێنە پیرۆزەکان، سۆنگەی ئیمانداری بوون. موسڵمانەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەوا هەقیان بەسەر کچەکەوە هەیە، چونکە لە باوکێکی موسڵمان لە دایك بووە. ڕاستییەکەی باوکەکەی لە سەردەمانی تۆقینی پاشای ڕەواندوزدا، کە بە ناوی میری کۆرە ناسراوە، موسڵمان بووبوو، بەڵام دواتر پەشیمان بۆوە و لەگەڵ تەواوی بنەماڵەکەیدا و هاتەوە سەر ئایینی مەسیحی، کە هەر لەسەر ئەو ئایینەش مرد. چەندین جار سارا بە وادە و هەڕەشە داوای لێکرا تا لە ئایینی مەسیح هەڵگەڕێتەوە، بەڵام سارا بە توندی بەرگریی دەکرد. جارێکیان دەیبەنە بەر دەم میر بۆ ئەوەی لە بارەی ئایینەکەیەوە وەڵام بداتەوە، سارا ئازایانە ڕایدەگەیەنێ کە ئەو مەسیحییە و هەر بە مەسیحیش دەمێنێتەوە.- ((ئەوە هەڵگەڕاوەیە، ئەوکاتە موفتی ئاوایی گوتی و بەگوێرەی یاسای ئیسلام هەقی کوشتنە)). - ((بمکوژن ئەگەر دەتانەوێ بمکوژن، سارا

وەڵامی دایەوە، وام لە بندەستی ئێوە، بەڵام چاك بزانن ترسی کوشتن وام لێ ناکات واز لە ئاینی خۆم بهێنم)). -ڕەوانەیان کردەوە، بەڵام دواتر لەدوای ئەم دانیشتنە گشتییە، لە مزگەوت کۆڕێك بۆ هەموو خاوەن مەقامە ئاینییەکانی ناوچەکە گیرا و بڕیاریان دا سارا، وەك هەڵگەڕاوەیەك، بکوژرێ. بەجێهێنانەکەی بۆ یەکەمین دەرفەت دانرا کە بێتەوە پێشەوە. ئەوە خەلیفەیەکی ناوچەکە بوو کە دواتر پەردەی لەسەر ئەم دانیشتنە نهێنییەی مزگەوت هەڵدایەوە. ڕۆژی ٩ی ئاگستۆس، ڕۆژی تاوانەکە بوو. دوو فەقێ یا قوتابی ئەوە ئەرکەیان پێسپێردرابوو. ئەو فەقێیانە هەر کە دەزانن سارا چووە بۆ ڕەزەکەی خۆی، بەرەو ئەو لا بەڕێ دەکەون. کاتێك سارا لە گەڕانەوەیدا بە خۆی و زەمبیلێك ترێوە لەسەر شانی دەگەڕێتەوە، تووشی دەبن. - ((لەم ترێیەی خۆتمان بدەرێ، ئەوان پێی دەڵێن)). - ((بەخۆشحاڵییەوە)) - سارا وەڵام دەداتەوە. لەگەڵ ئەم ڕووخۆشییدا کە عادەتی وابوو، دەمودەست زەمبیلەکە دەخاتە سەر زەوی و لەناو ترێیەکانیدا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ باشترین هێشووە ترێیان پێشکەش بکات. لەکاتێکدا سارا ئاوا سەرقاڵ دەبێت، دوو فەقێیەکە داواکەیان دووبارە دەکەنەوە، کە چەندین جار لێی داوا کرابوو: - ((ببە موسڵمان))- ((نەخێر، سارا وەڵام دەداتەوە، ئێوە مەرام و نیازی من دەزانن)).- یەکێك لە دوو فەقێیەکە خەنجەرەکەی دەردەهێنێ، لەکاتێکدا سارا خۆی شۆڕ دەکاتەوە، بەم وەڵامدانەوەیە، سێ جار خەنجەرەکەی دەچەقێنێتە پشتی و دیواودەری دەکات. قوربانییە بەستەزمانە کە هەڵدەستێتەوە و چەند هەنگاوێك دەڕوات، پاشان دەچەمێتەوە و بەر دەبێتەوە سەرخۆیی و شەڵاڵی خوێن دەبێت و هەر لەو شوێنە گیان دەدات. دوو کەسە تاوانبارەکە دەناسرێنەوە، بینیویانە بەرەو لای ڕەزەکە ڕۆیشتوون و کاتی گەڕانەوەیان جلیان بەخوێن بووە. یەکێك لەوانە هەتا هاوڕێکەی خۆی، ئەوەی کە سارای بەر

خەنجەر دابوو، کوڕی یەکێك لە مەقامە ئایینییە یەکەمینەکانی ناوچەکە بوو. منداڵێکی ١٢ ساڵە، کە خزمی سارا و لەگەڵ سارا دا بووە و لە ڕێگەی ئەوەوە ڕەوشی کوشتنی "سارا"مان زانیوە.

وەختایەك هەواڵی تاوانەکە بەناو ئاواییدا بڵاو دەبێتەوە، من چەند کەسێکم بەدەورەوە بوو. کاتی بیستنی هەواڵەکە تاسام، بەڵام بۆم دەرکەوت وا پێدەچێ بۆ بەهاناوەچوونی سارا هێندە زۆر دڵگران نەبن، من بەدەنگەوە ئەو تێبینیەم دەربڕی- ((باوکە، وەڵامیان دامەوە، ئێمە بۆ ئەو ڕووداوانە دروست کراوین و لێرە ژیانمان هێندە تاڵە، لەجیاتی ئەوەی شکایەت بکەین بۆ ئەوەی کە تێدا دەچێ، ئێمە پێمان وایە ئەوە بەختەوەرە، بەتایبەت کاتێك وەك سارا، بۆ ئامانجی ئاینی پیرۆزمان ژیان لەدەست دەدات)). - ((بەڵام، من گوتم، ئێوە لێدەگەڕێن ئەم تاوانە ئاوها بە سووك و ئاسانی بڕوات و بێ ئەوەی لە لای دەسەڵاتکاران شکایەت بکەن؟ ئەگەر ئێوە بتانەوێ، من دەتونم یاریدەتان بدەم بۆ پێشکەشکردنی عەریزەتان)). - ((نەخێر!، نەخێر! وەڵامیان دایەوە، کە خوێنی سارا ببێبەتە تاقە تۆڵەسەندنەوەمان ! بۆ ئێمە وا باشترە، چونکە خودا دادپەروەرە! لێرە، ئێمە تەجرەبەمان هەیە، بۆ تاقە کەسێك کە بمانەوێ تۆڵەی بسەنینەوە، خەنجەردارانی کورد چواری دیکەمان لێ دەکوژن)). یەکێکیان باسی باوکی کرد، یەکێکی دیکە برایەکەی، یا کەسانی دیکە بینویانە خەنجەردارانی کورد لەم چەند ساڵانەی دواییدا لێیان داون. سارا خۆی تاقە کەسی بنەماڵەکەی نەبوو، کە لەژێر لێدانی ئەواندا تلابێتەوە. خوێنی ئەم گەنجە قوربانییە تا لای خودای تۆڵەسێنی بێگوناهان و چەوساوەکان ڕۆیشتووە: بەو هیوایەی کار لە هەنگاوهەڵگرتنەکانی خوداوەندی بەخشندە و میهرەبان بکات بەرامبەر بە گەلانی ئەوەندە بەدبەخت، کە لەوەی مەسیح دەچێ وا فەزیلەتەکانی پێ ڕادەگەیەنێ. لە هەمان کاتدا، بە قازانجی ئەو دەبێت بۆ درەخشانەوەی چاکترین ڕۆژ بۆ چەوساوەکان و بەرەو پێشەوەبردنی

ساتەوەختی گۆڕینی مەزهەب بۆ چەوساوەکان. هەموو ئەم ناجۆرییە هەرچییەك بێ، ئەم ڕەوشی چەوساندنەوەیە هەر بەردەوامە، کە بەلای کەمییەوە چاکەی ئەوەی هەیە مەسیحییەکانی شەقلاوە زیاتر پابەند دەکات بە خودا، زیاتر سەرڕاستتر و زیاتر بەحەماس تریان دەکات لە پراتیکی ئایین. حەزدەکەم لێرەدا گەواهی ئەوە بدەم کە ئەوانە باشترین کاتۆلیك بوون من لەناو کلدانییەکاندا ناسیومن. چوار قەشە کۆمیونیتەکەیان بەڕێوە دەبات. قوتابخانەی کوڕانیان چاك لەسەر پێی خۆیەتی. من زیاتر لە جێگەکانی دیکە لە وەڵامی منداڵەکان ڕازی و دڵشاد بووم کە بینیم ئەو مسیۆنەی وا پشتگیری لەم کارە دەکات، لێرە ئەنجامی چاکی دەست کەوتووە. هەرچی سەبارەت بە کچەکانە، هیچ قوتابخانەیەکیان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو زستانێك پیرەمێردێکی چاك خۆی تەرخان دەکات بۆ فێرکردنیان. پیرەمێردەکە هەرە بچووکەکانیان لە ماڵەکەی خۆیدا کۆدەکاتەوە، فێری ڕێنوێنییەکانی ئایینی مەسیحی و نوێژیان دەکات. شەقلاوە کلێسەیەکی تاڕادەیەك چاکی هەیە. چوار ساڵ بەر لە ئێستە پێویستی بە گەورەکردن بوو. کوردەکان دژی ئەو گەورەکردنە بوون و بە شەو ئەوەی لە ڕۆژدا دروستیان دەکرد، ئەوان تێکیان دەدا. ژیانی ئەو مەترانەی کە سەروکاریی دروستکردنی کلێسەکەی دەکرد، زۆربەی جار لە هەڕەشەدا بوو. دواجار پاشای کەرکوك لە ڕەوشەکە ئاگادار کرایەوە و بەوە کۆتایی هات کە کوردەکان بێدەنگ بکەن. من دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت لەوەی چەند کەسێك بهێنمە ناو کۆمەڵەی برایەتیی ئایینی ڕۆسێر و بەتایبەت بەو کاریگەرییەی سەرگوزشتەی بەخشین و شانازی ڕۆسێر سەرسام بووم، کە بەسەر ئەو هەموو خەڵکە میهرەبانەوە هەیبوو ((لەوەبەدوا ئیدی دڵدانەوەی ئێمەیە لەناو سزای ئێمەدا، ئەوان پێیان وتم ئەوە چەکی ئێمە دەبێ دژ بە دوژمنەکانمان)).

بەڵام هێشتا ڕوونم نەکردۆتەوە چۆن ڕوویدا، کە من لەم وڵاتەدا لەناو دارو دارستاندا، لەژێر کەپرێکی دارینددا ژیام. چەندین باخ و باخاتی بەرفراوان لە دەوروبەری شەقڵاوە دەبینرێن؛ دانیشتووانەکەی بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر ئەو میوەجاتە نایابانە دەژین، کە دەیچننەوە و، دەچن لە ئەربیل، لە کەرکووك، تەنانەت تاکوو (مووسڵ)یش دەیفرۆشن.

هەر کە میوەجاتەکان دەست بە پێگەیشتن دەکات، خەڵکەکە ئاوایی بەجێدەهێڵن بۆ ئەوەی هەریەکەیان بچێتە ناو بێستانی خۆی تا چاودێریی بکەن لە دژی دزان و بەم شێوەیە تا پاییز دەمێننەوە. هەر بنەماڵەیەك لەم ماوەیەدا لەژێر کەپرێکی دارینددا دەژی. قەشەکان زیاد لەوە کەپری تا ڕادەیەك فراوانیان هەیە کە تایبەتە بۆ یادکردنەوەی بۆنە پیرۆزەکان و تێیدا بنەماڵە زۆر نزیکەکان دێن بۆ ئەوەی بەشداری لە نوێژ و سرووتی پیرۆزی ئایینی بکەن. بۆ من شاپێلێکی* تایبەتیان دروست کردبوو، کە چەند باوەڕدارێك هەموو سبەینێیەك لەوێ کۆدەبوونەوە بۆ ئەوەی بۆنە ئایینییەکانی تێدا بکەن. من هێشتا لەوێ گوێگرانی دیکەی هەمەچەشنەم هەبوو کە تەیروتواڵ لەسەر هەموو درەختەکانی دەوروبەر و بە ئاوازیی هەرە بەجۆش و لەگەڵ جریوەجریوی بەئاواز سروودی سپێدەیان بۆ ئافەریدەکار دەچڕی.

دوای ١٥ ڕۆژ مانەوە لە شەقڵاوە، دەبوو بیر لەوە بکەمەوە لەم خەڵکە میهرەبانە جیا ببمەوە. ڕوانینی بەدبەختییان و خۆڕاگرییان پەیوەندییێکی هاوسۆزیی لەنێوان من و ئەواندا دروست کردبوو.، گڵکۆی سارای بێگوناه زیاتر نەرمونیانتری کردبوون، حەزم دەکرد هێشتا زیاتر بمێنمەوە، بۆ ئەوەی دۆستایەتییان گەرموگوڕتر بێت. بەڵام مسیۆنێر هەمیشە بەرفەرمانی سینیۆر و

* شاپێل: Chapell (نوێژخانە، شوێنی نوێژکردن لەناو کڵێسەدا) (وەرگێڕ).

پەیامبەرەکانیەتی:  دەڕوا، هەر بەحاستەم چاندی، دەبێت بڕوا بێ ئەوەی دەنکەکەی ببینێ. دڵگیریی ئەو زەوییەی کە تێیدا کاردەکات نابێ گلی بدەنەوە، ئەو بۆ هەموو وڵاتان: هەموو خەڵك و خوا کراوە. ئەو پەیوەندییانەی کە دەبێت بیانشکێنێ، ئەو دڵدانەوانەی کە بەجێیان دەهێڵێ، هەموو ئەو قوربانیدانانە، دەبنە سەرچاوەیەکی بەپیت بۆ ئەو زەوییەی کە چاندوویەتی و دروێنە تێیدا زۆر بەرفراوانتر دیار دەبێت.

# ٩

# گەڕانەوە-ڕێگەی شەقڵاوە بۆ عەنکاوە- هۆزی هەرکی - گەڕانەوە بۆ مووسڵ

سپێدەی ڕۆژی ١٣ی ئاگستۆس ماڵئاواییم لە مەسیحیایەتیی ئازیزی شەقڵاوە کرد. بە هاوەڵی چوار کورد کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد یەکێك لە ئەسپەکانم هی ئەوانە، بەڕێ کەوتم. تەنانەت لە شەقڵاوە بەزەبری هێز دەستیان بەسەر ئەسپەکەدا گرتبوو: بەڵام دوایی میر لە ترسی ناوی کونسوڵی فەرەنسا لە مووسڵ بۆی گەڕاندمەوە و ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە پرۆسەکە لە مووسڵ یەکلایی بکرێتەوە: کەوایە ئەو خەڵکە بۆ ئەوە هاتوون و دەیانەوێ سکاڵای خۆیان بکەن. من چاك چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بەهاوەڵیی ئەوانە گەشتەکەم بە هێمنی نەبرم. ڕاستییەکەی، کاتێك لەناو چیاکان ون بووین، بەهێز دەستیان بەسەر ولاغەکەمدا گرت و بە چەکەکانیان هەڕەشەیان لێ دەکردین، بەڵام بۆ یەکەمجار توانیمان چەکەکانیان لەدەست دەربهێنین. کاتێك گەیشتینە ناو ئاواییەکی کوردی، لەوێ توانییان بە قازانجی خۆیان خەڵکەکە بهێننە ناوەوە و جارێکی دیکە ولاغەکەیان لێ سەندینەوە بردیانەوە بۆ ئەربیل. لە ئەربیل توانیم جارێکی دیکە بە فەرمانی حاکمی شار ئەسپەکەم وەر بگرمەوە و خۆم لەدەست ئەو هاوڕێگە ئێسك قورسانە ڕزگار کرد.

لە شەقڵاوە سەفەرەکەم وا ڕێك خستبوو لە گەڕانەوەدا بە عەنکاوەدا بگەڕێمەوە. ڕێگەکە بەشی زۆری بەناو چیا بەرزەکاندا تێپەڕ دەبوو. ئەو

ڕێگەیەی کە بەناو ئاواییەکانی کاوانیان، گردەچار (گردەچاڵ)* و کۆڕێ یدا بردین، کە ئەوێ هێشتا باخچەی جوانی تێدا بوو. چیای بەرزی پیرە مام مان بڕی، کە لە خوارەوەی بانەمانی لێیە، لەگەڵ قەڵا مکوومە کۆنەکەی. دوای ئەوەی لە ڕووباری بەستۆرە پەڕینەوە، چیایێکی زۆر بەرزی دیکەمان بڕی کە لەوێوەوە دەیڕوانییە سەر تەواوی پێدەشتی ئەربیل، لەگەڵ کۆنە شارێ کە کەوتۆتە ناوەڕاستەکەی، وەکوو قووچەکێکی وەستاو و پێدەشتەکەش وەکوو بنکە بێت وابوو، لەو بەرزاییەوە تەماشاکردنی شتێکی نایاب بوو. لە لاپاڵی داوێنی ئەم چیایەدا، ئاوایی سەرکەشی (براغ) بلاغ (بولاغ) Bolahk مان بینی، کە تەنیا چوار کاتژمێر لە ئەربیلەوە دوور بوو.

کاتی تێپەڕبوونمان بەو ڕێگەیەدا کەوشەنی هۆزی هەرکیمان بینی، کە بە خۆیان دەڵێن ئامۆزای فەرەنسییەکان. من نەمتوانی بچمە ناو باسی ئەوەی قسە لەسەر ئەم *خزم و کەسە دوورانە*** بکەم. هەرکییەکان بۆ سەلماندنی بنەچەکناسییان کە زۆر شانازیی پێوە دەکەن، دەڵێن باووباپیرانیان لە دەورانی کۆندا چوونەتە فەرەنگستان، وڵاتی فەرەنسییەکان و لەوێوەوە جێگیر بوون و بوونەتە تۆرەمەی نەتەوەکانی ئێستە. من بیستوومە کوردی دیکەش هەمان شانازیی بەخۆیەوە بڕیوە، ئەگەرچی دەشزانن دووپاتکردنەوەکانیان هیچ بنەوانێکی نییە، چونکە سێلت و پێلاگەکان کە پەلاماری ئەورووپایان داوە لەولایەوە هاتوون. ئەمڕۆ هێشتا ژمارەیەکی زۆر وشەی فەرەنسی لەناو زمانی

---

* Gardatchuar.

** *parents élognés* نووسەر بۆ نیشاندانی گومانی خۆی لەبارەی ڕاستی و دروستی ئەم وتانە هەردوو وشەکەی بە خواری نووسیووەتەوە، ئێمەش بۆ هەمان مەبەست هەردوو ئەم وشەمان وەکوو خۆی لە وەرگێڕانە کوردییەکەشدا هەر بە خواری نووسیوەتەوە، (وەرگێڕ).

کوردیدا هەیە و لەسەر دوندی چیاکانی کوردستان زۆربەی جار ئەم دروستکراوە فرەیە و دروستکراوە بەردینەی بێتاشین دەدۆزینەوە کە بەرەنگاریی زەمەن و مرۆڤەکانیان کردووە و بێگومان زۆر لەوانە دەچن کە لە سیسیل و لە ئیتاڵیا دەبینرێن. هەرچۆنێك بێ، هەرکییەکان هێشتا خاڵی لەیەکچوویان لەگەڵ فەرەنسەوییەکان هەیە.، هەرکییەکان وریا، ڕاشکاو و زۆر تێکەڵاون، بەڵام ئەم سیفاتە چاکانەیان بە غەریزەی تاڵان و برۆیی بەهەدەر داوە. ئەوە ڕاستە کە ئەوان دزی گەورەی سەرە ڕێگە نین، بەڵام ئەگەر میوانداری یا پێشوازی دەکەن، بەدەگمەن وا هەیە لەم دەرفەتانەدا دەست بەناو چەند شتێکدا نەگێرن کە هی ئەوان نییە. هەروەها زۆربەی کوردەکان، لە سەدەی یەکەمی زاینیدا بوونە مەسیحی.، ئێمە دەزانین تەواوی هەرێمی ئەدیابین، کە ئەم ناوچانەی دەگرتەوە و ئەربیل پایتەختی بوو، لە سەدەی شەشەمدا بەتەواوی مەسیحیی بوو و پڕبوو لە کڵێسە و دێرە و ئەمڕۆ هێشتا دەبینرێن هەر ماون و زۆر لە شەهیدەکان گەواهی ئەوە دەدەن لە ژێر زوڵم و زۆری ئێرانییەکان بوون. هەرکیەکانمان زۆر چاك دەزانن، کە لە چەند دەورانێکدا باووباپیرانیان مەسیحی بوون و شیمانەی ئەوە هەیە کە ئەوان دوایەمینی ئەم گەلانە بن کە وازیان لە ئایینی مەسیح هێنابێ، چونکە تا ئەمڕۆژانە هەموو ترادسیۆنەکانیان پاراستووە. ئەوان ناو و کاتی جەژنەکانی مەسیحییان دەزانن و بەگوێرەی ئەوانە دەورانەکان دیاری دەکەن. هەروەها هەرکییەکان لە هەموو کوردەکانی دیکە زیاتر لەگەڵ مەسیحییەکان تێکەڵن. بەگشتی هەرکییەکان کۆچەرن، واتە کۆچبەرن، هاوینان وڵاتەکەیان بەجێدەهێڵن، کە لەوەڕگەکان لەبەر قرچەی گەرما وشك دەکەن، بۆ لەوەڕاندنی مێگەڵەکانیان دەچنە هەرێمە زۆرتر فێنکەکانی شەمدینان، ئازەربایجان و ورمێ لە ئێران. زمانیان کوردیی بادینانە، وێڕای ئەوەی کە هۆزەکەیان سەر بە هەرێمی

سۆرانە. ئینشائەللا بەم زوانە کڵێسە دەسەڵاتی ئاینیی خۆی لەناو ئەم گەلانەدا دادەمەزرێنێ، بۆ ئەوەی فێری ئەو فەزیلەتانەیان بکات، کە ئەو ئەوەندە لێی دوور کەوتوونەتەوە!

١٣ی ئاگستۆس، ئێوارەکەی دوای یانزە کاتژمێر ڕۆیشتن، گەڕامەوە بۆ عەنکاوە. لەوەتای دەرچوونمەوە دەستی خوداوەند بەسەر ئەم مەسیحییە گومڕایانەدا هاتبوو، لەناو پرسە و ترسدا بینیمنەوە لە دوای شەڕێکی نێوان عەرەب و خەڵکی ئاوایی، چەکەکان لێك ڕاکێشرابوون و یەکێك لە گەنجەکانی ئاوایی، یەکێك لە گەنجە هەرە بەجەرگەکان و خۆشەویستی هەموان کوژرابوو، کەللەی سەری بە تاپوزێکی *Tapous* پڕ لە بزماری عەرەبەکان شکابوو، هەندێکی دیکە بە سەختی بریندار بووبوون. لەلایەن عەرەبەکانیشەوە کوژراو و بریندار هەبوو. دەستەڵات دەستی بەسەر ئەم پرسەدا گرتبوو و خەڵکی عەنکاوە لەوە دەترسان ئەمە بۆ ئەوان خراپ بشکێتەوە. ئەم ڕووداوە، هاوڕێ لەگەڵ سەرکۆنەی توندی مۆنسەنیۆر (مەتران) یۆحەننا، میزاجی ئەندێشەکانی باشتر کردبوو، بۆیە لە جاری یەکەم کەمتر ساردوسڕتر پێشوازی کرام.

دوو ڕۆژ لە عەنکاوە مامەوە: ئێوارەی جەژنی هەڵکشانی پاکیزە بۆ ئاسمان* ، ئەو ڕێگەم گرتە بەر کە دوو مانگ بەر لە ئێستا گرتبوومە بەر و ڕۆژی ١٧ی ئاگستۆس گەیشتمەوە مووسڵ.

* جەژنی هەڵکشانی (چوونی) پاکیزە بۆ ئاسمان لە ئایینی مەسیحیەتدا: Assomption

# ١٠

# ئەنجام

لەم گەشتە درێژەدا باسی دڵنەوایی و خەمباریم گێڕایەوە. خەمباریم بۆ ئەوەبوو ببینی ئەوەندە گەلانی جێنشین کە لە سێبەری مەرگدا بن و وا دیار بێ تاوەکوو ئێستە ئامادەبن بۆ ئەوەی تیشکی ڕاستەقینە وەربگرن. داڵدانەوەکانیشم بۆ ئەوە بوون کە بەچاوی سووك سەیر کرام، دڵیان شکاندم، نیگەران بووم لەسەر ڕێگەکەمدا، لەکاتێکدا من لە پێناو عیسا-مەسیح سەفەرم کردبوو، بەڵام لای من هەروەها باش بوو کە بینیم نمایشی ئەو هەموو مەسیحییە میهرەبانە زۆر دەگمەنانە بە چاوی خۆم کە ئەفسووس لە ئەسقەفیەی کەرکووك لەناو سادەگیی ئایینیدا نوقم بووبوون، وێڕای ئەو ئاستەنگیانەی لە هەموو چەشنێك کە دڵی مسیۆنێر ئەوەندە دەبەخشی وەریدەگرتەوە. ئەوەی مایەی داخە ئەوەیە، کە ئەم دانیشتوانە سەرنج ڕاکێشانە ئاوها هێندە دوور، پەرت و بڵاو، ئەوەندە دەست پێ ڕاگەیشتنیان سەختە. ئێمە دەتوانین زۆر جاران وایان لێ بکەین بەشداری لە کاری چاکەی کەشیشیی ئێمەدا بکەن، کە ئەوان زۆر باش ئامادە کراون بۆ ڕەوشی چەوساندنەوەی هەمیشەییان. من لای ئەم مەسیحییە هەژارانە کوڵەمەرگیی جەستەییم بینی، من بەختیارم کە توانیم لە سایەی ئەو دەستگیرۆییە خێرخوازییەی بڵاوکەرەوەی ئایینی* و قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بڕێك باریان سووك بکەم. هەروەها توانیم بەدەنگ ئەو کڵێسە

* Propagation de la foi

هەژارانەوە بچم، بەوەی ئارایش و جلوبەرگی ئایینیان بەسەردا دابەش بکەم. ئەو برە پارەیەی، کە بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ خۆمدا بردبووم، هەموویم لێ سەرف کرد، بەڵام خێرخوایی ژنانی کاری تەبشیری و مسیۆنی دۆمینیکان لە بن نەدەهات، ئێمە پشتمان بەوان بەستبوو بۆ بەردەوامبوونی ئەم کارە چاکەیەی ئالیکاریی کلێسە هەژارەکانی ڕۆژهەڵات. وێنەگەلی گەورە بۆ کلێساکان، کە من لە کاتی ڕۆشتنمدا کۆم کردبوونەوە، بە خۆشی دەربڕینی هەرە سادەوساکارانە لەلایەن ئەم خەڵکەوە پێشوازی لێوە کرا، کە خۆیان ئەوەندە بێ وێنەی پیرۆز بوون. بە چ ڕازیبوونێک. بەتایبەت کە ئەوان دەیانڕوانییە وێنەی جوانی پاکیزە! بۆ ئەم مەسیحییانە وا دیار بوو کە بە زیندوویی ببینن، نیان، پاك، تەواو باش، تەواو میهرەبان، وەک چۆن دڵە سادەکانیان زۆر باش لێی تێدەگەن. مەریەم، پشتیوانی هەژاران، دڵنەوایدەری ئازارچەشتووان، دایکی ناسکیی مرۆڤایەتی، زۆر باشتر بەم وێنەیە بانگەشەی بۆ دەکرا نەک بە جوانترین دیسکورسەکان (گوتارەکان).

لەودیو ئایینەوە، بێگومان کاری دیکە هێشتا بە پێداگرتنەوە داوای جۆشوخرۆشی ئێمە دەکات لای ئەم مەسیحیانە، چ بۆ پاراستنی ڕۆحیان و چ بۆ پەروەردەی چاکی منداڵەکانیان. بەڵام ئەوەی مایەی تووڕەبوونە کە جۆشوخرۆشی مسیۆنێر واهەیە زۆربەی جار هێندە بێ دەسەڵات بێ بەهۆی خەوشی سەرچاوەی ماددییەوە، باوەڕی ئێمە بە خودایە و لەناو ڕۆحی بەخشندەی خودا دایە، کە لە دوورەوە پشتگیری لە بانگەوازی مەسیحییەتی ئێمە دەکات، ئێمە بەو پشتگیرییانە هیواخوازین دەسەڵاتی ئەوەمان بداتێ هەموو چاکەیەك بکەین کە حەز دەکەین بیکەین.

ناتوانم ئەم سەربوردەیەم تەواو بکەم بەبێ ئەوەی ستایشی دەسەڵاتکارانی تورك نەکەم کە چاکەیان نکوڵیی لێ ناکرێ و هەمیشە

یارمەتییان داوم و بە تەنگمەوە هاتوون، بۆ هەموو ئەوەی پێویستم بووە داوام کردووە. ئەوە بۆمن قەرەبووکردنەوەیەکی شادمانانە بوو بۆ ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە لە لایەن کوردەکانەوە چەشتم. خودا پاداشتی ئەوانەیان بداتەوە بۆ چاکەیان بۆ مسیۆنێری هەژاریان و لە ئەوانی دیکەش ببورێ لەو خراپەکارییەی کە بەرامبەریان کردووم، لە نەزانی و کوێرییان ببورێ.

-تەواو-

Tome 1er Page 160.



*Toufangchi nestorien du Hekary.*

نەستووریيەکی چیایی لە هەکاری (گاسپارد درۆڤیل، بەرگی یەکەم، 1825)

6

Chapitre XVII

Les convois des déportés étrangers, en transit par Mardine

Sommaire. Convoi des dames arméniennes de Diarbékir. Vers la fin de juin 1915, six mille arméniennes du Nord sont massacrées sur le Geuk-sou selon le récit d'une rescapée venue à Mardine — trait de courage d'une convoyée — Convoi allant à Ras-el-Aïn très éprouvé par la chaleur et la soif, femmes buvant le sang de leurs compagnes tuées. Le jeune Arménien Yacoub tué. Des femmes chrétiennes en preuve de sa foi musulmane. Sept mille déportés du 10 juillet, quatre mille du 14 sept, deux mille du 20 octobre, trois mille du 28 octobre. Dispersion et destruction des familles — À [illegible] on se réjouit de l'annonce des meurtres des arméniens. (De la page 256 à la page 276)

Le premier convoi de personnes déportées qu'on vit passer à Mardine se composait de dames arméniennes de Diarbékir avec leurs enfants et leurs domestiques, formant ensemble environ quatre cents individus. Ces dames parmi lesquelles il y avait des catholiques, étaient les épouses des notables chrétiens que le gouvernement avait fait disparaître de Diarbékir dès le commencement des événements, en donnant à croire qu'il les avait exilés à Mossoul. Un jour Rechid Pacha fit dire à ces dames : Vos maris sont arrivés à Mossoul et ils demandent que vous alliez les rejoindre ; nous sommes heureux de vous accorder cette permission. Ce n'était qu'une ruse de cannibale qui veut de la chair humaine, et à laquelle ces personnes ne comprirent rien, éblouies qu'elles étaient par l'agréable perspective de se retrouver en famille. Elles emportaient avec elles leurs objets les plus précieux et beaucoup d'argent pour vivre dans l'exil, en attendant, pensaient-elles, que l'orage soit passé et qu'elles puissent retourner chez elles.

دەستنووسی یاددشتنامەکانی ڕیتۆری ژاك سەبارەت بە قەتڵوعامی ساڵی ١٩١٥-١٩١٦ی مەسیحیەکان.

# GRAMMAIRE

DE LA

# LANGUE SOURETH

OU

## CHALDÉEN VULGAIRE

SELON LE DIALECTE DE LA PLAINE DE MOSSOUL
ET DES PAYS ADJACENTS



PAR LE P. J. RHÉTORÉ
DES PP. DOMINICAINS, MISSIONNAIRE EN KURDISTAN



MOSSOUL
IMPRIMERIE DES PÈRES DOMINICAINS
1912



بەرگی کتێبی ڕێزمانی زمانی سورێت
بە زمانی فەرەنسی-١٩١٢




بەرگی کتێبی بە فەرەنسی چاپکراوی یاددشتنامەکانی ڕیتۆریَ ژاك
لەبارەی قەتڵوعامی مەسیحییەکانەوە- ١٩١٥



دیمەنی قەڵای ئامێدی لە ساڵی ١٨٧٦

سەرچاوە: A.P.F ساڵی ١٨٧٦



Vue générale de Diarbékir, vers 1913 (Tfinkdji, *op. cit.*, p. 39).

دیاربەکر ساڵی ١٩١٥

سەرچاوە: Les chrétiens aux bêtes


Groupes de réfugiés assyro-chaldéens et arméniens
uivant les troupes russes lors de leur retraite de la région d'Ourmiah (janvier 1915).

کۆچڕەوی مەسیحییەکانی هەکاری بۆ ورمێ
ساڵی ١٩١٥

# ئیندێکسی ناو و شوێن

## ب

## و



## ی

# پێڕەست

**Le Kurdistan au XIXe siècle**
**Vu par des voyageurs occidentaux**
Texte traduit du français en kurde et annoté
par : Najat Abdulla

«لە ئەرگەهـ، لە بناری گاشەبەردە سووتاوەکانی ئەلەجە-داغ، لەسەر زەوییەکی تەپوتۆزاوی و بێ سێبەر، چوار هەزار زیندانیی کورد لە هەموو زایەند و تەمەنێک دەبینران. ئەوانە تەنانەت یەک تاقە پارچە قوماشیشیان نەبوو بۆ ئەوەی ڕەشماڵێکی لێوە درووست بکەن، لەبەر چرقەی ئەم خۆرەتاوە سووتێنەرە هەڵخرابوون! بەوەی نەیاندەتوانی چیتر بەرگەی گەرمای بەتینی ڕۆژ بگرن، لەناو تەپ و تۆزدا دەم و چاویان نوقمی عەرەقە بوو بوو. ئەم پیاو، ژن، کیژۆڵەی گەنج و زارۆکانە، کە زۆربەی هەرە زۆریان بە تەواوی ڕووت و قووت بوون، بڕێکیان هەر تەنیا پارچەیەک قوماش بەدەوری کەمەریانەوە بوو. دەربڕینی ئازار و بێهیوایی لەسەر هەموو ڕووخساریان دیاربوو، ئا لێرەدا ئەشکەنجە، گیانکێشانێکی ئازاراویی، حەسرەتی قووڵ، هەر لە خڕەخڕی گیانکێشانێکی تۆقینەر دەچوو، کە لە سینگی پیاوەکانەوە دەهاتە دەرەوە، گریان و کرووزانەوەی ژنان، هاواری منداڵی بەرمەمکان، ڕۆحی دەپساند. ئەم چوار هەزار کوردە، بەدەم توندترین ئەشکەنجەدانەوە ڕاپێچ کرابوون».

« ئەنفالی لەشکرکێشیی عوسمانی،
بناری ئەلەجە-داغ، ئاگستۆسی ١٨٣٧»




**لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی**
**هەولێر ٢٠٢٢**

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر